

# مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس

## پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان

ماریژان مۆڵە - هێرتزفێلد - گێرشمەن

وەرگێڕانی

ئەردەڵان مام وسو دزەیی



٣

# مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس

## (پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان)

## (بەرگی سێیەم)

ماریژان مۆڵە ـ هێرتزفێڵد ـ گێرشمەن

وەرگێڕانی

ئەردەڵان مام وسو دزەیی

## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس** (پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان)
- نووسینی: ماریژان مۆڵە، هێرتزفێڵد، گێرشمەن
- وەرگێڕانی بۆ فارسی: زەبیحوڵڵا مەنسووری
- وەرگێڕانی: ئەردەڵان مام وسو دزەیی
- پێداچوونەوەی: کامەران تاهیر
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- نرخ: (٢٠.٠٠٠) دینار بۆ هەر چوار بەرگ
- چاپی یەکەم : ٢٠١٤
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٢)ی ساڵی (٢٠١٣) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٥٢)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێڕست


بەرەو ئەسینا ........................................ ٧
دیمەنەکانی شاری ئەسینا ........................................ ٢٦
جەنگی سالامیس ........................................ ٤٤
گەڕانەوەی خەشایار شا ........................................ ٦٠
جەنگی مەگار ........................................ ٧٤
ماسیس تەس برای خەشایار ........................................ ٩٣
ناپاکی ........................................ ١٠٦
کوژرانی خەشایارشا و دەسەڵاتیی ئەردەشێر ........................................ ١١٨
ئاشتی نێوان هەخامەنشیی و یۆنانییەکان ........................................ ١٣٥
جەنگ و براکوژی ........................................ ١٥٠
داریوشی دووەم (ئەخۆس) و پرۆشات ........................................ ١٧٦
جەنگی دوو برا ........................................ ٢٠٠
شاژنێکی کینە لە دڵ ........................................ ٢٢١
ڕووخان ........................................ ٢٥١

له گۆگمەل تا بابل.................................... ٢٧٨
تەختی جەمشید لەنێو ئاگردا ................................ ٢٩٨
له ئەکباتان تا باختەر ................................... ٣١٩
دوای مردنی ئەسکەندەر................................... ٣٤٠
دەسەلاّتداری یۆنانییەکان.................................. ٣٥١
بالادەستی پارتەکان له رۆژهەلاّتی ئێران........................ ٣٦٨
کۆتایی دەسەلاّتیی یۆنانییەکان له ئێران ....................... ٣٨٧
ژیانی شاپووری یەکەم کوڕی ئەردەشێری پاپەکان بە پێنووسی خۆی .................. ٤١٢

# بەرەو ئەسینا

دوای هاتنی شەو، باران دەستی کرد بە بارین و بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان، خوداوەندیان بۆ ئێسپارتەکان گریان، باران تا بەرەبەیان بەردەوام بوو و خوێنە ڕژاوەکانی گۆڕەپانی جەنگی شووشتەوە، بۆ ڕۆژی دواتر هەتاوێکی گەرم لە شاخەکانی دەدا، هیچ شوێنەواری خوێن نەمابوو.

ئەو ڕۆژە لەشکری خەشایار بۆ ڕۆیشتن بە گەلی تەرمۆپیلێ دەستی کرد بە جووڵە، بەڵام بەو شوێنەدا نەڕۆیشتن، کە یۆنانییەکان لە ئەوێ چاوەڕێیان بوون و بەو بزنەڕێیەدا ڕۆیشتن، کە سەربازەکانی دەستەی بەدواداگەڕان دۆزیبوویانەوە، پێشتریش خەشایار لێی ئاگەدار بوو، دوای ئەوەی جەنگ دەستی پێکرد دەستەکانی بەدواداگەڕان، دۆزییانەوە کە شوێنی کوژرانی ئێسپارتەکان، دەستپێکی ئەو ڕێگەیە بوو.

بەڵام هیرۆدۆت دەڵێت خەشایار لە بوونی ئەو ڕێگەیە بە ئاگا نەبوو و شوانێکی یۆنانی لە بەرانبەر بیست یاخۆ بیست و پێنج بەرد زێڕ ڕێگەکەی بۆ ئەوان ئاشکرا کرد، هەر بەردێکی هەخامەنشیی بەرانبەر دوو کیلۆ و نیوە، واتە شوانەکە پەنجا تا شەست و دوو کیلۆ و نیو زێڕی وەرگرتووە...بۆ مرۆڤ جێگەی سەرسووڕمانە، شوانێك لە شاخەوە دێت و لە شاخەوەش دەڕواتەوە، چۆن توانای هەڵگرتنی شەست و دوو کیلۆ و نیو یاخۆ پەنجا کیلۆ زێڕی هەبوبێت.

شوانە یۆنانییەکە پرۆفیسۆر "بارن" باسەکەی بە ئەفسانە دەزانێت، بەپێی ئەو گێڕانەوەیە شەوی پێشتر و پێش ئەوەی باران ببارێت، خۆی گەیاندە لەشکری هەخامەنشیی و وتی: بۆ کارێکی گرینگ هاتووم، کە سەرکەوتنی پاشای هەخامەنشیی بەو کارە بەندە و دەبێت خەشایار ببینم.

دوای ئەوەی بردیان بۆ لای پاشا، وتی: لەو شاخەدا ڕێگەیەك هەیە، ئەگەر لەشکری ئێران بەو ڕێگەیەدا بڕوات لە گەلی تەرمۆپیلێ تێپەڕ دەبێت بێ ئەوەی بەناو گەلییەکەدا بڕوات، من ئامادەییم هەیە کە ببمە ڕێپێشاندەر و لەشکری هەخامەنشیی لەو ڕێگەیەوە دەرباز بکەم.

خەشایار بەرانبەر بە شوانەکە گومانی هەبوو و پێی وابوو، کە ئەو لەلایەن یۆنانییەکانەوە نێردراوە تا لەشکرەکەی بە شوێنێکدا ببات، کە پێویستییەکانی لەنێوبردنی ئەو لەشکرە لە ئەوێ هەبێت، بۆیە پێی وت: لە بەرانبەر ئەو خزمەتە چ شتێکت دەوێت؟، شوانەکە وتی: "٢٠ تا ٢٥" بەرد زێڕم دەوێت، "خەشایار"یش وتی: سێ یەکی ئەو زێڕە پێش جووڵەی لەشکر وەردەگری، دوو بەشەکەی دیکەیش دوای ئەوەی لەشکرەکەم لە تەرمۆپیلێ تێپەڕ بوو، گەیشتە پێدەشتەکەی ئەو دیو، دەتدەمێ، شوانەکە مەرجەکەی پەسەند کرد، سپێدەی ڕۆژی پاشتر شوانەکە بووە ڕێپێشاندەری لەشکری خەشایاری، لەشکرەکەی لەو بزنە ڕێگەیەوە برد و گەیاندنییە پێدەشتەکان. ئەو دەمەی شوانەکە ڕێ پێشاندەری دەکرد، چەند سەربازێکی خەشایار چاوەدێری ئەویان دەکرد، تا ئەگەر مەبەستی فێڵکردن بێت یاخۆ بیەوێت لەشکری هەخامەنشیی بخاتە نێو بۆسەی دوژمنەوە یەکسەر بیکوژن.

هیرۆدۆت نالێت لەشکرە پێنج ملیۆن کەسییەکەی خەشایار چۆن توانی بەو بزنە ڕێیەدا بڕوات، کاتێك هیرۆدۆت باس لە ناپاکی ئەو شوانە دەکات سەربازەکانی لەشکری خەشایار بە پێنج ملیۆن کەس دەنووسێت.

بزنەڕێی شاخەکان ڕێگە نین، ئەمەش بە دوو هۆکار چێ دەبن: بەهۆی تێپەڕبوونی ئاو لە ماوەی دەیان هەزار ساڵ و بگرە پتریش، دووەم لە ئاکامی تێپەڕبوونی مەڕ و بزنە کێوییەکان بە درێژایی دەیان هەزار ساڵ و زیاتریش چێ دەبن.

تێپەڕینی ئاو کە لە ئاکامی باران بارین و توانەوەی بەفر دێتە دی و ڕۆیشتنی ئاژەڵە کێوییەکان بە تایبەتی مەڕ و بزن بە سەر بەردی نەرمدا بۆ ماوەی ساڵانی یەکجار زۆر، بەردەکان دەسووێت و ڕێگەیەك چێ دەکات، کە مرۆڤ دەتوانێت بەسەریاندا بڕوات، بەڵام لەشکرێکی پێنج ملیۆن کەسی بە هەموو پێداویستییە جەنگییە قورسەکانی شەڕەوە ناتوانێت بەو شوێنەدا بڕوات.

لەشکری خەشایار لەنێوان هەشتا تا سەد هەزار سەرباز پێکهاتبوو، بۆ پەڕینەوە بەو ڕێگەیەدا هەموو پێداویستییە سەربازییەکانی خۆیان جێهێشت و لە ماوەی دوازدە ڕۆژ و

بەپێی هەندێ گێڕانەوەش پازدە ڕۆژی خایاندووە، تا لەشکری خەشایار توانیان بەو ڕێگەیەدا بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەنن بە پێدەشتەکانی باشووری دەربەندی تەرمۆبیل، لە هەندێ شوێن سەربازەکان بۆ خۆپاراستن لە هەڵدێران، سوودیان لەو پەتانە وەردەگرت، کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویانن، بەهۆیەوە تێپەڕ دەبوون.

هۆکاری درەنگ کەوتنی پەڕینەوەی لەشکری خەشایارشا بەو کوێرە ڕێیانەدا، جگە لە سەختی کوێرەڕێی شاخ، کورتی ڕۆژانی پاییزیش بوو، هەر دەستەیەك لە سەربازەکان کە لە شاخ دەپەڕینەوە، دوای پەڕینەوە بۆ پێدەشتەکە ڕاستەوخۆ خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکرد و چاوەڕوان بوون تا یۆنانییەکان لەپڕ هێرش بکەنە سەریان، بەڵام یۆنانییەکان هێرشیان نەکرد.

هیرۆدۆت دەڵێت: یۆنانییەکان ئاگەدار نەبوون، کە ناپاکییان بەرانبەر کراوە و لەشکری خەشایار بەو بزنە ڕێگەیەدا ڕۆیشتووە.

ئاخۆ دەچێتە ئەقڵەوە کە پێنج ملیۆن سەرباز[1]، بەو ڕێگە شاخاوییە بڕۆن و ئەوانەی چاوەڕوانیانن ئاگەداری هاتنیان نەبن؟، ئاخۆ ئەو یۆنانییانەی لە دەروازەی باشووری گەلی تەرمۆبیل چاوەڕوانی هاتنی ئەوان بوون، بیریان نەکردەوە، دوژمنەکەیان چی لێ هات، کە نایەن بۆ شەڕی ئەوان؟

ناچێتە ئەقڵەوە لەشکرێکی وەك لەشکری یۆنان لە مەیدانی شەڕدا چاوەدێر و ڕاسپێردراوی بەدواداچوونی نەبێت و ئاگەداری لەشکری دوژمن نەبن و لە جووڵەی ئەوان لەو شوێنە سنووردارە ئاگەدار نەبن، گریمان چاوەدێرەکان نەیان زانی بێت هۆکاری درەنگ هاتنی هەخامەنشییەکان چییە، دەبووایە بزانن بویەرێکی نائاسایی ڕوودەدات و پێویستە بەدواداچوون بکەن بۆ ئەو ڕووداوە تا بزانن چی قەوماوە.

---

(١) (زەبیحوڵڵا کاتی پەڕینەوەی لەشکری هەخامەنشیی لە شاخ ئەوانی بە هەشتا تا سەد هەزار دیارکردووە، بە دوازدە تا پازدە ڕۆژ پەڕاندووینەوە، بە هەمان شێوەش کە دەگوترێت هەر لە بزنەڕێ و کوێرەڕێکان بووە و کەلوپەلی سەربازیشیان جێهێشتووە، بە واتایەکی دی ڕۆژانە لە ٥٠٠٠ تا ٦٥٠٠ سەرباز پەڕیونەتەوە، بەڵام کاتێك ناوی هیرۆدۆت دێت ژمارەکە دیسان دەبێتەوە بە پێنج ملیۆن و لە کاتی جەنگ دیسان بە هەشتا تا سەد هەزار، بەو شێوەیە بەردەوام بۆ سەپاندنی رای خۆی بابەتەکە بە لاڕێدا دەبات و دەیەوێت رای دەیان و سەدان مێژوونووس بێ پاساو رەت بکاتەوە. وەرگێر بۆ کوردی).

لە یەکەم رۆژی پەڕینەوەکەدا، خەشایار باشترین دەستە لە سەربازەکانی لەو رێگەیەوە نارد، دوای تێپەڕبوونیان بەو رێگەیەدا، گەیشتنە پێدەشتێك بە ناوی (ئاهار)، کە ئێستە چوار سەد مەتر لە ئاستی دەریا بەرزترە.

هۆکاری ئەوەی لە یەکەم رۆژدا خەشایار شا باشترین سەربازەکانی خۆی نارد تا لە شاخ بپەڕنەوە، ئەو پێشبینی ئەوەی دەکرد دوای گەیشتنی سەربازەکانی بۆ ئاهار، لەوانەیە هێرش بکرێتە سەریان، بۆیە دەبێت هێندە بەهێز بن تا بکارن بەرگەی یۆنانییەکان بگرن.

دەستەی یەکەمی سەربازە هەخامەنشییەکان دوای ئەوەی چوونە ناو پێدەشتی ئاهار، ئۆردووگەیەکی بەهێزیان لە پێدەشتی ئاهار دامەزراند، بەڵام نەکەوتنە بەر هێرش، رۆژی دواتریش دەستەیەکی دیکە لەو سەربازانەی لە بزنەڕێگەکە تێپەڕ ببوون، گەیشتنە لایان و سوپایەکی بەهێزی هەخامەنشیی لە دەشتی ئاهار دامەزرا، بەڵام دیسان یۆنانییەکان هێرشیان نەکرد.

لە رۆژانی سێیەم و چوارەم و پێنجەمیش چەندین دەستەی سەربازی دیکە پەڕینەوە و گەیشتنە ئاهار و تێکەڵ بوون بە هاونیشتمانییەکانیان، بەڵام دیسان یۆنانییەکان هێرشیان نەکرد، دەبێت بوترێت کە یۆنانییەکان لە بەشی باشووری تەرمۆپیلێ بوون و نەیاندەتوانی بە خێرایی خۆیان بگەیەننە ئاهار، چوونکە لە نێوان پێدەشتی ئاهار و دەروازەی باشووری دەربەندەکە رێگەیەکی راستەوخۆ نەبوو، هەر بەو هۆیەش رێگەیەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان ئەو دوو دەڤەرە نەبوو، سەربازانی خەشایار هەوڵی گرتنی دەربەندی باشووری تەرمۆپیلێیان نەدا، هەرچەندە بۆ تاکتیکی شەڕ داگیرکردنی ئەو شوێنە پێویست بوو.

لەشکری خەشایار پێویست بوو، دەستبەجێ دوای تێپەڕبوون لە بزنەڕێیەکە، خۆیان بگەیەننە باشووری تەرمۆپیلێ و داگیری بکەن، چوونکە باکوریش بە دەست ئەوان بوو، بەمەش یۆنانییەکان گەمارۆ دەدران و دەکەوتنە نێوان دوو بەرداش یاخۆ لەنێودەچوون یاخۆ دەبووایە هەموویان خۆبەدەستەوە بدەن، بەڵام هەخامەنشییەکان ئەو کارە پێویستەیان بە ئەنجام نەگەیاند، چوونکە ئەگەر ویستبایان لە پێدەشتی ئاهار خۆیان بگەیەننە باشووری تەرمۆپیلێ، دەبووایە ماوەیەکی باش رێگە ببڕن و بە دەورەی زنجیرە شاخێکدا بسووڕێنەوە، ئەمەش لەوانە بوو یۆنانییەکان بهاتنایە نێو پێدەشتەکە و هێرشیان بکردایە سەریان، بەڵام یۆنانییەکان تا تەواوی لەشکری خەشایار نەگەیشتە پێدەشتەکە، هێرشیان نەکردە سەریان و ئەو شوێنە و ئەوانیان پەلامار نەدا.

پیلانی گشتیی یۆنانییەکان ئەوە بوو، کە هێرش نەکەنە سەر خەشایار تەنیا لە ڕێگەیەکی شاخاوی نەبێت، تا بەو شێوەیە لە مەترسی گالیسکەکان و سوارە ئێرانییەکان پارێزراو بن. پێدەشتی ئاهار بریتی نەبوو لە ڕێگەیەکی شاخاوی، بەڵام لەشکری خەشایار لەو شوێنە نە گالیسکە و نە سواری هەبوو، ئەو دووانە نەدەتواندرا بە بزنەڕێگەکەدا تێپەڕ بکرێن، ئەگەر یۆنانییەکان لەو پێدەشتە هێزیان هەبووایە، هەخامەنشییەکانیان لەنێو دەبرد، چوونکە لە چوارچێوەی دەستەی بچووکدا لە شاخ دەهاتنە خوارەوە و لە توانایان دەبوو لەنێویان ببن.

بە وتەی هیرۆدۆت کە پرۆفیسۆر بارن ئەو بابەتە پەسەند ناکات، چوونکە لەگەڵ تێڕوانینی سەربازیدا ناگونجێت، یۆنانییەکان ئاگەداری گەیشتنی سەربازەکانی لەشکری خەشایار بۆ ئاهار نەبوون، تا هەموو لەشکرەکە لە کوێرەڕێیەکە پەڕینەوە و لە ئاهار گردبوونەوە، ئەو کاتەش ئەو لەشکرە هێندە بەهێز بوو، کە یۆنانییەکان نەیاندەتوانی پەلاماریان بدەن.

ئەوەی بوو بە هۆکار بۆ ئەوەی خەشایار لەشکرەکەی لە بزنەڕێگەکەوە پەڕاندەوە و بردیە ناو پێدەشتی ئاهار، جەنگی سێ ڕۆژەی ئەو بوو لە گەلی تەرمۆپیلێ و دەروازەی باشوور.

ئازایەتی سەربازە یۆنانییەکان بە تایبەتی لیۆنیداس و سێ سەد سەربازە ئێسپارتەکەی، ئەو ڕاستییەی خستە بەرچاوی کە بۆ تێپەڕینی بەو گەلییەدا و لابردنی یۆنانییەکان لەسەر ڕێگەی لەشکرەکەی، پێویستە هەزاران لە سەربازەکان بە کوشت بدات، ڕەنگە ئەو دەمە بتوانێت لە گەلییەکەدا بپەڕێتەوە، چوونکە دەنگۆ هەبوو، لەشکری ئێسپارت دوای هاتنی لیۆنیداس دێن و ڕێگە بە لەشکری خەشایار دەگرن، ئەگەر تەواوی یۆنانییەکان وەك ئێسپارتەکان لەگەڵ خەشایار بجەنگانایە، تەنانەت لە پێدەشتی ئاهاریش، ئاخۆ دەیانتوانی ڕێگە لە هەشتا هەزار سەربازی ئەو بگرن، کە نە ئەسپ و نە گالیسکەیان نەبوو، بەڵام بە هۆی ئەو ناکۆکییانەی لە نێوان نەتەوە یۆنانییەکاندا هەبوو، هەوڵی هێرش بۆ سەر لەشکری خەشایاریان لەو پێدەشتە نەدا.

ئەسینا بە تەنیا توانای هێرشی بۆ سەر لەشکری هەخامەنشیی لەو پێدەشتەدا نەبوو و دەوڵەتە شارەکانی دیکەی یۆنانیش، بۆ نموونە ئێسپارتەکانیش ئامادەی یارمەتیدانیان نەبوو، بە تایبەتی کە لە گەرمەی شەڕی تەرمۆپیلێشدا پرۆپاگەندەی هەخامەنشییەکان بەردەوام بوو، پاشای هەخامەنشیی بە یۆنانییەکانی دەوت: من ناخوازم شەڕ بکەم لەگەڵ هیچ کام لە دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان، جگە لە ئەسینا نەبێت، بۆیە ڕێگەم بدەن تا بچم بۆ ئەسینا و ئەوان تەمبێ بکەم و بگەڕێمەوە، ئەسیناش بە دەوڵەتە شارە یۆنانییەکانی دەوت: ئەو وتەیەی

پاشای هەخامەنشیی، تەنیا فێڵی جەنگە و مەهێڵن ئەو بەربەرییانە تێپەڕ بن و بێنە ناو ئەسینا، چوونکە ئەو رۆژەی خەڵکی ئەسینا لەنێوبچن، تەواوی خەڵکی دەوڵەتە شارە یۆنانییەکانیش لەنێودەچن.

خەشایار شا دوای پەڕینەوەی لە دەربەندی تەرمۆپیلێ، لە رێگەی سیخوڕەکانییەوە زانیاریی پێگەیشت، کە ئەسینا هەوڵ دەدات دەوڵەتە شارەکانی (تسالی و مەکدۆنیا) لە دژی ئەو بێنێتە ناو شەڕ تا رێگەی گەڕانەوەی خەشایار و لەشکرەکەی دابخەن و کارێك بکەن تا لە پێشڕەوی لە یۆنان پەشیمان ببێتەوە، تاکە رێگە بۆ رێگرتن لە پیلانی ئەسینا بۆ هاندانی ئەوانی دیکە برێتی بوو لە هەوڵدان بۆ هەرچی زووتر گەیشتن بە ئەسینا.

بەڵام بە رێکەوت زستانی ساڵی (٤٨٠ – ٤٧٩ پ. ز) زووتر لە ساڵانی پێشوو هات، چەند رۆژێك دوای جووڵەی لەشکری خەشایار لە پێدەشتی ئاهار، بەفرێکی قورس کەوت.

رێگەی رۆیشتنی لەشکری خەشایار دەڤەرێکی شاخاوی بوو، بۆیە دوای بارینی بەفرێکی قورس رێگەکە داخرا، خەشایاریش ناچار بوو بوەستێت تا رێگەکە دەبێتەوە، ژمارەیەك لە سەربازەکانی نارد بۆ کردنەوەی رێگەکە، بەڵام دوای هەفتەیەك دووبارە بەفرێکی زۆرتر باری و ئەو رێیەی سەربازەکان کردبوویانەوە دووبارە داخرایەوە.

ئەوەی شارەزایانی سەربازی یۆنان دەیانەویست هاتەدی و رێگەی لەشکری خەشایار گیرا، بە ناچاری لە ئەوێ وەستان، خەشایار لەو رۆژەوە کە هاتە نێو یۆنان، بەردەوام جووڵەی لەشکرە وشکانییەکەی و هێزی دەریایی بە هاتەرێب رێکخست بوو، بەردەوام پێوەندیی لە نێوان ئەو دوو هێزەدا هەبوو، هەرچەندە دووجارانیش بەدووی یەکدا بەفرێکی یەکجار زۆر باری، بەڵام پێوەندیی نێوان ئەوان هەر بەردەوام بوو، بۆیە لەشکری وشکانی خەشایار لە ڕووی ئازووقەوە ئاریشەیان بۆ چێ نەبوو.

ئەو دەڤەرەی لەشکری خەشایار لێی گیرسابۆوە، تژی بوو لە داری "ڕزین" ئەمەش (مادەیەکە کە بە باشی دەسوتێت)، بۆیە سەربازەکان دەیان بڕین و ئاگری گەورەیان دەکردەوە و جلوبەرگی گەرمیشیان لابوو، هەروەها شەوانە لەو خێوەتانەدا دەنووستن، کە لە لباد چێ کرابوون، بۆیە بە دەست سەرماوە هەراسان نەبوون، خەشایار پێش بەر لەوەی بەرێ بکەون ئامۆژگاری کورۆشی جێبەجێ کرد، کە دەڵێت: "تەنانەت ئەگەر لە هاوینیشدا چوون بۆ جەنگ، بەرگی هاوینی و زستانی سەربازەکان و خێوەتی لبادتان بیر بێت"، هەرچەندە

خەشایار لە بەهاردا چوو بوو بۆ شەڕ، بەڵام پێداویستییە زستانییەکانی لەشکرەکەی بیر نەچوو بوو.

خێوەتە لبادەکانی لەشکری خەشایار سادە و سووك و گواستنەوەیان ئاسان بوو، لە چەند پارچە لباد پێکهاتبوون و بە جیرە لەیەك دەبەستران، ستوونە دارەکانیشیان بریتی بوون لە داری بادامی کێوی و سووك، کە لە چەند پارچەیەك پێکهات بوون، خێوەتەکان بە ئاسانی هەڵدەدران و گردکردنەوەشیان لە بەیانیاندا زۆر ئاسان بوو، بە هۆی ئەو ئاگرە گەورانەی سەربازەکان دەیانکردەوە، زەوی دەوروبەری خێوەتەکان وەك هاوین وشك بوون.

خەشایار نەیدەویست لەو ناوچە شاخاوییەدا بمێنێتەوە و دەیویست لە ئەوێ تێپەڕ ببێت و بچێتە پێدەشتێك بە ناوی (تەلکۆ)، لەو شوێنە بمێنێتەوە تا تەواو بوونی شەست ڕۆژی یەکەمی زستان، کە زۆر ساردە و بەفرێکی زۆریش لەو دەمانەدا دەبارێت، دواتریش بەرەو ئەسینا بکەوێتە ڕێ، چوونکە دوای شەست ڕۆژان سەختی سەرماوسۆڵە کەم دەبێتەوە، بەفر و شەختەش دەست بەتوانەوە دەکات، ئەو گاڤەش لەشکر بە ئاسانی دەکارێت بپەڕێتەوە، بەڵام دوای بەفری دووەم، سێیەمین بەفر دەستی بە بارین کرد، وەرزەکە هێندە ساردی کردبوو، ئەگەر سووتەمەنی بێ سنوور و جلوبەرگی گەرم نەبووایە، لەشکرەکەی خەشایار بە تەواوی لەنێودەچوون. ئەوان پێوەندییان بە پشتەوە پچڕا بوو، بەڵام بەردەوام لەگەڵ هێزی دەریایی لە پێوەندیدا بوون و ئازووقەیان پێ دەگەیشت.

وەرزی زستان وەرزێکە بۆ هەمووان بێزارکەرە، تەنانەت یۆنانییەکان پتر لە هەخامەنشییەکان ئازاریانە چەشت و لەو سەرمایە بێ ئامانەدا وەڕس بوون، چوونکە ئەوان خێوەتی لبادیان نەبوو...هەندێ گاڤان سەربازانی یۆنانی هەوڵیان دەدا هەڵبکوتنە سەر ئۆردووگەی خەشایار، بەڵام بۆیان نەدەکرا، چوونکە خەشایار ئۆردووگەکەی قایم و پتەوکردبوو، پاسەوانەکان بەشەو و بەڕۆژ هەر دەمژمێر جارێك دەگۆڕدران، جگە لەمەش ئەوان لە کاتی پاسەوانیدا کەپەنەکیان دەکردە بەریان، کە بریتی بوو لە بالاپۆشێکی لباد، بەمەش دەیانتوانی بەرگەی ئەو کەشە سەخت و دژوارە بگرن و دەهەمبەر سەرما نەکەون، بۆ ئەوان وەك ئەوە وابوو، کە لە ژوورێکی گەرمدا کاتەکانیان بەسەر بن، هەروەها هەموو سەربازەکان (چامووش)یان لە پێ دەکرد تا قاچەکانیان لەو کاتەدا لە سەرما و شەختە بپارێزن ( چامووش بریتی بوو لە شاڵێکی درێژی پشمین، واتە شاڵەیان لە قامکی پێیەکانیانەوە تا دەگەیشتە بەرە ڕانەکانیان دەپێچا، کە لەنێو

پۆشێکی چەرمیان داویشت تا سەر گۆزینگی دادەپۆشی و قەیتانەکانی تا سەر بەرە ڕانەکانی دەهات، ئەو شاڵە درێژە و نێوپۆشە چەرمەکان کە قەیتانی درێژیان هەبوو بە چامووش ناودەبرا، بە شێوەیەك قاچەکانی لە بەرانبەر سەرما دەپاراست کە بچووکترین هەستیان بە سەرما نەدەکرد).

یۆنانییەکان چەندین جار لە ئۆردووگەی هەخامەنشییەکان نێزیك دەبوونەوە، چوونکە دەیانبینی ئەوان بە تەواوەتی هۆشیارن و ناتوانرێت لەپڕ بەسەریاندا بدرێت، چیتر هەوڵی پەلاماردانیان نەدایەوە، لەو کاتە بەدواوە ئیتر شەوان لە دەنگی گورگە برسییەکان زیاتر هیچی دیکە نەدەهاتە بەر گوێی سەربازەکانی هەخامەنشیی، بە ڕۆژیش هەزاران قەلەڕەشکە لە دەوروبەر و لەنێو ئۆردووگەکە دەبینرا و لە بزاوتی بەردەوامدا بوون، بۆ ئەوەی بکارن خۆراکێك بۆ خۆیان دابین بکەن.

خەشایار دەیزانی ئەو ڕێگەیەی لە نێوان ئۆردووگەکەی و هێزی دەریایی هەیە، زۆر گرینگە، بۆیە ئەگەر ئەو ڕێگەیە نەمێنێت یاخۆ یۆنانییەکان داگیری بکەن، لەوانەیە هەموویان لەو سەرمایە توند و سەختەدا لە برسان بمرن، بەڵام یۆنانییەکان هەوڵی داگیرکردنی ڕێگەکەیان نەدەدا، چوونکە سەرمای توندیش توانای هێرش و هەوڵدان بۆ ئەو کردەیەی بۆ نەهێشتبوونەوە.

خەشایار دەیزانی ڕێگەی وشکانی نێوان ئەسینا و هەردوو دەوڵەتە شارە گەورەکانی (تسالی و مەکدۆنیا) پچڕێندراوە و نەماوە، بەڵام کەشتییەکانی ئەسینا لە ڕێگەی دەریا و دوور لە هێزی دەریایی هەخامەنشیی، پێوەندی و هاتوچوویان هەبوو، خەشایاریش بێ زانیاریی نەبوو لەو بارەوە، تەنانەت دەیزانی کە ئەسینا بەڵێنی پارە و زێڕی بە هەردوو وڵات داوە تا لەو ڕێگەیەوە ئەوان لە دژی خەشایار یاخی بکات و مەترسی لەشکرەکەی لەسەر ئەسینا نەهێڵێت.

خەشایار لەوە نەدەترسا ڕێگەی گەڕانەوەی بگیرێت، چوونکە ئەگەر گریمان هەردوو وڵاتی تسالی و مەکدۆنیاش لە دژی یاخی بن و ڕێگەکە دابخەن، ئەوا کەشتییەکانی و ڕێگەی دەریایی هەبوو، بەڵام دەیزانی ئەگەر ئەسینا سەرکەوتوو ببایە و توانیبایە دۆخێك بێنێتە کایەوە، کە لەشکری خەشایار بە بێ تەمبێ کردن بگەڕێتەوە، ئەو کات هەخامەنشییەکان، نەك تەنیا لە یۆنان، بگرە لە ئاسیای بچووکیش هیچ دەسترۆیشتوویان نەدەما و وڵاتەکانی ئەوێ لەژێردەستەیی هەخامەنشییەکان دەردەچوون، هەرچەندە ژێردەستە بوونەکانیان هیچ

قورسایی نەخستبوو سەر باری وڵاتەکانیان، تەنیا ساڵانە پاشاکانیان هەندێ دیارییان بۆ پاشای هەخامەنشیی دەنارد، دیارییەکانیش هێندە گران بەها نەبوون، کە بۆ پاشاکانی ئەو دەڤەرانە ببێتە ئەرك و بارگرانی.

بێ زێدەڕۆیی دەکارین بڵێین لەنێو ئەو وڵاتانەی لە دنیادا بە داگیرکەر ناسرا بوون، دەوڵەتێك نەبوو وەك دەوڵەتی هەخامەنشیی ببێتە پاڵپشتی باش بۆ ئەو دەوڵەتانەی داگیریان دەکات، لە ڕاستیدا ناتوانین هەخامەنشییەکان بە وڵاتێکی داگیرکار ناو ببەین، چوونکە داگیرکاران وڵاتان داگیردەکەن تا خەڵکەکەی بچەوسێننەوە و سەرمایە و سامانەکەی بە تاڵان ببەن، بەڵام پاشا هەخامەنشییەکان وڵاتانی ژێردەستەیی خۆیان دەپاراست، بۆ ئەوەی نەهێڵن دوژمنەکانیان سەربەخۆییان لێ زەوت بکەن.

پاشا هەخامەنشییەکان چاویان نەبڕیبۆوە سامانی وڵاتە ژێردەستەکانیان و باجیان لێ نەدەستاندن، تەنیا لە کاتێکدا ئەو کارەیان دەکرد، کە ئەوان دژایەتییەکیان بنواندایە، بە هەمان شێوە، وەك چۆن باجیان لە دوازدە شارە یۆنانییەکە وەردەگرت، بۆیە ئەگەر خەشایار بێ تەمبێ کردنی ئەسینا گەڕابایەوە شکۆمەندی و دەستڕۆیشتوویی ئەوان لە ئاسیای بچووك نەدەما و تەواوی وڵاتانی ژێردەستەشیان سەربەخۆ دەبوون.

ئەگەر ئەسینا سەرکەوتوو بووایە بۆ ئەوەی هەردوو دەوڵەتە شاری تسالی و مەکدۆنیا لە دژی هەخامەنشییەکان بێنێتە ناو جەنگ، خەشایار ناچار دەبوو هێزەکانی خۆی لە یۆنان پاشەکشە پێ بکات، بەو پێیەی هەردووکیانیش دەکەونە باکوری یۆنان و "خەشایار"یش لەوێ تێپەڕ ببوو و خۆی گەیاند بووە باشوور، کە ئەوانیش دوو دەوڵەتی مەزنی یۆنانی بوون و دانیشتووانی زۆریان هەبوو، دەیانتوانی لەشکرێکی گەورە ئامادە بکەن.

ئەو دەمەش لەشکری ئێران گەورەتر و بەهێزتر بوو لە لەشکری یۆنان، بۆیە ئەگەر دوو دەوڵەتە شارەکانی مەکدۆنیا و تسالی هێزیان ناردبایە بۆ هاوکاری ئەسینا، ئەوا یۆنان دەبووە خودان لەشکرێکی بەهێزتر لە لەشکرەکەی خەشایار، هەرچەندە سەربازانی هەموو وڵاتەکانی دیکەی یۆنان وەك سەربازانی ئێسپارت و ئەسینا بایەخی سەربازیان بەرز نەبوو، بەڵام فرەوانبوونی لەشکری یۆنانییەکان، وایدەکرد لەشکری هەخامەنشیی تەفرووتوانا ببێت، ئەوە بوو خەشایار بۆ ئەوەی ڕێگر بێت لە کاریگەریی ئەسینا بەسەر دەسەڵاتدارەکانی تسالی و

مەكدۆنیا، هەوڵیدا هەندێ زێڕ بە پاشاكانی هەردوو وڵات بدات، بۆ ئەوەی دووریان بخاتەوە لە بەشداریكردنی جەنگ بە سوودی ئەسینا.

مێژوونووسە یۆنانییەكان وەك چۆن سەبارەت بە ژمارەی لەشكری خەشایار زێدەڕۆییان كردووە، بە هەمان شێوە سەبارەت بەو ڕێژە زێڕەی خەشایار بۆ دەسەڵاتدارانی هەر یەكە لەو دوو دەوڵەتە شارانەی ناردووە، زێدەڕۆییان كردووە. دەبێژن دوو (كرور داریك) زێڕی ناردووە، بیریان لەوە نەكردۆتەوە دوو كرور داریك لە زێڕ بە سەرەنجدان لە بەهای زێڕ لە بیست و پێنج سەدە بەر لە ئێستەدا، چەند دەكات و گواستنەوەی ئەو بڕە لە ڕێگەی وشكانییەوە پێویستی بە چەند ئەسپ و ئێستر بووە تا بگوازرێتەوە[٢].

تۆسیدید دەڵێت: كە خەشایار بۆ هەریەكە لە دوو دەسەڵاتداری مەكدۆنی و تسالی سەد هەزار داریك زێڕی ناردووە، ئەو ژمارەیە دەكرێت دروست بێت، هەروەها تۆسیدید دەڵێت لەو وەرزەدا نەیاندەتوانی زێڕەكە لە ڕێگەی وشكانی بنێرن، لە ڕێگەی دەریاوە ئەو زێڕە گواسترایەوە، پاشایەكی بەهێزی وەك خەشایار ناچار بوو، بۆ ئەوەی دەسەڵاتدارانی ئەو دوو دەوڵەتە شارە لە دژی نەیەنە نێو جەنگەوە، ئەو هەموو زێڕەیان پێ دەدات.

لە كاتێكدا خەشایار چاوەڕوانی توانەوەی بەفر و كەمبوونەوەی سەرما بوو، لە دووەمین مانگی زستاندا، چوارەم بارینی بەفر هات، ئەو بەفرە قورستر بوو لەوانی پێشوتر، سەرما و بەستەڵەك جارێكی دیكە درێژ بۆوە، جووڵەی لەشكری خەشایار یەك مانگی دی دواكەوت، بەڵام پێنج ڕۆژ پێش هاتنی بەهار خەشایار فەرمانی جووڵەی لەشكرەكەی دەركرد، لەشكرەكەی لە ناوچە شاخاوییەكان دەرچوو و گەیشتە پێدەشتی تەلكۆ خەشایار بۆ ئەوەی

---

(٢) لەشكرێكی گەورەی وەك لەشكری خەشایار، تەنانەت وەك زەبیحوڵڵا باسی دەكات ئەگەر سەد هەزار كەسیش بووبێت، تەنیا بۆ خۆراكی یەك ڕۆژ لانی كەم سەد هەزار كیلۆ خواردنی ویستووە، زۆركات لەشكری لەو شێوە دەبێت ئازووقەی یەك مانگی لا بێت، لە لایەكی دی كەلوپەلە جەنگییەكانیش دەبێت بگوازرێنەوە، دەزانرێت بۆ ئەو بابەتانە لەشكری لەو چەشنە وەك زەبیحوڵڵا دەڵێت بارهەڵگرەكانی دەخستە بەشی پشتەوەی لەشكر، كە لەوانەیە لە هەزاران ئاژەڵی بارهەڵگر پتر بووبن، بۆیە دروست نییە بۆ كەمكردنەوەی شتێك پەنا ببرێتە بەر ئەوەی ئەو بارە قورسە چۆن دەگوازرایەوە، هەر وەك هەموو كەلوپەلەكانی دی، دەتوانرا زێڕەكەش بگوازرێتەوە، پێویست بوو بۆ كەمكردنەوەی ڕێژەی زێڕەكە پشتی بە هۆكارگەلی دیكە ببەستایە. وەرگێڕی كوردی.

سەربازەکانی سەختی سەرمای زستانیان بیربچێتەوە، سێ ڕۆژ مۆڵەتی پێدان تا جەژنەکانی سەری ساڵ و نەورۆز، کە جەژنی ئێرانییەکانن بە خۆشی بەڕێ بکەن، ئەو دەیزانی دوای تێپەڕبوون لە پێدەشتی تەلکۆ، دیسان دەچێتەوە نێو دەڤەرێکی شاخاوی، لەوانەیە یۆنانییەکان هەوڵ بدەن لەو ناوچەیەش پێش بە لەشکرەکەی بگرن، بەڵام ئەو ناوچە شاخاوییە وەك تەرمۆپیلێ سەخت نەبوو، بە پێچەوانەی ئەوەی لە تەرمۆپیلێ ڕوویدا، لەشکرەکەی دەیتوانی باشتر سوود لە تواناکانی وەربگرێت، دوای سێ ڕۆژان دیسان فەرمانی جووڵەی لەشکر درا، پێدەشتی تێلکۆیان جێهێشت، دەڤەرەیلی شاخاوی دەرکەوتن، پێشەنگی لەشکرەکەی هەواڵیان ڕاگەیاند، ئەو ناوچانە لەلایەن یۆنانییەکانەوە گیراوە، خەشایار فەرمانی بە ئەفسەرەکانی کرد بۆ جەنگێکی دیکە خۆیان ئامادە بکەن.

سرووشتی گەلیی تێلکۆ بە شێوەیەك بوو، کە گالیسکە جەنگییەکان دەیانتوانی لێی تێپەڕ بن، خەشایار لە شەڕی تەرمۆپیلێ پایزی رابردوودا، ئەزموونی تاڵی هەبوو، بۆیە فەرمانی کرد گالیسکەکان دەبێت بەرگرییەکانی یۆنانییەکان تێك بشکێنن و ڕێگە بۆ پیادە و سوارەکانی لەشکرەکەی بکەنەوە، تەنانەت ئەگەر دوایین گالیسکەی جەنگیش لەنێو بچێت، هۆکاری ئەوەی خەشایار فەرمانی کرد، گالیسکە جەنگییەکان لە دەربەندی تێلکۆ بپەڕنەوە و ڕێگە بۆ پیادە و سوارەکان بکەنەوە، چوونکە گەلییەکە ڕێگەی تێدا نەبوو، ڕێڕەوی ئەو زێیەی دەکەوتە نێوان دوو شاخەکەش، هەمان ڕێگەی ئەو شوێنە بوو، کە یۆنانییەکان وا بیریان دەکردەوە، لەشکری هەخامەنشییی لەنێو ئاودا شەڕ ناکات، بەڵام هەر زوو بۆیان دەرکەوت کە هەڵەن، مەیدانی شەڕ لە گەلیی تێلکۆدا، هەمان ڕێڕەوی زێ، واتە نێو ئاو بوو، سەربازەکانی یۆنانیش ناچار بوون، لەنێو ئاودا ڕێگە لە لەشکری خەشایار بگرن، هەردوولای زێیەکەش دوو شاخی لێ بوو، کە بەرزاییەکەیان نێزیکەی سەد و بیست مەتر دەبوو، ژەنراڵ گۆردۆنی بەریتانی دەڵێت: تا ئێستە ماون، ئێستەش وەك ئەو سەردەمەی خەشایار بە نێوانیاندا تێپەڕ بووە، بە شێوەیەك داوێنی شاخەکان، کەوتوونەتە سەر زێیەکە، لەوە دەچێت دوو دیواری بەردین لە دوو لای زێیەکە چێ کرا بێت، چوونکە شاخەکان ڕاست و لووس بوون، یۆنانییەکان نەیانتوانی بوو لە داوێنی شاخەکاندا هەندێ شوێن بۆ بەرد باراندن بەسەر لەشکری خەشایاردا دەست نیشان بکەن، لەنێو زێیەکەشدا، بێ ئەوەی بتوانن ڤاڵانژ چێ بکەن، پێشیان بە لەشکری خەشایار گرت.

لەنێو ئەو گەلییەدا کە ئاوی تێدابوو، پێکهێنانی ڤالانژ بێ سوود بوو، بۆیە لە جیاتی پێکهێنانی ڤالانژ، لە سێ ڕیزی لە دوای یەکدا وێستان، تا ئەگەر ڕیزی یەکەم لەنێو بچێت، ریزی دووەم، بە هەمان شێوە ریزی سێیەم جێگەی بگرنەوە. یۆنانییەکانیش وەك گالیسکەکانی هەخامەنشییەکان لەنێو ئاو بوون، ئاو گەیشبۆوە سەر گۆزینگی پێیەکانیان، هەخامەنشییەکان لە باکوڕەوە بۆ باشوور دەڕۆیشتن، ئاوی ڕووبارەکەش لە باشوورەوە بۆ باکوڕ دەهات، پێچەوانەی ئەوان بوو، بەڵام ئاوەکە هێندە زۆر نەبوو، کە ڕێگر بێت لە هێرشبەران یاخۆ بەرگریکاران، بە دەستپێکردنی جەنگ، گالیسکە جەنگییەکانی هەخامەنشیی بەرەو لای سەربازە یۆنانییەکان جووڵان، ئەگەر گالیسکەکان لە پانتاییەکی زۆردا هێرشیان بکردایە، یۆنانییەکان هەوڵیان دەدا لە هەردوولاوە لێیان بدەن، چوونکە ئەسپەکان لە تەنیشتەکانیانەوە پارێزگارییان نەبوو، بەڵام لە پێشەوەی گالیسکەکان هۆکاری بەرگری هەبوو، برێتی بوو لە ئاسنێکی درێژ و پانی تیژ، کە لە پێشەوە بەسترا بوو، کاتێك سەربازی یۆنانی لە پێشەوە بۆ کوشتنی ئەسپەکان هێرشی بکردایە، ئەو ئاسنەی بەردەکەوت یاخۆ بریندا دەبوو یانژی دەکوژرا، بەڵام لە ڕووباری تێلکۆ نەیان دەتوانی لە تەنیشتەکانەوە هێرشیان بکەنەسەر، چوونکە گالیسکەکان تەواوی پانتایی ئەو ڕووبارەیان لە شاخەوە بۆ شاخ داگیرکردبوو، خەشایار فەرمانی کردبوو گالیسکەکان بە شێوەیەك لە تەنیشت یەك بڕۆن، کە سەربازە یۆنانییەکان نەکارن بچنە ناوەڕاستیان و ئەسپەکانیان بکوژن، لێخوڕی گالیسکەکانیش ئەو فەرمانەیان بە وردی جێبەجێ کرد.

هەر بە هەمان شێوە لە سەدەکانی ئەم دواییەدا لە یەکەتیی سۆڤیەتی جاران نەتەوەی (مالاگا) لە لێخۆڕینی گالیسکە زۆر لێهاتوو بوون، باشترین لێخوڕەکانیش لەنێو ئەوان هەڵدەبژێردرا، بە هەمان شێواز لە سەردەمی هەخامەنشییەکان لێخوڕی گالیسکەکان لەنێو خەڵکی باختر واتە باکوڕی ڕۆژئاوای خۆراسانی ئێستە و ئازەربایجان هەڵدەبژێردران، بەر لەوەی بێنە نێو خزمەتی سەربازی، ماوەیەك دەخرانە بەر مەشق و ڕاهێنان تا باشتر فێری لێخوڕینی گالیسکە بن، بۆ ئەوەی ئەسپە بەهێز و سەرکێشەکانی گالیسکەکان بەر فەرمانی خۆی بکات.

بەهێزی و سەرکێشیی ئەسپی گالیسکەکانی ئێران بەناوبانگ بوو، بۆیە پیاوانی سەرکێش و تووندخوو بەو ئەسپانە دەشوبهێندران، لەشکری ئێرانیش وردبینی دەکرد لە بەهێزی و سەرکێشیی ئەسپی گالیسکەکان، تا ئەوان بەهێز و پڕ لە جووڵە بن، وێنجەی وشکیان دەکردە

ناو شەراب، لەگەڵ جۆش کشمیشیان دەدانێ، ئەستەم بوو تازە لێخوڕێك بکارێت ئەسپەکان چەمووش بکات، بەهێزکردن و هارکردنی ئەسپەکان تا سەردەمی ئەشکانییەکان و ساسانییەکانیش مایەوە، لە دوایین سەدەی دەسەڵاتیی ساسانییەکان، بەهای گالیسکەی جەنگی نەما، هەڵبەتە لێخوڕینی گالیسکە جەنگییەکان وەك لێخوڕینی گالیسکەیەکی پڕ لە کا یاخۆ وێنجە نییە، بگرە پێویستی بە لێهاتوویی جەستەیی و شارەزایی هەیە، بۆیە پیاوێکی بێ هێز و لاواز ناتوانێت گالیسکەی جەنگی لێ بخورێت، چوونکە بەڕێوەبردن و ڕامکردنی چوار ئەسپی سەرکێش، کە لە هەموو ساتێکدا دەیانەوێت وەك دەگوترێت گالیسکەکە هەڵبگرن، پێویستی بەهێزێکی جەستەیی یەکجار زۆر هەیە.

گالیسکەکانی خەشایار هەموو پان و بەرینی ڕووبارەکەیان گرتبوو، ئەمەش بۆ سەربازە یۆنانییەکان ئاریشەیەکی مەزن بوو، کە بچنە ناوەڕاستیان و لە ڕاست و چەپەوە هێرشیان بکەنەسەر و ئەسپەکان بکوژن، وێڕای ئەوەش هەندێ سەربازی یۆنانی سەرکەوتوو دەبوون و خۆیان دەگەیاندە ناوەڕاستی گالیسکەکان، هەرچەندە دوای کوشتنی یەك یاخۆ دوو ئەسپ دەکوژران، ئەو تیرهاوێژانەی لەسەر گالیسکەکان بوون بە تیر لێیان دەدان یاخۆ بەو ئاسنە تیژەی لە پێشەوەی گالیسکەکان بوون دەکوژران یاخۆ دەکەوتنە ژێر پێی ئەسپ و تایەی گالیسکەکان، بەڵام دەیانتوانی گالیسکەیەك لەکار بخەن، بەڵام ژمارەی گالیسکەکان زۆر بوون و گووشاری زۆریان هەبوو، بۆیە یۆنانییەکان بە لە کارخستنی چەند گالیسکەیەك نەیان دەتوانی، ڕێگە لە هێرشی گالیسکەکانی دیکەی هەخامەنشیی بگرن.

گالیسکەکانی خەشایار ریزی یەکەمی سەربازە یۆنانییەکانیان لەنێو برد، کەس لە سەربازەکانی ئەو ریزە زیندوو یاخۆ سەلامەت دەرنەچوون، بریندارانیش نەیاندەتوانی لەسەر پێ بوەستن و یەکسەر دەکەوتن، تا دەهات ڕەوشەکەیان ڕووی لە خراپتر دەبوو، چوونکە لەلایەك ئاوی ڕووبارەکە لە ئاکامی توانەوەی بەفری شاخەکان تا دەهات ساردتر دەبوو، ئەمەش دەبووە مایەی ئازاری پتری ئەوان، هەرچەندە ئاستی ئاوەکە کەم بوو، بەڵام بە هۆی بێ هێزبوونی بریندارەکانەوە دەکەوتنە نێو ئاوەکە، ئیدی نەیاندەتوانی سەریان بەرزتر لە ئاستی ئاوەکە ڕابگرن و دەخنکان.

سەربازەکانی خەشایار لە گەلیی تەرمۆپیلێ لاشەی کوژراو و بریندارەکانیان لەسەر ڕێگە لادەدا، لە گەلیی تێلکۆش گالیسکە شکاوەکانیان دەگواستەوە بۆ دەرەوەی گەلییەکە یاخۆ بۆ

پشتەوەیان دەبردن، هەندێ لە سەربازەکانی خەشایار تەنیا کاریان ئەوە بوو، کە لاشەی ئەسپە کوژراوەکان یاخۆ بریندارەکان و گالیسکە تێکشکاوەکان بەرەو پاشەوە ببەن، چوونکە ڕێڕەوی ئاوی رشووبارەکەش بەرەو باکوڕ بوو، واتە پشت شەڕگەی ئەوان بوو، لەو کارەش هاوکاری دەکردن.

ریزی یەکەمی سەربازە یۆنانییەکان لەنێو چوون، گالیسکە جەنگییەکان گەیشتنە دووەمین ریز، هەرچەندە یۆنانییەکان دلێرانە دەجەنگان، بە ڕم و تیر و تەور سەربازەکانی سەر گالیسکەکانیان دەکوشت یانژی بریندارییان دەکردن، بەڵام نەیانتوانی بەربەست چێ بکەن لە تێپەڕبوونی گالیسکە جەنگییەکان، ئەوان لە جیاتی ئەوەی سینگی خۆیان بکەنە بەربەست، دەیانتوانی بە تیری بەرز یاخۆ پەرژینی ئاسنین ئەگەر لەنێو ڕووبارەکە چێیان بکردایە، ڕێگە لە گالیسکەکان بگرن، تەنانەت ئەگەر لەمبەری ڕووبارەکە بۆ ئەوبەری دیوارێکی بەردینیان چێ کردبایە، لەشکری هەخامەنشیی نەیدەتوانی بپەڕێتەوە، بەڵام ئەو ئامرازەی بەرگری نەکەوتنە بیری یۆنانییەکان، چوونکە بیریان لەوە نەدەکردەوە، کە لەشکری خەشایار لە ئاودا هێرش بکات. بەر لەوەی گالیسکەکان بگەنە سێیەمین ڕیزی سەربازە یۆنانییەکان، ئەو ڕیزە بە فەرمانی فەرماندەکەیان بۆ دواوە کشانەوە، زانیان کە ئەوانیش تەنیا لەنێودەچن و ناتوانن ڕێگە لە گالیسکەکان بگرن، لەوە بە دواوە تا دەرچوونیان لە ڕووباری تێلکۆ، یۆنانییەکان ڕێگەیان بە لەشکری هەخامەنشیی نەگرت.

تێپەڕبوونی لەشکری خەشایار بەو گەلییە کە ڕێڕەوی ڕووبارەکە گەلیی تێلکۆ بوو، چوار ڕۆژ یانژی شەش ڕۆژانی خایاند، بەڵام هەموو ڕێگەی گالیسکەکان و پیادە و سوارەکان بە ناو ئاودا نەبوو، لە بەشی باشووری گەلیی تێلکۆدا، ڕێگەیەکی باریك لە تەنیشت زێیەکە هەبوو، کە دەتوانرا پیایدا تێپەڕ بن، بەڵام گالیسکەکانیان لەوێ کردەوە و بە پارچەکراوی لە ڕێگەکەیان پەڕاندنەوە، چوونکە نەدەتوانرا گالیسکە بەو ڕێگەیەدا بڕوات.

دوای دەرچوونیان لەو ڕێگەیە، گەیشتنە هەورازێکی توونـد، دوای سەرکەوتن لە هەورازەکە، شاری (تارت) دەرکەت، بۆ گەیشتن بەو شارەش دەبووایە نشێوێکی توونـد ببڕن، لەو نشێوەدا پتر لە سەد ئەسپ هەڵدێران و تۆپین.

کاتێك لەشکری خەشایار لەو نشێوە هاتەخوارێ، کچانی شاری تارت، کە لە وەرزی بەهاردا خۆیان بە گوڵ ڕازاند بۆوە، بە ساز لێدانەوە هاتنە پێشوازی خەشایار، تارت شارێکی

بچووك بوو، ناوەندی دەوڵەتە شارێك بە هەمان ناو بوو، وەك زۆرینەی وڵاتانی یۆنان بە سیستەمی دیموکراتی بەڕێوە دەبرا، ئەوان شەڕیان لەگەڵ خەشایاردا نەبوو، خەشایاریش لە دەرەوەی ئەو شارە لەشکری خۆی جێگیر کرد.

خەشایار بۆ حەسانەوە و پشوودانی لەشکرەکەی پێنج رۆژان لەو شارە مایەوە، لە دووەمین رۆژی مانەوەکەیدا پەیکەرتاش (سی دیاس) هاتە لای و پێشنیازی کرد، کە پەیکەری ئەو لە بەردی مەڕمەڕ داتاشێت.

خەشایار وتی: چەندی کات دەوێت تا پەیکەرێك بۆ من چێ بکەیت؟

سی دیاس وتی: سی رۆژان.

خەشایار وتی: دەرفەتم نییە، تا سی رۆژان لێرە بم، دەمەوێت بۆ ئەسینا بچم.

سی دیاس وتی: بەڵام من کاتم هەیە تا لەگەڵ تۆدا بێمە ئەسینا، ئەگەر یەك لە گالیسکەکانی خۆتم بۆ تەرخان بکەی، من لەنێویدا کارگەیەکی پەیکەرسازی دادەمەزرێنم، رۆژانە هێندەی کە کاتت هەبێت، لەسەر پەیکەرەکەت کار دەکەم تا تەواوی دەکەم، بەم شێوەیە بۆ یەکەمجار لە دنیادا کارگەیەکی گەڕۆك بۆ چێکردنی پەیکەری پاشای هەخامەنشیی دامەزرێندرا.

رۆژێك پێش ئەوەی خەشایار لە شاری تارت بەرێ بکەوێت، بڵاوکراوەیەکی بۆ دانیشتووانی ئەسینا نارد، تێیدا دەبێژێت: هەر کەسێك خۆی بەدەستەوە بدات، دەکەوێتە بەر بەخشینی پاشا و سەر و ماڵ و نامووسی پارێزراو دەبێت.

پرۆفیسۆر بارن لەم بارەوە دەڵێت: لە تەواوی ئەو ماوەیەی لەشکری خەشایار لە یۆنان بوو لە بواری خۆراك و ئالیك نەبووە بار بەسەر خەڵکی ئەو وڵاتانە، ئەوەی لە خواردن و ئالیك پێویستی ببووایە دەیکڕی، بەشێك لە پێداویستییەکان لە رێگەی دەریا و بە هۆی کەشتیگەلی هێزی دەرياییەوە دەگەیشت، ئەوی دیکەیش بە پارە و زێڕ دەکڕدرا، هەروەها دەڵێت: لەشکری خەشایار لە یۆنان، نانی تازەیان دەکڕی بە نرخی سێ بەرد بە یەك (ئەبوول)، بە پێوەری ئێستە هەر بەردێکی هەخامەنشیی برێتی بوو لە دوو کیلۆ و نیو لە یۆنان، هەر شەش (ئەبوول) دەبۆوە یەك (دراخم)، کە دواتر بوو بە (درهەم). مامۆستایەك لە قوتابخانەیەکی ئەسینا وانەی دەوتەوە، رۆژانە دوو دراخم مووچەی هەبوو، وردە وردە مووچەکەی زیاد دەبوو، لە کۆتایی

سەردەمی وانە وتنەوەی بە هۆی ئەو ڕێزەی لە کۆمەڵگەی ئەسینا لە مامۆستا دەگیرا، مووچەکەی ڕۆژانە دەگەیشتە دوازدە دراخم.

بەپێی لیکۆڵینەوەکانی پرۆفیسۆر بارن، لەشکری خەشایار کەمتر نانی تازەیان دەکڕی، ئەوان گەنمیان دەکڕی، دەیانکردە ئارد و نانیان لێ چێ دەکرد، گەنم بە هەر نرخێك کە لەلایەن جووتیارانەوە پێیان فرۆشرا بووایە، دەیان کڕی..لە تەواوی ئەو ماوەیەی لەشکری خەشایار لە یۆنان بوو، هیچ جووتیار و باخەوانێك سکاڵای لەسەریان نەبوو، هۆکاری سەرەکیی بۆ سەرکەوتنی خەشایار لە یۆنان بۆ ئەو بابەتە دەگەڕێتەوە، کە ئەو خەرجی و تێچووی لەشکرەکەی نەدەخستە سەر دانیشتووانی دەڤەرە جیاکانی یۆنان، ئەوانیش هەوڵیان نەدەدا لە دژی یاخی بن و شەڕی لەشکرەکەی ئەویان نەدەکرد.

کاتێك بڵاوکراوەکەی خەشایار گەیشتە ئەسینا، تیمیستۆکیل سەرۆکی وڵات داوای کرد کۆبوونەوەی پەرلەمانی وڵات ببەسترێت، لە کۆبوونەوەی پەرلەمان بڵاکراوەکەی خەشایار خرایە بەر باس، تێکڕای ئەندامانی پەرلەمان بڕیاریاندا کە پێویستە بەرگری بکەن و خۆیان نەدەنە دەست بەربەرەکان..وەك پرۆفیسۆر بارن باس دەکات خەشایار دەیەویست تەنیا بە وەرگرتنی باجی شەڕ لە ئەسینا، خۆی لە شەڕ بپارێزێت تا نیاز پاکی خۆی بۆ گەلی ئەسینا و گەلانی دیکەی یۆنان بسەلمێنێت، بەڵام پەرلەمانی ئەسینا ئەوەیان پەسەند نەکرد و خۆبەدەستەوەدانیان لە بەرانبەر لەشکری هەخامەنشییان بە پەستییەکی لە ڕادەبەدەر دانا و بڕیاریاندا بجەنگن.

لە ئەسینا تەواوی پیاوان سەربازی یەدەکبوون و لە هونەرەکانی جەنگیان دەزانی، هەر کاتێك دەوڵەتی ئەسینا دەرگیری شەڕ بووایە، هەموو پیاوان دەچوون بۆ شەڕ، دەوڵەت دەبووایە تا گەڕانەوەیان مووچە و خەرجی بداتە خانەوادەکانیان، کاتێك لە شەڕدا دەکوژران، مووچەی دەدایە منداڵەکانی تا گەورە دەبوون، ژنی کوژراوەکەش تا مردن مووچەی بۆ دیاری دەکرا.

هەموو مێژوونووسە یۆنانییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کاتێك حکوومەتی ئەسینا بڕیاری چۆڵکردنی شاری ئەسینایدا، بۆ هەموو ئەوانەی لە شار دەڕۆیشتن تێچووی پێویستی لەبەر چاو دەگرت، چوونکە ئەوانەی دەڕۆیشتن هەموویان ژن و منداڵ و کەم ئەندام و بە تەمەنەکان بوون، پیاوەکان بۆ بەشداریکردنی جەنگ لە ئەسینا دەمانەوە، حکوومەتی

کۆماری ئەسینا بەرپرس بوو، کە خەرجی ژن و منداڵ و بە تەمەن و ساڵمەندەکان دابین بکات، جا کەم ئەندامەکان نەخۆش بن یاخۆ بە هۆی تەمەنی زۆرەوە نەتوانن بەشداری جەنگ بکەن.

هەندێك لە مێژوونووسەکان وایان بیر کردۆتەوە، کە دەوڵەتی ئەسینا تەنیا بڕیاری چۆڵکردنی شاری ئەسینای داوە، بەڵام ئەوان بڕیاری چۆڵکردنی هەموو وڵاتەکەیاندا، هەموو پیاوانی یۆنان لە پیشەوەرەوە بگرە تا دەگاتە جووتیار، مامۆستا و فەیلەسووفەکان ڕەزامەند بوون تا ژن و منداڵەکان و خزم و کەسوکار و کەم ئەندامەکانیان لە ئەسینا بڕۆنە دەرێ، بۆ ئەوەی بێ ترس و دوودڵی بتوانن بجەنگن.

دەوڵەتی یۆنان فەرمانی بە هەموو چینەکان کرد، ئەوەی شتانەی دەتوانن بیگوازنەوە با لەگەڵ خۆیاندا ببەن، چوونکە هەرچی شتێك بمێنێتەوە دەبێتە هی هەخامەنشییەکان، بۆیە ئەسینایییەکان هەرچی توانیان لە ڕێگەی ژن و منداڵ و ساڵمەندانەوە گواستیانەوە بۆ دەرەوەی ئەسینا، هەندێکیان ڕۆیشتن بۆ پلۆپۆنز لە باشووری یۆنان، هەندێکیش بۆ سالامین. لەنێو پیاوان تەنیا مامۆستایانی بە تەمەن لە جەنگ بەخشران و لەگەڵ منداڵەکان ڕۆیشتن.

پرۆفیسۆر بارن نووسیویەتی ئەو مامۆستایانەی تەمەنیان دەگەیشتە چل ساڵ لە بەشداریکردن لە جەنگ بەخشران، بەڵام فەیلەسووفان دەبووایە بەشداری شەڕ بکەن، فەیلەسووفانی ئەسینا وەرزشکار و شمشێرباز و نێزە هاوێژ بوون، هەروەها بە باشی ڕم و دیسکیان هەڵدەدا، ئەوانەی تەمەنی شەڕکردنیان هەبووایە، بەشداری شەڕ دەبوون.

ئەو فەرمانەی لەلایەن حکوومەتی ئەسینا دەرچوو، بۆ چۆڵکردنی شار، لە ئاکامی ئەوەی ئەسینایییەکان بیریان لەوە نەدەکردەوە، کە خەشایار بتوانێت خۆی بگەیەنێتە ئەسینا، ئەوان پێیان وابوو لەشکری هاوبەشی دەوڵەتە شارەکانی باشووری یۆنان، لە گەلیی تەرمۆپیلدا ڕێ لەو لەشکرە دەگرێت و ناهێڵێت بگەنە ئەو وڵاتە، دوای پەڕینەوەی خەشایاریش، ئەسینایییەکان خوازیاربوون، کە زستانی سەخت بتوانێت ڕێگە لە خەشایار بگرێت، بەڵام زستانە سەختەکەی ٤٨٠ — ٤٧٩ پ. ز نەیتوانی لەشکری هەخامەنشیی لەنێو ببات، بۆیە دواتر ئەسینایییەکان بەئومێدی ئەوە بوون یۆنانییەکان بکارن لە گەلیی تێلکۆ ڕێگە بەو لەشکرە بگرن، بەڵام لەوێش هەر سەرکەوتوو نەبوون.

ئەگەر ئەو بڕیارە زووتر دەرچووبایە، ئەوان دەرفەتی تەواویان بۆ گواستنەوەی تەواوی ئەو کەرەستانە دەبوو، کە دەکرا بگوازرێنەوە، بەڵام فەرمانەکە درەنگ دەرچوو، بۆیە دەرفەتی تەواو بە دەستەوە نەبوو، کەشتیی پێویستیش بۆ رۆیشتنی هەمووان نەبوو، چوونکە هەمووان دەیانەویست ئەوەی هەیانە لەگەڵ خۆیان بە کەشتیی بیگوازنەوە بۆ پلۆپۆنز یاخۆ سالامین، لە ترسی ئەوەش لەشکری هەخامەنشیی بە دوایان نەکەوێت، نەیاندەویست بە رێگەی وشکانیدا بڕۆن بۆ پلۆپۆنز، لێ ئەگەر لەشکری خەشایار توانیبای بەسەر بەرگریکاراندا سەربکەوێت، دەکەوتە دووی ئەوان.

لە لایەکی دیکە رێگەی دەریا پارێزراو بوو، هێزی دەریایی هەخامەنشیی لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی ئەسینا نەبوو، کە خەڵکەکە لەوێوە سواری کەشتیی دەبوون، ئەوان لەگەڵ خەشایاردا تەریب دەهاتن.

سەرمایەی گوندنشینان برێتی بوو لە (مەڕ، مانگا، بەراز، دانەوێڵە و خواردنە وشکەکان)، بۆ گواستنەوەی ئەوانەش ئەگەر شوێن دەست بکەوێت، دەبووایە ئەوانە سواری کەشتیی بکرێن و ئالیکی پێویستیشیان بۆ دابین بکرێت، هەروەها دەبووایە ئاوی شیرنیشیان بۆ بار بکەن.

ئەوانەی ناچاربوون ماڵ و وڵاتیان جێبهێڵن و لەپڕ لەو شوێنە بڕۆن، کە ساڵانێکی زۆر لێی بوون، لەو کاتەدا دەزانن هەندێ شتوومەك کە هەرگیز بۆ خاوەن ماڵ بایەخی نەبووە، تەنانەت بیریشی نەبووە، کە ئەو کەرەستانەی هەیە، بە بایەخ دەکەوێتەوە، ئەو دۆخە بۆ خەڵکی ئەسیناش هاتبۆوە پێشێ، بەڵام بردنی کەلوپەلی زیادە بۆ ئەوان سەخت بوو، ئەو کەسانەی سەگ و پشیلە و کەروێشکیان لە ماڵدا هەیە، دەزانن ئەندامانی ماڵ و منداڵەکانیان چەندە هۆگری ئەو ئاژەڵانەن، بۆ هەر شوێنێك دەچن دەیانەوێت ئەوان لەگەڵ خۆیاندا ببەن، بەڵام رێك لەو کاتەدا نەخۆشییەك هاتە پێش، کە دەوترا لە رێگەی سەگ و پشیلەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە، بوکرات کە بیست ساڵ دوای چوونی خەشایار بۆ یۆنان لە دایکبوو، بناخەی نۆشداری کۆنی دامەزراند، وتی ئەو نەخۆشییە لە سەگ بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە، نها ئەو نەخۆشییە بە (لۆسەمیا) نێو دەبرێت، نێوی ناسراویشی (شێرپەنجەی خوێنە)، دوای دوو هەزار ساڵ نۆشداران ئەو بۆچوونەیان پشتڕاست کردەوە، بۆیە کاتێك پەنابەرەکان بۆ سواربوونی کەشتییەکان دەچوون، دەریاوانەکان مۆڵەتیان نەدەدا سەگ و

پشیلە ماڵییەکان لەگەڵ خۆیان بۆ نێو کەشتیی بار بکەن، وێڕای ئەوەی جیابوونەوە لە ئاژەڵە ماڵییەکان بە تایبەتی بۆ منداڵان یەکجار سەخت بوو، بە ناچاری باوانی منداڵەکان دەستیان لە پشیلە و سەگەکانیان هەڵدەگرت، ئەوانیان لە کەنارەکان جێ دەهێشت و منداڵەکانیان دەبردە نێو کەشتییەکان، زۆر جار دەبینرا دوای رۆیشتنی کەشتییەکان، سەگەکان دەکەوتنە مەلەکردن بە دوای کەشتییەکەدا، هێندە دەڕۆیشتن تا بە هۆی شەپۆلەکان دەخنکان.

مێژوونووس و نووسەری ناسراو پلۆتارك کە لە ساڵی (٤٦ ز) کۆچی دوایی کردووە دەڵێت: خەڵکی ئەسینا دوای ئەو کۆچە بە کۆمەڵە، هێندە ئەمەکداری سەگەکانیان لەسەریان کاریگەر بوو، کە بە یادی سەگە بە ئەمەککان بینایەکیان چێ کرد و ناویان لێنا (کینووس ـ سەما) واتە تەلاری یادگاری سەگەکان.

دەوڵەتی ئەسینا خەڵکەکەی ناچار نەدەکرد تا ژن و منداڵ و کەم ئەندامی بنەماڵەکانی خۆیان و سەرمایەیان بگوازنەوە، بەڵام دەیوت دەوڵەتی ئەسینا ناتوانێت سەر و ماڵ و ژن و منداڵەکانیان بپارێزێت، چوونکە بە پروپاگەندەی فەرمی خەڵکیان وا تێگەیاند بوو، کە ئێرانییەکان بەربەر و دڕندەن، کاتێك بێنە نێو ولاتێك، هەموو کەسێك، تەنانەت منداڵە شیرەخۆرەکانیش دەکوژن. وێڕای ئەوە هەندێك لە خەڵکی ئەسینا کە توانای رۆیشتن یاخۆ دەست هەڵگرتن لە ماڵ و ولاتیان نەبوو یاخۆ دەرفەتیان بۆ رۆیشتن نەبوو، لە ئەسینا مانەوە و نەڕۆیشتن.

# دیمەنەکانی شاری ئەسینا

لەنێو مێژوونووساندا سەبارەت بە مێژووی هاتنی لەشکری خەشایار بۆ ئەسینا جیاوازیی هەیە، هۆکاری جیاوازییەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لە نێوان مێژووی هاتنی ئەو لەشکرە بۆ یۆنان و مێژووی هاتنی هەمان لەشکر بۆ ئەسیناش جیاوازیی هەیە، هەندێ لە مێژوونووسان ماوەی تێپەڕبوونی لەشکری خەشایار بەنێو یۆنان بۆ گەیشتن بە ئەسینا بە (١٨٠) رۆژ دادەنێنن، هەندێکی دیکە بە (١٥٠) رۆژ، هەندێکیش بە (١٢٠) رۆژ، تەنانەت بە (٩٠) رۆژیش دیار کراوە، دەڵێن بەر لە هاتنی زستانی ٤٨٠ – ٤٧٩ پ. ز لەشکری خەشایار هاتووەتە نێو یۆنان، پرۆفیسۆر بارن لە ڕێگەی هەندێ بەڵگەی کرۆنۆلۆژییەوە، واتە ئەو بەڵگانەی پشت بە بەسەرچوونی رۆژ و ساڵ دەبەستێت، دەری دەخات کە خەشایار یەك زستان لە یۆنان بووە، جگە لەوەش ئەو بویەرانەی بۆ لەشکری خەشایار لە زستاندا ڕوویانداوە لە مێژوودا ماون، بۆیە باس لە ڕووداوەکانی هاتنی لەشکری هەخامەنشیی بۆ ئەسینا دەکەین:

ئەسینا خوداوەندێکی هەبوو بە ناوی (ئاتنە)، کچی زێئۆس خوداوەندی خوداوەندکانی یۆنان بوو، لەنێو ئەسینا پەرستگەیەك بە ناوی (ئاکراپوولی) بۆ ئەو چێ کرابوو، ناوی شارەکەش لەنێوی ئەو خوداوەندوە وەرگیرا بوو، ئاتنە خوداوەندی چوار شتان بوو، کە بریێتی بوون لە: (ئەقل، زانست، پیشەسازی و هونەر)، چوونکە ژیانی مرۆڤ لە ڕووی مادی و مەعنەوی بەو چوار بابەتەوە بەندە، کەواتە ئاتنە خوداوەندی هەموو شتێکی گەلی یۆنان بوو.

پەرستگەی ئاکراپوولی لەنێو ئەسینا لەلایەن خەڵکەکەیەوە بۆ ئاتنە چێ کرا بوو، لە ڕاستیدا شارێك بوو لەنێو ئەسینا، تەنانەت گرینگی لە ئەسیناش پتر بوو، هێمای شارەکە بوو. ئەگەر کەسێك توانای ناسینی ئاکراپوولی هەبووایە، ئەسیناشی دەناسی، بێ ناسینی ئاکراپوولی هەوڵی ناسینی ئەسیناش، کارێکی بێ سوود بوو.

ئەقڵ، زانست، پیشەسازی و هونەری خەڵکی ئەسینا لە ئاکراپوول گردبۆوە، بۆیە لە ماوەی (٢٥٠٠) ساڵەوە، ئەوانەی دەیانەوێت لەبارەی ئەسینا بدوێن، باسی ئاکراپوولی دەکەن، بەردی

بناخەی ئاکراپوولی بەر لە دامەزراندنی شارەکە دانراوە، تا ئاکراپوولی دروست نەبوو، ئەسینا نەهاتە کایەوە، خەڵکی ئەسینا ئەقڵ و زانست و پیشەسازی و هونەری خۆیان خستەگەڕ تا گەورەیی و جوانی بداتە ئەو پەرستگەیە، ئاکراپوولی لەسەر هەندێ گرد بە بەرزایی ٢٧٠م بەپێوەری ئێستە چێ کرا بوو، تا ئێستەش لەو پەرستگە جوان و مەزنە دوو وێرانە ماونەتەوە، بە ناوەکانی (پارتە نۆن و ئەرك تە ئەیۆن)، شوێنەکانی دیکەی ئەو تەلارە وێران کران، دواتر بەردەکانیان بردن بۆ ئەوەی لە خانوو دروست کردن سوودیان لێ وەربگرن، تا ئێستەش لە یۆنان لە کاتی گڵ هەڵکەندن هەندێك لەو بەردانە دەردەکەونەوە.

لە (٢٥٠٠) ساڵ پێش ئەمڕۆ ئەو کەسەی دەیویست بچێتە پەرستگەی ئاکراپوولی، بە ڕێگەیەکی خیزەڵێنی پەستراوەی پاندا کە گالیسکە دەیتوانی پیایدا بڕوات سەردەکەوت، بۆ ئەوەی لەسەر گردەکەوە بتوانێت تەواوی ئەسینا ببینێت، لەوێ چاوی دەکەوت بە دەروازەی پەرستگەکە، خەڵکی ئەسیناش بە (پرۆپیلە) ناوزەدیان دەکرد، کە بریتی بوو لە دەروازەیەکی دروستکراو لە بەردی مەڕمەڕ، بە بەرزی سێ مەتر و پانی دوازدە مەتر، بە شێوەیەك چێ کرابوو، کە دوو پەیکەری مەڕمەڕ پایەیەك و دوو پەیکەری مەڕمەڕی دیکەیش پایەکەی دیکەیان ڕاگرتبوو، لەسەر دەروازەکەش هەندێ پەیکەری فریشتەکان بە باڵی کراوەوە هەبوون، کە هەموویان خزمەتکاری ئاتنە بوون، هەندێ پارچەی ئەو پەیکەرانە ئێستە لە مۆزەخانەی بەریتانیا لە لەندەن ماون، ئەوەمان بۆ دردەکەوێت، کە بە چ وردەکارییەکەوە چێ کراون.

بە دەگمەن ڕوودەدا کەسێك بە گردەکە سەربکەوێت و چاوی لە بەرانبەر مەزنی و جوانی ئەو دەروازەیە سوور نەمێنێت، بەردی مەڕمەڕی پەیکەرەکانیان بە شێوەیەك دانابوو، کە کاتێك هەتاویان بەردەکەوت ڕەنگاوڕەنگ دەهاتنە بەرچاو، بینەر دوای تێپەڕبوون لەو دەروازەیە دەگەیشتە (ڕێگەی پیرۆز)، لە هەردوو لای ڕێگەی پیرۆز لە مەودای دیارکراودا هەندێ پەیکەری فریشتەکان دەبینرا، پاسەوانی ئەو ڕێگەیە بوون و بۆ ڕێزگرتن لە ئاتنە، کە لە کاتی چوونەوەی بۆ ماڵ بەو ڕێگەیەدا دەڕۆیشت، لەو شوێنە داندرا بوون، هەر فریشتەیەك بە باڵە ئاوالاکانییەوە لەسەر پایەیەك داندرابوو، بە شێوەیەك داتاشرابوون، کە یەك بە یەکی پەڕەکانی باڵیان و هێڵەکانی سەر پەڕەکان دیار بوون، لەو پەیکەرانە ئێستە تەنیا یەکیان ماوە، لە مۆزەخانەی لۆڤەری پاریسە و بە (سەرکەوتن) ناسراوە، تەنیا یەك باڵی ماوە و لە دوورگەی (ساموس تراس)ـەوە هێنراوە، بەڵام هەر ئەو باڵە لەگەڵ پەیکەرەکە بەڵگەی ئەو

ڕاستییەیە، کە یۆنانییەکان لە هونەری پەیکەرتاشی گەیشتبوونە ئاستێك کە ئیدی کەسی پێنەگەیشت، پەیکەری سەرکەوتن لە کاتێکدا داتاشراوە، کە یۆنانییەکان چەند پلەیەك لە داتاشینی پەیکەر بەرەو دوا کشابوونەوە، بەڵام لەو ڕۆژەوە کە ئەو پەیکەرە لە دوورگەی سامۆس تراس دۆزرایەوە و بۆ لۆڤەر گوازرایەوە، تا ئێستەش پەیکەرسازێك نەیتوانی پەیکەرێکی نێزیك بەو پەیکەرە بتاشێت، لە کاتێکدا کە ئەو پەیکەرەی وەك مۆدێلێك لە بەردەستە، کاتێك مرۆڤ بە ڕێگەی پیرۆز تێپەڕ دەبوو، ئەو فریشتە مەڕمەڕییانە بە باڵە ئاواڵاکانیانەوە دەبینێت، هەست دەکات بەنێو دوو ریز لە فریشتەکان بۆ خزمەتی ئاتنە خوداوەندی گەورە دەڕوات. ئەو فریشتانەی لە شوێنەکانی دی تاشراون باڵەکانیان لە شێوەی باڵی کۆترە، بەڵام فریشتەکانی ڕێگەی پیرۆز هەر وەك (پەیکەری سەرکەوتن) باڵەکانیان، باڵی جۆرێك لە هەڵۆیە، کە بە (شاهین) ناو دەبرێت و مەزنترین جۆری هەڵۆکانە، لە پشت پەیکەرەکان، لە دوو لای ڕێگەکە هەندێ خانوو هەبوون، کە بە بەردی مەڕمەڕ کرابوون، خزمەتکارەکان تێیاندا دەژیان، بەڵام هیچ شوێنەواریان نەماوە، ئەمەش بە هۆی گرانی بەهای بەردی مەڕمەڕ، هەموویان بردوون، هەڵبەت بە بڕوای خەڵکی ئەسینا خزمەتکارەکان فریشتە بوون و لەو خانووانەدا دەژیان، بەڵام لە ڕاستیدا خزمەتکارە مرۆڤەکانی ئەوێ لەو خانووانەدا دەژیان. لە نێوان ڕێگەکە و خانەوەکاندا، داری شمشادیان چاندبوو، بە شێوەی دیوار (وەك ئێستە لە پارکەکاندا هەیە) بڕیبوویان و لە وەرزەکانی (بەهار و هاوین و پایز) گوڵیان دەچاند.

دوای تێپەڕبوون لە ڕێگەی پیرۆز، یەکەم تەلاری گەورەی ئەو پەرستگەیە بە ناوی (پارتە نۆن) لەسەر گردێك بە هەمان ناو بە دیار دەکەوت، تا ئێستەش وێرانەکانی ئەو تەلارە ماوە، کە وەك هۆڵێکی مەزن کۆمەڵێك دینگەی بەرز و تەکووزی هەیە، بەڵام ئەو هۆڵە کە ئەمڕۆ بەرچاو دەکەوێت، تەنیا بەشێك بوو لە بینایەی گەورەی پارتە نۆنی ڕەسەن، جگە لەو تەلارە، بینایەی پارتە نۆن کۆمەڵێك تەلاری دیکە هەبوون، کە ئێستە نەماون.

بینای پارتە نۆن وەك هەموو بیناکانی دیکەی ئاکراپوولی کۆمەڵێك پەیکەری مەڕمەڕی هەبوو، ڕووکاری تەلارەکەش هەر لە مەڕمەڕ بوو، ئەو شوێنە بریتی بووە لە شوێنی دیداری ئاتنە، ئەو خوداوەندە هەر کاتێك ویستبای خەڵك ببینێت لەو شوێنە خەڵکی بۆ دیداری خۆی وەرگرتووە، دوای تێپەڕبوون لە بەرانبەر ئەو بینایە، دەگەیشتینە کۆشکێك، کە بە شێوازێکی تەلارسازی زۆر بە شکۆ دامەزرابوو، ئاتنە لەوێ هاوسەرەکەی دەدیت، ئەو تەلارەی کە شوێنی

ژووانی خۆشەویستی ئاتنە بوو، هیچ شوێنەواری نەماوە، دوای ئەوەی لە بینای ژوانگەی ئاتنە تێپەڕ دەبووین، دەگەیشتینە تەلاری (ئەرك تە ئەیۆن) ئەویش شوێنەواری نەماوە.

ئەو بینایە شوێنی ژیانی (ماری پیرۆز) بوو، هەموو زێڕ و زیو و یاقوت و کوتاڵە گرانبەهاکان و فەرش و دیارییەکانی بۆ ئاتنە دەهاتن لەو شوێنە هەڵدەگیران، خەڵکی ئەسینا باوەڕیان وابوو کە مارێکی گەورە پاسەوانی سەرەکیی ئاکراپوولییە و ئەو گەنجینەیە دەپارێزێت، لە جەژنەکانیشدا جۆرە حەلوایەکیان چێ دەکرد، کە بە هەنگوین خۆش دەکرا، باوەڕیان وابوو کە مارەکە ئەو حەلوایە دەخوات، بە وتەیەکی دروستتر خزمەتکارەکانی پەرستگە حەلواکەیان دەخوارد و دەیانوت مارەکە خواردوویەتی.

کاتێك لەشکری خەشایار لە ئەسینا نێزیك کەوتەوە، دەوڵەتی ئەسینا ڕایگەیاند، کە ئەوان بۆ ئاکراپوولی نیگەران نین، چوونکە ئەوێ خوداوەندێکی هەیە دەیپارێزێت و ناهێڵێت گەنجینەکەی بەردەستی بەربەرەکان بکەوێت، لە ئاکامی ئەو بیروباوەڕەدا هەموو ئەو کەسانەی توانایان نەبوو، کەلوپەلە گران بەهاکانی خۆیان ببەنە دەرەوەی شار، هەموویان لە ئاکراپوولی دانا و خۆشیان بوونە دانیشتووی پەرستگەکە، دڵنیابوون کە هەخامەنشییەکان دەستیان ناگاتە ئەو پەرستگەیە.

ئەوەی لەبارەی ئاکراپوولی باسکرا، تەنیا برێتی بوو لە بینینەکانی بینەرێکی ئاسایی، کە (٢٥٠٠) ساڵ پێش چوونی بۆ ئەو شوێنە بەرچاوی دەکەوت، بینەری ئاسایی نەیدەتوانی بزانێت ئەو پەرستگەیە بە دەست چ وەستاگەلێك دامەزراوە یاخۆ کام بیناسازان کاریان تێدا کردووە یانژی کامەن ئەو پەیکەرتاشانەی ئەو پەیکەرە جوانانەیان داتاشیوە؟ کێن سەرپەرشتیارانی پەرستگەی ئاکراپوولی، ئەو کەتیبانەی لەسەر دیوارەکانی بیناکانی ئاکراپوولی نووسراونەتەوە کاری کامە خۆشنووسانە؟.

بینەری ئاسایی نەیدەزانی ئاکراپوولی لەو ڕۆژەوە کە دروست کرا تا ئەو ڕۆژەی وێران کرا، هەرگیز کاری بیناسازی تیایدا تەواو نەبوو، واتە خەڵکی ئەسینا بەردەوام بینای نوێیان بۆ سەر بینا کۆنەکان زیاد دەکرد، بەردەوام پەیکەرەکانیان لووس و پاك دەکردەوە و خانووەکانیان نۆژەن دەکردەوە.

ئەو نەیدەزانی خەڵکی ئەسینا لە سەرەتاوە تاکو لەنێوچوونی شارستانییەتەکەیان، بەردەوام لەگەڵ ئاکراپوولی یەکگرتوو بوون و خۆیان لەو جیانەدەکردەوە، ئەو ڕۆژەی ئەسینایان بەجێهێشت، بڕوای بەهێزیان هەبوو کە ئاکراپوولی دەستی لێ نادرێت، ئەوان لەو شارە ڕۆیشتن

و خۆیان گەیاندە پلۆپۆنز، بڕوایان وابوو کە ئاتنە پارێزگاری لە پەرستگەکەی دەکات و ماری پیرۆز کە پاسەوانی گەنجینەی پیرۆزە ناهێڵێت ئەو گەنجینەیە بکەوێتە دەست هەخامەنشییەکان.

هیرۆدۆت نووسیویەتی کە ماری پیرۆز مارێکی ڕاستی نەبوو، تەنیا هێمای یەك لە خوداوەندان بوو، کە پارێزگاری لە گەنجینە دەکرد، (هیرۆدۆت بە ڕەگەز یۆنانی بوو، باوەڕی تەواوی بە ئاکراپوولی هەبوو).

دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئەسینا کاتی چۆڵکردنی وڵاتەکەیان، ئامۆژگاری خەڵکیان دەکرد، کە سەرەڕای بردنی کەرەستە گرانبەهاکانیان، هێندەی توانایان هەیە دانەوێڵە ببەن، تا بۆ هەخامەنشییەکان لە بەردەست نەمێنێتەوە، هەروەها حکوومەتی ئەسینا وتیان ماوەی دوو سالەبەر وبووم لە پلۆپۆنز باش نییە و بە هۆی رۆیشتنی هەموو ئەسینابییەکان بۆ پلۆپۆنز و سالامین، ئەو دوو شوێنە دووچاری کەمبوونەوەی دانەوێڵە و خۆراك دەبن، بۆیە پێویستە بۆ ئەوەی برسی نەمێننەوە و خۆراکی تەواویان لا بێت، هێندەی دەتوانن دانەوێڵە لەگەڵ خۆیاندا ببەن، بەڵام بە هۆی نەبوونی ئامێرەکانی گواستنەوە، هەندێ لە دانەوێڵەکان مانەوە و خەڵکی ئەسینا بەهیوای ئەوە بوون، کە بەردەستی هەخامەنشییەکان نەکەون.

لە ناوچەی پلۆپۆنز لە باشووری یۆنان، لەشکرێکی سی هەزار کەسی بۆ شەڕی خەشایار ئامادەکرابوو، لەژێر فەرماندەیی (کلۆم برۆتۆس)، ئەو فەرماندەیە دە هەزار لە سەربازەکانی خۆی لە ڕێگەی دەریا گەیاندە ناوچەی (گران سیا) لە باکوری ئەسینا، ئەوانی ڕاسپارد تا ئەو ڕێگەیەی بۆ ئەسینا دەچێت وێران بکەن، بۆ ئەوەی لەشکری خەشایار نەتوانێت لەو ڕێگەیەوە بگاتە ئەسینا، ئەو ڕێگەیەش وەك تەرمۆپیلێ دۆخێکی تایبەتی هەبوو، کەوتبۆوە نێوان دەریا و شاخ، ئەگەر وێران بکرایە هەخامەنشییەکان نەیدەتوانی لەو ڕێگەیەوە بگەنە ئەسینا.

لە وڵاتی یۆنان نۆ شار بە ناوی (ئەسینا) هەبوو، بەڵام لێرە باسی ئێمە لەبارەی پایتەختی ناسراوی وڵاتی ئاتیکە، کە نێزیکەی حەوت کیلۆمەتر لە بەندەری (پیرۆس) دوور بوو، دەکرێت بڵێین ئەسیناش بەندەر بوو، دەبێت ئەو پرسە وەك خۆی بخەینە ڕوو، کە ئێمە ئەسینا بەو شێوەیە باس بکەین، کە لە ٤٨٠ یا ٤٧٩ پ. ز لەلایەن سەربازانی خەشایارەوە بینراوە، نەك وەك سەردەمانی دواتر.

ساڵی ٤٨٠ یاخۆ ٤٧٩ پ. ز کاتێك سەرباز و ئەفسەرانی خەشایار گەیشتنە ئەسینا، هێشتا هەندێ بەشی ئەو شارە بینا نەکرابوون. بۆ نموونە باخە بەناوبانگەکەی (ئەکادیمیا)، کە شوێنی ژیان و وانە وتنەوە و مردن و ناشتنی ئەفلاتوون بوو، هێشتا دروست نەکرابوو، هەروەها (لیسە) کە ئێستە ئەو ناوەیان بۆ قوتابخانەکان بەکارهێناوە، (بە دەرچووانی بەشەکانی بەرایی یاخۆ ناوەندی زانستەکان دەوترێت لە کاتی چوونی ئەواندا نەبوو)[1].

ئەو کات هێشتا تەلاری مەزنی (پارتە نۆن) بینا نەکرابوو، لیسەیەکی دیکە، لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی ڕووباری بچووکی (ئیلی سۆس) بوو، نەهاتبوو کایەوە. نابێت لیسەی یەکەم و ئەمەی دوایی بە هەڵە بە یەك بزانین، چوونکە لیسەی دووەم بۆ خوداوەندی ڕووناکی و هونەر (ئاپۆلۆن) بینا کرا.

ئەسینا شارێك بوو، دەتوانرێت بوترێت (پی زیس ترات) دایمەزراند، ئەو پیاوە لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵی و لە ٥٢٧ پ. ز کۆچی دوایی کردووە، شاری ئەسینای لە گوندێکی گەورەوە گۆڕی بۆ شارێکی گەورە، وێڕای ئەوەی دامەزرێنەری ئەو شارە بووە، بەڵام مێژووی جیهان بە کۆکەرەوەی شیعرەکانی (هۆمێر) دەیناسن، لە تەواوی ئەو کارانەی کردوویەتی، تەنیا ئەو کارە بۆ ئەو بوو بەسەرمایەیەکی مەزن و ناوی ئەوی بەدرەوشاوەی هێشتەوە.

کاری پاشای موزەفەرییەی باشووری ئێرانیش، کە بۆ کۆکردنەوەی شیعرەکانی حافزی شیرازی ئەنجامی دا، لەو کارە دەچێت، کە پی زیس ترات بۆ کۆکردنەوەی شیعرەکانی هۆمێر کردی. هۆمێر و حافز هەردووکیان نابینا بوون، بیست و دوو سەدە لە نێوانیاندا هەیە، هەردووکیان باوەڕیان وابوو، کە دوای مردنیان نابێت هیچیان لەدوا جێ بمێنێت، بۆیە شیعرەکانیان کۆنەکردەوە.

پاشای موزەفەریی بۆ کۆکردنەوەی هەر بەیتێك لە شیعرەکانی حافز یەك میسقاڵ زێڕی دەدا، ئەوانەش توانای شیعریان هەبووایە بە شێوازی حافز، دەهاتن زێڕیان وەردەگرت، بۆیە نابێت دووچاری سەرسووڕمان ببین، کە بۆچی بەشێك لە غەزەلەکانی حافز هی خەڵکانی

---

(١) لیسە ناوی گەڕەکێك بوو، کە ئەرەستۆ قوتابیە ناسراوەکەی ئەفلاتوون لەوێ دەژیا و وانەی دەوتەوە، ئەو وەك نەریتێك لە کاتی وانە وتنەوە لە یەك شوێن نەدەوەستا، بۆیە وانە وتنەوەی ئەرەستۆ بە وانەی بەڕێدا رۆیشتوو ناوزەد دەکرێ، (زەبیحوڵڵا).

دیکەیە، هەر کەسێك نەختێك توانی شیعر نووسینی هەبووایە، غەزەلی دەوت و ناوی حافزی لە کۆتایی شیعرەکە دەهێنا و چەندین میسقاڵ زێڕی وەردەگرت.

دوو شاکاری مەزنی هومێر بە ناوەکانی (ئیلیاد و ئۆدیسە) هەردووکیان شیعرن، دەبێت هەردووکیان بە دەقە کۆنە یۆنانییەکانیان بخوێندرێنەوە تا بەها ئەدەبییەکەیان بزانرێت، لەلایەن پی زیس ترات کۆکرانەوە و بەش بەش کران، ئەگەر ئەو کارەی ئەنجام نەدایە، لەوانە بوو ئەمڕۆ کەس ئاگەداری ئەو دوو شاکارە نەبووایە، هەر شاکارەکانی "هۆمێر"یش وایکرد ناوی پی زیس ترات لە مێژوودا بەزیندوویی و بۆ هەتا هەتایی بمێنێتەوە.

ساڵی ٤٨٠ یاخۆ ٤٧٩ پ. ز لە باشوورەوە دەچین بۆ پایتەختی ئاتیك، چوونکە لەشکری خەشایار لەو شوێنەوە ڕۆیشتە نێو ئەو شارە، یەکەم شت کە بەرچاو دەکەوێت تەلارێکی بچووك و جوانە بە ناوی (کالیرۆ)، کانییەك لەنێو زەوییەکەیەوە دێتەدەر، هەر یۆنانییەك کە بەو جێگەیەدا بڕوات، ئاوی لێ دەخواتەوە، تەنانەت ئەگەر تینووش نەبێت، چوونکە ئاوی ئەو کانییە پیرۆزە، بەو پێیەی یەکێك لە خوداوەندانی یۆنان سەرپەرشتی دەکرد، بۆیە هەر کەسێك لێی دەخواردەوە پاك دەبۆوە، دوای کانیاوەکە دەگەینە دیواری شار، کە چوار دەورەی شارەکەی گرتووە، لە کاتی گەیشتنی لەشکری خەشایار نۆ دەروازەی هەبوو، دیواری شار بە کەرپووچ و خشت چێ کرا بوو، لە کاتێکدا تەلارەکانی نێو شار بە بەرد چێ کرابوون، بە هۆی کورتی دیوارەکە و چێکردنی بیناکانی نێو شارەکە لەسەر گردەکان، دەتوانرا هەموو تەلارەکان لە دەرەوەی دیوارەکەوە ببینرێت، شەقامەکانی نێو شاریش بەسەر گردەکاندا درێژدەبنەوە.

ئێمە لە دەروازەی بەرانبەرمان، کە بە (ئۆلەمپیۆم) دەناسرا، چووینە نێو شار و گەیشتینە گەڕەکی ئۆلەمپیۆم، ئەگەر هەشتا ساڵ دواتر چووباین لە بەرانبەرماندا پەرستگەی گەورەی (زێئۆس یاخۆ ژووپیتێرن) کە (١٢٤) دینگەی هەبوو، دەکەوتە بەرچاومان، ئەو کات ئەو پەرستگەیە نەبوو. لە هەردوو لای ڕێگەی ئێمە و لە داوێنی گردەکان کۆمەڵێك خانوو دەبینران، کە هەموویان یەك نهۆم بوون، هەر یەکەیان دوو هەیوانی هەبوو، یەکیان ڕووی لە باشوور و ئەویدیی ڕووی لە باکوڕ بوو، دانیشتووانی ئەوێ لە وەرزی زستان بۆ سوود وەرگرتن لە گەرمای هەتاو لە هەیوانی باشوور دادەنیشتن، لە هاویندا لەبەر فێنکی لە هەیوانی باکوڕ دەنووستن، دوای (٢٥) سەدە، بەو هەموو پێشکەوتنە پیشەسازییە، مرۆڤ هێشتا نەیتوانیوە خانووی تەندروست و باشتر لەو خانووە یەك نهۆمییانەی ئەسینا چێ بکات.

لە هیچ یەك لە خانووەكاندا كەرەستەیەك نەدەدۆزرایەوە، كە لە پێداویستییەكانی ماڵ پتر بێت، تەنانەت لە ماڵی سەرمایەدارەكانیش شتێك وەك قەنەفە و بابەتی ئاسوودەیی نەدەبینرا، بە پێچەوانەوە هیچ ماڵێك نەبوو، كە ئامێری چەنگ (ئامێرێكی موزیكە) یاخۆ نیگاركێشی و بەردتاشی لێ نەبێت. تەنیا بابەتی جوانكاری لە ماڵەكاندا بریتی بوو لە پەردە، خەڵكی ئەسینا زۆر گرینگیان بە پەردە دەدا و ئارەزوویان دەكرد پەردەكان جوانتر و دروینیان باشتر و ڕازاوەتر بن، ئەمڕۆ لە هەر شوێنێكی دنیا كە پەردە هەبێت، دەبێت بڵێین پەردە دروین لەلایەن خەڵكی یۆنانەوە هاتەكایەوە، تەنانەت جلوبەرگیش بە واتای پوخت و جوانی ئەمڕۆ لەلایەن خەڵكی ئەسینا كرایە نەریت، ئەوان زۆر گرینگیان بە جلوبەرگی جوان دەدا، بەڵام لە ڕۆژی چوونی لەشكری خەشایار بۆ نێو شار، بە هۆی چۆڵكردنی شارەكە، كەس لە ڕێڕەوەكانی نێو شار نەدەبینرا، تا جوانی جلوبەرگەكانیان سەرنجی هەخامەنشییەكان ڕابكێشێت، ئەگەر پەسەندی بكەین، كە یەك لە دەركەوتەكانی شارستانییەت، لەبەركردنی جلوبەرگی نوێ بێت، ئەوا دانیشتووانی ئەسینا بە پێشڕەوانی شارستانییەت دەزانرێن.

دوای تێپەڕبوونمان لە گەڕەكی ئۆلەمپیۆم، ڕۆیشتین بەرەو باكوری شار، گەیشتینە گەڕەكی ئارئۆپاگۆس، كە لە زمانی فەرەنسی بە ئارئۆپاژ ناسراوە. لەو گەڕەكەش چەند گردێك بەرچاو دەكەوت، كە لەسەر یەكێكیان تەلارێكی بەردین بە ناوی ئارئۆپاژ هەبوو، بریتی بوو لە دادگەی ئەسینا، لەو دادگەیەدا پارێزەرەكان داكۆكییان لە تاوانباران دەكرد، دەبێت بزانرێت كە بوونی پارێزەر لە دادگەكاندا داهێنانەكانی سەدەكانی هاوچەرخ نییە، لە (٥٠٠ پ. ز) لە دادگەی ئائۆپاژ لە شاری ئەسینا پارێزەرەكان داكۆكییان لە تاوانباران دەكرد، بەڵام ئەگەر پارێزەرانی ئەو سەردەمە، كە هەموویان زانكۆیان تەواو كردووە دەچوونە ئەو دادگەیە، توانای بەرگری لە تاوانبارانیان نەدەبوو، چوونكە پارێزەرانی ئەو سەردەمە كاتی پێشكێش كردنی باسەكەیان بۆ بەرگری لە تاوانبار، دەچنە نێو باسی كۆمەڵایەتی، سیاسیی و دەروونی. لە دادگەی ئارئۆپاژ پارێزەران بۆیان نەبوو لە باسەكەیان دەربچن، بە پێچەوانەوە مافی بەرگریان لێ زەوت دەكرا، دادوەرانی ئەو دادگەایە هێندە وردبین و ڕەقبوون تا ئێستەش ناویان دەبرێت.

ئێمە لە ڕۆژێكدا چووینە ناو ئەسینا، شارەكە چۆڵ بوو، بۆیە نە دەنگی ساز و چەنگ، نە ئاوازی دەنگ بێژەكانمان بۆ نەدەهات، بەڵام بێگومان ئەگەر ڕەوش و ژیان لەو شارە ئاسایی بووایە، ئەوا شارەكە نەتەنیا دەنگی ساز و موزیكمان دەبیست، بگرە دەنگ بێژەكانیشمان دەبینی، كە

زۆرینەیان ئافرەت بوون، دەمانبینی لە هەیوانەکاندا خانمە گەنجەکان دانیشتوون و بسکەکانیان داوەتە دەست شنەی با و بە پەنجە ناسکەکانیان چەنگ دەژەنن، کیژ و خانمە گەنجەکانی ئەسینا لایان نەریت بوو، کە پرچیان بەردەنەوە سەر شان و ملیان، تا با بۆیان بژاکێنێت، نەریتێکی دیکەیان ئەوە بوو، کە لە هەیوانەکان دادەنیشتن و چەنگیان دەژەنی، بۆیە دیمەنی ئافرەتێکی گەنج کە بسکەکانی بە دەست باوە ژاکاوە و چەنگ لێ دەدات، بۆتە دیمەنێکی کلاسیك، ئێستە کەس ناتوانێت ئەو دیمەنە بە شێوەیەکی دیکە بخاتە بەرچاو، دوای گەڕەکی ئارئۆپاژ گەیشتینە گەڕەکی (مۆزیۆم)، تەلاری گەورە بە شکۆی مۆزیۆم لەسەر گردێك بە هەمان ناو بوو، لە ڕاستیدا برێتی بوو لە پەرستگەیەك کە بۆ هەر نۆ خوداوەندەکەی هونەر چێ کرابوو، کە برێتی بوون لە:

١) کلیۆ خوداوەندی مێژوو.
٢) ئۆترەپ خوداوەندی موزیك.
٣) تالی خوداوەندی کۆمیدیا.
٤) مل پۆ مێن خوداوەندی تراژیدیا.
٥) تەرپ زی شور خوداوەندی تراژیدیا.
٦) ئەراتۆ خوداوەندی لاواندنەوە.
٧) پولیم فوو خوداوەندی غەزەل.
٨) ئۆرانی خوداوەندی ئەستێرەناسی.
٩) کالی یووپ خوداوەندی ڕەوانبێژی.

نابێت مۆزەخانەی ئەسینا، ئەو مۆزەخانەیەی دوو سەد ساڵ دواتر لە ئەسکەندەرییەی میسر چێ کرا بە یەك دابنێن، مۆزەخانەی سەرەکیی هەر ئەوەیە، کە لەسەر ئەو گردەی ئەسینا بوو، لە دوولای ئەودا دوو گرد بە ناوەکانی (تەنف و پۆبێکس) هەبوون، دوای تێپەڕبوون لەو گەڕەکە، لە لای باکوڕ گەڕەکی ئاکرۆپوولی بوو، لای ڕۆژئاواشمان گەڕەکی (سێرامیکۆم) هەبوو، ئەو گەڕەکە شوێنی گۆزەگەر و ئەو کەسانە بوو، کە بابەتی گڵێنیان دەکرد، لە شوێنە ڕازاوەکانی ئەو شارە بوو، هەموو ئەو پیشەوەرانەی ئەو کارەیان دەکرد لەو گەڕەکە نیشتەجێبوون، هێشتا ئەسینا هێندە گەورە نەببوو، کە دوکانەکان و شوێنی نیشتەجێ لەیەك جودا ببنەوە، وەك ئێستە گەڕەکی پیشەسازی و نیشتەجێ لێك جیا نەبوون.

گۆزەگەرەکانی ئەسینا دەفرە گڵێنەکانیان بە ڕەنگە جیاوازەکان دەڕەنگاند و لە کورەدا سووریان دەکردنەوە، دەفر و ئامانە گڵێنەکانی ئەسینا هێندە جوان بوون، کە مرۆڤ نەیدەویست چاویان لەسەر هەڵبگرێت، شارستانییەتی نوێی هونەری تەلارسازی بووە هۆکاری لەنێوچوونی دەفرە گڵێنەکان، بەڵام لە (٥٠٠ پ. ز) ئەسینا لە گەرمەی پێشکەوتنی ئەو پیشەسازیەدا بوو، پێویستبوونی ئەو پیشانە بووە مایەی پێشکەوتنیان، دانیشتووانی ئەسینا لە چێشتخانە و سەر خوانەکانیان سوودیان لە ئەوان دەدیت، مەنجەڵەکانیشیان گڵێن بوون، چوونکە دەیانزانی مەنجەڵە مسەکان دەبنە هۆی ژەهراویبوونی مرۆڤ، ئەوان هێشتا سوودیان لە قەڵایی نەدەدەیت بۆ سپی کردنەوەی مەنجەڵەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان مەنجەڵی بەردینیشیان هەبوو.

هەرچەندە لە ئەسینا گۆزەسازی خوداوەندی تایبەتی نەبوو، بەڵام ساڵانە لە مۆزیۆم واتە پەرستگەی نۆ خوداوەندەکەی هونەر دیاری دەدرایە خاوەن جوانترین دەفرە گڵێنەکان، گۆزەگەرەکان هێمای تایبەت بە خۆیان هەبوو، ئەو هێمایەیان لەسەر گۆزەکانیان هەڵدەکەند، ئەو پیشەیە لە باوك بۆ کوڕ دەمایەوە، چەندین خانەوادە تا سەدەی دووەمی پێش زاینیش بەو پیشەیەوە خەریك بوون، دەفرە گڵێنەکانیان بەناوبانگ بوون و بۆ فرۆشتن دەناردران بۆ دەوڵەتە شارەکانی دیکەی یۆنان.

دوای بینینی گەڕەکی گۆزەگەرەکان، باشتر وابوو بچینە ئاکراپوولی، لە ئەوێوە بەرەو باکوڕ بڕۆین، لە باکوڕی ئاکراپوولی گەڕەکێك بە ناوی (کۆلی تۆس) هەبوو، کە زۆرینەی پیشەوەرەکانی شار لەو گەڕەکە بوون و بە گەڕەکی پیشەسازی دەناسرا، لەو گەڕەکە جگە لە بابەتە کانزاییە پێداویستییەکانی ناوماڵ و پەرستگەکان، شمشێر، نێزە، چەقۆ و زرێیان دروست دەکرد، لەنگەرگەی کەشتییەکانی بەندەری (پیرۆس) کە دەکەوتە حەوت کیلۆمەتری ئەسینا لەوێ دروست دەکران، بەردەوام لە کارگەکانی ئەو گەڕەکە دووکەڵ بەرەو ئاسمان بەرز دەبۆوە، لە هەر ماڵێکی ئەو گەڕەکەدا، بارە دارێك دەبینرا، چوونکە لە تەواوی کارگەکان داریان وەك سووتەمەنی بەکاردەهێنا، یۆنانییە کۆنەکان لە دار زیاتر هیچ سووتەمەنییەکیان بەکارنەدەهێنا.

ئەو رۆژەی لەشکری خەشایار گەیشتە ئەسینا، گەڕەکی کۆلی تۆسیش وەك گەڕەکەکانی دیکە بێدەنگ و بێ جووڵە بوو، دووکەڵ لە کارگەکانی نەدەبینرا، بەڵام ئەگەر رۆژانی پێشتر

چووباینە ئەو شارە وامان هەست دەکرد، کە چووینەتە کارخانەیەکی گەورە، چوونکە تەواوی کرێکارەکانی ئەو کارخانەیە بەرگی هاوشێوەیان لەبەر بوو.

بەر لە دووەمین جەنگی جیهان دەوترا، کە هیچ گەلێك بە ئەندازەی گەلی ئەڵمان ئارەزوویان بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگی یەکپۆش نییە، دەگوترا کە ئەڵمانەکان دوو بەشن، یەکەم ئەوانەی هاپۆشن لەجلوبەرگدا پیاسە دەکەن، دووەم ئەوانەی دەوەستن و پیاسەکردنی ئەوان تەماشا دەکەن، کە هاپۆشن و یەجۆر جلوبەرگیان لەبەردایە، بەڵام لەبەر گی یەکگرتوودا یۆنانییەکان لە پێش ئەڵمانەکانن، لە سەردەمێك کە لە هیچ شوێنێك هاپۆشی لە جلوبەرگ نەبوو، کرێکارانی کارگەکانی کانزای یۆنان یەك جۆر جلوبەرگیان دەپۆشی.

لە رۆژهەڵاتی کۆلی تۆس گەڕەکێك بە ناوی (پۆلی تریۆم) هەبوو، ئەو گەڕەکە ئەو بایەخەی هەبوو، کە تەلاری پۆلی تریۆم لە هەمان گەڕەك و لەسەر گردێك بوونیاد نرابوو، پۆلی تریۆم شوێنی کۆبوونەوەی نوێنەرانی گەلانی دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان بوو، نوێنەرەکان لە هەر سەردەمێك بە ناوێك ناسرا بوون، ئەوکات بە سیناتۆر دەناسران، ئێمە ڕاهاتووین کە نوێنەرانی پەرلەمان بە جیا لە سیناتۆرەکان بناسین، لە کۆندا هەردووکیان یەك بوون، بە واتایەکی دیکە (باڵاترین ئەنجومەنی نیشتمانی بۆ چارسەرکردنی کاروبارەکان)، لە سەردەمانی باستاندا لە نێوان نوێنەرانی ئەنجومەنی نیشتمانی و ئەنجومەنی (سیناتەکان) جیاوازیی نەبوو، هەردووکیان بە سیناتۆر ناو دەبران.

نابێت خۆمان لە باسکردنی دوو بینای دی، کە لە ئەسینا هەبوون بەدوور بگرین، یەکیان تەلاری شانۆگەری، ئەوی دیکەیشیان (ستادیۆم) واتە کۆمەڵگەی وەرزشی تایبەت بە کێبەرکێ وەرزشییەکان بوو، سەبارەت بە شانۆ و وەرزش لە یۆنانی کۆن، بە تایبەتی لە وڵاتی ئاتیك کە ئەسینا پایتەختی بوو، خەڵك بە هەڵەچوونە و سەرەنج لەو بابەتە نادەن، کە شانۆ و وەرزش بەشێك بووە لە ئاینی یۆنانییەکان، ئەوان بۆ شانۆ و هونەرە جوانەکانی دیکە، خوداوەندی تایبەتیان هەبووە، شانۆکاران کە لە تەماشاخانەکاندا نواندنیان دەکرد، بە خزمەتکارانی خودا ناسرا بوون، دەنگبێژ و ژنیارەکانیش خزمەتکاری خوداوەند بوون، هەر دەنگبێژ و ژەنیار و هونەرمەندێکی لەو سەردەمەدا، کاتێك لە کارەکەی خۆی ئاسوودە دەبوو، کە بۆ خزمەتی خوداوەندیانی خۆی کارێکی کرد بێت.

لە ئەسینا ڕۆژی جارێك کێبەرکێی وەرزشی لە کۆمەڵگە وەرزشییەکە ئەنجام دەدرا، دوای گەڕانەوەی هەخامەنشییەکان لە ئەسینا بەشداری ئافرەتانیش لە کێبڕکێیەکان بووە نەریت،بەڵام کاتی گەیشتنی لەشکری خەشایار بۆ ئەسینا تەلاری کۆمەڵگە وەرزشیەکە هێشتا تەواو نەببوو.

ئەوەی باسکرا کورتەیەك بوو لەبارەی گەڕەك و تەلارەکانی ئەسینا لە کاتی گەیشتنی لەشکری هەخامەنشیی، هەندێ لە گەڕەك و تەلارەکان کە لە مێژوودا ناویان هاتووە، ئەو دەمە دروست نەکرا بوون، دوای گەڕانەوەی خەشایار چێ کران.

خەشایار شا دوای ئەوەی گەیشتە ئەسینا، ئۆردووگەی خۆی لە دەرەوەی ئەسینا دامەزراند، ئەو دەیزانی یۆنانییەکان لە پلۆپۆنز، کە لە باشووری یۆنان بوو لەشکریان هەیە، لەوانەیە ئەو لەشکرە بێتە یۆنان و ئەو لەنێو شاردا گەمارۆ بدەن، بۆیە دوای گەیشتنی بە ئەسینا ئۆردووگەی خۆی لە دەرەوەی ئەو شارە دانا، تا لە کاتی هاتنی یۆنانییەکاندا، لەشکرەکەی لەنێو شار گەمارۆ نەدرێت، خەشایار خۆی لە تەلاری پۆلۆتریۆم نیشتەجێ بوو، هەروەها (گاردی جاوید) کە تایبەت بە پارێزگاری خۆی بوو، لەو تەلارەدا نیشتەجێ بوون.

کاتی گەیشتنی لەشکری خەشایار بۆ نێو ئەسینا، تەنانەت یەك کەسیش لە شارە نەدەبینرا، بەڵام نێو ئاکراپوولی پڕ بوو لە خەڵك، خەشایار فەرمانی کرد هیچ کەس کێشەیان بۆ نەنێتەوە، ئەو کەسانەی لە ئاکراپوولی کۆببوونەوە ئەوانە بوون، کە نەیانتوانی لە ئەسینا دووربکەونەوە، هەندێکیان بە هۆی دەست نەکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوە و هەندێکیش بە هۆی هەژاری بە ناچاری لە ئاکراپوولی مابوونەوە و پێیان وابوو خوداوەندی گەورەی ئەسینا ئەوان لەدەست هەخامەنشییەکان دەپارێزێت، بە هۆی ئەو ڕێزەی خەشایار لە ئاینی نەتەوەکانی دیکەی دەگرت، خۆی لە هێرش بۆ ئاکراپوولی و ئازاردانی ئەوانەی لە ئەوێ بوون پاراست، چوونکە دەیزانی ئەوانەی لە ئەوێ ماونەتەوە بۆ خۆراك دەکەونە کێشەوە، ڕێگەی پێدان لەو شوێنە بێنە دەرێ و خۆراك بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

لە سەرچاوە مێژووییەکانی ئەورووپادا هاتووە، کە خەشایار ئاکراپوولی وێران کردبێت، بەڵام ئەو وتەیە ڕاست نییە، ئەو تەنیا قەڵای ئاکراپوولی وێران کرد، کە قەڵایەکی سەربازی بوو، لەسەر گردێك و لەلایەن (پی زیست ترات) بینا کرابوو، ئەسینا شارێکی بێ بەرگری بوو، واتە بۆ پارێزگاریکردن لەو شارە کەس بەرگری نەکرد، ئەو کات ئەو شارانەی بەرگرییان نەدەکرد، وێران

نەدەکران، لە سەرچاوە مێژووییەکانی ئەورووپاییەکاندا هاتووە کە خەشایار لە تۆڵەی وێرانکردن و سووتاندنی شاری (سارد) پایتەختی لیدی، شاری ئەسینای وێران کرد، ئەوە ڕاست نییە، پێویستە ئەو هەڵە ئەنقەستە ڕاست بکرێتەوە، خەشایار جگە لە قەڵای ئاکراپوولی و دوو شار کە لە دەوروبەری ئەسینا بوون، هیچ شوێنی دیکەی وێران نەکرد، ئەو ڕۆژەی لەشکری خەشایار لەو شارە گەڕایەوە، تەواوی شارەکە و بیناکانی وەك خۆیان بوون، یۆنانییەکان لە شەڕە ناوەخۆییەکانیاندا (٤٣١ تا ٤٠٤ پ. ز) ئەسینایان وێران کرد، ئەوانەی گومان لەو بابەتە دەکەن، پێویستە پەڕتووکە مێژووییەکانی (تۆسیدید) بخوێننەوە، تۆسیدید جەنگە ناوەخۆییەکانی یۆنان بە جەنگەکانی پلۆپۆنز ناو دەبات، کە لە (٤٣١ پ. ز) واتە پەنجا ساڵ دوای گەڕانەوەی خەشایار لە ئەسینا دەستیان پێکردووە، توسیدید ڕاستگۆترین مێژوونووسی یۆنانە، بۆ خۆی لە جەنگەکانی پلۆپۆنز بەشدار بووە و ڕووداوەکانی ئەو جەنگانەی تا ساڵی (٤١١ پ. ز) نووسیوەتەوە دواتریش لەلایەن گزنفۆن نووسینەوەی ئەو مێژووە لە پەڕتووکێك بە ناوی (هەلەنیك) واتە (یۆنانییەکان) نووسراوە و ڕووداوەکانی جەنگەکان لە ساڵی (٤٠٤ پ. ز) تەواو دەبن.

ئەسینا لە جەنگە ناوەخۆییەکانی یۆنان وێران بوو، بەڵام بە تەواوەتی وێران نەبوو، ئەوە ڕاست نییە، کە هەخامەنشییەکان بە وێرانکاری ئەو شارە بزانرێن، هەخامەنشییەکان لە جەنگە ناوەخۆییەکانی یۆنان تەنیا ناڕاستەوخۆ بەشدار بوون، ئێسپارتەکان و پێشەنگی لەشکری هەخامەنشیی لەگەڵ ئەسینا دەجەنگان، ڕاستینەی مێژوویی ئەوەیە کە خەشایار بۆ وێرانکردنی ئەسینا چوو بوو، بەڵام ئەو ئازایەتییەی ئەوان لەو دوو جەنگەدا نواندیان، کاریگەریی لەسەر خەشایار کرد، جگە لەوەش خەشایار و ئەو سەربازانەی لەگەڵیدا بوون بە واتای وشە شارستانی بوون و حەزیان بە جوانی و ئاوەدانی و تەلاری جوان و بە شکۆ دەکرد، خەشایار کە هێشتا سەرگەرمی تەواوکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس بوو، کە لەلایەن داریوشی باوکی دەستی پێکرد بوو، ڕێگەی بە خۆی نەدەدا تەلارە جوانەکانی ئەسینا وێران بکات.

توسیدید دەڵێت: لە سێیەمین ڕۆژی گەیشتنی خەشایار بۆ ئەسینا، بە فەرمانی خەشایار جارچییەکان بانگیان ڕاداشت، هەر کەسێك لە ئەسینا ڕۆیشتووە، دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر و ماڵی پارێزراو دەبێت، چوونکە ئەو خەڵکە هەژار و بێ توانایەی لە ئەسینا مابوونەوە، نەیان دەتوانی خۆراك بەدەست بێنن، خەشایار وتی لە گەنمی لەشکرەکەی بدەن بە ئەوان تا بۆ خۆیان

بیکەن بە نان، لە پێنجەمین رۆژی گەیشتنی هەخامەنشییەکان بۆ ئەسینا، نانەواخانەکان کرانەوە، ئەسینا لە دۆخی جەنگ دەرچوو، لە دەیەمین رۆژی گەیشتنیدا، خەشایار چوو بۆ پەرستگەی ئەکراپوولی، تەنانەت بەخششی دایە خزمەتکارەکانی ئەو پەرستگەیە.

بەڵگەنامە مێژووییەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە لە دەیەمین رۆژی گەیشتنی لەشکری خەشایاردا، لە گەڕەکی سێرامیکۆم چەند کارگەیەکی گۆزەگەری، تەنانەت لە گەڕەکی کۆلی تۆسیش چەند کارگەیەکی ئاسنگەری کرایەوە، هەندێ بەڵگەش دەریدەخەن کە لەو رۆژەدا لە هەندێ ماڵ دەنگی موزیك دەهات.

بەپێی ئەو بەڵگەنامە مێژووییانە دەردەکەوێت ئەسینا بە دەست خەشایار شا وێران نەکرا، چوونکە ئەگەر وێران کرابووایە، پاشای هەخامەنشیی نەدەچووە پەرستگەی ئاکراپوولی، نانخانەکان، دوکانەکانی گۆزەکەری و ئاسنگەری نەدەکرانەوە، کچ و ژنان نەدەکەوتنە ژەنینی چەنگ و موزیك لە شارێکی وێراندا، تەنانەت ئەگەر ئافرەت یاخۆ کچی جوان و گەنجیشی لێ بێت، دڵی رێگەی پێ نادات موزیك بژەنن.

یەك لەو ڕاستیانەی تەنانەت هیرۆدۆتیش نەیتوانیوە بیشارێتەوە، رێزی زۆری هەخامەنشییەکان بووە بەرانبەر بە ناموسی یۆنانییەکان، نابێت ئەو بابەتە بە بچووك سەیر بکرێت، سەربازە هەخامەنشییەکان لانی کەم ساڵێك بەپێی هەندێ لە سەرچاوەکان پتر لە ساڵێك لە خێزانەکانیان دوور بوون، زۆرینەیان گەنج و لە تەمەنێکدا بوون، کە پیاو زۆر بە توندی هۆگری ژن دەبێت. خانمە یۆنانییەکانیش بە هۆی لانی کەم سێ سەد ساڵ وەرزش، باڵایان رێك و زۆر جوان بوو، وێڕای ئەوەش نەبینرا سەربازێك یاخۆ ئەفسەرێکی هەخامەنشیی دەستدرێژی بکاتە سەر خانمێکی یۆنانی، لە تەواوی ئەو مێژووانەی لەلایەن مێژوونووسە کۆنە یۆنانییەکانەوە نووسراون، بۆ یەك جاریش ئاماژە بەو ناکەن، کە سەرباز و ئەفسەرانی هەخامەنشیی ئەو کردانەیان ئەنجام دابێت، لە کاتێکدا لە دنیای کۆندا کاتێك تەنیا بۆ یەك شەو لەشکرێك دەگەیشتە نێو شارێك، هەروەك چۆن هەموو سەرمایەی لایەنی شکستخوردووی بە هی خۆی دەزانی، بە هەمان شێوە ژنەکانیانیشی بە هی خۆی دەزانی، بەڵام ئێرانییەکانی سەردەمی هەخامەنشیی هێندە گرینگیان بە ناموس دەدا، کە هیچ کات رێگەیان بە خۆیان نەدا، دەستدرێژی بکەنە سەر ژنەکانی لایەنە شکستخواردووەکان، ئەوان

پیاوانیان دەکوشت و بە دیل دەیان گرتن، ئەگەر بەرگرییان بکردایە، بەڵام ڕێزیان لە ژنەکان دەگرت.

کەتزیاس نۆشدار و مێژوونووسی یۆنانی ماوەیەك دوای هاتنی خەشایار بۆ ئەسینا، لە کۆشکی پاشایەتیی ئێران خزمەتی دەکرد، بیست ساڵ لە ئێران مایەوە، دەڵێت لە ئێران ژنی بەد ڕەوشت نییە. ئەو کاتەی ئەو لە ئێران بوو پاشاکانی هەخامەنشیی کە لە دوای خەشایار و داریوش هاتبوون، بەهۆی خۆشگوزەرانی و بێ بەندوباری نەیاندەتوانی ڕێگر بن لە بێ بەندوباری، وێڕای ئەوەش ژنی بەدرەوشتی لێ نەبوو.

خاڵێکی دیکە لە هەموو مێژووی یۆنانییەکاندا دەبینرێت، نەبوونی ڕق و تورەیی دەسەڵاتدارە هەخامەنشییەکان بووە بەرانبەر بەو دوژمنانەی کە بەر فەرمان دەبوون، لە تەواوی ئەو ماوەیەی خەشایار لە یۆنان بوو، هەر کەسێك کە بەرفەرمان بووایە دەبەخشرا، هەر سەرباز و ئەفسەرێك کە خۆی بەدەستەوە دەدا، نەدەکەوتە بەر کێشە و ئازاردان.

ئەگەر پاشای هەخامەنشیی ئەسینای وێران کردبێت و تەنیا کونەپەپوو لەوێ ماوەتەوە، بۆچی پێش ڕۆیشتنی لەو شارە، هەندێ خەڵکی ئەسینا گەڕانەوە؟ ئایا پەسەندە خانەوادە یۆنانییە خاوەن تواناکان کە لە پلۆپۆنز ژیانیان خۆش بوو و دوور بوون لە مەترسی بەربەرەکان، گیان و ماڵیان بخەنە مەترسی و بۆ ئەسینا بگەڕێنەوە بۆ ئەوەێ بکوژرێن، یاخۆ تالان بکرێن و نامووسیان بکەوێتە بەردەستی هەخامەنشییەکان؟

هەندێ لە مێژوونووسە یۆنانییەکان باسیان لە گەڕانەوەی هەندێ لە ماڵە یۆنانییەکان بۆ ئەسینا پێش ڕۆیشتنی هەخامەنشییەکان لەو شوێنە کردووە، نووسینی وشەی (خانوو) ئەو ڕاستییە دەردەخات، کە هەموو ئەسینا بەدەستی خەشایار وێران نەکراوە، ئەگەر نا خانوویەك نەدەما خەڵکی ئەسینا بچنە ناوی.

ئەوەی لەبارەی هاتنی لەشکری خەشایار بۆ ئەسینا ئاماژەیان بۆ کرا لە لێکۆڵینەوە بێ لایەنەکانی پرۆفیسۆر بارن وەرگیراون، بارن بەو شێوەیە باس لە ئەسینا دەکات، کە تەنانەت لە هەندێ لە گەڕەکەکان ناوی ماڵەکانیش باس دەکات، ئینجا هەندێ لە نووسینەکانی (هیرۆدۆت) لەبارەی چوونی لەشکری خەشایار بۆ ئەسینا دەهێنینەوە:

"کاتێك دڕندە هەخامەنشییەکان گەیشتنە ئاتیك، پاسەوانەکان هاتنی ئەوانیان بۆ ئاتیك ڕاگەیاند، کە لەشکری دڕندەکان لە ئەسینا نێزیك کەوتنەوە، فەرمانی چۆڵکردنی شار درا، بەڵام

سەربازگەیەکی بەهێز لە شار هەبوو، ئەوان بەردیان بەسەر هەخامەنشییەکاندا باراند و ڕێگریان کرد لە نێزیك بوونەوەیان لە دیواری شارەکە، لەشکری ئێران چەند ڕۆژ لە بەرانبەر دیوارەکە چاوەڕوان بوون، تا دوایین سەربازی سەربازگەکە نەکوژرا، نەیانتوانی بچنە نێو شار، ئینجا هەخامەنشییەکان چوونە نێو شار، خەشایاری پاشا لە تەلاری ئەنجومەنی سیناتی ئەسینا مالّی دانا، لەشکرەکەی چوونە پەرستگەی ئاکراپوولی و تەواوی ئەو هەژارانەیان کوشت کە لەوێ پەناگیر ببوون، دواتر کەوتنە تالاّنکردنی ئەو پەرستگەیە و هەرچی بەنرخ بوو بردیان، پاشان ئاکراپوولی کە پڕاوپڕ لە داهێنانەکانی جوانی بوو، هاوتای لە دنیادا نەبوو، لەلایەن ئەوان ئاگری تێبەردرا و وێران کرا.

چەند ڕۆژ دواتر خەشایار فەرمانیدا کە یۆنانییەکان ئازادن، کە بگەڕێنەوە بۆ ئاکراپوولی و بۆ ئاتنەی خوداوەندی ئەوێ قوربانی بکەن، هۆکاری دەرکردنی ئەو فەرمانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خەشایار خەونێکی دیت و لە تالاّن و سووتاندن و وێرانکردنی ئاکراپوولی پەشیمان بۆوە."

ئەو نووسینەی هیرۆدۆت دوای نێزیکەی سەد سالّ کەوتە بەر دیدەی ئەسکەندەری مەکدۆنی و ژوونکە ئەوکات ئاکراپوولی وێران ببوو، ئەو گەنجە مەکدۆنییە دلّنیابوو کە هەخامەنشییەکان ئاکراپوولیان سووتاندووە و وێران کردووە و بۆ ئەوەی تۆلّە بستێنێتەوە، دوای ئەوەی کۆشکی پێرسپۆلّیسی تالاّن کرد، سووتاندی و وێرانی کرد و بە دلّنیاییەوە دەتواندرێت بگوترێت کە ئەگەر هیرۆدۆت ئەو نووسینەی نەنووسیبووایە، کۆشکی پێرسپۆلّیس لەنێو نەدەچوو.

هیرۆدۆت دیسان لە ڕووی ڕقەوە نووسیویەتی: جەنگی ئەسینا دوو **قۆناخی** هەبووە، کە یەکیان قۆناخی پەڕینەوە لە دیواری شار و ئەویدیی قۆناخی داگیرکردنی ئاکراپوولی بووە، ئەو دوو جەنگە بیست ڕۆژی خایاند، لەو ماوەیە لەشکرە پێنج ملیۆنییەکەی هەخامەنشیی لەگەلّ ئەو خەلّکە هەژارەی کە نەیانتوانی بوو لە ئەسینا بڕۆن، لە پەرستگەی ئاکراپوولی مابوونەوە، جەنگان، دوای سەرکەوتن بەسەر ئەواندا، هەموو ئەو بەرگری کارانەیان کوشتن.

ماوەی نێوان (پلۆتارك) لەگەلّ هیرۆدۆت پێنج سەدە بووە، ناچار بابەتەکانی تایبەت بە هاتنی لەشکری هەخامەنشیی بۆ ئەسینای لە مێژوونووسە یۆنانییەکان، بە تایبەتی لە هیرۆدۆت وەرگرتووە، جەنگی ئاکراپوولی بە بیست ڕۆژ باس کردووە و مرۆڤ سەرسام دەبێت،

که چۆن لەشکرێکی گەورەی پێنج ملیۆن کەسی[٢] ماوەی بیست ڕۆژ بەرانبەر پەرستگەی ئاکراپوولی مایەوە و نەیتوانی بە سەر دەستەیەك خەڵکی هەژار و بێ چەك سەربکەوێت، کە لەو پەرستگەیەدا مابوونەوە.

تەنانەت ئەگەر پەرستگەی ئاکراپوولی سەربازگەیەکی بەهێزیشی بۆ بەرگری هەبووبێت، دیسان لە ماوەیەکی کورت و لەوانەیە لە شەو و ڕۆژێکدا ئەو سەربازگەیە لەنێو بچێت، ئەگەر پەسەندیشی بکەین کە لەشکری گەورەی خەشایاری پاشای هەخامەنشیی ماوەی بیست ڕۆژ لە بەرانبەر ئەو پەرستگەیە وەستاوە، ئایا بەڵگە نییە بۆ ئەوەی ئەو نەیویستووە کە ئاکراپوولی وێران بکات؟

هیرۆدۆت نەیتوانیوە ڕاستی گەڕانەوەی هەندێ خەڵکی ئەسینا بۆ ئەوێ بشارێتەوە و پشتڕاستی کردووەتەوە، کە خەشایار بەڵێنی پارێزگاری داوەتە ئەوان و ئەوانیش گەڕاونەتەوە.

خەشایار ئاکراپوولی وێران نەکرد، بەڵام دوو پیکەری دوو دەسەڵاتداری ئەسینای لەو پەرستگەیە بردە دەرەوە و لە کۆشکی پێرسپۆلیسی دانان، پەیکەرەکان هی دەسەڵاتدارانی پێشووی ئەسینا بوون، یەکێك لە پەیکەرەکان هی (هارمۆیۆس)، ئەویدی بە ناوی (ئاریستۆ گیتۆن) بوو، هەردوو پەیکەر لە قوڕقۆشم چێ کرابوون، لە ڕووی هونەرییەوە یەکجار نایاب و جوان بوون، کە خەشایار نەیتوانی دەستیان لێ هەڵبگرێت، ئەمە وایکرد هەردوو پەیکەری بردنە ئێران و لە کۆشکی پێرسپۆلیس داینان، تا کۆتایی دەسەڵاتیی هەخامەنشییەکان لە پێرسپۆلیس مانەوە، دوای ئەوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی ئێرانی داگیرکرد، هەر دوو پەیکەری

(٢) لەسەرەتای باسی لەشکرکێشیی خەشایار بۆ ئەسینا تا بە ئێرە، چەندین جار زەبیحوڵڵا بە ئەنقەست ژمارەی لەشکرەکەی خەشایار دەگەیەنێتە پێنج ملیۆن کەس تا ئەو مەبەستەی بۆی دەچێت یاخۆ لانی کەم نیشاندانی ئەستۆ پاکییە بۆ خەشایار و لەشکرەکەی لە وێرانکاری و تاوانەکانیان لە ئەسینا، لە مێشکی خوێنەر جێ بکاتەوە، دەبینین ئەو لە هەندێ شوێن جەخت دەکاتەوە، کە ژمارەی لەشکرەکە تەنیا هەشتا هەزار کەس بووە، هەردوو بۆچوون لە یەك کاتدا بەرجەستە کردنیان تەندروست نییە، واتە لە کاتی سەرکەوتنەکاندا لەشکرەکە بچووك دەکاتەوە، کاتی دی وتەی هیرۆدۆت بە سەرسامییەوە باس دەکات، خۆ ئەگەر لە ڕێگە هەندێك سەرباز مردبن و چەند هەزارێکیش لە جەنگەکانی تەرمۆپیل کوژرا بن، ئەوا ئەو هەشتا هەزارەی زەبیحوڵڵا. "وەرگێڕی کوردی".

لەو کۆشکە دەرهێنانەوە تا بۆ یۆنان بنێردرێنەوە و لە پەرستگەی ئاکراپوولی دابنرێنەوە، ئێستە ئەو دوو پەیکەرە هەن، بەڵام پەیکەرە رەسەنەکان نین، نازانرێت ئەو پەیکەرە رەسەنانەی لە ئێرانەوە بۆ ئاکراپوولی گەڕێندرانەوە چییان بەسەرهات.

هیرۆدۆت دەڵێت: لە کاتێکدا کە خەشایار گەمارۆی پەرستگەی ئاکراپوولی دابوو، لەگەڵ بەرگریکارانی ئەو پەرستگەیەدا دەجەنگا، شەڕی دەریایی سالامیس دەستی پێکرد، ئەو بابەتە جگە لە جەنگی دەورەی ئاکراپوولی ڕاستە، ئەو کاتەی خەشایار لە ئەسینا بوو، شەڕ لە نێوان هێزی دەریایی یۆنان و هێزی دەریایی هەخامەنشیی لە نێزیك دوورگەی سالامیس ڕوویدا.

# جەنگی سالامیس

ئاکراپوول پەرستگەی خوداوەندی ئەسینا (ئاتنە) هێندە جوان و پڕ شکۆ بوو، کە مرۆڤ بە یەکجار بینین نەیدەتوانی هەموو جوانییەکانی ببینێت، بۆیە خەشایار کە جاری یەکەم لە دەیەمین ڕۆژی گەیشتنی بە ئەسینا چوو بۆ ئەو پەرستگەیە، لە پازدەمین رۆژیش بڕیاریدا بچێتە ئەو پەرستگەیە و جوانییەکانی ببینێت.

ئەو ڕۆژە تا ڕادەیەك ئەسینا دۆخی ئاسایی ببۆوە، خەڵك لە ڕێگەکان دەبینران، هەندێ لە دوکانەکان کرابوونەوە، فەرماندەی گاردی پاسەوانی خەشایار وتی باشتر وایە پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ، پەرستگەکە چۆڵ بکەن تا پاشا بتوانێت بە ئاسوودەیی دیدەنی ئەوێ بکات.

سۆئێتون مێژوونووسی بەناوبانگ دەڵێت: خەشایار کاتێك گەیشتە سەر ئەو گردەی پەرستگەی ئاکراپوولی لەسەر بونیادنرا بوو، فەرمانی کرد پەرستگەکە چۆڵ بکەن، ئەفسەر و فەرماندەکانی گاردی جاوید خەڵکەیان لە پەرستگە هێنایەدەر، بەڵام ڕێگەیان نەدان لە گردەکە بێنە خوارێ، چوونکە خەشایار لە گردەکە سەردەکەوت، ئەگەر خەڵك بچوونایە خوارێ، ڕێگەی ئەویان دەگرت. هەر بۆیە دوای هاتنە دەرەوەی خەڵکەکە لە پەرستگە، ئەوانیان لە کەناری ڕێگەکە ڕاگرت، بۆ ئەوەی ئەو تێپەڕ بێت، لەبەرئەوەی خەشایار بەسەر گردەکەدا بەرەو نێو پەرستگەکە دەڕۆیشت، ئەو رۆژە خەشایار جلوبەرگی ئاسایی لە بەردا بوو، چەکدار نەبوو، تەنیا (داگ) واتە شمشێرێکی درێژ و ڕاستی دوو دەمی لە کەمەردا بوو.

کاتی تێپەڕبوونی خەشایار، یۆنانییەکان لەمبەر و ئەوبەری ڕێگەکە وێستا بوون، رمێك بۆ لای هاوێژرا، ئەو نێزە بچووك و سووکە بەر ڕانی چەپی خەشایار کەوت، لە چاو تروکاندنێکدا پیاوانی گاردی جاوید، دەورەی پاشایان گرت، تا ڕمی دیکەی بۆ هەڵ نەدرێت، دەستوبرد سەربازەکانی دیکە بە خێرایی هێرشیان برد، تا ئەو کەسە بگرن، کە ڕمەکەی هاویشتووە، لە ئاکامی ئەو کردەیە زۆر تورە بوون، هەر کەسێك لەسەر ڕێگەیان بوو کوشتیان تا گەیشتنە ئەو کەسە و دەستگیریان کرد، سۆئێتۆن دەڵێت: لەو رۆژەدا لە پەرستگەی ئاکراپوولی بیست تا

سی کەس کوژران، دوور نییە ئەفلاتوون کە باس لە کوشتاری خەڵك لە ڕۆژی چوونی لەشکری خەشایار بۆ ئاکراپوولی دەکات، مەبەستی لە ڕۆژی ئەو ڕووداوە بوو بێت.

نێزەکەیان هەر لە شوێنی ڕووداوەکە لە ڕانی پاشا دەرهێنا، چوونکە خوێنی لەبەر دەچوو، لەوێندەر برینەکەیان پێچا، تەختی گەڕۆکییانیش بۆ پاشا هێنا و لەسەر تەخت ئەویان گەڕاندەوە، دواتر ئەنجامدەری هێرشەکە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا، دەرکەوت نیشتمانپەروەری هانیداوە بۆ ئەو کردەیە، بۆیە بەپێی نەریتەکانی ئەوکات ئەنجامدەرانی ئەو جۆرە کردەوانە سزای زۆر توند دەدران، ئەویش دووچاری هەمان چارەنووس هات.

دوای ئەو ڕووداوە چەند ڕۆژێك خەشایار شا خەریکی تیمارکردنی برینەکەی بوو، نەیدەتوانی ڕێگە بکات، لەو سەروبەندەدا هەواڵی شکستی هێزە دەریاییەکەی لە شەڕی سالامیس پێ گەیشت، لە سالامیس دووجاران جەنگ لە نێوان هەردوو کەشتیگەلی هەخامەنشیی و یۆنان ڕوویدا، کە یەکەمین جەنگ لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا بەرپا بوو، ئەو جەنگەش لە مێژووی یۆنان زۆر دەرنەکەوتووە، بەڵام دووەمین جەنگ پایەی مەزنی هەبوو، چوونکە لە دووەمین جەنگ هێزی دەریای هەخامەنشیی زۆر بە سەختی لە بەرانبەر یۆنانییەکان شکستی خوارد، لە کاتێکدا کەشتیگەلی هەخامەنشیی نەدەبووایە ئەو جەنگە بکات، چوونکە زۆر لاواز بوو، کەشتیگەلی هەخامەنشیی بە درێژایی ئەو ماوەیەی لەشکری خەشایار هاتە نێو خاکی یۆنان تا گەیشتنیان بە ئەسینا، بەردەوام تەریب بە لەشکری خەشایار و لە کەناری دەریاکان دەجووڵان، تا بەو ڕێگەیەوە لەمپەر بن لە دابەزاندنی هێزی یۆنانییان لە پشت لەشکری خەشایارەوە، هەروەها بەردەوام خۆراکیان دەگەیاندە لەشکری خەشایار.

دوای گەیشتنی خەشایاریش بە ئەسینا، کەشتیگەل خۆراك و پێداویستیی دەگەیاندە لەشکرەکەیان و نانخانەکانی ئەسیناش، بەهۆیەوە دەست بەکاربوونەوە، ئەگەر کەشتیگەلی هەخامەنشیی خۆراك و پێداویستیی نەگەیاندبایە لەشکرەکەیان، بە هۆی ئەوەی لەوێ خۆراك دەست نەدەکەوت، هەموو لەشکرەکە لە برسان دەمردن.

خەشایار بەر لەوەی بگاتە ئەسینا وای بیر دەکردەوە، لەوانەیە لەوێندەر ڕووبەڕووی بەرگری سەخت ببێتەوە، بۆیە ی ڕاسپارد تا لە ڕۆژئاوای ئاتیك هێز دابەزێنن، بەو ئاوایە یۆنانییان ناچار بکات لەگەڵ دوو بەرەدا شەڕ بکەن و زوو لەنێو بچن، ئەگەر سەرەنج بدەینە نەخشەی یۆنان، ئەو دەمە باشتر دەکارین لە مانۆڕی سەربازی خەشایار تێبگەین، دەمانبینی کە

خەشایار لە رۆژهەڵات و باکوورەوە لەپێشەنگیدا بوون، ئەگەر لە رۆژئاواش لەشکری دابەزیبایە، زۆر بە ئاسانی تەواوی هێزی بەرگریکاری یۆنان دەکەوتە نێوان دوو هێڵی جەنگ و لەنێو دەچوون، لە ڕووی تاکتیکەکانی جەنگەوە، ئەو تاکتیکە بۆ (٢٥٠٠) ساڵ گرینگ و سەرنجڕاکێش بوو، خەشایار گومانی هەبوو، کە یۆنانییەکان بزانن ئەو دەیەوێت لە رۆژئاوای ئاتیك هێز پیادە بکات، بۆ ئەو کردەیەش پێویستی بە کەشتیی و کەشتیگەل هەبوو بۆ گواستنەوەی لەشکرەکەی، کەشتییەکانیش دەبووایە بە نێزیك دوورگەی سالامیندا بڕۆن، وەك لە سەردەمی داریوشی یەکەم ئەنجام درا، هەروەك چۆن دوورگەی ئۆکیناوا دەروازەی ژاپۆن بوو لە دووەمین جەنگی جیهانیدا، بە هەمان شێوەش سالامیس دەروازەی ئاتیك بوو لە جەنگەکانی هەخامەنشیی و یۆنانییەکاندا.

سالامیس لە رۆژئاوای وڵاتی ئاتیك، پێگەی کەشتیگەلی یۆنان بوو، ئەوان بۆیە لەوێندەر گردبوونەوە، چوونکە ئازایەتی ڕووبەڕووبوونەوەیان نەبوو لەگەڵ هێزە دەریاییە بەهێزەکەی خەشایاردا، کاتێك خەشایار فەرمانیدا بەشێك لە هێزە دەریاییەکەی، گواستنەوەی سەربازەکانی بۆ رۆژئاوای ئاتیك لە ئەستۆ بگرێت، نیوەی کەشتیگەلی هەخامەنشیی لە رۆژهەڵاتی ئاتیك مایەوە، نیوەکەی دیکەی بۆ رۆژئاوای ئەو وڵاتە رۆیشتن، ئەمەش بووە مایەی لاوازبوونی هێزی دەریایی خەشایار، بە هۆی ئەو تاکتیکە جەنگییەی سالامیس ڕوویدا.

لە ڕاستیدا کەشتیگەلی یۆنان لە سالامیس خۆیان لە جەنگ بە دوور دەگرت، چوونکە دەیانزانی ئەگەر دووچاری جەنگ لەگەڵ کەشتیگەلی هەخامەنشیی بن لەنێو دەچن، بەڵام کاتێك کەشتییە هەخامەنشییەکان لە کەنارەکان نێزیك بوونەوە تا لەشکرەکەیان پیادە بکەن، بە بینینی ئەو لەشکرە لاوازە، ئازایەتیان بۆ گەڕایەوە و بڕیاری جەنگیاندا.

تیمۆستۆکێلی سەرۆکی کۆماری ئەسینا فەرماندەیی کەشتیگەلی یۆنانی لە ئەستۆ بوو، لە مێژووی یۆنان ئەو بە فەرماندەی گشتیی ئەو جەنگە ناسراوە، بەپێی زانیارییەکان ئەو دەریاوانێکی باش نەبوو، کەسێك کە بە واتای دنیای کۆن دەریاوان نەبووایە نەیدەتوانی فەرماندەیی جەنگێکی دەریایی بکات، چوونکە لە دەریا هەندێ پێداویستیی دێنە پێشێ، کە جیاوازن لە پێداویستییەکانی وشکانی، تەنانەت سەردارێکی دلێر و بەهۆش کە لە وشکانی

زۆر سەرکەوتنی بەدەستهێنا بێ، کاتێك دەبێتە فەرماندەی جەنگێکی دەریایی ناتوانێت بە ئەندازەی مەلەوانێکی ئاسایی کاریگەر و بە سوود بێت.

گومانمان نییە تیمۆستۆکیل تەنیا بەناو فەرماندەیی کەشتیگەلی یۆنانی لە جەنگی سالامیس لە ئەستۆ گرتووە، فەرماندەی کەشتیگەلی یۆنان لەو جەنگە ئەفسەرێکی یۆنانی بووە کە مێژوو ستەمی لێکردووە و ناوەکەی تۆمار نەکردووە.

ئەو ئەفسەرەی لە جەنگی سالامیس فەرماندەی کەشتیگەلی یۆنان بووە، ئەفسەرێك بووە شارەزا بە تاکتیکەکانی جەنگ و لە چاو تروکاندنێکدا توانی کەشتییە یۆنانییەکان، لەکاتێکدا لە پێگەی سەرەکیاندا سەرگەرمی پشوو بوون، بۆ جەنگ ئامادە بکات، لەوانەشە بە چاوەدێریکردن بۆی دەرکەوتبێ هێزی هەخامەنشیی نێزیك دەبێتەوە، گەیشتنی کەشتیگەلی هەخامەنشیی بۆ ئەو چاوەڕوان نەکراو نەبوو بێت، هەروەها ئاگەدار بووە ئەو هێزە لاوازە، تەنیا برێتییە لە نیوەی هەموو کەشتیگەلی هەخامەنشیی و دەتوانێت بە ئاسانی ئەو هێزە لەنێو ببات.

بۆ ئەوەی بزانین بۆچی هەخامەنشییەکان لە جەنگی دەریایی سالامیس شکستیان خوارد، پێویستە ئاماژە بەم خاڵانە بکەین:

یەکەم هۆکار ئەوە بوو کە ئەسینا بە ڕاستی وڵاتێکی دەریادار بوو، زۆر گرینگی بە هێزی دەریایی دەدا، دەتوانین بڵێین تەواوی بودجەی سەربازی ئەسینا بۆ هێزی دەریایی خەرج دەکرا، دۆخی ئەسینا لە دنیای کۆن، هاوشێوە بوو لەگەڵ دۆخی بەریتانیای بەر لە دووەمین جەنگی جیهانی و هیتلەر کە تەواوی دنیای شکستدا و نەیتوانی بەریتانیا شکست پێ بهێنێت، چوونکە بەریتانیا ئەو کات خودان هێزێکی گەورەی دەریایی بوو، ئەسیناش هەموو توانا سەربازییەکانی لە دەریاوانی دادەنا، لەو وڵاتەدا هەستی دەریاوانی چێ ببوو، لە هەندێ بنەماڵەکاندا کوڕ لە دوای باوك دەبوو بە دەریاوان و خۆبەختکردنیان لە پێناو ئەسینا بە ئەرك دەزانی.

دووەم هۆکار برێتی بوو لە ئەوەی ماوەی نێوان هەردوو جەنگدا، واتە یەکەمین جەنگی سالامیس، کە لە سەردەمی داریوشی یەکەم ڕوویدا، لە دووەمین جەنگی سالامیس، ئەندازیارێکی یۆنانی بە ناوی (ئاکریۆس) دەرکەوت، ئەو بەشەی ژێرەوەی کەشتییەکان کە لەژێر ئاو بوو، وەك دەمی خەنجەر تیژ و باریك دروست کرد، بەم هۆیەوە خێرایی و توانای

کەشتییە یۆنانییەکان زۆر زیاد بوو. هەردوو بابەت واتە توانا و خێرایی کەشتییە جەنگییەکان لە هۆکارە گرینگ و کاریگەرەکانی جەنگە دەریاییە کۆنەکان بوون. کەشتیی خێرا و سووك و بەردەست هەر کاتێك کە دەیانەویست جەنگی دەکرد، ئەگەر جەنگەکەیان بە سوودی خۆیان نەدیتبایە، بلەز لە مەیدان دوور دەکەوتنەوە.

لە جەنگی دەریایی سالامیس تەواوی کەشتییە یۆنانییەکان بەپێی ئەو نەخشەیەی ئاکریۆس دروست کرابوون، کەشتییەکانی خەشایاریش نە خێرایی و نە توانای کەشتییەکانی یۆنانیان نەبوو لە بەردەستبوون بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان، نالێین ئەوان ڕێڕەوەکانیان بە هۆی سووکانەوە دەگۆڕا، چوونکە سووکانیان نەبوو، کەشتیی جەنگی و بازرگانییەکانیان بە هۆی سەوڵەوە بۆ لای چەپ و ڕاست دەڕۆیشتن یاخۆ دەسوڕانەوە. لە جەنگی سالامیس کەشتییەکانی یۆنان وەك ئۆتۆمبێلی بچووك و کەشتییەکانی هەخامەنشیی وەك ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر بوون، وێڕای ئەوەش تا ئەو دەمە کەشتییە هەخامەنشییەکان بەیەکەوە بوون، یۆنانییەکان بوێرییان، نەبوو هێرش بکەنە سەریان، بەڵام کە بوونە دوو بەش، بوێرییان هاتەبەر و هێرشیان کرد.

سێیەم هۆکاری شکستی هەخامەنشیی لە جەنگی سالامیس ئەوە بوو، کە فەرماندەی کەشتیگەلی هەخامەنشیی کە ناوی (تارك) بوو، زانیاریی لەبارەی ئەو کەنداوە گەورەیە نەبوو، کە لە کەنارەکانی دوورگەی سالامیس بوو، لەو کەنداوە دوو ئاراستەی ئاو هەبوو، یەکیان لە باکوڕ بۆ باشوور، ئەویدیی لە باشوور بۆ باکوڕ بوو، کەشتییە یۆنانییەکان زانیارییان لەبارەی هەردوو جووڵەی ئاو هەبوو و سوودیان لێ وەرگرت، بەڵام تارك ئەو زانیارییانەی نەبوو.

چوارەم هۆکاری شکستی کەشتیگەلی هەخامەنشیی لە جەنگی سالامیس هەر ئەوە بوو کە وێرژیلی شاعیری ناسراو لە شیعرە بەناوبانگەکەی خۆی بەناوی (ئانائید) باسی کردووە و دەڵێت ئەسینایییەکان لە وڵاتی خۆیان دەجەنگان و دەریاوانەکانیان لە شوێنێك بوون کە هەموویان دەناسی و دەیانزانی بۆچی دەجەنگن.

پێنجەم هۆکاری شکست لە جەنگی سالامیس ئەوە بوو، کە هەخامەنشییەکان چاوەڕوان نەبوون کە کەشتیگەلی ئەسینا دەرکەوێت و هێرشیان بکاتەسەر، ئەوە بۆ ئەوان لەپڕ ڕوویدا،

دەبێت دان بەو ڕاستییە بنێن کە تارك وردبین نەبووە، ئەگەر نا دەبووایە هەموو کاتێك چاوەڕوانی هێرشی یۆنانییەکان بێت.

خەشایار فەرمانی بە تارك دابوو تا بەشێك لە لەشکری هەخامەنشیی ببات و لە ڕۆژئاوای وڵاتی ئاتیك پیادەیان بکات، بەڵام خەشایار سەردارێکی وشکانی بوو، تارك سەرداری دەریایی، دەبووایە تارك کە سەردارێکی دەریایی بوو، مەترسییەکانی دابەشبوونی کەشتیگەلی بۆ خەشایار ڕوون بکاتەوە و تێی بگەیەنێت کە ئەو بابەتە مەترسیدارە، بەڵام ئەو بە پاشای نەوت.

ئایا تارك دەیزانی کە نابێت بە هێزێکی دەریایی لاواز بەرەو ڕۆژئاوای ئەسینا بچێت و لە ترسی خەشایار باسی نەکردووە؟ لەوانەیە وابوو بێت، چوونکە خەشایار و بە گشتیی پاشاکانی پێش ئەو (کوروش، کەمبۆجیە و داریوشی یەکەم) لە جەنگدا زۆر تووندبوون، کاتێك فەرمانیان دەدا، دەبووایە جێبەجێ بکرێت، لەوانەیە تارك ترسا بێت، کە بە پاشا بڵێت ئەوە مەترسیدارە کە نابێت بە کەشتیگەلی لاوازەوە بچێتە ڕۆژئاوای ئاتیك.

بە گشتیی بەرپرسیارییەتیی تێکەوتنی کەشتیگەلی هەخامەنشیی لە سالامیس دەکەوێتە ئەستۆی تارك، بەڵام هەر ئەو فەرماندەیە و ئەفسەر و سەربازەکانی کاتێك بینیان لە هەمبەر هێزێکی دەریایی بەهێزن و توانای کەشتیگەلی یۆنانییەکان لە هی ئەوان پترە ، هێندە بە دلێری جەنگان، تەنانەت هیرۆدۆت لە چەند شوێنێك نووسیویەتی کە هەخامەنشییەکان لە شەڕی سالامیس ئازایانە جەنگان، هیرۆدۆت زۆر بە کەمی بەرانبەر ئێرانییەکان ڕاستبین بووە، ئەوە دەگمەنە شتەکان وەك چۆن ڕوویانداوە ئاوا باسیان بکات.

کاتی نیوەڕۆ بوو هەردوو کەشتیگەل لە یەکدیی نێزیك بوونەوە، مێژوونووسان ژمارەی کەشتییە هەخامەنشییەکان بە چوار سەد کەشتیی دەنووسن، کە بێگومان زیادەڕۆیی تێدایە، ژمارەی کەشتییەکانی یۆنانیش بە سێ سەد، هەندێ مێژوونووسانیش بە دوو سەد کەشتیی دەست نیشانیان دەکەن.

هیرۆدۆت بە ئەنقەست لە تەواوی ڕووبەڕووبوونەوەکاندا ژمارەی هەخامەنشییەکانی زیاد نووسیوە و دەڵێت لەو جەنگەدا کەشتیگەلی یۆنان دوو سەد کەشتیی پتریان نەبووە، بەڵام ئەگەر هەخامەنشییەکان چوار سەد کەشتییان هەبووایە شکستیان نەدەخوارد.

سەرهەنگ (گۆردۆنی) بەریتانی دەڵێت ژمارەی کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی لە جەنگی دەریایی سالامیس دوو سەد کەشتیی بووە، ئەو ژمارەیە لێکدانەوەیەکی ئەقڵانییە.

لە یەکەم بینیندا تارکی فەرماندە، تەواوی کەشتییە یۆنانییەکانی نەدیت، چوونکە هەڵکەوتەی زەوی دوورگەکە بە شێوەیەك بوو، کە هەندێك لە کەشتییەکانی ئەسینای دەشاردەوە، هەر ئەم هۆکارەش وایکرد تارك نەکارێت، تەواوی کەشتییەکان ببینێت.

ئەگەر نەخشەی وڵاتی یۆنانت لەبەردەستدا بێت، لە کاتی خوێندنەوەی جەنگی سالامیس، تەماشای ئەو دوورگەیە بکەیت، کە لە رۆژئاوای ئەسینا لە کەنداوی گەورەیە، تێگەیشتنی ئەو بابەتە ساناتر دەبێت، دەبێ ئەوەش بڵێین لە نێوان سالامیس و رۆژئاوای وڵاتی ئاتیك دا، گەروویەك هەیە، هەخامەنشییەکان ناچار بوون بۆ دابەزاندنی هێز لە کەنارەکانی ئاتیك لەوێوە تێپەڕ بن، چوونکە گوزەرێکی دیکەیان نەبوو، ئەوە بوو جەنگ لەو گەرووە ڕوویدا، کەنارەکانی دوورگەی سالامیس لەو گەرووە نارێکە رۆچوون و دەرکەوتنی زۆری هەیە، دۆخی ئەو شوێنە وایکرد لەبەر ئاییدا تارك، تەنیا چەند کەشتییەکی یۆنانی ببینێت، چوونکە کەشتیگەلی خۆی بەلاوە بە هێز بوو، لەگەڵ هەموو ئەو دۆخەشدا ئازایانە بەرەو ڕووی کەشتییە یۆنانییەکان چوو، بەڵام شەپۆلی ئاوی کەنارەکان لە باکورەوە بۆ باشوور دەهات، لەکاتێکیشدا ئاراستە و جووڵەی کەشتیگەلی هەخامەنشیی بە پێچەوانەی ئاراستەی ئاو دەڕۆیشتن، ئەمەش خێرایی هێواش دەکردووە. لەو کاتانەدا ئەوانەی فەرماندەیی سەوڵلێدەرانیش لە ئەستۆیە بەسەریاندا هاوار دەکەن، کە خێراتر سەوڵ لێدەن، سەوڵلێدەرانیش تەواوی هێزی خۆیان بۆ ئەو مەبەستە دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی کەشتییەکە خێراتر بڕوات، هاوکات هەموویان پێکەوە و بە یەك ئاواز هەندێ وشەیان بۆ هاندانی خۆیان دەوتەوە، کەواتە ئاراستە و جووڵەی ئاوی دەریا ئاستەنگ بوو، کە نەکارن بەخێرایی پێویست بەرەو پێشڤە بچن، بۆ ئەوەی کەشتییە یۆنانییەکان بگەن، بەڵام کەشتییە یۆنانییەکان سووك و بلەبوون، جووڵەی ئاویش هاوئاراستەی ئەوان بوو، سوودیان لە ڕێڕەوی ئاو وەردەگرت، بۆیە زۆر بە خێرایی لە دوژمن نێزیك دەبوونەوە، بە تێپەڕبوونی کات ژمارەی ئەوان لەبەر چاوی تارك زیاد دەبوو، تا گەیشتە ئەوەی تەواوی گەرووەکە بە کەشتگەلی یۆنانی داپۆشرا، ئەو کەشتییانەی نێزیك کەنارەکان دەڕۆیشتن بە سوود وەرگرتن لە جووڵەی ئاوەکە خێراتر دەڕۆیشتن، تیمیستۆکیل فەرماندەی یۆنانییەکان فەرمانی کرد پێویستە خێرایی هەمووان وەك یەك بێت،

بۆ ئەوەی هەمووان پێکەوە بگەنە کەشتییە هەخامەنشییەکان، تارك کاتێك زانی کەشتیگەلی بەرانبەر لە هی ئەو بەهێزترە، بە پێویستی زانی پاشەکشە بکات، بەڵام لە بەردوو هۆ پاشەکشەی نەکرد:

یەکەم: خۆی و ئەفسەر و سەربازەکانی لە پیاوانی دلێر بوون و لە مردن نەدەترسان، دەیانتوانی بێ ترس و سڵەمینەوە بەرەو ڕووی دوژمن بڕۆن.

دووەم: کەشتیگەلی ئەسینا خێراتر بوون، تەنانەت ئەگەر پاشەکشەشیان بکردایە، بە زوویی پێیان دەگەیشتن و جەنگەکەش هەر ڕوویدەدا.

فەرماندە هەرچەندە دلێر بێت، پێویستە بەرژەوەندیی هێزەکانی خۆی بەهەند وەربگریت، تارك لەو دەمەدا، نە تەنیا دەریاوانەکانی خۆی لەگەڵدا بوون، بگرە بەشێك لە هێزی خەشایاریشی دەگواستەوە بۆ ڕۆژئاوای ئاتیك تا پیادەیان بکات، ئەرکی تارك ڕزگارکردنی ئەو سەربازانە بوو، کە لەگەڵیدا بوون، بەڵام کاتێك بە هێزی دوژمنی زانی، ئەو دەمە دەرفەت نەمابوو، ناچار بوو جەنگی پێ باشتر بێت، بۆیە بە فەرماندەی کەشتییەکانی ڕاگەیاند سەربازەکان بۆ جەنگ ئامادە بکەن.

ئەو کارانەی لەسەر ڕووی کەشتییەکان ئەنجامدران، هەروەك ئەو کارانە بوون، کە بۆ ئامادەکاری یەکەمین جەنگی سالامیس ئەنجامدرا، بۆ نموونە هەندێ چەویان لەسەر ڕووی کەشتییەکان پەرشوبڵاو کرد، تا لە کاتی شەڕدا و دوای ڕژانی خوێن، جەنگاوەران لەسەر خوێنەکان خلیسك نەبەن و نەکەون، سەتڵی گەورەیان بەردەست کرد، بۆ ئەوەی ئەگەر ئاگرکەوتەوە بلەز بیکوژێننەوە، لەوانە بوو کەشتییە یۆنانییەکان ئاگریان بۆ ئەوان هەڵدابووایە، هەروەسا لە کۆگەکانی کەشتییەکانیش تەواوی ئەو هەتوانانەی هەیانبوو بەردەستیان کردن بۆ تیمارکردنی بریندااران.

شێوازی جەنگ وابوو، کە دوو کەشتیی ئامادە بۆ جەنگ، ئەوا بە تەواوی هێزەوە خۆیان بەیەك دەکێشا، ئەو بەریەك کەوتنەیان هێندە توندبوو، کە لە ئاکامدا یەکیان یاخۆ هەردوو کەشتیی دەشکان و ئاوی دەریا هروژمی دەبردە نێو کەشتییەکان لەو دۆخەشدا هەردوو کەشتی نغرۆ یاخۆ نقووم دەبوون، ئەمەش وایکرد سەرەتا کەشتییەکان بەئاوایەك چێ بکرێن، کە ڕووی پێشەوەیان لووتێکی باریکیان هەبێت، کە لە دار چێ دەکران، دواتریش لە شێوەی قەڵەنگی، کاتێك دوو لووتی قەڵەنگی، دوو کەشتیی بەریەك دەکەوتن، دەنگی بەریەك کەوتنەکە، میناکی دەنگی تۆپ وابوو، پاشان سەربازانی هەردوو لای شەڕکەر، چەنگاڵی بەستراویان بە

زنجیری ئەستوور بۆ لای یەکدیی دەهاویشت، بۆ ئەوەی لە دیوارەی کەشتییەکان گیر بن، تا یەکدیی بگرن، دواتر دەیان سەرباز لەنێو کەشتییەکانەوە زنجیرەکانیان ڕادەکێشا، بۆ ئەوەی کەشتییەکان بکەونە تەنیشت یەکدی، ئەو کارەش بۆ ئەوە بوو، تا سەربازان بکارن بگەنە سەر کەشتیی سەربازانی دوژمن و بیانکوژن.

لە یەکەم دەمژێری جەنگ و کاتی بەریەك کەوتنی کەشتییەکان، چەند کەشتییەکی ئێرانی بە هۆی بەرکەوتنیان، بە کەشتییە یۆنانییەکان شکان و ئاو هروژمی هێنا بۆ نێو کەشتییەکە، هۆی درزبردنی کەشتییەکانی هەخامەنشی دەگەڕایەوە بۆ خێرایی زۆری کەشتییە یۆنانییەکان و پتەویان، ئاگریۆس ئەندازیاری یۆنانی نەتەنیا ئەو بەشەی کەشتیی، کە دەکەوتە نێو ئاو، بەئاوایەك چێکرد بوون، دەبووە مایەی ئەوەی خێراییەکەی زیاد بکات، بگرە کەشتییەکانی زۆر بەرز کردبوون، تەنیا بەشی پێشەوەی کەشتییە هەخامەنشییەکان پتەوبوو، کە لووتی کەشتیی لێبوو، گرینگی پێ درابوو، کەچی بەشەکانی دیکەی کەشتیی بایەخی پێ نەدەدرا، بەڵام ئاگریۆس دەیزانی ئەگەر کەشتی پتەو نەبێت لە کاتی بەر یەك کەوتندا، لەوانەیە تەنیشتەکانی، تەنانەت پشتەوەشی تێك بشکێت، بۆیە هەموو بەشەکانی زۆر بە پتەوی نەخشەکێشا بوو.

ئەوەی ئاگریۆس سەبارەت بە کەشتییە جەنگییەکان کردی، هەمان ئەوەیە ڕاهێنەران لە پاڵەوانێتییەکان لە وەرزشکارانی دەخوازن، سەبارەت بە گرینگیدان بە بەهێزی و پتەوکردنی تەواوی جەستەیان، چوونکە دوای٢٥٠٠ساڵ ڕاهێنەرانی گۆڕەپان و مەیدان بۆیان دەرکەوتووە، کە تەنیا بە ڕاکردنی بەردەوام، قارەمانییەتی بەردەست نابێت، بگرە پێویستی بەپتەوبوون و بەهێزکردنی تەواوی بەشەکانی جەستەیە، ئاگریۆسیش لە کارگەکانی کەشتیسازیدا بایەخی تەواوی بەهەموو بەشەکانی کەشتیی دەدا، بۆ ئەوەی لە کاتی بەریەك کەوتندا، نەتەنیا پێشەوە و پشتەوە، بگرە تەنیشتەکانیشی نەشکێن.

هەڵبەتە لە یەکەمین دەمژمێری جەنگدا، ژمارەیەك لە کەشتییەکانی هەخامەنشیی بە هۆی بەریەك کەوتنیان بە شێوەیەك شکان، کە ئاو چووە نێو کەشتییەکان و نووقمی ژێر ئاوبوون، ئەمە وایکرد ناچار بن ژمارەیەك لە سەربازان بگوازنەوە نێو کەشتییەکانی دیکە، تەنانەت هەندێکیان کەوتنە نێو دەریاوە، ئەوانەی مەلەیان دەزانی بە خێرایی مەلەیان دەکرد تا خۆیان بگەیەننە سەر کەشتییەکی دیکەی ئێرانی، بەڵام ئەوانەی مەلەیان نەدەزانی هەر زوو

نقووم دەبوون، تیرهاوێژە یۆنانییەکانیش لەسەر کەشتییەکانیانەوە، ئەوانیان تیرباران دەکرد، کە کەوتبوونە نێو ئاوەوە، ئەو تێکشکانەی بەر کەشتییەکانی هەخامەنشیی کەوتن، یەکەمین گورزی کوشندە بوو، کە بەر هێزی کەشتیگەلی تارك کەوت، سەر ڕووی کەشتییەکان ببوونە گۆڕەپانێك بەشێوەیەك ئاپۆرەی سەربازانی هەردوولا تێهالاّ ببوون، کە بستێك شوێنی بەتالاّیی نەما بۆوە، لەو گۆڕەپانانەدا سەدان دەست دەجوولاّن تەور، تیر، گورز، نێزە و شمشێریان دەوەشاند، لەوی ڕۆژان ئەوی هیچ بایەخی نەبوو، گیانی مرۆڤان بوو، سات ناساتێك دەستێك دەپەڕا، یاخۆ تەورێك قاچێکی دەپەڕاند، تەوری دەستی سەربازەکان جیاواز بوون، لە تەوری داربڕین دەمەکەی زۆر پانتر و تیژتر بوو، بە یەك لێدانی تووند، ڕانی مرۆڤێك لە جەستەی جیا دەکرایەوە، ئەگەر کەسێك بۆ چرکەیەك دەرفەتی هەبووایە یاخۆ تەماشای دەوروبەری بکردایە، لاشەی کوژراوێکی دوژمنی دەخستە نێو ئاو تا جێگە ببێتەوە و ئاپۆرەکە کەمتر ببێتەوە.

پانتایی مەیدانی شەڕ برێتی بوو لە نێزیکەی هەموو گەڕووی سالامیس، لایەکی کەشتییەکان گەیشتبوونە کەنارەکانی ولاّتی ئاتیك، لایەکەی دیکەش گەیشتبۆوە دوورگەی سالامیس، مەیدانی جەنگ زۆر گەورە نەبوو، لە تەواوی جەنگە دەریاییەکانی کۆندا، مەیدانی جەنگ گەورە دەبوو، سەرکردەی هێزەکان نەیاندەتوانی لە باکوڕ بۆ باشوور یاخۆ لە ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلاّت یەك بە یەکی کەشتییەکانیان ببینن، بەتایبەتی لەو کاتانەی کەشتییەکان دووکەلّیان چێ دەکرد تا لە یەك ون بن، بەلاّم ئەو ڕۆژە هیچ دووکەلّێك نەبوو، هەمووان دیار بوون. بۆیە تارك و تیمیستۆکیل نەیاندەتوانی تەواوی مەیدانی جەنگ ببینن، بەردەوام فەرماندەکان دەبووایە لە مەیدانی جەنگەوە لەملاوە بۆ لایەکەی دی لە جوولّە بن، تا ئاگەداری تەواوی مەیدانەکە بن و بزانن کامە لە کەشتییەکانیان لە خراپترین دۆخدایە و پێویستی بە یارمەتی هەیە، فریای بکەون.

لە هەموو کەشتییەکان دەنگی نالّە و نەعرەتەی سەربازان دەهات و ئەوانەی زەربەیان دەوەشاند، نەعرەتەیان دەدا و ئەوانەی بەریان دەکەوت، هاواریان دەکرد. ئەگەر سەربازێك خلیسکابووایە و کەوتبایە سەر زەوی، بێ گومان نەیدەتوانی هەستێتەوە و زەربەی تەور سینگ یا پشت یا سەری دەگرتەوە یا شمشێر ملی دەپەڕاند و خوێنەکەی دەرژایە سەر ئەو خوێنانەی لەسەر کەشتییەکە ڕژابوون.

هەندێك كات لە كەشتییەكەوە بۆ ئەوی دیكە ئاگر هەڵدەدرا، سەرنشینانی كەشتییەكە هەوڵیان دەدا، ئاگرەكە بكوژێننەوە، ئەو دەمە پەمپی ئاو دانەهێندرابوو، ئاگر بە ئاوی نێو سەتڵەكان دەكوژێندرایەوە، بەڵام ئەگەر دوژمن هەوڵی دابووایە ئاگرەكە گەورەتر بكات، ئەو كەسانەیان دەدایە بەر تیر، كە خەریكی كوژاندنەوەی ئاگرەكە بوون، تا نەكارن ئاگرەكە بكوژێننەوە، كەشتییەكان لە دار چێكرابوون، بۆیە ئەگەر ئاگرەكە گەورە بووبایە، ئەوا سەرنشینەكانی كەشتییەكە بۆ ئەوەی نەسوتێن، دەبووایە خۆیان بخەنە نێو ئاو، ئەو كەشتییەی كە ئاگریشی هەڵدابوو بۆ نێوی كەشتی دوژمن، بلەز چەنگاڵەكانی دەكردەوە و دوور دەكەوتەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش نەسوتێن.

ئەو دەمەی هەمووان لە ترسی ئاگر خۆیان دەخستە نێو ئاوەوە هاواری سەوڵلێدەرە بەدبەختەكان بەرەو ئاسمان دەهات، پێش دەست پێكردنی هەر جەنگێك بۆ ئەوەی رێگە لە یاخیبوونی سەوڵلێدەرەان بگرن، لاقیان بە زنجیر دەبەستنەوە، بۆیە لەكاتی ئاگركەوتنەوە لە ترسی سووتانیان بە زیندوویی، بە هەموو تواناوە هاواریان دەكرد و داوای یارمەتییان دەكرد، بەڵام هیچ كەس وەدەنگییانەوە نەدەچوو، لەبەر ئازاری سووتانیش، پتر هاواریان دەكرد، دواجار هەموویان بە هۆی ئاگرەوە یاخۆ نقوومبوونی كەشتییەكە دەمردن.

سەربازە یۆنانییەكانی نێو كەشتییەكان، هەموویان كاسكێتیان لەسەر و زرێیان لەبەر بوو، لە كاتێكدا كە سەربازە هەخامەنشییەكان بە بێ كاسكێت و زرێ دەجەنگان. خۆ بە دوورگرتنی ئەوان بۆ كەم خەرجی نەبوو، لەبەر قورسی ئەو كەرەستانە و ڕانەهاتنیان لەگەڵیاندا بوو، پێیان وابوو چالاكی و جووڵەیان بەو كەلوپەلانەوە كەمتر دەبێتەوە.

ئەو رۆژە دوای ئەوەی ماوەیەك بەسەر نیوەڕۆدا تێپەڕ بوو، هەوا گەرم ببوو، ئەو بایە فێنكەی بە سەر دەریادا دەشنایەوە، نەیدەتوانی گۆڕانكاریی لە هەوای گەرمدا بكات، سەربازە یۆنانییەكان ئارەقەیان لێ دەچۆڕایەوە، بەڵام كاسكێت و زرێكانیان بۆ بەرگریكردن باش بوون، بەشێك لە پەلامارەكانی سەربازانی هەخامەنشیی كە بەریان دەكەوت، بێ كاریگەریی دەبوو.

لە جەنگی دەریایی سالامیس هەروەك جەنگە كۆنە دەریاییەكانی دیكە، باشترین تاكتیك لەو جەنگەدا ئەوە بوو، كە چەندان كەشتیی بەرەیەك پێكەوە هێرش بكەنە سەر یەك كەشتیی دوژمن و بلەز ئەوەی لە سەرباز و ئەفسەر لەنێویدا هەیە بیانكوژن یاخۆ بە دیلیان بگرن،

تەنیا سەوڵلێدەران لەنێو کەشتییەکاندا بمێننەوە، ئەوان وێڕای ئەوەی مرۆڤ بوون، بەڵام وەك بزووێنەری بێ گیان، هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو، بەردەوام لەژێر فەرمانی ئەو کەسەدا بوون، کە فەرماندەیی کەشتییەکەی بەدەست بوو، ئەوان تەنیا سەوڵیان لێ دەدا و کەشتییەکەیان دەجووڵاند.

سەوڵلێدەران دەیانزانی ئەگەر پێچەوانەی ویستی فەرماندەکانی کەشتیی بجولاێنەوە، هێندەیان لێ دەدرێت تا دەمردن، ئەوەش بۆ ئەوەبوو کەسیان یاخی نەبن. ئەوان چەندان هەزار ساڵە بە کاری توند و بێ بەزەییانە ساتوسەوداییان لەگەڵدا دەکرێت، تەنانەت ئەو کاتەی کەشتی چارۆکەداریش هاتەکایەوە، کاریگەریی ئەوان هەر وەك خۆی مایەوە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمیش کاتێك ماتۆڕ سەریهەڵدا، بۆ جووڵەی کەشتییەکان سەوڵلێدان هەر پێویست بوو، تەنیا دوای دۆزینەوەی هێزی هەڵم، ڤێجا سەوڵلێدەران لە کارە توندەکانیان ڕزگاریان بوو، ئەو کەسەی یەکەم ماتۆڕی هەڵمی کەشتییەکانی داهێنا، توانی ببێتە ڕزگارکەری هەموو سەوڵلێدەران، بە تێپەڕبوونی کات ژمارەی کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی کەم دەبوونەوە، هەرچەندە کەشتییەکانی یۆنانی بەهێز و پتەوتر بوون لە کەشتییەکانی هەخامەنشیی، تەنانەت لە ڕووی ژمارەش هەر پتر بوون، بەڵام یۆنانییەکان خۆیان پشتڕاستیان کردۆتەوە، کە ئەوی ڕۆژان نەتەنیا کەشتییەکانی هەخامەنشیی، بگرە سەربازەکانیش داوای پارێزراو بوونیان نەکردووە و خۆیان بەدەستەوە نەداوە، تا ئەو دەمەی بەهۆی سەختی برینەکانیانەوە دەمردن یاخۆ نەیان دەتوانی چیدیی بجەنگن لەو جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی هەخامەنشییان دیل کران، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان دەبێژن هیچ سەربازێك دەستگیر نەکراوە بەبریندار نەبێت، واتە هەموو دیلەکان بە برینداری دەستگیر کراون، ئەوەش بۆ مێژووی ئێران بە سەروەری و سەربەرزییەکی دیکە تۆمار دەکرێت.

گومان لە شکستی کەشتیگەلی هەخامەنشیی لە جەنگی سالامیس نییە، بەڵام کاتێك ئێرانییەکان خۆیان لە بەردەم لەنێوچووندا بینی، ورەیان بەرنەدا، هێندە خۆڕاگریان کرد تا هەموویان کوژران، یۆنانییەکان لاشەکانیان خستنە دەریاوە، لەنێو ئەو سەربازانەش کە بە زیندوویی لەلایەن یۆنانییەکانەوە بە دیل گیران، هیچ سەربازێك نەبوو بریندار نەبێت.

تارك فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشیی تا ئەو دەمەی بەئومێدی سەرکەوتن بوو، وەك فەرماندەیەك ئەرکەکانی بەجێ دەگەیاند و خۆی لەبەر یەك کەوتنی کەشتییە یۆنانییەکان

دەپاراست، بەڵام دواتر بۆی ڕوون بۆوە، کە سەرکەوتوو نابن، ئیدی بڕیاریدا بەشدار ببێت لە جەنگ و فەرمانی بە فەرماندەی کەشتییەکەی کرد، تا بە توندی خۆی بە نێزیکترین کەشتیی یۆنانی بکێشێت، لەگەڵ بەریەك کەوتنی لووتی هەردوو کەشتیی، دەنگی ئەو بەریەك کەوتنە وەك تریشقەی هەور گەیشتە ئاسمان، لێ بەر لەوەی چەنگاڵەکان لە هەردوو کەشتییەوە هەڵبدرێن، بۆ ئەوەی کەشتییەکان بکەونە تەنیشت یەکدیی، تارك وەك پاڵەوانێك خۆی هەڵدا و چۆوە نێو کەشتییە یۆنانییەکە، ئەو شمشێرێکی درێژ و ڕاستی لە دەستدا بوو، کاتێك گەیشتە نێو کەشتیی دوژمن، چەند سەربازێکی یۆنانی پێشیان گرت، بەڵام ئەو توانی لە نێوانیانەوە تێپەڕ ببێت، پێش ئەوەی چەنگاڵەکان هەڵبدرێن، چەند سەربازێکی هەخامەنشیی بەدوایدا خۆیان هەڵدایە نێو کەشتییە یۆنانییەکە، تارك بۆ سەرکەوتن نەدەجەنگا، چوونکە ئەو وەك سەردارێك گومانی لە چۆنییەتی کۆتایی هاتنی جەنگ نەبوو، لەو کاتەدا تەنیا بۆ مردن دەجەنگا، بۆیە تارك لە هەوڵی ئەوەدا بوو وەك تەواوی ئەو ئەفسەر و سەربازانەی ئەو ڕۆژە کوژران، بمرێت.

کاتێك دوو کەشتییەکە بەریەك کەوتن، هەموو سەرنشینانی کەشتییە یۆنانییەکە زانیان ئەوە کەشتی فەرماندەی کەشتیگەلی دوژمنە، چوونکە کەشتییەکە هێمای تایبەتی هەبوو، دوای ئەوەی تارك چووە نێو کەشتییە یۆنانییەکە، هەموویان بۆیان دەرکەوت کە ئەوە فەرماندەی کەشتیگەلی هەخامەنشییە، چوونکە کاسکێت، ڕانبەند، لاقبەند، زرێ گرانبەها و درەوشاوەکانی پێناسە بوون بۆ پلەکەی، فەرماندەی کەشتییە یۆنانییەکە داوای لە سەربازەکانی کرد تارك بە زیندوویی بگرن، وتی ئەو پیاوە فەرماندەی کەشتیگەلی هەخامەنشییە، ئەگەر بە زیندوویی بیگرین لای تیمیستۆکیل و گەلی یۆنان شاناز دەبین.

لە ڕابردوودا جەنگە دەریاییەکان بە پێچەوانەی هەندێك لە جەنگە وشکانییەکان درێژخایەن نەبوون، ساڵانێك خەریکی چێکردنی کەشتیی دەبوون، سەوڵێدەریان دەستەبەر دەکرد، ئەفسەری دەریاوانییان پەروەردە دەکرد، ئاکامی چەند ساڵ ماندووبوون لە چەند کاتژمێرێك یەکلایی دەبۆوە، ئیدی هێزێك سەردەکەوت ئەوی دیکەش شکستی دەخوارد.

ئەو ڕۆژە هێزی دەریایی هەخامەنشیی شکستی خوارد، تارکی دەریاسالار خۆی بۆ مردن ئامادە کرد، بەڵام دەریاوانە یۆنانییەکە داوای لە سەربازەکانی کرد، تارك بە زیندوویی بگرن، ئەوانەی لێی نێزیك دەبوونەوە بۆ ئەوەی بە زیندوویی بیگرن، بە یەك وەشاندنی شمشێرەکەی دەکوژران. تارك لە کاتی شەڕ لەنێو کەشتییە یۆنانییەکەدا زۆر بە شکۆ بوو، بە وتەی ئاریانی

مێژوونووسی ناسراو، له سینگیدا هەتاو دەدرەوشایەوە، لەسەر ریشه درێژەکەیشی پرشنگی دەدایەوە، ئەو هەتاوەی لەسەر سینگی بوو، هەمان ڕووناکی هەتاو بوو، که له زریّ لووسەکەیدا دەبریسکایەوە. ئەفسەرە باڵاکانی هەخامەنشیی ئەوکات به ڕادەیەك زریّکانیان لووس دەکردنەوە، که وەك ئاوێنە تیشکەکانی هەتاویان دەدایەوە، پیشەوەرە ئێرانییەکان لەو کارە کارامە بوون، نەوەکانیان تا چەند سەدە بە لە ئێستە سینی زیو و زێڕیان لووس و جەلایی دەکرد، بە وتەی (تاوەرنییە) هێندە لەو کارەیان کارامە و لێهاتوو بوون، کاتێك لە سینیدا چاوت لە ڕووناکی هەتاو دەکرد، وەك ئەوە بوو، کە هەتاوەکە ببینن و ئاو لە چاویان دەهات.

لووس و جوانکردنی زریّ، تەنیا بۆ جوانی و شکۆ نەبوو، بە ئامرازێك بۆ بەرگری دادەنرا، لە ڕۆژدا ڕووناکی هەتاوی دەبریسکاندەوە و چاوی سەربازی بەرانبەری تێکدەدا و ڕێگر دەبوو لەوەی بکارێت بە وردی نیشانە بگرێت یاخۆ شمشێر و تیری خۆی ئامانجەکەی بپێکێت.

هەر کەسێك لە تارك نێزیك دەکەوتەوە دەکوژرا یاخۆ بریندار دەبوو، کاسکێت و زریّ و بەشەکانی دیکەی بەرگە سەربازییەکەی لە لێدانەکانی شمشێر و تەور دەیانپاراست، هێندە ئازایانە دەجەنگا، هەستی بەو گورزانە نەدەکرد بەری دەکەوتن یاخۆ برینی بچووکیان لە جەستەیدا چێ دەکرد، لەو جەنگە کۆنانەی بە شمشێر و گورز و تەور و...هتد دەکران، کەسێکی ئازا و خۆنەپارێز، بەختی ئەوەی هەبوو لە سەرکەوتن نێزیك ببێتەوە، ئەگەر سەریش نەکەوتبایە، پێش مردن ژمارەیەکی زۆر لە دوژمنی دەکوشت یاخۆ برینداری دەکردن، لەو شەڕەدا تارك کەسێك بوو کە شتێکی پێچەوانەی ویستی خۆی بەسەردا نەدەدرا، ئەگەر کوژرابووایە، بەو ئاواتە دەگەیشت کە بۆی دەجەنگا، ئەگەر نەکوژرا بووایە بە پێچەوانەوە بوو، بۆیە ژمارەیەکی زۆر سەربازی دوژمنی لە تۆڵەی هاونیشتمانییەکانی خۆی دەکوشت.

دوو کەشتی دیکە لە کەشتییە جەنگییەکانی یۆنان، لە کەشتییەکەی تارك دەریاسالاری هەخامەنشیی نێزیك بوونەوە، سەربازەکان لە هەردوو کەشتییەکانەوە چوونە نێو ئەو کەشتییەی تارك تیایدا بوو، ئەو کەشتییەی تارك لێیەوە خۆی هەڵدایە نێو کەشتییە یۆنانییەکە. سەربازە هەخامەنشییەکان چیدیکە نەیاندەتوانی بچن، بۆ نێو کەشتییە یۆنانییەکە بۆ یارمەتیدانی تارك، بۆیە ئەو بە تەنیا دەجەنگا.

تارك ئەو ڕۆژە توانای هەبوو لەگەڵ هەموو سەربازانی یۆنانی سەر ئەو کەشتییە و کەشتییەکانی دیکەش کە هاتبوون بۆ ناو ئەو کەشتییە بجەنگێت، ئەو بە بەردەوام پتر لە پێنج

یاخۆ شەش شمشێر و چەکی دیکەی لە بەرانبەر بوو، بۆ ئەوەی لە پشتەوە گورزی بەر نەکەوێت، بەردەوام خۆی هەڵدەدا و شوێنی خۆی دەگۆڕی، بە تێپەڕ بوونی کات بریسکانەوەی زرێکەی کەمتر دەبۆوە، دواجار بە یەکجاری نەما، چوونکە خوێن سینگ و سکی داپۆشی.

ئەگەر بۆ ساتێك لە جیهانی بیرکردنەوە گۆڕەپانی ئەو کەشتییە یۆنانییە بێنینە بەرچاو، تارك بە پرچی لوول و درێژ، بە ڕیشی پان و درێژ، باڵای بەرزی ئاریایی، چوارشانە وەك خوداوەندکانی نێو ئەفسانەکان وابوو، دەمان بینی، لە دەوروبەری ئەو پیاوانی کورتە باڵا و ڕدێن تاشراو، وەك چەند کوێرێك دەهاتنە بەرچاو هەوڵیان دەدا ئەو خوداوەندە باڵابەرزە بکوژن، هەندێ کاتان لە دەمی ئەو کەڵەپیاوە لەخۆبوردەیە، دەنگێك دەردەچوو، کە بە سەر ئاوی دەریاوە دەگەیشتە گوێی کەشتییەکانی دیکەیش، کە سەرگەرمی جەنگ بوون.

تارك هێندەی سەربازان کوشت، کە دەریاوانی یۆنانی لە فەرمانی دەستگیرکردنی ئەو بە زیندوویی ژێووان بۆوە، هەر بۆیە فەرمانی کرد، تا دەست بەجێ بیکوژن، لە ماوەی کەمتر لە یەك خولەك لە دەرچوونی ئەو فەرمانە، کەوانچییەکان ڕووخساری تارکیان کردە ئامانج و تیربارانیان کرد، ڕووخساری تارك ڕووپۆشی نەبوو، بۆیە ئەوان بەتیر لەویان دەدا.

دوای ئەوە بە وتەی ئاریان، پاڵەوانی ئێرانی چیدیکە نەیتوانی لە شەڕکردن بەردەوام بێت، بەتەواوی شەکەتت ببوو، کەوتەسەر گۆڕەپانی کەشتییەکە، چەند سەربازێك کە بە دەستی ئەو بریندار ببوون لە ڕقی خۆیان، گورزی توندیان لە ڕووخسار و دەست و قاچی دەدا، قۆڵ و باسکیان قرتاند، دەریاوانە یۆنانییەکە فەرمانی کرد واز لە کوشتنی تارك بێنن، بەڵام کاتێك فەرمانەکە دەرچوو، ئیتر درەنگ بوو، تارك دوو دەست و قاچێکی لێ ببۆوە، چەند تیرێك بە ڕووخسارییەوە بوو، ئەو بەو شێوەیە گیانی سپارد. یۆنانییەکان لاشەی تارکیان گواستەوە بۆ وشکانی و فەرماندەی هێزی دەریایی ئەسینا فەرمانیدا لاشەکەی بنێژن.

دەگوترێت کاتێك لاشەی تارك بردرایە لای تیمیستۆکیل، فەرمانی کرد، وەك شەڕڤانانی دیکە فڕێی بدەنە نێو دەریا، بەڵام سەردارێك بە ناوی (ئاریس تید) کە بەشداری شەڕی سالامیس بوو، داوای کرد ئەو کارە نەکەن، وتی پێویستە ئەو بنێژرێت. ئاریس تید پیاوێکی ئازا و ڕاشکاو بوو، پێش هێرشی خەشایار، بە فەرمانی تیمیستۆکیل و ڕەزامەندی پەرلەمانی یۆنان، لە وڵات دوورخرابۆوە، کاتی هاتنی لەشکری خەشایار، سەرۆك کۆماری ئەسینا بۆ یەکخستنەوەی تەواوی هێزەکانیان فەرمانی کرد ئاریس تید بێتەوە و پلە و پایەی پێشووی بۆ

گەڕێندرایەوە، ئەو لە شەڕی سالامیس فەرماندەی هەموو یاخۆ بەشێك لە سەربازانی یۆنانی بوو، کە لە کەشتییەکاندا دەجەنگان. هەندێ کەس دەڵێن وتەیەکی بەناوبانگ هەیە، کە هی ئاریس تید بووە، هەرچەندە هەندێکی دیکەش دەڵێن هی (کاتۆری) رۆمییە کە لە (٢٣٤ تا ١٤٩ پ. ز) ژیاوە، ئەندامی ئەنجومەنی سیناتورەکانی رۆم و بە وتەی رۆمە کۆنەکان، سانسۆر بووە، سانسۆرەکان لە رۆمی کۆندا، هەم سەرژمێریان کردووە، هەمیش کاری تاپۆیان لە ئەستۆ گرتووە، کە چ شتێك هی چ کەسێکە، دەڵێن دواتر کاتۆری لە رۆمەکان دەتۆرێت و دەڕوات کە دەڵێت: "ئەی وڵاتی بێ ئەمەك، بۆ سزای تۆ هەر هێندە بەسە، کە ئێسکەکانم لە خاکی تۆدا نانێژرێت."، بەڵام هەندێ کەس پێیان وایە ئەو وتەیە هی ئاریس تیدە، ئەگەر کاتۆریش ئەو وتەیەی وتبێت لە ئاریس تیدی وەرگرتووە، لەو کاتەوە ئەو بێژەیە بە داڕشتنەوەی جۆراوجۆر و بە هەمان واتا لەلایەن زۆر کەسانی دیار دەوترێتەوە.

ناپلیۆنی یەکەم ئیمپراتۆری فەرنساش کاتێك لە دوورگەی سێنت هێلێن بوو، ئەو بێژەیەی وتووە، دواتر لەبەر خاتری کوڕەکەی کە دەبووایە بگاتە دەسەڵات، زانی کە پێویستە بەرانبەر فەرنسا خۆشەویستی دەرببڕێت و بڵێت ئارەزوو دەکات لاشەکەی لە فەرنسا لە کەناری ڕووباری سێن بنێژرێت، هەروەهاش بوو، لاشەی ئەویان لە سێنت هێلێن گواستەوە بۆ فەرنسا.

ناپلیۆنی دووەم، کوڕی ناپلیۆنی یەکەمیش کە لە کۆشکی خۆیان لە وڵاتی ئوتریش دەژیا، ئەو بێژەیەی کردە وێردی سەر زمان، بەڵام لاشەی ئەویان بە فەرمانی هیتلەر لە ساڵی (١٩٤٠ ز) گەڕاندەوە بۆ پاریس و لە تەنیشت گۆڕی باوکی ناشتیان، هیتلەر بەو هەنگاوەی ویستی خۆی لەلای فەرنسییەکان خۆشەویست بکات.

# گەڕانەوەی خەشایار شا

مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە کە لە چوار سەد کەشتیی هەخامەنشیی کە لە جەنگی سالامیس بەشدار بوون، تەنیا بیست و پێنج کەشتیی توانیان بە سوود وەرگرتن لە تاریکی و هاتنی شەو خۆیان دەرباز بکەن، بۆیە کەشتییەکانی دیکە یان نقووم بوون یان کەوتنە دەست یۆنانییەکان.

چوارسەد کەشتی زێدەڕۆیی تێدایە، ئێرانییەکان بەلایەنی زۆرەوە دوو سەد کەشتییان هەبووە، بەڵام ناکارین دان نەنێین بەوەی، خەشایار لە وشکانی سەرکەوتوو بوو، لە دەریا شکستی خوارد، ئەو شکستە کاریگەریی لەسەر بازرگانی رۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانە هەبوو.

وەك دەزانرێت هۆکاری سەرەکیی جەنگەکانی هەخامەنشیی و یۆنانییەکان، بازرگانی و ئابووری بووە. یۆنانییەکان لە (٢٥٠٠) ساڵ پێش ئێستە، هەر وەك ئێستە زۆر پێوەستبوون بە بازرگانی کردنەوە، تەنانەت ئێستەش لە تەواوی دەریای مەدیتەرانە هیچ وڵاتێك نییە، بەبارتەقای یۆنان کەشتیی بازرگانی هەبێت، مەزنترین دامەزراوەکانی کەشتیوانی لەو دەریایە هی یۆنانییەکانە، خاکی یۆنان نەیتوانی بە تەواوەتی پێداویستییەکانی ژیانی یۆنانییەکان دابین بکات، بۆیە ئەوان هێندە هۆگری بازرگانی دەریایی بوون، ئێمە وا بیردەکەینەوە یۆنانییەکان بە هۆی زیادبوونی دانیشتووانەوە ناچارن گەنم بکڕن، بەڵام پتر لە٢٥٠٠ ساڵ بەر لە ئێستە تیمیستۆکیلی سەرۆکی ئەسینا سکاڵای هەبووە، لەوەی ئاتیك توانای هێنانی گەنمی پێویستی نەبووە لە میسر، ئەوکاتیش وەك ئێستە بەرهەمی سەرەکیی کشتووکاڵی ئەوان ترێ و زەیتوون بوو، دوای هێنانی تووتن لە ئەمەریکا بۆ ئەورووپا، چاندنی تووتنیش بوو بە بەشێك لە کشتووکاڵی ئەو وڵاتە.

هەروەك چۆن ئێستە رۆڵەکانی یۆنان کۆچ بۆ وڵاتانی دیکەی جیهان دەکەن، بۆ ئەوەی پێداویستییەکانیان دەستەبەر بکەن، ئەوکاتیش وەك ئێستە یۆنانییەکان بە هۆی نەبوونی زەوی کشتووکاڵی و دەست نەکەوتنی پێداویستییەکانی ژیان، رۆڵەکانی یۆنان کۆچیان بۆ شوێنەکانی

دیکە دەکرد بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی ژیان بۆ خۆیان دابین بکەن، تەواوی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك بەو هۆکارە دروست بوون، کە گەنجانی یۆنان لەنێو وڵاتەکەیان ئامرازی دابین کردنی ژیانیان نەبوو، بۆیە گەنجە یۆنانییەکان لە پێناو زەویوزاری فرەوانی ئەو ناوچەیە، کۆچیان بەرەو ئەو شوێنانە دەکرد.

یۆنانییەکان لە رۆژهەڵاتی مەدیتەرانە بۆ دەریاوانی و بازرگانی ڕکابەری گەورەی هەخامەنشییەکان بوون، هەرچەندە خەشایار شا ئاتیکی داگیرکرد، بەڵام نەیتوانی دەریاوانی یۆنان لەنێو ببات، ڕەنگە ببێتە مایەی سەرسووڕمان کە بڵێین ئاکامی کۆتایی جەنگی سالامیس بووە هۆکاری دۆستایەتی یۆنان و هەخامەنشییەکان.

یۆنانییەکان دڵنیابوون لە وشکانی ناکارن بەسەر هەخامەنشییەکاندا زاڵ بن، چوونکە هەر جارێك لە وشکانی لەگەڵ هەخامەنشییەکان جەنگابوون، دووچاری شکان هاتبوون، هەخامەنشییەکانیش دڵنیابوون لە دەریادا ناتوانن ڕکابەری یۆنان بکەن، جگە لە پێکدادانە بچووکەکان، لە تەواوی ئەو جەنگانەی لە دەریادا لەگەڵ یۆنانییەکان کردبوویان، شکستیان خواردبوو.

هەرچەندە جەنگی سالامیس بە شکستی هەخامەنشییەکان کۆتایی هات، بەڵام ئەو جەنگە ڕووی ئێرانییەکانی لای یۆنانییەکان سپی کردەوە، مێژوونووسە یۆنانییەکان کە ئەوانیان بە بەربەر دەناسی، کەوتنە باسی ئازایەتی ئەوان، بە ئازا ناوزەدیان کردن و دەستیان کرد بە بەسەردا هەڵدان پێیاندا.

هیرۆدۆت دەڵێت دوای گەیشتنی هەواڵی شکستی سالامیس، خەشایار کە لە ئەسینا بوو، گریا، ئەو شکستەی بەگورزێکی مەزن بۆ سەر هێزی دەریایی خۆی زانی، بەپێی وتەی هیرۆدۆت کاتێك داریوشی یەکەم مرد، تەمەنی خەشایار سی و دوو ساڵ دەبوو، کاتی گەیشتنی بۆ ئەسیناش لە تەمەنی سی و هەشت ساڵیدا بوو.

هیرۆدۆت دەڵێت ئەویش وەك باوکی باڵابەرز بوو، دۆخێکی بە شکۆی هەبوو، کاتێك دوژمن شکستی دەخوارد، داوای لێ خۆشبوونی دەکرد، دەیبەخشین، لەگەڵ دوژمنە شکست خواردوو و دیلەکانیان توندی نەدەنواند، ئەو لە کاتی بیستنی کارەساتەکان دەگریا.

بە شێوەیەکی گشتیی خەشایار بەرانبەر ژێردەستەکانی میهربان بوو، پتر بزەی لەسەر لێو بوو، لە دانیشتنە دۆستانەکاندا دەوروبەرەکان بێ ترس لە سزادان، گاڵتە و گەپیان لەگەڵ

دەکرد، بەڵام لە دانیشتنە فەرمییەکان بچووکترین گاڵتە و جەفەنگ و کەمی نواندن لە ڕێزدا، توندترین سزای بە دواوە بوو.

هیرۆدۆت دەڵێت خەشایار خۆی بە ئازا نیشان دەدا، بەڵام لە ناخدا ئازا نەبوو، لە جەنگەکانی یۆنان هیچ کات لە ریزەکانی پێشەوەی جەنگدا نەبوو، وتەی هیرۆدۆت لەو بارەوە بێ واتایە، چوونکە لە هیچ سەردەمێك و لە هیچ شەڕێکدا پاشاکان لە ریزی پێشەوەی جەنگدا نەبوون، چوونکە بوونی ئەوان بۆ فەرماندەیی و بەڕێوەبردنی جەنگ بە بایەختر بووە، لەوەی لە ریزی یەکەمی شەڕدا بن، وەك سەربازێکی ئاسایی شەڕ بکەن[1]، ئەوە بە واتای ترسنووك بوونی ئەوان نەبووە، لە تەواوی جەنگەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمیشدا، کە ملیۆنان سەرباز لە جەنگەکاندا بوون، تەنیا ئەفسەر و سەربازان بوون، کە لە ریزەکانی پێشەوەی شەڕدا بوون.

هەر بە وتەی هیرۆدۆت ئەو رۆژەی خەشایار بڕیاریدا لەشکرکێشیی بۆ یۆنان بکات، هەموو براکانی دژ بوون، وتیان لەشکرەکەمان لە یۆنان لەنێو دەچێت، بە خەشایاریان وت سەربازی هەخامەنشیی توانای سەربازی یۆنانی نییە، چوونکە لێهاتوویی و چاپووکی ئەوانیان نییە، ئازایەتی سەربازانی یۆنان بۆ بەرگری لە وڵاتەکەیان دوو بەرابەر زیاد دەکات، بەڵام خەشایار ڕای برا و برازا و سەردارەکانی خۆی پەسەند نەکرد، لەشکری بردە یۆنان و هێزی دەریایی خۆی لە سالامیس لە کیس چوو.

بە وتەی هیرۆدۆت یەك لە کارەکانی خەشایار تەواوکردنی کاری تەلارسازی کۆشکی پێرسپۆلیس بوو، ئەو دەڵێت شکۆی خەشایار لە یۆنان دەرنەدەکەوت، بگرە لە کاتێکدا لە پێرسپۆلیس لەسەر تەخت دادەنیشت، دە هەزار سەربازی گاردی جاوید لە بەرانبەری ریزیان دەگرت و فەرمانڕەوایانی وڵاتاکان بە دەست و دیارییەوە دەهاتنە لای، زۆر بە شکۆ

(١) زۆرینەی پاشاکان بەشداربوونە لە جەنگەکان، هەندی کاتیش لە ریزی پێشەوەی شەڕبوونە، لە تەواوی پەڕتووکە مێژووییەکانی کۆندا، دەبینین پاشاکان خۆیان جەنگاون، زەبیحوڵڵا خۆی بیری چوتەوە لەو پەڕتووکەدا باسی ئازایەتی کوروش و بەشداری ڕاستەوخۆی لە شەڕی لیدی دەکات، بە هەمان شێوە باسی داریوش و پاشای ئێسپارت و...هتد دەکات، لە ڕاستیدا ئەوکات بەشداری پاشاکان لە شەڕدا نەریت بووە، ورەی سەربازانی بەرز کردوتەوە، بەڵام خەشایار هەرگیز بەشداری ئەو شەڕانە نەبوو، لە دوورەوە چاوەدێری دەکرد، زۆر مێژوونووسی دیکەش هاوڕای هیرۆدۆتن لەو بارەوە ـ وەرگێڕی کوردی.

دەردەکەوت. ئەوان دیارییەکانیان دەخستە بەر دیدەی، دواتر دەیاندا بە (چیلیارك) کە فەرماندەی گاردی جاوید بوو.

فەرماندەی گاردی جاوید کە هیرۆدۆت پلەی ئەوەی بە بەرزتر لە پلەی ساترابەکان (حوکمڕانەکانی وڵاتە ژێردەستەکانی هەخامەنشیی) زانیوە، لە سەردەمی خەشایاردا دەسەڵاتیی زۆر زیادی کرد، بە وتەی هیرۆدۆت گۆچانێکی بەدەستەوە دەگرت، کە سەرەکەی هەنارێکی زێڕینی پێوەبوو، ئەو گۆچانە وەك هێماکانی ئەو سەردەمە، هێمای فەرمی پۆستی ئەو بوو.

هیرۆدۆت دەڵێت: خەشایار لە سەرەوەی دەروازەی کۆشکی پێرسپۆلیس نووسراوێکی هەڵواسیوە کە ئەمە ناوەرۆکەکەیەتی:

(ئاهورامەزدا زەوی ئافراند، مرۆڤی ئافراند، بۆ مرۆڤ ئاشتی بڕیار لێدا.

ئاهورامەزدا خەشایاری کرد بە پاشا، ئەوی کرد بە پاشای چەندین وڵاتی جیاواز.

من خەشایار شام، پاشای پاشاکان، پاشای وڵاتەکان، کوڕی داریوشی هەخامەنشیی.

من یەکم لە پارسەکان، ئەویش کوڕی یەکێکی دیکەی پارسی بووە.

من یەکێکم لە ئێرانیان، کوڕی ئێرانییەك، ئەویش کوڕی ئێرانییەکی دیکە بووە.

خەشایار شا ئەوەها دەبێژێت، پاشای پاشاکان، پاشای وڵاتەکان، ئەوانە وڵاتی منن.)

دوای ئەو نووسینە هیرۆدۆت ناوی وڵاتەکانی ژێردەستی خەشایار دێنێت، کە دەکەوتنە نێوان ڕووبارەکانی (سند، سیحوون، جەیحوون و دەریای مەدیتەرانە). هەرچەندە هیرۆدۆت ترسنۆکبوونی داوەتە پاڵ خەشایار، بەڵام نەیتوانیوە ئازایەتی سەربازانی ئێرانی ڕەت بکاتەوە، پێ دەچێت خەسڵەتەکانی سەربازانی ئێرانی هێندە بەرز بوونە، کە مێژوونووسێك ئەگەر تەنانەت دژیش بووبێت، نەیتوانیوە لە باسکردنیان خۆی بپارێزێت.

هەر وەك دەزانرێت هیرۆدۆت گەشتی بۆ ئێران کردووە، لە نووسینەکانی دیارە تەنیا یەکجار گەشتی بۆ ئێران نەکردووە، ڕوونکردنەوەکانی لەبارەی کۆشکی پێرسپۆلیس نیشاندەری ئەوەیە، کە ئەو خۆی کۆشکەکەی دیوە و دەرفەتی پێدراوە تا بەنێویدا بگەڕێت و بەشەکانی ببینێت.

زانایەکی یۆنانی کە لە سەردەمی خەشایاردا ژیاوە و مێژوونووس نەبووە، بەڵام هەندێ بابەتی مێژوویی لە دوای خۆی جێ هێشتووە، لەبارەی خەشایارەوە دەڵێت ئەو پاشایەکی بە بەزەیی و جوامێر بووە، ئەم زانایە ناوی (دیۆژێن)ـە، واتە کەسایەتییە برێتی نییە لە دیۆژێنی

خێوەتنشین، بەم پێیە ئەم زانایە هاوسەردەمی خەشایار بووە، ئەوی دیکەیان بە رۆژی ڕووناك بە چراوە رێی دەکرد و دەیوت: "لە مرۆڤەکان دەگەڕێم"، ئەم کەسایەتییەش هاوسەردەم بووە لەگەڵ ئەسکەندەری مەکدۆنی، (ئەم دوو کەسایەتییە مەودای نێوانیان سەد و نیوێك بووە).

دیۆژێنی زانا لە سەردەمی خەشایاردا ژیاوە، باوەڕی وابوو، هەوا بنچینە و پێکهێنەری سەرەکیی هەموو شتێکە، بۆیە دەیوت: "هەموو شتێك و مرۆڤیش لە هەواوە هاتوونە کایەوە و بە بوونی هەوا ماونەتەوە، ئەگەر هەوا نەبووایە، هیچ شتێك لە گەردوون نەدەهاتە کایەوە و نەدەمایەوە".. لە پاش خۆی هەندێ نووسینی مێژوویی بەجێماوە و دەڵێت: "بیرم نەدەکردەوە کە پاشای بەربەرەکان (واتە خەشایار)، بەو ڕادەیە بە بەزەیی و جوامێر بێت، ئەو هێندە بە بەزەیی بوو، کە سەربازانی هەخامەنشیی لە یۆنان، تەنانەت دەستدرێژیان نەکردە سەر کۆیلەیەکیش."

دوای ئەوەی دیۆژێن زانی خەشایار بە پێچەوانەی ئەو ناوبانگەی هەیەتی خوێنڕێژ نییە، دوای دەست پێکردنی پێوەندیی دۆستایەتی نێوان ئێران و یۆنان، گەشتێکی بۆ ئێران کرد و ماوەیەك وەك ئەو یۆنانییە کۆچبەرانەی لەو وڵاتەدا بوون، لەوێ مایەوە و بە ئاسوودەیی ژیا. ئەو بابەتە زانستییانەی بە ناوی دیۆژێنن، هی ئەو زانایەن و هی دیۆژێنی خێوەتنشین نین، کە کۆمەڵێك وتە و بێژەی بەهاداری کورتی لە پاش بەجێماوە، ناوبراو خودان کۆمەڵێك پەڕتووکە، لێ جگە لە یەك پەڕتووك هیچیان نەماون، (دەی نۆن) دەڵێت: دوای مانەوەی لە ئێران سەرگەرمی وانەبێژی بوو، زانستی فیزیکی دەگوتەوە لەسەر بنەمای، "هەموو شتێك لە هەوایە".

کاتی شکستی هەخامەنشییەکان لە جەنگی سالامیس ئاگری ئاگرخانەی چیچەستی لە ورمێ سێ جاران کوژایەوە و پێبۆوە، مووغەکان ترسان و وایانزانی خەشایار کوژراوە، بەپێی هەندێ گێڕانەوە دەنگۆی کوژرانی خەشایار بە هۆی ئەو ڕووداوە پەرەی گرت، کە سەرووی سرووشت بوو، بەڵام ڕاستینەی مێژوویی ئەوەبوو، کە خەشایار بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە یۆنان بوو، پێوەندیی لەگەڵ وڵاتەکەی هەبوو، دامەزراوەی چاپار خانەی گەورە (نووسینگەی پۆستە)، کە لەلایەن داریوشی یەکەم دامەزرا، لە سەردەمی خەشایاری کوڕیدا بە باشی کاری دەکرد، بۆ ساتێکیش چییە لەکار نەکەت، تەنانەت لە وەرزی زستانیشدا پێوەندیی بە وڵاتەوە هەبوو، چوونکە لەو وەرزەشدا کە رێگەی وشکانی داخرا بوو، هێزی دەریایی بەردەوام

پێوەندییەکانی نێوان خەشایار و وڵاتی دەهێنا و دەبرد، تەنانەت هەواڵی شکستی خەشایار لە سالامیس گەیشتە وڵات، دەنگۆی کوژرانی خەشایاریش کەوتە نێو جەماوەر، بە تایبەت کە لە یۆنان دووجاران هەوڵی کوشتنیان دا، بەڵام بەسەلامەتی دەرچوو.

دەی نۆن مێژوونووسی ناسراو، کە لەگەڵ ئەسکەندەر بوو، نووسیویەتی: (گۆرپاتی) فەرمانڕەوای ناوچەی باختەر یاخی بوو، لە بابلیش (ئالۆی دیۆس) ڕاپەڕی، لە دەڤەرەکانی دیکەیش ئەوانەی لە خەشایار دەترسان یاخی بوون. هەڵبەتە ئەو کەسانەی یاخی دەبوون بەترسناکترین شێواز دەکوژران یاخۆ ڕووبەڕووی سزای یەکجار قورس دەبوونەوە، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە هیچ کەس بیر لە یاخیبوون نەکاتەوە، بەڵام کاتێك هەواڵی مردنی یاخۆ کوژرانی پاشایەك بڵاو دەبۆوە، ئەوانەی سەرکێش بوون ڕادەپەڕین و یاخی دەبوون.

گۆرپاتی فەرمانڕەوای باختەر، جێگەی متمانەی هەردوو پاشا داریوشی یەکەم و خەشایار بوو، هەردووکیان خۆشیان دەویست، ئەو لە تەواوی سەردەمی دەسەڵاتیی داریوش، دواتریش لە سەردەمی خەشایاردا، سنوورپارێز بوو، ئەو وڵاتە ژێردەستە ڕۆژهەڵاتییەکانی هەخامەنشیی لە هێرشەکانی سکاکان دەپاراست.

کاتێك هەواڵی یاخیبوونی گۆرپاتی گەیشتە خەشایار، وایزانی تەواوی فەرمانڕەواکان یاخیبوون، چوونکە کاتێك کەسێکی خودان متمانە ڕادەپەڕێت، دیارە ئەوانەی سەرکێشن ڕاپەریون، بۆیە ئەوانیش ڕادەپەڕن، بۆیە خەشایار پتر مانەوەی لە یۆنان بە پەسەند نەزانی و بڕیاریدا بۆ وڵات بگەڕێتەوە، بەڵام نەیدەویست کاری یۆنان بەنیوەچڵی و ناتەواوی بهێڵێتەوە، بۆیە ئەگەر وای کردبایە یۆنانییەکان ئەویان بە شکستخواردوو دەناسین دوای ئەوە نەتەنیا شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك، بگرە تەواوی وڵاتانی ئاسیا لە ئیمپراتۆرییەکەی جیا دەبوونەوە.

یۆنانییەکان بە هۆی سەرکەوتنیان لە سالامیس وورەیان بەرز ببۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتدارانی تسالی و مەکدۆنیا کە دۆستی خەشایار بوون، لە جەنگەکاندا یارمەتی دەوڵەتە شارە باشوورییەکانی یۆنانیان نەدا، بەڵام لە دۆستایەتی داریوش سست ببوون. هەرچەندە ئەوان نەیاندەتوانی ڕێگەی گەڕانەوەی خەشایار بگرن، لەو کاتەدا خەشایار دەیتوانی بە کەشتییەکانی لەشکرەکەی بگەڕێنێتەوە، بەڵام دووریش نەبوو لە پێناو زێڕ و پارەدا لە ڕێگەی گەڕانەوەیاندا، کێشە و گرفت بۆ لەشکری خەشایار بنێنەوە.

دۆخی خەشایار لە یۆنان لە دوای شکستخواردنی لە شەڕی سالامیس لە دۆخی ناپلیۆن دەچوو لە دوای سووتانی مۆسکۆ لە ساڵی (١٨١٢ ز)، ناپلیۆن بینی ئەگەر نەگەڕێتەوە، ئەو پاشایانەی بوونەتە دۆستی لەوانەیە پشتی تێ بکەن و ڕێگەی گەڕانەوەی لێ دابخەن. خەشایار دووچاری ئەو دۆخە بوو، تەنیا جیاوازیی ئەوە بوو، کە دوای گەڕانەوەی ناپلیۆن، لەشکرەکەی لە مۆسکۆ لەنێو چوو، بەڵام لەشکری خەشایار دوای گەڕانەوەی خەشایار لە یۆنان مایەوە و لەنێو نەچوو، بەردەوام بوو لە جەنگ.

کۆمەڵێك لە شازادە ئێرانییەکان لە یۆنان لەگەڵ خەشایار بوون، کاتێك خەشایار بڕیاری گەڕانەوەیدا، هەموو ئەو سەردارانەی زیندوو مابوون، لەگەڵ خۆی بردەوە و فەرماندەیی لەشکرەکەی لە یۆنان بە مەردۆنیۆس سپارد. مەردۆنیۆس کوڕی گۆبریاس[٢] کوڕی داریوش و برازای خەشایار بوو، ئەو ناوە نابێت لەگەڵ ناوی دیکەی هاوشێوەی بە هەڵە دابنرێت، چوونکە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان ناوێکی باو بوو.[٣]

---

(٢) لەسەرچاوەی دیکە مەردۆنیۆس یاخۆ مەردۆنییە کوڕی گیریاسی زاوای داریوشی یەکەم بووە، گیریاس یەکێك بووە لەو حەوت سەردارەی لە ڕووداوی بەردییەی درۆزن لەگەڵ داریوش هاوپەیمان بوو بۆ کوشتنی بەردییە. مەردۆنیۆس کە هاوسەری کچی داریوش بوو، لەسەردارە بەناوبانگەکانی هەخامەنشیی بوو و لە زۆر جەنگ لەسەردەمی داریوش و خەشایاردا بەشدار بووە، خەشایار بە پێداگری ئەو و ئەو یۆنانییانەی دوورخرابوونەوە، لەشکرکێشیی بۆ یۆنان کردووە. زەبیحوڵڵا.

(٣) باسی ئەو خاڵە پێویستە کە مەردۆنیۆس ناوی بە یۆنانی کراوی برازاکەی خەشایارە و ناوی ڕاستی ئەو نازانین، یۆنانییەکان هەموو ناوە ئێرانییەکانیان گۆڕیوە، سەرچاوە ئێرانییەکانیش لەنێوچوون، بۆیە ناتواندرێت ناوی هەندێك لە ژن و پیاوانی ناو مێژوو بزانین. یۆنانییەکان بە ڕادەیەك ناوە ئێرانییەکانیان گۆڕیوە کە ئەمڕۆ ناتواندرێت ،تەنانەت لەبارەی ئەو پاشایانەی لە نووسراوەکاندا ناویان نەهاتووە، سەرچاوەی فارسیمان نییە، چجای ناوی بەرپرسانی پلە دوو و سێ و چوار.

سەبارەت بە ناوەکانی کوروش، داریوش و وێشتاسب بە هۆی ئەوەی لە نووسراوەکاندا هاتووە گومانمان نییە، دەزانین کە ناوی ڕاستینەیان لەسەرچاوە فارسییەکاندا چۆن بووە، بەڵام نازانین ناوی مەردۆنیۆس لە فارسیدا چۆن بووە، تەنیا بە گریمان بەشێکی کە برێتییە لە مەرد واتە پیاو، ئەمەش لە ناوە ئێرانییەکاندا دەبینرێت، زەبیحوڵڵا.

خەشایار سۆزی زۆری بۆ مەردۆنیۆس هەبوو، ئەویش مامی خۆش دەویست، بۆیە کراوە بە فەرماندەی لەشکرەکە، بۆ ئەوەی کەس ڕێگری نەبێت، تەواوی شازادە پلە یەکەکانی لەگەڵ خۆی لە یۆنانەوە بردەوە، تەنانەت هیچ یەکێك لە برازاکانی لە یۆنان جێ نەهێشت.

گزنفۆن سەبارەت بە گەڕانەوەی خەشایار لە یۆنانەوە نووسیویەتی: کاتێك ئەو لە یۆنان گەڕایەوە، دەگیری سەرمای سەختی زستان بوو، لەو ساڵەدا سەرمایەکی هێندە توند بۆ یۆنان هات، کە بۆ یەکەمجار ئاوی دەریا لە کەنارەکانی ڕۆژئاوای یۆنان دووچاری بەستەڵەك بوو، لە سەرمای سەختی ئەوێ خەشایار و هاوڕێکانی لە بەفردا مانەوە و نەیانتوانی لە ڕۆیشتن بەردەوام بن، تەنانەت ژمارەیەکی زۆریانیش مردن، بەڵام (دەی نۆن) پێی وایە گزنفۆن لەو بابەتە زێدەڕۆیی کردووە، بۆیە دەڵێت زستانەکە سەخت بوو، بەڵام هاوڕێکانی خەشایار دووچاری زیان نەبوونەوە. خەشایار بەو ڕێگەیە گەڕایەوە، کە پێیادا هاتبوو، واتە بە درێژایی کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی یۆنان دەگەڕایەوە، بەردەوام پێوەندیی لەگەڵ هێزە دەریاییەکەیدا هەبوو، بێ هیچ ڕووداوێکی شیاوی باس گەیشتەوە داردانێل، لەوێشەوە هاتە نێو ئاسیای بچووك.

مەردۆنیۆس فەرماندەی لەشکری هەخامەنشیی لە یۆنان تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو، نابێت دووچاری سەرسووڕمان بین، کە گەنجێك لەو تەمەنە ببێتە فەرماندەی لشکرێکی ئاوا گەورە، لە ڕابردوودا پیاوان لە تەمەنی کەمتریش دەبوونە فەرماندە و لە جەنگەکانیشدا سەرکەوتوو دەبوون.

ئەسکەندەر لە تەمەنی نۆزدە ساڵان لە ئیسۆس لە ئاسیای بچووك، لەشکری داریوشی سێیەمی بەزاند، لە سەرەتای سەدەی شازدەیەم شا ئیسماعیلی سەفەوی لە تەمەنی چواردە ساڵان بووە فەرماندە لە مەیدانی جەنگ، لە هەمان سەدە (دۆن ژووان) لە تەمەنی بیست و چوار ساڵان لە جەنگی دەریایی (لپانت) لە باشووری یۆنان فەرماندەی جەنگ بوو، هێزی دەریایی عوسمانییەکانی شکاند، هۆکارەکانی ئەوەی گەنجەکان لە ڕابردوودا دەیانتوانی ببنە فەرماندەی جەنگەکان بۆ ئەو سێ خاڵە دەگەڕێتەوە:

یەکەم: خوێندن بە واتای ئێستە نەبوو، کوڕان لە تەمەنی زوودا لە بەردەستی باب و براکانیان بە کردەیی تاقی کردنەوەکانی ژیانیان دەبڕی و لە تافی گەنجی و لە تەمەنی کەمتر لە بیست ساڵان، دەبوونە پیاوانی بە ئەزموون.

دووەم: لە رابردوودا هونەرەکانی جەنگ وەك ئێستە زانستییانە و تەکنیکی نەبوون، فێربوونیان پێویستی نەدەکرد چەندان ساڵ کاتیان بۆ تەرخان بکرێت یاخۆ ساڵانێکی زۆر ناچار بە خوێندن بن بۆ ئەوەی هونەرەکانی جەنگ فێر بن.

سێیەم: لە جەنگە کۆنەکاندا ئازایەتی و خۆڕاگری و بەرگەگرتنی سەختییەکان، هۆکاری سەرەکیی سەرکەوتن بوون، ئەو خەسڵەتانەش بە گشتیی لە گەنجان زۆرتربوون تا لە پیاوانی پێگەیشتوو، هەڵبەت پیاوانی پێگەیشتووش هەبوون، کە بێ ترس خۆیان لە قووڵایی جەنگ دەدۆزییەوە، بەڵام خۆڕاگری و ئازایەتی لە لاوان پتر دەبینرێت، بۆیە فەرماندەیی لەشکرەکان زۆرتر بە گەنجان دەدران.

خەشایار پێش گەڕانەوەی لە یۆنان، مەردۆنیۆسی مۆچیاری کرد کە هەڵسوکەوتی دەبێت بە شێوەیەك بێت کە سکاڵای لێ نەکرێت، نابێت دەستدرێژی بکاتە سەر جووتیار و کرێکار و پیشەوەر، بۆ هەر کاڵایەکیش کە دەیکڕێت دەبێت پارە بدات، خەشایار پارە و زێڕی گەنجینەکەی کردە نیوە، نیوەی بۆ مەردۆنیۆس بەجێ هێشت تا بیکاتە خەرجی بۆ لەشکرەکەی و ڕایسپارد کە سێ مانگ پێش تەواوبوونی سەرمایەکەی ئاگەداری بکاتەوە تا سەرمایەی دیکەی بۆ رەوان بکات.

**یەکەم:** کاری مەردۆنیۆس دوای رۆیشتنی خەشایار برێتی بوو لە هەڵواسینی پەیکەری خەشایار لە پەرستگەی ئاکراپوولی، ئەو پەیکەرە لەلایەن (سی دیاس) پەیکەرتاشی مەزنی یۆنانی دروست کرا، چوونکە خەشایار دەرفەتی وێستانی نەبوو، سی دیاس کارگەی پەیکەرتاشی خۆی لەسەر گالیسکە دانا و هێندە کاری کرد تا تەواو بوو، سی دیاس مامۆستای (فیدیاس) بوو، فیدیاس هەر ئەو کەسەیە کە پەیکەری (زێئۆس) خوداوەندی خوداوەندیانی یۆنانی بە بەرزی چواردە مەتر و لە بەردی مەڕمەڕ چێ کرد و لە پەرستگەی زێئۆسی دانا کە لە پلۆپۆنز بوو.

تا ئەو رۆژەی خەشایار لە یۆنان بوو، بیرۆکەی دانانی پەیکەرەکەی لە ئاکراپوولی نەبوو، بەڵام دوای رۆیشتنی ئەو لە یۆنان، مەردۆنیۆس پەیکەری ئەوی لە پەرستگەکە دانا، بەڵام لە مێژوودا هیچ ئاماژەیەك نییە، کە دانانی ئەو پەیکەرە بە فەرمانی خەشایار شا بوو بێت، لەکاتێکدا بە دووری دەزانین مەردۆنیۆس سەربەخۆ ئەو پەیکەرەی لەو پەرستگەیە دانابێت، چوونکە ئەو پاشایانەی لە سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی بوونە پاشا، رێزێکی یەکجار زۆریان

له ئاینەکانی دیکە دەگرت، هەروەها خۆیان لە هەموو کردەوەیەك دەپاراست، کە ببێتە مایەی بریندارکردنی هەستە ئاینییەکانی نەتەوەکانی دیکە.

ڕەزامەندی سەرپەرشتیار و خزمەتکارانی پەرستگەی ئاکراپوولی بۆ دانانی پەیکەری، نیشاندەری ئەوەیە، کە ئەوان لە هەڵسوکەوتی خەشایار و لەشکرەکەیان بەرانبەر بە یۆنانییەکان و خەڵکی ئەسینا هێندە دڵخۆش بوونە، کە ڕەزامەندیان لەسەر دانانی پەیکەرەکەی دەربڕیوە، بەو هەڵوێستەیان بە خەشایاریان وتووە، کە لە لای ئەوان چەندە ڕێزی هەیە.

ئەو بابەتە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر گرینگە، لەوانەیە وا بیر بکەینەوە، چوونکە برازای خەشایار فەرمانڕەوای ئەسینا بوو، سەرپەرشتیارانی پەرستگە بە ناچاری ڕەزامەند بوون، کە پەیکەری خەشایار دابنرێت، ئەگەر ئاوایە بووایە، دوای ڕۆیشتنی لەشکری هەخامەنشیی لە یۆنان، دەبووایە ڕاستەوخۆ ئەو پەیکەرە لابدەن، بەڵام ئەوە زانراوە تا پازدە ساڵ دوای ڕۆیشتنی لەشکری خەشایاریش لە ئەسینا، ئەو پەیکەرە لەوێندەر هەر مابۆوە، تیمیستۆکیلی سەرۆکی ئەسیناش کاتێك ناچار بە هەڵاتن بوو، چوو بۆ کۆشکی خەشایار و بە ئاسوودەیی لەوێ ژیا، بۆیە دەبێت پەسەندی بکەین، کە هەڵسوکەوتی باشی خەشایار و لەشکرەکەی بووەتە مایەی ڕازیبوونی سەرپەرشتیارانی پەرستگەکە بە دانانی پەیکەری خەشایار و مانەوەی لەو پەرستگەیە، بەدەر لە نەریت و یاساکانیان. ئەگەر ئەوان لە سەردەمی دەسەڵاتیی مەردۆنیۆس بە ناچاری ئەو کارەیان بکردایە، دواتر دوای گەڕانەوەی هەخامەنشییەکان لە یۆنان دەیانتوانی پەیکەری خەشایار لابدەن، بەڵام ئەو کارەیان نەکرد، بە گریمانی زۆر کاتی شەڕە ناوەخۆییەکانی یۆنان کە پەرستگەی ئاکراپوولی کەوتەبەر هێرش، پەیکەرەکان شکاندراون.

لە پەڕتووکی ئاینی جوولەکەکان، بەڕێزەوە ناوی کوروش هاتووە، یۆنانییەکان دوای جوولەکەکان پایەی خەشایاریان بەرز کردەوە و ڕێزیان گرت، بەڵام ئێستە لە مێژووی یۆنان هیچ شتێك نابینرێت، نیشاندەری ڕێزی یۆنانییەکان بەرانبەر ئەو بێت، بەڵام دانانی پەیکەری خەشایار لە ئاکراپوولی بەو واتایە دێت.

یۆنانییەکان توانیان لەشکرێك لە پلۆپۆنز لە باشووری یۆنان دابنێن و ئەفسەرێك بە ناوی (کلۆم برۆتۆس) فەرماندەیی ئەو لەشکرەی گرتە ئەستۆ، ئەرکی ئەو لەشکرە لە کاتی هێرشی لەشکری خەشایار بریتی بوو پارێزگاریکردن لە دەوڵەتە شارەکانی باشووری یۆنان لە داگیرکردنیان لەلایەن

خەشایار، ئەگەر هێرشیش نەکرابووایە سەر ئەوان، ئەو لەشکرە دەبووایە بێت و دەڵەتەشاری ئاتیك کە شاری ئەسینا پایتەختی ئەو دەوڵەتەشارە بوو، لەو لەشکرە پاك بکاتەوە.

کلۆم برۆتۆس فەرماندەی لەشکری یۆنان لە باشوور، پیاوێك بوو بە باڵای ئاسایی و قەڵەو، تەمەنی پەنجا ساڵ بوو، سەری ڕووتابۆوە، دوای مانگی سێی بەهار بەردەوام ڕووت بوو، تەنیا یەك پانتۆڵی کورتی لە بەردەکرد، بەو شێوەیە لە ژوورەکەیدا لەگەڵ پیاسەکردن شیعرەکانی هۆمێری دەوتەوە، ئەو دەنگی گڕ و گەورە و بەهێز بوو، لە کاتی ئاساییدا کاتێك دەدوا، وەك ئەوە وابوو کە بەشەڕ دێت، هەر ئەو پیاوە دوای دەست پێکردنی جەنگ هێندە ئارام دەبوو، کە کەس دەنگی نەدەبیست، کاتێك دەیویست فەرمانێك ڕابگەیەنێت، هێندە بە ئارامی دەیوت کە وا دەزانرا تەنیا لەبەر خۆیەوە دەدوێت.

کلۆم برۆتۆس لە گەنجیدا پاڵەوانی هەڵدانی دیسك بووە، دوای سییەکانی تەمەنی ئەو وەرزشەی نەکردووە، کەڵکەڵەی ژیانی سەربازی بە ڕادەیەك ئەوی سەرگەرم کردبوو، کە چیدی کاتی بۆ وەرزش نەمابوو، لە لای یۆنانییەکان بە یەکێك لە سەرکردە دیارەکان هەژمار دەکرا، ئەو پیاوەی دەیویست لەگەڵ مەردۆنیۆسی فەرمانڕەوای هەخامەنشیی لە یۆنان بجەنگێت، بەو شێوەیە بوو.

مەردۆنیۆس فەرماندەی لەشکری هەخامەنشیی لە یۆنان، لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا بوو، وەك شازادەکانی دیکەی هەخامەنشیی باڵابەرز بوو. لە سەردەمی هەخامەنشییەکان بە کەمی ڕووی دەدا، کە شازادەیەك لە یەکێك لە چەکە جەنگییەکان پاڵەوان نەبێت، مەردۆنیۆس پاڵەوان بوو لە بەکارهێنانی نێزە و هاویشتنی تیر و کەوان، زۆر بە خێرایی دەیتوانی تیر بهاوێژێت، لە ماوەیەکی زۆر کورت جەستەی دوژمنی دەکردە ئامانجی تیرەکانی، مەردۆنیۆس لە هەر خولەکێکدا دەیتوانی بیست و پێنج تیران بهاوێژێت، (هەر خولەکێك بە پێوەری خولەکی یۆنانییەکان، نێزیکەی هەمان پێوەری ئەو خولەکەیە کە ئێستە بەکاردێت، کورتترین پێوەرە)، لە هەندێ لە گێڕانەوەکان دەبێژن بیست تیری دەهاویشت، ئەو کەسانەی ژێی کەوانیان ڕانەکێشا بێ، نازانن ئەو کارە چەندە هێزی مەچەك و بازووی پێویستە، دوای تێپەڕاندنی تەمەنی منداڵی و لە کاتی دەسەڵاتداری داریوشی یەکەم کە دەکاتە باپیری، بەشداری لە جەنگەکان دەکرد، لە لەشکرکێشییەکەی خەشایار بۆ یۆنان، بە ڕادەیەك بۆوە جێگەی ڕەزامەندی خەشایاری مامی، کە ئەوی بە فەرماندەی لەشکرەکەی و

فەرمانڕەوای یۆنان لە دوای گەڕانەوەی دانا، بە واتایەکی دیکە ئەو بوو بە جێنشینی خەشایار.

دوای گەڕانەوەی خەشایار بۆ ئیمپراتۆرییەتەکەی، مەردۆنیۆس هێرشکردنی بۆ سەر دەوڵەتەشارە یۆنانییەکانی دواخست، تا ئەوکاتەی لە ڕێگەی وشکانی یاخۆ دەریاوە لەلایەن خەشایار هێزی یارمەتی بۆ بنێردرێت، دواخستنی ئەو هێرشە بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە.

یەکەم: خەشایار لەکاتی گەڕانەوەیدا بەشێك لە لەشکرەکەی لەگەڵ خۆیدا بردەوە، دەیزانی دوای شکستی سالامیس پاشاکانی تسالی و مەکدۆنیا، واتە ئەو دوو دەوڵەتە شارەی، کە دەبووایە خەشایار بەنێویاندا بگەڕێتەوە، لەوانەیە ڕوویان وەرگێڕن و ئەو دۆستایەتییەی تا ئەوکات هەیانبوو، بیکەن بە دوژمنایەتی و ڕێگەی بگرن، تا هەرچی لە سەرمایە هەیەتی لێی بستێنن و سەربازەکانیشی بکەن بە کۆیلەی خۆیان. بۆیە بەشێك لە لەشکرەکەی برد تا ئەگەر ئەو دۆخە ڕوویدا، بتوانێت ڕێگەی خۆی بکاتەوە و دەرباز بێت، بۆیە ئەو لەشکرەی هەخامەنشیی کە لە دوای گەڕانەوەی خەشایار لە ئاتیك مایەوە، لاوازتر بوو، لەو کاتەی کە خەشایار گەڕایەوە.

**دووەم:** مەردۆنیۆس پێش ئەوەی بەرەو دەوڵەتەشارەکانی باشووری یۆنان بڕوات، دەبووایە لەشکرەکەی بکاتە دووبەش، لەبەر مەترسی هێرشی یۆنانییەکان، بەشێکی لە ئەسینا دابنێت و بەشەکەی دیکەی ببات. مەردۆنیۆس نەیدەویست  هەموو لەشکرەکە بگەڕێنەوە، چوونکە ئەمە وایکرد بە لەشکرێکی بچووك بچێت بۆ جەنگی کلۆم برۆتۆس، ئەوکاتیش شکستی دەخوارد.

سیخوڕەکانی هەخامەنشیی زانیارییان دابوو، کە نیوەی ئەو سی هەزار سەربازە یۆنانییەی لە پلۆپۆنزن، لە جۆری هۆپ لیت، هەخامەنشییەکان دووجار لەگەڵ ئەو سەربازانە جەنگابوون، دەیانزانی ئەوان خۆڕاگرن و سەرکەوتن بەسەریاندا قورسە، مەردۆنیۆسیش هەرچەندە تەمەنی تەنیا بیست و شەش ساڵ بوو، بەڵام خاوەن ئەزموون بوو، دەیزانی چوون بۆ جەنگ لەگەڵ پازدە هەزار سەربازی هۆپ لیت و پازدە هەزار سەربازی دیکە لە نیشتمانی خۆیاندا دەجەنگن، کارێکە پێچەوانەی ئەقڵ، باشترە تا هاتنی ئەو هێزە یارمەتیدەرەی خەشایار بەڵێنی دابوو، بوەستێت، دواتر بچێتە جەنگەوە.

**سێیەم:** ئاستەنگێکی دیکە کە ڕێگر بوو لە ڕۆیشتنی مەردۆنیۆس بۆ باشووری یۆنان، دەوڵەتە شاری ئێسپارت، ئەو کەوتبووە کۆکردنەوەی لەشکر، ئەو وڵاتە تا ئەوکاتەی خەشایار

له ئەسینا بوو، لەشکری له دژی ئەوان ساز نەدا، بەڵام دوای گەڕانەوەی خەشایار بۆ وڵاتەکەی، ئەوان فەرمانیان کرد تا تەواوی ئەو پیاوانەی ڕاژەی سەربازی دەیگرتنەوە بێنەوە نێو سوپا، هۆکاری ئەوەی ئێسپارت بڕیاریدا هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوە ئەوە بوو، کە دوای گەڕانەوەی خەشایار بۆ وڵاتەکەی، ژنێکی ئێسپارتی بە ناوی (سانی دیس) کە کوڕە گەنجەکەی له گاردی پاسەوانی لئۆنیداسی پاشای ئێسپارت بوو، لەگەڵ ئەودا له تەرمۆپیلێ کوژرابوو، چوو بۆ ئەنجومەنی پیرانی وڵاتەکەی و بە نوێنەرانی وت ئێوه هێندە ترسنووك و بێ هەستن، تەنانەت ئێستەش کە خەشایار لێرە نییە، ناتانەوێت تۆڵەی ڕۆڵەکانتان بکەنەوە؟

ئەنجومەنی پیران بڕیاری خۆئامادەکردنی ڕێژەیی لەشکرەکەیانیدا، بڕیاریان دەرکرد هەرکاتێك کلۆم برۆتۆس بەرەو ئەسینا کەوتەڕێ، ئەوانیش بکەونەڕێ تا هەخامەنشییەکان له هەردوو لاوە پەلامار بدەن و بە زوویی لەنێوی ببەن، لەشکری ئێسپارت بە تەنیا نەیدەتوانی شەڕی هەخامەنشییەکان بکات، بۆیە چاوەڕێ بوون تا کلۆم برۆتۆس بێت، ئەو دەمە هەموو پیاوان بۆ جەنگ ئامادە بکەن. ئەگەر مەردۆنیۆس بەشێك له لەشکرەکەی له ئەسینا بەجێ هێشتبایە و بەرەو پلۆپۆنز چووبایە، ئەوکات ئێسپارتەکان هێرشیان دەکردە سەر ئاتیك و دەیان گرتەوە، لەوانەبوو تەواوی لەشکری هەخامەنشیی کە لەوێ بوون، لەنێو بچن. ئەوانە ئەو هۆکارانەن کە ڕێگربوون له هێرشی دەست بەجێی مەردۆنیۆس بۆ باشووری یۆنان، لە دوای گەڕانەوەی خەشایار بۆ وڵات.

زانیاریی تەواو لەبارەی هێرشی بەکۆمەڵی لەشکری کلۆم برۆتۆس و ئێسپارت بۆ سەر لەشکری مەردۆنیۆس نییە، مێژوونووسە یۆنانییەکانیش بە کورتی نووسیویانە، تەنیا هێندە دەزانین، کە ئێسپارت بەردەوام پێوەندییان بە کلۆم برۆتۆس هەبووە، دووریش نییە پێوەندییەکە له ڕێگەی دەریاوە بوو بێت، چوونکە دوای شکستی هەخامەنشییەکان له جەنگی سالامیس، ڕێگەی دەریا بە ڕووی کەشتییە یۆنانییەکاندا کرایەوە، ئەوان دەیانتوانی له بەشەکانی باکوری یۆنان کە هێزی دەریایی هەخامەنشیی لێ نەبوو، بێ ترس له بەیەك گەیشتنیان لەگەڵ کەشتیگەلی هەخامەنشیی هاتوچۆ بکەن، بەڵام له بەشەکانی باکوری یۆنان ئەو ئازادییە بۆ کەشتییە یۆنانییەکان نەبوو، چوونکە هێزی دەریایی هەخامەنشیی هێرشی دەکردنە سەر، تەنیا نیوەی ئەو هێزەی له شەڕی سالامیس لەنێوچوو بوو، نیوەکەی دیکەی مایەوە، خۆراك و

پێداویستییان بۆ لەشکری خەشایار دەهێنا و دەیزانی ئەگەر ڕێگەی وشکانی بگیرێت، لە ڕێگەی دەریاوە خۆی بگەیەنێتە ئاسیای بچووك.

ئەوەی لە ڕێگەی مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە زانراوە، ئەوەیە کە ئێسپارت و کلۆم برۆتۆس بڕیاریاندا لە یەك کاتدا هێرش بکەنە سەر مەردۆنیۆس، ئەویش وردەکارییەکانی هێرشەکەی نەدەزانی، بەڵام مەزەندەی ئەوەی دەکرد، کە ئەو دوو لایەنە بۆ هێرشەکەیان پێکەوە لە گفتوگۆدا بن، چوونکە هەردوولا یۆنانی بوون و ڕقیان بەرانبەر هەخامەنشییان هەبوو، بۆیە لە دەرفەتێك دەگەڕان بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیان بکەنەوە.

# جەنگی مەگار

لەو دەمەدا کە مەردۆنیۆس چاوەڕوانی هاتنی هێزی یارمەتیدەر بوو، لەشکری کلۆم برۆتۆس لە پلۆپۆنز کەوتەڕێ، مەردۆنیۆس وەك خەشایار بەردەوام ئامرازەکانی وەرگرتنی زانیاریی هەبوو، لە جوولەی لەشکری یۆنان لە پلۆپۆنز ئاگەدار بۆوە، تێگەیشت کلۆم برۆتۆس بۆ جەنگی ئەو دێت، ئەگەر نەخشەی یۆنانمان هەبێت و سەیری بکەین، دەبینین هەر کەسێك بیەوێت لە ڕێگەی وشکانی لە پلۆپۆنز بێتە ئەسینا، جگە لە تێپەڕبوونی بە دەربەندی مەگار ڕێگەی دیکە نییە، ئەو دەربەندە وەك بەرزەخێك وابوو، کەوتبۆوە نێوان دوو دەریا و مەردۆنیۆس دەیزانی دەبێت لەو شوێنە ڕێگە لە لەشکری یۆنانی بگرێت.

مەردۆنیۆس چاوەڕوانی هێرشی ئێسپارت بوو بۆ سەر ئەسینا، بەشێك لە هێزەکەی خۆی لە ئەسینا هێشتەوە، لەگەڵ یەکەکانی دیکەی لەشکرەکەیشی بەرەو بەرزەخی مەگار ڕۆیشت، بەرزەخی مەگار بەرزەخێکە لە ڕۆژهەلات بۆ ڕۆژئاوا درێژ بۆتەوە، ئەو کەسەی بیەوێت لەو بەرزەخە ڕێگەی تێپەڕبوونی لەشکرێك بگرێت، دەبێت لە باکورەوە باشووری ئەوێ بگرێت، مەردۆنیۆسیش بە هەمان شێواز لە باکور بۆ باشوور ناوچەیەکی کۆنترۆڵ کرد، کە کەس نەیدەتوانی لێی تێپەڕ ببێت، تەنیا ناوچەیەکی زەلکاوی باریك و تەریب بە کەنارەکانی لە باکور داگیرنەکرد، چوونکە هەر کەسێك بەوێدا ڕۆیشتبایە، لە زەلکاوەکە ڕۆدەچوو، داگیرکردنی ئەو ناوچە زەلکاوییە لەلایەن سەربازەکانی مەردۆنیۆس قورس و مەترسیدار بوو، چوونکە ئەوان نەیاندەتوانی لەنێو قوڕ و پیسیدا بژین، مەترسیشیان هەبوو، کە بە وتەی یۆنانییەکان دووچاری نەخۆشی زەلکاوەکان واتە مەلاریا ببن، مەردۆنیۆس بۆ ئەوەی سەربازەکانی دووچاری گرفت و نەخۆشی نەبن، نەیویست ئەو شوێنە داگیر بکات، متمانەی هەبوو کە لەشکری کلۆم برۆتۆس ئەگەر بێتە ئەو ناوچەیە لە زەلکاوەکەدا لەنێو دەچن.

لەشکری کلۆم برۆتۆس بۆ گەیشتن بە وڵاتی ئاتیك بە پەلە ڕێگەیان دەبڕی، کاتێك گەیشتنە بەرزەخی مەگار، ئەو ڕێگەیە گیرابوو. کلۆم برۆتۆس چاوەڕوان نەبوو، کە مەردۆنیۆس لەوێدەر ڕێگەی لێ بگرێت، پێی وابوو فەرماندەی لەشکری بەربەرەکان هێندە

ئەقڵی نییە تا لە مەگار ڕێگەیان لێ بگرێت، بۆیە وا بیری دەکردەوە کە لەشکری هەخامەنشیی لە ئاتیك دووچاری پشۆکان دێن لە بینینی ئەوان.

ئەو هیچ چارەی دیکەی نەبوو، جگە لەوەی بە جەنگ ڕێگەی خۆی بکاتەوە و بگاتە ئاتیك، یاخود بگەڕێتەوە بۆ پلۆپۆنز و چاوەڕوانی دەرفەتێکی دیکە، بەڵام نەیدەویست بگەڕێتەوە بۆ پلۆپۆنز، بۆیە بڕیاری جەنگی دا، لەشکری کلۆم برۆتۆس لە سی هەزار سەرباز پێکهاتبوو، کە پازدە هەزاریان لە هیپ لۆپەکان، واتە سەربازە ئاسنینەکان بوون، کە بە باشترین سەربازی یۆنانی ناسرابوون.

کاتێك خەشایار گەڕایەوە، تەواوی چەکە قورسەکانی بەجێ هێشت، مەردۆنیۆس مەنجەنیق و گالیسکەی جەنگی و لەشکری سوارە و پیادەی هەبوو، ژمارەی سەربازەکانی مەردۆنیۆس بە تەواوی نازانین، ئەو ژمارانەی مێژوونووسە یۆنانییەکان باسیان دەکەن، زێدەڕۆییان تێدایە، تەنیا بە لێکدانەوە دەڵێین مەردۆنیۆس خاوەنی پەنجا تا شەست هەزار[1] سەرباز بووە، بەڵام هەموویان لە مەگارە نەبوون، بەشێك لە لەشکرەکەی لە ئەسینا مابۆوە.

سوارکارەکانی مەردۆنیۆس کەوتبوونە باکوری مەیدانی شەڕ و لای ڕاستیان پێکهێنابوو، لە باکوری ئەوان ناوچە زەلکاوییەکە بوو، کە کەس توانای پەڕینەوەی لەوێندەر نەبوو، پیادەکانیش کەوتبوونە ناوەڕاست و دڵی شەڕگە، باشووری شەڕگە و لای چەپیش هی گالیسکەکان بوو. مەردۆنیۆس مەنجەنیقەکانی لە پێش پیادەکان و لە دڵی شەڕگە دانابوو تا

---

(١) (زەبیحوڵڵا لە باسی هاتنی لەشکری خەشایاردا ژمارەی هەشتا هەزار سەرباز بۆ لەشکرەکەی ئەو بە دروست دەزانێت، بەردەوام دووپاتی دەکاتەوە کە یۆنانییەکان زێدەڕۆییان لە دەرخستنی ئەو ژمارانەدا کردووە، بەڵام وەك لەو پەڕتووکەدا باسی دەکات، کە لە هەردوو جەنگی تەرمۆپیلێ و تێلکۆ ژمارەیەکی باش لەسەربازانی خەشایار کوژراون، دواتر لە جەنگی دەریایی سالامیس ئەو سەربازانەی خەشایار کە بە مەبەستی پیادە بوون لە ڕۆژئاوای ئاتیك بە دەریادا ڕۆیشتن، هەر هەموویان لەنێوچوون، لەسەرجەمی چوار سەد کەشتی تەنیا بە وتەی زبیحوڵڵا بیست و پێنج کەشتی گەڕایەوە، دواتر زەبیحوڵڵا دەڵێت خەشایار نیوەی لەشکرەکەی کە نێزیکەی ٥٠ تا ٦٠ هەزار کەس بوو لە ئاتیك بۆ مەردۆنیۆس بەجێ هێشت، بەو پێوەرە تەنیا ئەگەر کوژراوەکان بە سی هەزار وەربگرین، دەبینین کە لەشکری خەشایار لە هاتنی بۆ یۆنان بە لانی کەم نێزیك سەد و پەنجا هەزار و پتر بووە. وەرگێڕی کوردی.

یۆنانییەکان بەردباران بکەن، بەڵام بەرانبەر سوارە و پیادەکان مەنجەنیق نەبوو، مەردۆنیۆس نەیدەویست مەنجەنیقەکان ڕێگر بن لە گالیسکە و سوارکارەکان بۆ کاتی هێرش بردن، زانراوە هێرشی گالیسکە و سوارەکان زۆر خێرایە، یەکێك لەو هۆکارانەی کاریگەریی ئەوان پتر دەکات، ئەگەر مەنجەنیقەکان لە پێش ریزی ئەوان بووایە، کاتی پێویست بوو تا پێش ئەوان چۆڵ بکەن تا ڕێگە ببێتەوە.

لەو ڕۆژەی لەشکری هەخامەنشیی هاتنە نێو خاکی یۆنان، تەنیا لە گەلیی تێلکۆ، بە پێچەوانەی ئاراستەی ئاو توانیان کەمێك سوود لە گالیسکەکانیان ببینن، کە چەکی ئاگرینی ئەوان بوو، بەڵام تێلکۆ ناوچەیەکی شاخاوی بوو، گالیسکەکان بە ئاسانی بەکار نەدەهاتن، بەڵام مەردۆنیۆس لە مەگار زەوی تەختی لەبەردەست بوو، توانای سوودوەرگرتنی تەواوی هەبوو لە گالیسکەکان.

کلۆم برۆتۆس فەرمانی بە هێزەکانی دا هێرش بکەن، سەربازە هۆپ لیتەکان دەستیان کرد بە هێرش لە دژی پیادەکانی هەخامەنشیی و قەڵغانەکانیان خستەسەر سەریان بۆ ئەوەی ئەو بەردە گەورانەی لە مەنجەنیقەکان هەڵدەدرا، بەریان نەکەوێت، دوای گەیشتنیان بە مەنجەنیقەکان، هێندەی توانیان تێکیان شکاندن تا نەبنە مایەی زیان گەیاندن بەو سەربازانەی لە دوایانەوە دەهاتن، دوای تێپەڕبوون لە مەنجەنیقەکان هێرشیان کردە سەر سەربازەکانی هەخامەنشیی.

جیاوازیی جلوبەرگ و باڵای دوو لەشکرە هێرشبەر و پیادەکە بە شێوەیەك بوو، کە کەس لە ناسینیان دووچاری هەڵە نەدەبوو.

هۆپ لیتەکان بەرگی یەکگرتووی ئاسنین و کاسکێتی پەڕداریان لەبەر بوو، هەخامەنشییەکان باڵاپۆشی درێژ و یەکگرتووی لەشکری خۆیان لەبەربوو، کە پێکهاتبوو لە عەبایەکی درێژی خۆڵەمێشی، پانتۆڵێکی شین، هەندێك لە سەربازەکان لەسەر عەباکانەوە زرێیان لەبەر بوو، کە تا کەمەریان دەهات، هەندێکی دیکەیان زرێیان لەبەر نەبوو، تا جەستەیان قورس نەبێت و بە ئاسوودەیی شەڕ بکەن.

هۆپ لیتەکان بە شمشێری درێژ دەجەنگان و قەڵغانیان پێبوو، سەربازە هەخامەنشییەکانیش قەڵغانیان هەبوو، قەڵغان وێڕای ئەوەی جەستەی ئەوانی دەپاراست،

دەبۆوە ڕێگر بۆ پیاوێکی شەڕکەر و چالاك، ئەوانەی متمانەیان بە ئازایەتیی خۆیان هەبوو، پێیان باشتر بوو کە بەبێ قەڵغان بجەنگن.

هۆپ لیتەکان باش و بە ڕێکوپێکی دەجەنگان، ئەگەر پێویست بووایە ریزەکانیان دەکردەوە ڤالانژ، بەڵام ئەو کاتانەی دەترسان دوژمن لە پشتەوە هێرش بکات، ڤالانژیان دادەمەزراند، لە سەرەتای هێرشەکەیان بۆ سەر هەخامەنشییەکان مەترسی هێرشیان لە پشتەوەڕا نەبوو، بۆیە لە هێڵێکی ڕاستدا دەجەنگان.

لەو ڕۆژەوە کە هاتبوونە یۆنان، یەکەمجار بوو سەربازە هەخامەنشییەکان بتوانن لە ریزێکی درێژ و لە شەڕگەیەکی بەریندا لەگەڵ هۆپ لیتە یۆنانییەکاندا بجەنگن.

لە گەلیی تەرمۆپیل، مەیدانی شەڕ بەرتەنگ بوو، سەربازە پیادەکانی هەخامەنشیی نەیاندەتوانی خۆیان بڵاوبکەن، سەربازە یۆنانییەکانیش هەر بە هەمان شێوە، شاخ لە لایەك و خەرەند لە لایەکی دی دەرفەتی ئەوانی بەرتەسك کردبۆوە، لە گەلیی تێلکۆش هەر وەك باسکرا، بەڵام دۆخی بەرزەخی مەگار جیا بوو، پانتایی مەیدانی شەڕ زۆر بوو، هەردوولا دەیانتوانی بە ئاسانی هێزی خۆیان بخەنە ڕوو.

لەشکری یۆنان نە سوار و نە گالیسکەیان هەبوو، بەڵام کلۆم برۆتۆس دەیزانی لەشکری هەخامەنشیی لە لای ڕاستیان سوارکار و لە لای چەپیان گالیسکەی جەنگیان هەیە.

کلۆم برۆتۆس لە کاتی ئاساییدا پیاوێکی بە دەنگەدەنگ بوو، بەڵام هەر کە جەنگ دەستی پێدەکرد، هێندە ئارام و لە سەرخۆ دەبوو، کە پێدەچوو زمانی نەبێت، وەك ئەوەبوو کە تەواوی هێز و توانای ئەو بۆ ئەقڵ و بیرکردنەوە بێت، هێزێکی بۆ هەرا و هاوار کردن نەدەمایەوە.

دوای ئەوەی کلۆم برۆتۆس گەیشتە لەشکری هەخامەنشیی، بینی ئەوان گالیسکەیان لەلایەك و سوارکاریان لە لایەکەی دیکە هەیە، لە ماوەیەکی کەمدا هێندەی دەیتوانی بەو کەرەستانەی بەردەست دەکەوتن بەربەستی لە بەرانبەر ئەسپ سوار و گالیسکەکان دامەزراند، سەربازە یۆنانییەکان بە یارمەتی دانیشتووانی ناوچەکە دارە کورتەکانیان بڕین، وەك پەرژینێکی کورت لە زەویدا چەقاندیانن تا پێش لە گالیسکەکان بگرن و ڕێگربن لە تێپەڕبوونیان.

کلۆم برۆتۆس دەیزانی هەرچەندە گالیسکەکان چەکی زۆر کاریگەرن، بەڵام بەربەستێکی بچووکی وەك پەرژین یاخۆ قۆڵتێك دەتوانێت ڕێگر بێت لە تێپەڕینی، ئەو دەرفەتی نەبوو لە

پێش ئەواندا خەندەق هەڵکەنێت، بەڵام دەیزانی بە داکوتانی پەرژین لە زەویدا دەتوانێت ڕێگریان بێت و یەك پەرژینی ئاوا بچووك دەتوانێت گالیسکەکان، کە بە ئەسپە خێراکان دەجووڵان لەکار بخات، ئەو هێندەی ترسی لە گالیسکەکان هەبوو لە سوارکارەکان نەدەترسا، دەیزانی مەترسی ئەوان بۆ سەربازە پیادە یۆنانییەکان کەمترە لە مەترسی گالیسکە جەنگییەکان.

سەربازە یۆنانییەکان بە هۆی ڕاهێنانی بەردەوام توانیبوویان هونەرەکانی جەنگ کردن لە بەرانبەر ئەسپ سوارەکان فێربن، لە شەڕەکاندا سوودیان لێ دەبینی، بەڵام ڕێگرتن لە گالیسکەکان بە بێ ئەو بەربەستانەی لە زەوی دادەنرێن، بۆ ئەوان کارێکی سەخت بوو، بۆیە کلۆم برۆتۆس هێندەی لە توانای بوو لە لای ڕاستی لەشکرەکەی کە دەبۆوە بەرانبەری لای چەپی لەشکری دوژمن بەربەستی بۆ گالیسکەکان چێ دەکرد.

بۆ ئەوەی بتوانین دۆخی شەڕگە لەنێو مێشکماندا ببینین، بە خێرایی دەڵێین مەیدانی شەڕ لە باکور بۆ باشوور بوو، سوارکارە هەخامەنشییەکان لە باکور خودان زەلکاوان بوون، پیادەکانیان لە باشووری سوارەکان و گالیسکەکانیش لە باشووری پیادەکان بوون. بەرانبەر ئەو سێ بەشە لەشکری پیادە یۆنانییەکان دەبینران، بۆیە هەخامەنشییەکان لە ڕۆژهەڵات، یۆنانییەکانیش لە ڕۆژئاوا بوون.

لە سەرەتاوە دەردەکەوت جەنگەکە زۆر سەخت دەبێت، لە هەردوو بەرە دیار بوو کەس نەرمی بەرانبەر ئەویدیی نانوێنێت. کلۆم برۆتۆس دەیزانی بۆ گرتنەوەی ئاتیك، پێویستە لەشکری مەردۆنیۆس لەنێو ببات، مەردۆنیۆسیش دەیزانی بۆ ئەوەی لەنێو نەچێت، دەبێت لەشکری ئەوان لەنێو ببات.

مەردۆنیۆس هەموو گالیسکە و سوارەکانی خستە دۆخی ئامادەباشی تەواو، سوارەکانیشی ڕاسپارد تا وێڕای هێرشیان بۆ سەر پیادە یۆنانییەکان، ڕێگەی ئەوان بدەن تا بە باکوردا تێپەڕ بن، مەبەستی ئەوە بوو یۆنانییەکان بچنە نێو زەلکاوەکە و لەنێو بچن، بەڵام ئەوان خەڵکی ئەو دەڤەرە بوون، لە زەلکاوەکە ئاگەدار بوون.

گالیسکەکان لە لای باشووری هێزەکەیانەوە بە شێوەیەك کەوتنەڕێ کە وەك تیرێك وابوون، کە لە کەوان دەرچووبێت، خەڵکی ئێستە بە تەواوەتی ڕاهاتوون لەگەڵ ئەسپان، ئەگەر بمانەوێت ئەسپێك بێنینە بەرچاو، ئەسپێکی نێوقەد باریکی لادێکان، کە لە گۆڕەپاناندا غار دەدات،

ناتوانین ئەسپەکانی گالیسکە جەنگییەکانی ئەوی گاڤان بێنینە بەرچاوان، ئەسپی گالیسکەکان، هەرچەندە ڕووەکیان دەخوارد، بەڵام وەك دڕندان ترسیان و تۆقیینیان دەنایەوە، هەر ئەسپێك لە شەو و ڕۆژێکدا پازدە کیلۆ جۆ و کشمیشیان دەخوارد، بەردەوام لە سەرکێشیی بوون، جگە لە لێخوڕی گالیسکەکە کەسی دیکە نەیدەتوانی ئەسپەکە بخاتەڕێ.

کاتێك چوار ئەسپی بەهێز و گەنج و سەرکێش بە گالیسکە دەبەسترانەوە، ئەگەر لێخوڕێکی نەناسراو هاتبایە سەر گالیسکەکە، ئەوان لەپڕ دەکەوتنە جووڵە، هیچ شتێك توانای نەبوو ڕێیان لێ بگرێت، خۆیان لە هەموو شتان دەدا، بێتە سەر ڕێگەیان، تا دەمردن یاخۆ لێخوڕەکەیان دەکوشت، بۆیە تەنیا لێخوڕی خۆیان، توانای ئاراستەکردنی ئەو ئاژەڵانەی هەبوو، کە لە دڕندان دەچوون.

کاتێك ئەسپی گالیسکەکان بە نەعرەتەی لێخوڕی گالیسکە لە گۆڕەپانی جەنگدا دەکەوتنەڕێ، وەك ئەوە وابوو، کە چوار شێری تووڕە بەدەم نەڕاندنەوە بکەونە ڕێ، هەر کەسێك کەوتبایە بەر دەمیان لەژێر سمی ئەسپەکان، ئێسکەکانی تێك دەشکا، گالیسکەکە هێندە دەڕۆیشت تا گۆڕەپانی شەڕی تەواو دەکرد، ئەو کات لێخوڕەکەی جڵەوی ئەسپەکانی ڕادەکێشا، دوای ڕاگرتن دەیگەڕاندنەوە.

گزنفۆن پیاوی سیاسیی و سەربازی و مێژوونووسی ناسراوی یۆنانی وتەیەکی خستە نێو خەڵك، لە پاش ئەو نووسەرانی دیکە زۆر بەکاریان هێنا، کە بریتییە لە: "ترسناك وەك گالیسکەکانی ئێران"، کاتێك لەپڕ لە مەیدانی شەڕدا چەند سەد گالیسکە دەکەوتنە ڕێ، ئەو کەسەی لە تەنیشت مەیدانی شەڕ دەوەستا و ئەو دیمەنەی دەبینی، بە خۆی دەوت لە جیهاندا هێزێك نییە بتوانێت ڕێ لەوانە بگرێت، بەڵام لەو ڕۆژەوە کە لە دنیا شەڕ هەیە، لە دژی هەر چەکێك، چەکێکی دیکە بۆ بەرگری دانراوە، ئەو ڕۆژە کاتێك گالیسکە هەخامەنشییەکان کەوتنە جووڵە تا پیادە یۆنانییەکان لەنێو ببەن، بە هۆی ئەو پەرژینە کورت و بەهێزانەی کلۆم برۆتۆس لە زەویدا چەقاندبوونی، گالیسکەکان تێکشکان، هێندە بەس بوو تا قاچی یەك لە ئەسپەکان بەر یەك لەوان بکەوێت و دەست بەجێ قاچی دەشکا و دەوەستا، بەو هۆیەوە سێ ئەسپەکەی دیکە لە جووڵە دەکەوتن و گالیسکەکە دەوێستا یاخۆ ئەگەر تایەی گالیسکەکە بەر یەك لەو پەرژینانە کە وەك تیر بوون بکەوتایە، تایەکە دەشکا و سەرنشینەکانی گالیسکەکە دەکەوتنە سەر زەوی.

یۆنانییەکان لە جەنگدا گالیسکەیان بەکارنەدەهێنا، بە وتەی پرۆفیسۆر بارنی بەریتانی، بۆ ئەوان تەنیا هۆکار ئەوە نەبوو، کە گالیسکەکان خاڵی لاوازیان هەبوو، بگرە کەم دەرامەتی خەڵکی یۆنانیش ڕێگر بوو لەو کارە، وەك چۆن لە سەردەمی ئێستەدا هەندێ نەتەوە بە هۆی گرانی چەك، ناتوانن ببنە خاوەنی چەکی سەردەم. یۆنانییەکان بە هۆی کەمدەرامەتی نەیاندەتوانی گالیسکەی جەنگی ئامادە بکەن، چوونکە خەرجی ئەوانە بە شێوەی بەردەوام و ساڵانە زۆر بوو، بۆ هەر گالیسکەیەك، بەردەوام بەخێوکردنی چوار ئەسپ و مانگانە و خەرجی مەیتەرێکی پێویست بوو، ئەسپەکانی گالیسکەکان دەبووایە بەردەوام گەنج بن، کاتێك تەمەنیان دەبۆوە شەش ساڵ دەگواسترانەوە بۆ بەشەکانی دیکەی لەشکر و ئەسپی گەنجی دیکە دەهاتە جێیان.

بە وتەی بارن یۆنانییەکان ئەوکات هێندە کەم دەرامەت بوون، توانای ڕاگرتنی ئەسپیان نەبوو، بەڵام دواتر دەبینرێت، کە نەتەوەکانی یۆنان سوارکاریان پێکهێنا، لە شەڕە ناوەخۆییەکانی پلۆپۆنز سوارەکان ڕۆڵی خۆیان بینی، ئەسکەندەر کاتێك هێرشی کردە سەر ئێران، هەزاران سواری هەبوو، بەڵام چوونکە تەواوی توانای یۆنانییەکان بۆ ڕاهێنانی هێزی پیادە بوو، ئەمە وایکرد پیادەکانیان لێهاتوویی جەنگییان زۆرتر بێت، بۆیە دەیانتوانی پێش بە سوارەکان بگرن.

هاوکات لەگەڵ تێکشکانی گالیسکەکانی مەردۆنیۆس بە هۆی بەرکەوتنیان بە پەرژینەکان یاخۆ شکاندنیان بە دەستی پیادە یۆنانییەکان، هێرشی سوارەکان بە تەور و گورزەوە دەستی پێکرد، ئەوان بۆیە سوودیان لە تەور و گورز وەردەگرت، چوونکە بەشێك لە سەربازەکانی کلۆم برۆتۆس لە هۆپ لیتەکان بوون و زرێیان لەبەر بوو، شمشێر کاریگەریی لەسەر ئەوان نەبوو، سوارە ئێرانییەکان دەبووایە بە تەور و گورز هەوڵی لەکار خستنی ئەوان بدەن.

کلۆم برۆتۆس سەربازەکانی خۆی لە بەرانبەر سوارەکانی مەردۆنیۆس بە شێوەی ژووژك دامەزراند، بەڵام ئەوانی کرد بە دوو ڕیز، ریزی یەکەم لەسەر ئەژنۆ، ریزی دووەمیش بە پێوەبوون، هەر دوو ریز نێزەی درێژیان بەرانبەر بە سوارەکان ڕاگرتبوو، کاتێك سوارەکان دەگەیشتنە شوێنی شەڕکردن، بە لانی کەم نێزەیەك لە جەستەی ئەسپەکانیان رۆدەچوو یەکسەر ئەسپەکە دەکەوت، لەگەڵ کەوتنی ئەسپەکە جەستەی سوارەکەی سەریشی کون کون دەکرا بە نووکی نێزەکان، بەڵام سوارەکان بە بێ ترس لە نێزەکان، هێرشیان دەکرد و بە تەور و گورز نێزەکانیان دەشکاندن یاخۆ بە زەربەی نێزەکان ئەسپەکان و خۆیان دەکوژران.

گووشاری سوارەکانی هەخامەنشیی، بۆوە هۆی تێکشکانی پیادە یۆنانییەکان لە باکور، کلۆم برۆتۆس بۆ ئەوەی ڕێگر بێت لە کوژرانی سەربازەکانی، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد، تا لە باشوور بکشێنەوە، بەڵام لە دڵی شەڕگەدا پیادە یۆنانییەکان گووشاریان خستبۆوە سەر پیادەکانی مەردۆنیۆس، ئەویش دەیبینی کات تێدەپەڕێت، بیری کردەوە ناتوانێت پێش هاتنی ئێوارە، ئامانجی کۆتایی جەنگەکەی دەست کەوێت.

خەشایار کاتێك یۆنانی جێهێشت، مەردۆنیۆسی کردە فەرماندە، پێی ڕاگەیاند کە لە ماوەیەکی کەمدا هێزی یارمەتیدەری بۆ دەنێرێت، بەڵام پاشای ئێران ناردنی هێزی لە ڕێگەی وشکانی بە باش نەزانی، چوونکە دوای شکستی سالامیس هەڵوێستی پاشاکانی تسالی و مەکدۆنیا بەرانبەر خەشایار شا گۆڕابوو، هەرچەندە بە فەرمی دژایەتیان ڕانەگەیاند، لێ ئەوان یۆنانین و دەمارگیری نەتەوەییان هەبوو، لەوانە بوو ڕێی هێزە یارمەتیدەرەکەی ئێران بگرن کە دەبێت بە تسالی و مەکدۆنیادا بڕوات یاخۆ لەنێویان بردبا.

خەشایار دەیزانی دەبێت پەلە بکات لە ناردنی هێز، چوونکە ئەگەر پەلەی نەکردبایە لەوانە بوو یۆنانییەکان لەشکری مەردۆنیۆس لە ئاتیك لەنێو ببەن، بۆ ئەوەی یۆنانییەکان نەتوانن ڕێگەی ئەو هێزە بگرن و لەنێوی ببەن، بڕیاریدا هێزەکە لە ڕێگەی دەریا ڕەوانە بکات، بۆ ئەم مەبەستەش دەبووایە لەلایەن کەشتییە جەنگییەکان بە توندی پاسەوانی بکرێن، چوونکە لەوانە بوو هێزی دەریایی یۆنان پێشیان پێ بگرێت، کەشتییە پاسەوانەکانی ئێران دەبووایە هێندە بەهێز بن، کە بتوانن لە کەشتییە یۆنانییەکان بدەن.

خەشایار هەموو کەشتییەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ئێژە کۆکردەوە و بە ئەفسەرێك لە بنەماڵەی هەخامەنشیی سپارد، کە ناوی (گۆدام) و تەمەنی (٢١ یاخۆ ٢٢) ساڵ بوو، یەك لە ئەفسەرە بە تەمەنەکانی هێزی دەریایی وەك ڕاوێژکار بۆ ئەو دیاری کرد، چوونکە دەیزانی بۆ دەریاوانی و جەنگی دەریایی، تەنیا ئازایەتی و سەرکێشی گەنجانە بەس نییە، ئەزموونیش زۆر گرینگە، هۆکاری هەڵبژاردنی (گۆدام) بۆ ئەو پۆستە دەگەڕایەوە بۆ سەرکێشی کردنی ئەو بە هۆی تەمەنی گەنجی و لەگەڵ گەیشتنی بە یۆنانییەکان سەرکێشی دەکرد و دەکەوێتە شەڕکردن وەك کەسێکی بە تەمەن خۆی لە چاوەڕوانیدا نەدەهێشتەوە.

دەڵێن ئەگەر ئەسکەندەر لە نۆزدە ساڵیدا بۆ گەشتوگوزار ڕۆیشتبا و لە چل ساڵیدا بۆ جەنگ لەگەڵ داریوشی سێیەم ڕۆیشتبا، هەرگیز نەیدەتوانی پێ بخاتە خاکی ئاسیا، چوونکە

بەپێی ئەزموون نەدەبوو لەگەڵ پاشایەکدا بجەنگێت، کە ئیمپراتۆرییەتەکەی کەوتووەتە نێوان دەریای مەدیتەرانە و ڕووباری سێند و دەتوانێت سەدان هەزار سەرباز لە وڵاتانی بەردەستی کۆبکاتەوە، بەڵام چوونکە تەنیا نۆزدە ساڵی بوو، هێشتا خاوەن ئەزموون نەبوو، کەوتەڕێ و هاتە نێو ئاسیا و بەرەو پێش چوو.

خەشایاریش کە لە خەمی شکستی جەنگی سالامیس لە ئازاردا بوو، ئەفسەرێکی بۆ فەرماندەیی هێزی دەریایی هەخامنشی هەڵبژارد، کە هیچ لێکدانەوە و خۆپارێزییەك ئەو لە جەنگ کردن ڕانەگرێت.

تۆسیدید دەڵێت خەشایار چل هەزار سەربازی بە گۆدام سپارد تا بیانباتە یۆنان و بیانکاتە بەشێك لە لەشکری مەردۆنیۆس، چوونکە تۆسیدید ڕاستگۆترین مێژوونووسی یۆنانییە، دەبێت ئەو ژمارەیەی وتوویەتی پەسەند بکەین، بە تایبەتی ئەو ژمارە زێدەڕۆیی پێوە دیار نییە و دەتوانین بە ئەقڵ پەسەندی بکەین.

گۆدام بە فەرمانی خەشایار لەگەڵ سەد کەشتیی جەنگی و چەندان کەشتی دیکە هەڵگری سەربازەکانی بوون لە بەندەری (لێس بۆس)[٢] کەوتەڕێ تا خۆی بگەیەنێتە ئاتیك، کە سوپای بچووکی هەخامەنشیی لێبوو، دوو ڕێگە بۆ ڕۆیشتن و گەیشتن بە ئاتیك لە بەردەم ئەو گەنجە بوون:

ڕێگەی نێزیك بۆ گەیشتن بە وڵاتی ئاتیك ئەوەبوو، کە دەریاسالاری ئێرانی بە ناوەڕاستی دوورگەکانی (سیکلاد)دا بڕوات و خۆی بگەیەنێتە کەنارەکانی ڕۆژئاوای ئاتیك، بەڵام ئەگەر ئەو ڕێگەیەی گرتبایە دووچاری هێزی دەریایی یۆنانییەکان دەبوو، چوونکە سیکلاد شوێنی لەنگەرگرتنی بەردەوامی ئەوان بوو.

ڕێگەیەکی دیکە ئەوە بوو کە گۆدام دەیتوانی هێزەکەی خۆی لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی دەریای ئێژە و تەریب بە کەنارەکانی ئێستەی وڵاتی تورکیادا تێپەڕ بکات و نیوە بازنەیەکی فرەوان ببڕێت تا بگاتە باشووری یۆنان، دواتر سەربازەکانی لە کەناری ڕۆژئاوای ئاتیك دابەزێنێت. ئەو ڕێگەیەی هەڵبژرادبایە ڕێگەکەی دوورتر بوو، بەڵام ئەو سوودەی هەبوو کە تەنیا لە کاتی

---

(٢) ئێستەش ئەو دورگەیە لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ئێژە لە نێزیك کەنارەکانی ئاسیای بچووك دەبینرێت، ئەو دورگەیە ناوبانگی زۆری هەیە لە ئەفسانە کۆنەکانی یۆنان کە بابەتی سەرەکییان بریتییە لە شەڕەکان و دڵداری نێوان خوداوەنن" زەبیحوڵڵا".

پەڕینەوە لە گەرووی سالامیسدا هێزی دەریایی یۆنان دەکەوتە سەر ڕێگەی تا خۆی بگەیەنێتە کەناری رۆژئاوای ئاتیك، بەڵام لەوکاتەدا یۆنانییەکان هێزی کاریگەریان لە گەرووی سالامیس نەبوو، چوونکە لەیچندەر چاوەڕوانی هاتنی دوژمن نەبوون، گریمان ئەگەر لە سالامیس یۆنانییەکان هێزی دەریایی کاریگەریشیان هەبووایە، گۆدام چارەیەکی دیکەی نەبوو، جگە لە ئەوەی بچێتە نێو گەرووی سالامیس، چوونکە بۆ گەیشتن بە کەناری رۆژئاوای ئاتیك، ناچار بوو بچێتە نێو ئەو گەرووە.

گۆدام کاتی بەرێکەوتن هەوڵیدا دانیشتووانی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك ئاگەداری جووڵەی کەشتییەکانی نەبن، چوونکە ئەستەم بوو، جووڵەی سەد کەشتیی جەنگی و ژمارەیەك کەشتیی سەرباز هەڵگر سەرەنجی ئەوان ڕانەکێشێت، ئەوانیش هەواڵی هاتنی ئەو لەشکرە دەریاییە بە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە شارەکانی یۆنان، بە تایبەتی ئاتیك نەگەیەنن. لە نێوان دانیشتووانی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك و دەوڵەتە شارەکانی یۆنان بە تایبەتی ئاتیك و دوازدە دوورگەکە و دوورگەکانی سیکلاد بە بەردەوامی پێوەندییەکی نەپساوە هەبوو، یەکێك لەو دوازدە دوورگەیە هێندە لە کەنارەکانی تورکیا نێزیکە، کە لە دوورگەکەوە ئەگەر کەسێك بە دەنگی بەرز بانگ بکات، لە کەنارەکانی بەرانبەری گوێبیستی دەبن. ئەوکات دەتواندرا لە رێگەی بەلەمەوە پەیامێك بە پەلە لە دوورگەیەك بۆ دوورگەیەکی دیکە بگوازرێتەوە تا دەگاتە یۆنان، بۆیە گۆدام بە شێوەیەك دەجووڵا، کە ئەوان هەستی پێ نەکەن، تەنانەت بۆ عەمبارکردنی ئاویش لەو دوورگانە لای نەدا، بەڕادەیەك نهێنی پارێزی کرد کە لە هێزەکەیدا هیچ مەلەوان و سەربازێك نەیدەزانی مەبەستی ئەو لەشکرە گەیشتنە بە کەنارەکانی ئاتیك، هەمووان پێیان وابوو کە بەرەو وڵاتی میسر دەڕۆن، تەنیا فەرماندەی کەشتییەکان ئەو بابەتەیان دەزانی.

وێرای ئەوەی گۆدام نەیدەویست تەنانەت بۆ وەرگرتنی ئاوی خواردنەوەش لە دوورگەکان بوەستێت، بەڵام پێویستیی نوێکردنەوەی ئاوی خواردنەوە ناچاری کرد لە دوورگەیەکی بچووك بوەستێت، دیارە کە مەلەوان و سەربازەکانی کە ماوەیەکی زۆر بوو لە کەشتیدا بوون، لە وشکانی دابەزین، هەر کەسێك لە دانیشتووانی ئەوێ کاتێك لێیان دەپرسین بۆ کوێ دەچن؟ وەڵامیان دەدایەوە کە بۆ میسر دەڕۆن.

دوای ئەوەی گۆدام دوازدە دوورگەکەی بەجێهێشت، هێندە بەرەو باشوور ڕۆیشت تا گەیشتە دوورگەی کریت، بیٚ ئەوەی لەوێندەریش بوەستێت، ڕێگەی باکوری بەرەو یۆنان گرتەبەر، بە درێژایی کاتی ئەو گەشتە جەنگییە، تەنانەت یەك کەشتیی یۆنانیش نەهاتە سەر ڕێگەی گۆدام تا گەیشتە ئەو کەنداوەی کە گەرووی سالامیسی کەوتبۆوە نێو لە نێوان ئاتیك و دوورگەی سالامیس بوو، دوای گەیشتن بەو کەنداوە دەریاسالاری گەنجی هەخامەنشیی ئارایشی کەشتییەکانی کە تا ئەوکات ئارایشی گەشت بوو، گۆڕی بە ئارایشی جەنگی، گۆدام هەموو کەشتییە جەنگییەکانی لە پێشەوە دانا و کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی لە پشت ئەوان دانا تا نەکەونە بەر مەترسی هێرشی کەشتییە یۆنانییەکان.

هەموو فەرماندەکانی کەشتییە سەربازهەڵگرەکانی هەخامەنشیی دەیانزانی ئەگەر لەگەڵ هێزی دەریایی یۆنانی بکەونە بەرانبەر یەکدیی، پێویستە سوود لە کات وەربگرن و خۆیان بگەیەننە نێزیکترین کەنارەکانی ئاتیك و سەربازەکانیان لە ئەویٚ دابەزێنن تا بگەنە ئەو لەشکرەی هەخامەنشیی کە لەوێیە. شەوێك لەکاتی ڕێکردنی کەشتییەکانی هەخامەنشیی لە دەریادا لە دوورەوە ڕووناکی کەشتییەك کەوتەبەر دیدەی ئەوان، هێدی هێدی لە هێزی دەریایی هەخامەنشیی نێزیك بۆوە، لەپڕ ڕووناکی کەشتییەکە کەم بۆوە، ئەوە نیشاندەری ئەو بابەتە بوو کە گەڕاوەتەوە.

گۆدام فەرمانی کرد یەکێك لە کەشتییە خێراکان بە دوای بکەوێت و بیوەستێنێت، چوونکە گەڕانەوەی ئەو کەشتییە نیشاندەری ئەوە بوو کە کەشتییە هەخامەنشییەکانی ناسیوە، هەرچەندە شەوەزەنگ بوو، بەڵام لە نێزیکەوە پەیکەر و چارۆگەکانی کەشتییە هەخامەنشییەکان لەژێر چەتری ئاسمان دەردەکەوت، کەسێکی ورد و زانا دەیتوانی بزانێت کە ئەوانە کەشتیی یۆنانی نین.

گرتنی ئەو کەشتییە بۆ گۆدام زۆر گرینگ بوو، فەرماندەی ئەو کەشتییەی ئەرکی گرتنی کەشتییە یۆنانییەکەی پیٚ سپێردرا، هێندەی پێویست بوو سەربازی برد تا ئەگەر شەڕ ڕوویدا، بتوانێت ناچاریان بکات خۆیان ڕادەست بکەن. کەشتییە هەخامەنشییەکە خۆی گەیاندە کەشتییەکە و ڕێگەی لێگرت، سەربازە هەخامەنشییەکان ڕۆیشتنە نێو کەشتییەکە و فەرماندەی کەشتییەکەیان گرت، دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە ئەوانی ناسیوە، بەپەلە ویستوویەتی هەواڵ بۆ یۆنانییەکان ببات. دوای ئەوەی فەرماندەی کەشتییە یۆنانییەکەیان

بردە لای گۆدام و ئەو پرسیاری لێ کرد کە بۆ کوێ دەچوو کاتێك بە بینینی کەشتییەکانی ئەوان گەڕایەوە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە دەچۆوە پلۆپۆنز.

گۆدام وتی: بۆ دەتەویست بچی بۆ لای ئەو؟

ئەو وتی: دەچوومە ئەوێ تا بۆ کلۆم برۆتۆس یارمەتی بێنم.

گۆدام ناوی کلۆم برۆتۆسی بیستبوو، دەیزانی ئەفسەرێکی پایەبەرزی یۆنانییە، لە یۆنانییەکەی پرسی، ئایا لە ئاتیك لەگەڵ هەخامەنشییەکان دەجەنگێت؟

ئەویش وەڵامیدایەوە: ئەو لە مەگار لەگەڵ هەخامەنشییەکان لە شەڕدایە.

گۆدام دەیزانی ئەوێ لە نێوان ئاتیك و پلۆپۆنزە، هەر کەسێك لە ڕێگەی وشکانی بیەوێت لە یەکیانەوە بچێتە ئەویدی، دەبێت بەو شوێنەدا بڕوات، لە کاتی لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوت هەخامەنشییەکان لە ئاتیك دەرچوون و شەڕ لە مەگارە درێژەی کێشاوە، هیچ کامیان توانای شکست دانی لایەنەکە دیکەی نییە، کلۆم برۆتۆس بۆ ئەوەی بتوانێت ئەوان بشکێنێت، بەو کەشتییە کە خێراتر دەڕوات داوای یارمەتی کردووە.

لە وتەکانی فەرماندەی کەشتییە یۆنانییەکە گەیشتە ئەو ئاکامە، کە ئەگەر سەربازەکانی لە مەگارە دابەزێنێت باشترە تا بیانباتە ئاتیك، ئەوان لە مەگارە ڕاستەوخۆ دەتوانن یارمەتی مەردۆنیۆس بدەن، دواتر کەوتە لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵێك بابەتی دیکە کە بە کورتی بریتی بوون لەو خاڵانەی خوارەوە:

**یەکەم:** ئایا لە کەنارەکانی مەگارە کەشتیی جەنگی یۆنانی لێیە یان نا؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی کاتێك من لەوێ دەرچووم، کەشتیی جەنگی لێ نەبوو، بەڵام دوای دەرچوونم لە ئەوێ لەوانەیە کەشتییە جەنگییەکان چووبن بۆ ئەو شوێنە.

**دووەم:** گۆدام پرسیاری لە یۆنانییەکە کرد ئایا لەسەر ڕێگەی ئەوان کەشتیی یۆنانی لێیە یاخۆ نا؟ ئەویش وەڵامی دایەوە لە ڕێگە کەشتیی لێ نییە، بەڵام لە کەنارەکانی سالامیس کەشتیی زۆری لێیە.

**سێیەم:** لە یۆنانییەکەی پرسی هەخامەنشییەکان کەوتوونەتە کام لای مەیدانی شەڕ؟ یۆنانییەکە دەیزانی ئەگەر وەڵام نەداتەوە یاخۆ درۆی لەگەڵدا بکات سزا دەدرێت، بۆیە بە ڕاستی وەڵامی دایەوە و وتی ئەوان لە ڕۆژهەڵاتی مەگارن.

چوارەم: دوایین پرسیار بریتی بوو لەوەی ئایا کام کەنارە باشترە تا هێزەکەی لێ دابەزێنێت، تا بگاتە ئەو بەشەی مەگار کە هەخامەنشییەکانی لێیە؟ بۆ جاری دووەم فەرمانەدی کەشتییە یۆنانییەکە ڕاستگۆیانە وتی کەنارەکانی پیلۆزۆن بۆ پیادەکردنی هێزەکان باشن، چوونکە کەنارەکانی لماوین و تاشەبەرد لە کەنارەکانیدا نییە، ئەگەر لە کاتی پیادەبوونی هێزەکانیان دەریا شەپۆلاوی ببێت، تەنیا مەترسی ئەوەیە کە کەشتییەکان لە لم رۆدەچن و بەر بەردەکان ناکەون و نقوومی ئاو نابن.

دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکە فەرماندەی کەشتییە یۆنانییەکە داوای کرد تا خۆی و کەشتییەکەی ئازاد بکەن.

گۆدام وەڵامی دایەوە و وتی: "چوونکە تۆ بۆ داواکردنی هێزی یارمەتیدەر دەچی، ناتوانم ڕەزامەندی بدەم لەسەر ئازاد کردنت، لەگەڵ خۆمدا دەتبەم، بەڵام دڵنیات دەکەمەوە، کە دوای ئەوەی هێزەکەم لە مەگارە پیادەبوو، چوونکە پێ دەچێت پیاوێکی ڕاستگۆ بی، ئازادت دەکەم، "دوای ئەوە کەشتییە جەنگییەکان، لە دواشیانەوە کەشتییە سەرباز هەڵگرەکان کەوتنەرێ، بەڵام لە جیاتی بۆ ئاتیك بچن، ڕاستەوخۆ بەرەو مەگار رۆیشتن.

هەر ئەو رۆژەی کەنارەکانی مەگار لە دوورەوە دەرکەوتن، چەند کەشتییەکی یۆنانیش دەرکەوتن، بەڵام هەر کە کەشتییە هەخامەنشییەکان لەسەر دەریاکە دەرکەوتن و لەلایەن یۆنانییەکانەوە بینران، ڕاستەوخۆ کەشتییە یۆنانییەکان ڕێڕەویان گۆڕی، چوونکە ڕێگەی باکور بەرەو کەنارەکان دەچوو، چوونکە دەیانزانی هێزەکەیان لە بەرانبەر هێزی گۆدام زۆر لاوازە و ناتوانن شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بە ناچاری بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتن، هەر هەمان رۆژ بەشی یەکەمی سەربازە هەخامەنشییەکان لە کەنارەکانی پیلۆزین دابەزین و خۆیان گەیاندە ئەو سەربازانەی دیکەی هەخامەنشیی کە لەو ناوچەیە بوون.

هیچ زانیاریمان لەبارەی رۆژی گەیشتنی ئەو سەربازانە نییە بە پیلۆزین، چوونکە مێژوونووسە یۆنانییەکان نەیاننووسیوە، سەرچاوە ئێرانییەکانیش بە دەست هێرشبەرانەوە لەنێو چووە[٣]، بەڵام دەزانین ئەوان لە هاوینی ساڵی (٤٧٨ پ. ز) گەیشتوونەتە ئەو شوێنە،

(٣) هەموو رووداوەکانی وڵاتی گەورەی ئێران لە شێوەی نووسراو لەسەر شاخ و تاشەبەردەکان هەڵکەندرا بوون، بەڵام زۆرینەی ئەو شوێنەوار و بەڵگەنامانە لەنێوچوون. پێویستە بڵێین لەنێوچوونی بەڵگەنامە

دوای دابەزینی ئەو چل هەزار سەربازە لە پیلۆزێن، بارودۆخی جەنگ بە سوودی هەخامەنشییەکان گۆڕا، ئەو سەربازانەی تازە هاتبوون بە ورەی بەرز کەوتنە یارمەتیدانی ئەوانی دیکە.

ئەوان لە ڕێگەی دەریاوە هاتبوون، کاتێك قاچیان نایە سەر زەوی، وەك هەر گەشتیارێکی دیکە کە لە دەریا بووە، دوای دابەزین دەزانێت کە زەوی لەژێر قاچی ناجولاێت، هەستیان بە خۆشی کرد و بە شادمانییەوە کەوتنە جەنگ. گۆدام بەپێی فەرمانی خەشایار شا هەموو هێزەکەی خستە ژێر فەرماندەیی مەردۆنیۆس، ئەویش دوای ئەوەی لەگەڵ هێزە تازەکە هێرشی کرد، توانی یۆنانییەکان بۆڕ بدات و بەشێکیان بەرەو زەلکاوەکانی باکور ببات، ئەو زەلکاوانە ئێستە نەماون، بە هۆی زێکێشی وشك بووە، ئێستە ناوچەیەکی کشتوکاڵییە، بەڵام لە ڕابردوودا ناوچەیەکی مەترسیدار بوو، ئەو سەربازە یۆنانییانەی ناچارکران بەرەو ئەویَ بچن، هەموویان لەنێو چوون یاخۆ بە سەختی توانیان خۆیان ڕزگار بکەن و لە باکوری مەگارەوە بگەنە دەریا.

بەشێکی دیکەی هێزی یۆنانییەکان بە هۆی گووشاری زۆری هێزی هەخامەنشییەوە، ناچار بوون بەو ڕێگەیەدا بگەڕێنەوە کە پێیدا هاتبوون، واتە بەرەو پلۆپۆنز گەڕانەوە. لە کاتی پاشەکشەدا کلۆم برۆتۆس فەرماندەی لەشکری یۆنان بە هۆی ڕمێك کە بۆی هاویشترا، بەر سینگی کەوت و مرد.

تەرمی ئەو کەوتەدەست لەشکری هەخامەنشیی، مەردۆنیۆس وتی ئەو پیاوە سەردارێکی ئازایە و پێویستە ڕێزی ئازایەتی ئەو ڕابگیرێت، وتی با یۆنانییەکان بێن و تەرمی سەردارەکەی خۆیان وەربگرنەوە، یۆنانییەکان تەرمی ئەویان کە فەرماندەیەکی هەڵکەوتوو بوو، وەرگرتەوە و بردیان لە پلۆپۆنز ناشتیان.

---

مێژووییەکانی ئێران، بەردەوام بە هۆی ڕق و دژایەتی و بە دەستی ئەنقەست نەبوون، هەندێکات نەزانی هۆکار بووە. ژاك دوو مۆرگانی فەرەنسی کە یەکەم کەسە کاری هەڵکەندنی لە وێرانەکانی شووش کردووە، نووسیویەتی: هەر گەشتیارێك بە پێرس پۆلیسدا دەڕوات، بە ئەرکی دەزانێت کە بەلانی کەم بەردێك لە بەردێکی دیکە جیا بکاتەوە و یارمەتیدەر بێت لە وێرانکردنی پتری پێرس پۆلیس، بۆیە دەڵێن هەندێ لە ئێرانییەکانیش بە هۆی نەزانینەوە بوونە هۆی لەنێوچوونی نووسراوەکان(زەبیحوڵلا).

مەردۆنیۆس دوای دەرکردنی یۆنانییەکان لە مەگار، هەوڵی نەدا بەدوویان بکەوێت و بچێتە پلۆپۆنز لە باشووری یۆنان، چوونکە فەرمانی لە خەشایار پێ گەیشتبوو، کە بە لەشکرەوە بگەڕێتەوە. خەشایار ئاگەدار بوو لە سەرکەوتنی لەشکرەکەی لە یۆنان و پێویستی بەو لەشکرە بوو لە شوێنی دیکە، بۆیە فەرمانی کرد مەردۆنیۆس لە یۆنان بگەڕێتەوە و سەربازەکانی بهێنێتەوە، دەبێت بزانرێت کە دوای سەرکەوتنی مەردۆنیۆس لە مەگار، خەشایار شا جەنگی یۆنانی بەکۆتا هاتوو دانا و تێگەیشت تۆڵەی شکستی سالامیس کراوەتەوە. مەبەستی خەشایار وەستاندنی یۆنانییەکان بوو، جەنگی مەگار سەلماندی کە تا ماوەیەکی درێژ یۆنانییەکان توانای جەنگیان لەگەڵ هەخامەنشییەکان نابێت.

هۆکارەکانی گەڕانەوەی لەشکری هەخامەنشیی لە یۆنان بەوتەی خۆیان، لەوانیش وەك گزنفۆن دەڵێت :

لەو رۆژەوە کە لەشکری هەخامەنشیی هاتنە یۆنان هیچ دەسکەوتیان نەبوو، چوونکە خەشایار شا دوای هاتنی بۆ نێو خاکی یۆنان، تەنیا دەیویست ئەسینا تەمبێ بکات، یۆنانییەکانیش سیاسەتی (زەوی سووتاو)یان بەرانبەر بە ئەوان پیادە کرد، ئەوەی بە کەڵکی لەشکری هەخامەنشیی دەهات، لەنێویان برد یاخۆ لەگەڵ خۆیان دەبرد، بۆیە پێداویستییەکانی لەشکری خەشایار دەبووایە لە دوورەوە بە کەشتیی بهێندرێت، ئەوەش تێچووی زۆر قورسی خستەسەر خەشایار.

توسیدید دەڵێت هەر سەربازێکی هەخامەنشیی رۆژانە یەك داریك خەرجی پێویست بوو. ئەگەر سکەی زێڕی ئەوکات بە پێوەری ئێستە پێنج گرام بووبێت و بەهای دراویش لە (٢٥٠٠) ساڵ بەر لە ئێستە زۆر پتر بوو، دەتوانین بڵێین تێچووی لەشکری خەشایار بە تایبەتی دوای هاتنی چل هەزار سەربازی دیکە بۆ یۆنان پشت شکێن بووە، خەشایار لە شەڕی یۆنان هیچ داهاتێکی ڕاستەوخۆی نەبوو، چوونکە هیچ دەسکەوتێکی جەنگی بەجێ نەمابوو. مەبەستی ئەو تەنبێ کردنی ئەسینا بوو، کە لە شەڕی مەگار هاتەدی، ئیتر بیانۆیەك بۆ مانەوەی لەشکرەکەی لە یۆنان نەبوو، بە تایبەتی کە لە شوێنی دیکە پێویستی بەو لەشکرە هەبوو. خەشایار دڵنیابوو سەرکەوتنی یۆنان پێوەستە بە دەریا، نەك وشکانی، تا ئەو کاتەی نەبێتە خاوەن لەشکرێکی بەهێزی دەریایی، ناتوانێت هێزی خۆڕاگری ئەوان لەنێو ببات.

لە هەموو جەنگەکانیان لەگەڵ یۆنانییەکاندا، خەشایار بۆی دەرکەوت سەربازی یۆنانی خۆڕاگر و ئازا و نیشتمان پەروەرە و بە ئاسانی ناتوانرێت شکست بدرێت، ئەو دیاردەیە بەو واتایە نایەت کە سەربازی ئێرانی خۆڕاگر و ئازا نەبوون، چوونکە سەربازی یۆنانی لە مەیدانەکانی جەنگ لە نیشتمانی خۆیدا دەجەنگا، هیچ سەرکردەیەکی سەربازی نییە، کە ئەو ڕاستییە رەت بکاتەوە کە ئەو سەربازانەی لە نیشتمانی خۆیاندا بۆ بەرگری لە خاکەکەیان دەجەنگن، لە سەربازانی هێرشبەر خۆڕاگرتر بن.

یۆنانییەکان لە بواری ئەدەبیاتدا لە وڵاتانی هاوسەردەمی خۆیان لە پێشتربوون، خاوەن ئەدەبیاتێکی نیشتمانپەروەری بوون لەو بوارەدا، هەموو ژن و پیاوانی ئەو وڵاتە لە منداڵییەوە بە نیشتمانپەروەری گۆش دەکران، عیشقی نیشتمان بەشێك بوو لە دەروونیان. لە هەندێ لە دەوڵەتە شارەکانی یۆنان وەك ئێسپارت و پلۆپۆنز، نیشتمانپەروەری وەك ئاین بوو، لایەنگرانی ئەو ئاینە وەك تاقمی (خوداوەندانی ئەلجەزایری) لە سەدەی نۆزدەیەم بوون، ئامادەبوون لە بەرانبەر هەموو سەختی و ئەشکەنجەیەك بۆ نیشتمانەکەیان خۆڕابگرن و گیانیان بسپێرن و خۆیان بە دەستەوە نەدەن. بەو هۆیەوە بوو کە خەشایار شا دوای جەنگی مەگارە بە باشی زانی کۆتایی بە جەنگی یۆنان بێنێت.

ئەو دەیزانی کە یۆنانییەکان بەو زووانە خۆیان ناگرنەوە، بەڵام سەرئەنجام خۆدەگرنەوە، لە لایەکی دیکە ئەو مەترسییە بۆ لەشکری هەخامەنشیی لە کاتی مانەوەیان بۆ ماوەی درێژ لە یۆنان هەبوو، کە دەوڵەتە شارەکانی وەك تسالی و مەکدۆنیا کە تا ئەوکات دۆستی ئەوان بوون، لەوانە بوو لەشکری هەخامەنشیی بشکێنن و خەشایار خوازیار ئەو دۆخە نەبوو.

لە ڕاستیدا سەرکەوتنی مەردۆنیۆس لە مەگار بیانوویەکی باشی دایە دەست خەشایار بۆ گەڕاندنەوەی لەشکری هەخامەنشیی لە یۆنان، دەزانین کە خەشایار خوازیار نەبوو یۆنان بکاتە بەشێك لە خاکی ئیمپراتۆرییەتەکەی، تەنیا لەسەر ڕاسپاردەی باوکی واتە داریوشی یەکەم بۆ تەنبێ کردنی ئەسینا، لەشکرکێشیی بۆ یۆنان کرد.

لەشکری مەردۆنیۆس دوای جەنگی مەگار بە رێگەی وشکانیدا دەستی بە گەڕانەوە کرد، چوونکە ئەوکات بە هۆی هاتنی چل هەزار سەربازی تازە بۆیان، لەشکرەکەیان هێندە بەهێز ببوو کە ئەگەری مەترسی رێگرتنی لەشکرەکەی لەلایەن تسالی و مەکدۆنیا وەلا دەنا و ئەو لەشکرە توانای شکستدانی ئەوان یاخۆ لێدانی گورزی توندی هەبوو، ئەوان بە ئارەزووی

خۆیان یاخۆ بە ناچاری ڕێگەی لەشکری هەخامەنشییان نەگرت و هێزی دەریایی هەخامەنشیش بە سەرکردایەتیی گۆدام تەریب بە ئەوان لە دەریادا دەگەڕایەوە.

هیرۆدۆت کە زمانی فارسی بە باشی زانیوە، جارێکی دیکە ڕاستییەکانی شێواندووە و دەڵێت یۆنانییەکان لەشکری هەخامەنشییان لەو وڵاتە وەدەرناوە. دیسان دەڵێینەوە هیرۆدۆت لە لایەك بە ڕەگەزنامە بە ئێرانی دەناسرا، چوونکە لە دایکبووی شاری هالیکارناس بوو، کە ژێردەستەی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی بوو، تا تەمەنی بیستساڵیش لەوێ ژیاوە و هەر لەو شارەش زمانی فارسی فێر بووە.

هیرۆدۆت لە ساڵی (٤٨٤ پ. ز) لە دایکبووە، کاتی هاتنی لەشکری خەشایار لە تەمەنی (٤ یاخۆ ٥) ساڵیدا بووە. ئەگەر لە ڕێگەی مێژووی ژیانی ئەو نەمانزانیبایە کە زمانی فارسی زانیوە، لە ڕێگەی نووسراوەکانی ئەو بابەتەمان بۆ دەردەکەوت، چوونکە لە چەند پەڕتووکی خۆیدا باس دەکات کە زمانی فارسی زانیوە. ئەو لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا شوێنی لە دایکبوونی خۆی بەجێ هێشت و بەرەو ساردی پایتەختی لیدی ڕۆیشت تا لەوێوە بۆ ئێران بڕوات. لە ماوەی ئەو دە ساڵەی کە سەرگەرمی گەشتەکەی بوو، سێ ساڵی لە ناوچە جیاکانی ژێردەستی هەخامەنشییەکان بوو، حەوت ساڵیش لە وڵاتانی دیکەی بردەسەر و تا ماوەیەکی درێژیش لە میسر مایەوە، لەو پەڕتووکانەی هیرۆدۆت لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە سەبارەت بە ئێرانییەکان دوو بیرۆکەی دژ بەیەك دەبینرێت:

لە بەشێك لە پەڕتووکەکانی کە برێتین لە گەشتنامەی هیرۆدۆت، ئێرانییەکان کەسانێکن ڕاستگۆ، خۆش گوفتار، میهربان، میوان دۆست، قسەخۆش و غەوارانیشیان لاواندوتەوە، دەڵێت جوانترین ژنانی جیهان لە ئەوێن، لەوێندەر خواردەمەنی هەرزان و زۆرە، جگە لە ریش و سمێڵی پیاوانی ئەوێ، هیچ کەموکورتییەکی دیکە نییە، بەڵام لە بەشێکی دیکە لە نووسینەکانی ئەودا ئێرانییەکان گیراوەیەکن لە خراپترین پێکهات و خەسڵەتەکان کە لەوانەیە لە کۆمەڵگەیەکی دڕندەیدا بوونیان هەبێت، ئەو ناکۆکییە لە بیروڕاکانی، ئەو بیرۆکەیەی هێنایە کایەوە، کە لەوانەیە کەسێکی دیکە پەڕتووکە مێژووییەکانی ئەوی نووسیبێت، بەڵام شێوازی نووسینی ئەو بیرۆکەیە ڕەتدەکاتەوە و مرۆڤ دەکەوێتە سەرسووڕمانەوە کە کام یەك لەو دوو ڕایەی ئەو ڕاستن.

توسیدید دەڵێت لە ساڵی (٤٤٥ پ. ز) لەگەڵ باوکم بۆ بیستنی وتاری هیرۆدۆت رۆیشتین، بە ڕادەیەك وتارەکەی کاریگەریی لەسەر من هەبوو کە گریام، ئەوکات هیرۆدۆت پیاوێکی سی و نۆ ساڵان بوو، هەر لەو ساڵەدا ئەنجومەنی ئەسینا دە تالانی دایە هیرۆدۆت تا پێداویستییەکانی ژیانی پێ دابین بکات.

تا ساڵی (٤٣٤ پ. ز) کە هیرۆدۆت دەگاتە تەمەنی پەنجا ساڵی ئاگەداری ژیانی ئەوین، بەڵام دوای ئەو مێژووە نازانین ئەو نووسەر و ئەدیب و مێژوونووسە چی لێهات و وتارەکانی چیان بەسەر هات، ساڵی (٤٢٥ پ. ز) کە مرد، ئاگەداریمان لەبارەی ئەو نییە. ئەو لە کاتی نووسینی گەشتنامەکەی خۆشحاڵە کە ئێرانییە، بەڵام دوای گەڕانەوەی لە ئێران داوای لە ئەسینا کرد تا رەگەزنامەی ئەو وڵاتەی پێ بدەن و بووە هاووڵاتی ئەو دەوڵەتە شارە.

ئەو کەسانەی ژیاننامەی هیرۆدۆتیان نووسیوە و ئێمە بینیوومانن، ئەو بە هەڵکەوتوو دەناسن و وتوویانە یەکەمین کەسە کە زانستی مێژوونووسی دامەزراندووە، یەکەم کەسە کە مێژووی لە ئەفسانە دابڕیوە، یەکەم کەسیشە کە تا بەڵگەنامەی بۆ ڕووداوە مێژووییەکان نەبووبێت یاخۆ بابەتەکەی نەبینی بێت، باسی لێوە نەکردووە، تا ئەم دواییانەش ئەوانەی دەیانەویست لەبارەی یەکەمین پاشاکانی زنجیرەی هەخامەنشییەوە بابەتێك بنووسن، نەوەد لە سەدەی زانیارییەکانیان لە هیرۆدۆت وەردەگرت، هێشتاش لە ئەورووپا کەسانێك هەن کە وابیر دەکەنەوە کە ئەوەی هیرۆدۆت نووسیویەتی دوورن لە گومان. بە هەمان شێوە کە تا سێ سەد ساڵ بەر لە ئێستە کەس نەیدەوێرا بیرۆکەکانی ئەرستۆ رەت بکاتەوە، وتەی ئەرستۆی لە بواری فەلسەفەدا وەك سرووش دەناسی، لە ئەورووپاش دەیانگوت لە مێژووودا ناکرێت هیرۆدۆت رەت برێتەوە، هەرچی وتوویەتی ڕاستی تەواوە، هیچ یەك لەوانەی ژیاننامەی هیرۆدۆتیان نووسیوەتەوە، نەیانویستووە سەرەنج لە وتە دژبەیەکەکانی ئەو لەبارەی ئێرانییەکان بدەن.

ماوەی نێوان سەردەمی ژیانی هیرۆدۆت لەگەڵ کوروش و داریوش و خەشایار زۆر لە یەك دوور نەبووە، بە گریمانی ئەوەی ئێرانییەکان گۆڕا بن، هیرۆدۆت لەو کاتەی خەشایار ئەسینای داگیرکرد، چوار یاخۆ پێنج ساڵان بوو، ئەو کاتەی ئەو چوو بۆ ئێران، تەنیا ساڵێك بەسەر کوژرانی خەشایار و هاتنی ئەردەشێری کوڕی بۆ سەر تەختی پاشایەتیدا تێپەڕی بوو.

ئەردەشێر لە ساڵی (٤٦٤ پ. ز) بوو بە پاشای هەخامەنشیی، هیرۆدۆت لە (٤٦٣ پ. ز) کەوتەڕێ، بۆیە دەتوانین بڵێین کە ئەو هاوسەردەمی خەشایار بووە، تەنانەت بە نێزیکەیی دەتوانرێت

بە هاوسەردەمی داریوشی یەکەم و کەمبۆجیە و کوروشی بناسین، چوونکە لە ماوەی پاشایەتیی ئەو سێ پاشایانەش زۆر تێنەپەڕی بوو، هیرۆدۆت خۆی دەڵێت لە ئێران سێ کەسم بینی کە راستەوخۆ (کوروش و کەمبۆجیە و داریوش)یان بینی بوو، لەوانەیە هیرۆدۆت کە مێژوونووس و لێتۆژ بووە لەبارەی ئەوان پرسیاری لەو سێ کەسە کردبێت و زانیاریی وەرگرتبێت.

# ماسیس تەس برای خەشایار

هیرۆدۆت مێژووی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی و پێوەندییەکانی یۆنان و ئەوانی تا ڕووداوی میکاڵ نووسیوەتەوە، ڕووداوی میکاڵ کە تا ئەو دواییانەش لای ئەورووپاییەکان زۆر گرینگی هەبوو بە درێژی لەلایەن هیرۆدۆت نووسراوەتەوە، لە بەرانبەردا سەبارەت بە ئاکامەکانی هەڵەی کردووە.

بە وتەی ئەو لە جەنگی میکاڵ هێزی دەریایی هەخامەنشییەکان بۆ هەردەم لەنێوچوو، هەخامەنشییەکان ناچار بوون سەر بخەنەوە ناو ماڵی خۆیان و لە قووڵایی ئاسیادا خۆیان حەشار بدەن و بۆ جارێکی دی بیر لە هێرشکردنە سەر یۆنان نەکەنەوە، ئەو جەنگە بۆ هەردەم هێلاسی (یۆنان) لە چەنگ بەربەرەکان رزگار کرد.

لە کاتێکدا کە ڕاستییە مێژووییەکان بە وتەی خودی مێژوونووسە یۆنانییەکان پێچەوانەی ئەو نووسینەی هیرۆدۆت پشتڕاست دەکاتەوە، دوای ڕووداوی میکاڵ دەسەڵاتیی هەخامەنشییەکان لە یۆنان پەرەی سەند، پاشاکانی هەخامەنشیی توانیان سیاسەتی ئەو وڵاتە بگرنە دەستی خۆیان. ئێستە باشتر وایە کە بزانین ئەو ڕووداوە چ بووە و بۆ زانینی ئەمەش، پێویستە بزانین کە میکاڵ کەوتووەتە کوێوە؟

ئەگەر بڕوانینە نەخشەی ئاسیای بچووك، واتە تورکیا و دوورگەی سامۆس لە نێزیك کەنارەکانی ئەوێ بدۆزینەوە، دەبینین کە بەرانبەر ئەو دوورگەیە و لە وشکانیدا، لووتکە شاخێك هەیە و زێی (مەندەرۆس) لە باشووری ئەو شاخەوە تێپەڕ دەبێت و دەچێتە ناو دەریا، ئەو لووتکە شاخاوییە ناوی میکاڵە و لە نێوان ئەوێ و دوورگەی سامۆس، گەروویەك هەیە، لە ساڵی (٤٧٨ پ. ز) هەندێك لە کەشتییە جەنگی و بازرگانییەکانی هەخامەنشیی لە بەرانبەر میکاڵ، لە گەرووی نێوان ئەوێ و دوورگەی سامۆس لەلایەن کەشتییە یۆنانییەکان لەنێو بردران، بەڵام هیرۆدۆت دەڵێت هەموو کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی لە دوای گەڕانەوە لە یۆنان لەلایەن کەشتییە جەنگییەکانی یۆنانەوە لەنێو بردران، بەڵام کاتێك هێزی دەریایی هەخامەنشیی و لەشکرە وشکانییەکەی کە لە یۆنان بوون پێکەوە گەڕانەوە، تا

نەگەیشتنە بیزەن تیۆم (ئیستانبوڵی ئێستە) و گەڕووی بسفۆر، نەچوونە ئاسیای بچووك و ئەو شوێنانەش لەگەڵ ناوچەی میكاڵ كە لە ئاسیای بچووكە زۆر لەیەك دوورن.

لەوانەیە پرسیار بكرێت ئەی چ ڕوویدا كە هەندێك لە كەشتییە جەنگی و كەشتییە بارهەڵگرەكانی ئێران چوونە بەرانبەر ئەو لووتكەیە؟، هەڵبەتە لەشكری هەخامەنشیی پێداویستییەكانی خۆیان لە یۆنان، بە تایبەتی لە دەوڵەتە شاری ئاتیك لە ڕێگەی دەریا و لە دەرەوەی یۆنان بەردەست دەكرد. ڕوونە كە لەشكری وشكانی و هێزی دەریایی هەخامەنشیی ئەو پێداویستییانەیان لە ئاسیای بچووكەوە دەبرد، چوونكە ئاسیای بچووك ژێردەستەی هەخامەنشییەكان بوو، لەوێندەر هەموو جۆرە خۆراك و پێداویستییەك زۆر بوو، نێزیكترین وڵاتی خۆمانە بوو بۆ ئەو دوو لەشكرەی هەخامەنشیی، بۆیە ئەوان خۆراك و پێداویستییەكانیان لەوێوە بە كەشتیی بۆ یۆنان دەگواستەوە، شوێنەكانی نێزیك زاری زێی مەندەرۆس ببوونە بازاڕی فرۆشتنی ئەو پێداویستییانە.

دەستەیەك كەشتیی بارهەڵگر بە پشتیوانی دەستەیەك كەشتیی جەنگی هەخامەنشیی و بە فەرماندەیی (ماسیس تەس) برای خەشایارشا هاتنە ناو میكاڵ تا خۆراك و پێداویستییەكانیان لە ئەوێ بكڕن.

هەموو كەشتییە بازرگانی و بارهەڵگرەكانی هەخامەنشیی، كە لە نێوان ئاسیای بچووك و یۆنان هاتوچۆیان دەكرد، بەردەوام لەلایەن هێزی دەریایی هەخامەنشییەوە پاڵپشتی دەكران و لەژێر پارێزگاری ئەواندا دەجووڵان، زانراوە كە یۆنانییەكان لە دەریادا بەهێز بوون و ئەوان بە دەوڵەتێكی دەریایی گەورە هەژمار دەكران.

وێڕای ئەوەی شێوازی باركردن لە كەشتییە بارهەڵگرەكان پێشكەوتنی بە خۆوە بینیوە، دیسان ماوەیەك دەخایەنێت تا پرۆسەی باركردن تەواو ببێت چجای ئەو سەردەمە. بە سەرەنجدان لەوەی میكاڵ ئەسكەلەی نەبوو، باریان بە بەلەم دەگواستەوە بۆ كەشتییەكان تا بە پالآن (باری بەرز دەكردەوە) بارەكان لە كەشتییەكان بار بكەن، ئەو كاتەی كەشتییە بارهەڵگرەكانی هەخامەنشیی سەرگەرمی باركردنی بارەكانیان بوون، دەستەیەك كەشتیی جەنگی یۆنانی لە میكاڵ نێزیك كەوتنەوە، ماسیس تەس فەرماندەی هێزە دەریاییەكەی هەخامەنشیی كە هاوكات فەرماندەی كەشتییە بارهەڵگرەكانیش بوو، فەرمانیدا تا كەشتییە جەنگییەكانی بۆ پێشگرتن لە كەشتییە جەنگییە یۆنانییەكان بكەونەڕێ.

هیرۆدۆت نووسیویەتی ماسیس تەس برای خەشایار بوو، لەو باتەوە هیچ گومانمان نییە، هەڵبەتە ئەو لە جەنگی تەرمۆپیێڵ بەشدار بوو، فەرماندەی سوپای هەشتەمی هەخامەنشیی بوو، پێش ئەوەی لەگەڵ خەشایار شا بچێتە ئەو جەنگە فەرمانڕەوای وڵاتی باختەر (باکتریا) بوو، کەواتە ئەگەر ئەو فەرماندەی کاروانە دەریاییەکە بووبێت، چوونکە ئەو لە بابی خەشایار و لە ئاتووسای دایکی ئەو بوو، دەبێت بڵێین کە دابینکردن و گەیاندنی خۆراك و پێداویستییەکانی دیکە بۆ لەشکری هەخامەنشیی لەلایەن هێزی دەریاییەوە بۆ خەشایار شا زۆر گرینگ و ژیاری بووە، بۆیە خەشایار شا براکەی خۆی بۆ ئەو کارە دیار کردووە، فەرماندەیی هێزی دەریایشی بە گەنجێکی وەك گۆدام سپاردووە.

ئەگەر ماسیس تەس برای خەشایار بووبێت، دەبێت پشتڕاستی بکەینەوە کە خۆی فەرماندە بووە و سەر بە گۆدام نەبووە، چوونکە ئەستەم بوو شازادەیەکی وەك ماسیس تەس کە برای پاشا بێت بخەنە ژێر دەستی پیاوێك کە لە روانگەی پلە و پایەوە ناگاتە ئەو.

مێژوونووسەکانی دیکەی یۆنان نووسیویانە کە دوای لەنێوچوونی هێزی دەریایی هەخامەنشیی (واتە تەنیا بەشێك لە هێزەکە کە بەرپرس بوون لە دابینکردنی خۆراك و ئالیك) لە جەنگی میکاڵ، ماسیس تەس برای خەشایار کە خۆی فەرماندەی هێزی دەریایی بوو، هەواڵی ئەو شکستەی لە شاری سارد گەیاندە پاشا.

ئەگەر ئەو خۆی فەرماندەی ئەو هێزە بووبێت، چۆن بە زیندوویی مایەوە؟ چوونکە بە وتەی یۆنانییەکان هێزی دەریایی هەخامەنشیی بە تەواوەتی لەنێوچوون هەموو ئەفسەر و مەلەوانەکان کوژران یاخۆ بە دیل گیران، ئەی ماسیس تەس چۆن توانی خۆی ڕزگار بکات و بچێتە سارد بۆ لای پاشای برای و هەواڵی شکستی بۆ ببات.

ئایا ناکرێت بیر بکرێتەوە کە هیچ کەس نەیدەوێرا هەواڵی لەنێوچوونی کەشتییە جەنگی و بارهەڵگرەکانی هەخامەنشیی لە ناوچەی میکاڵ بگەیەنێتە خەشایار، تەنیا براکەی نەبێت کە لە لای ئەو زۆر خۆشەویست بووە؟

فەرماندەی کەشتییە جەنگییەکان، کەشتیگەلی خۆی لە شوێنی لەنگەرگرتنیان هێنایەدەر، بەرەو کەشتییە جەنگییە یۆنانییەکانی بردن، هەرچەندە بە وتەی هیرۆدۆت، هێزی ئێرانییەکان لە هێزی یۆنانییەکان لاوازتر بوون، بەڵام مەردانە لەگەڵ کەشتییە یۆنانییەکان جەنگان.

له تەواوی ئەو سەردەمانەی هێزی دەریایی یۆنان بەهێزتر بووە لە هێزی دەریایی هەخامەنشییەکان، لە هەموو جەنگە دەریاییەکاندا هەخامەنشییەکان خۆیان لاوازتر هاتووەتە بەرچاو، بۆیە زۆر ئازا و مەردانە جەنگاون، تا دوا هەناسە بەرگریان کردووە.

لە جەنگی میکالێدا ئەو دیمەنانە دووبارە بوونەوە، جارێکی دیکە لە گۆڕەپانی کەشتییەکان خوێن ڕژایەوە، لاشەکان خرانەوە نێو دەریا تا شوێن بۆ بەردەوامبوونب جەنگ هەبێت، هەموو ئەفسەر و مەلەوانە هەخامەنشییەکان کوژران یاخۆیا بە شێوەیەك برینداربوون، کە توانایان نەما و کەوتن، بەڵام دیل نەبوون، ئەو بابەتە لەلایەن تۆسیدید مێژوونوسی ڕاستگۆی یۆنانی باس کراوە.

ئەو جەنگە کە لەلایەن هیرۆدۆت بە کۆتایی سەردەمی دەسەڵاتیی هەخامەنشیی لەسەر یۆنان ناسراوە، بەڵام بۆ هەخامەنشییەکان شانازییەکی گەورەیە، چوونکە تەواوی سەرباز و مەلەوانەکانی هەخامەنشیی کوژرا و کەس بە سەلامەتی دیل نەکرا، ئەو دیلانەی کەوتنە دەست یۆنانییەکان، هەموویان خزمەتکار و کرێکارانی نێو کەشتییە بارهەڵگرەکان بوون، کە چەکیان لا نەبوو و نەیاندەتوانی بجەنگن.

لە جەنگی میکالێدا کاروانی کەشتییە بارهەڵگرەکانی هەخامەنشیی و کەشتییە پاسەوانەکانیان لەنێوچوون، نەك هێزی دەریایی هەخامەنشیی، ئەو ڕووداوە بۆ کاروانە دەریاییەکە لە میکاڵ چاوەڕوان نەکراو بوو، تا ئەو ڕۆژە یۆنانییەکان نەیانوێرا بوو، لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك هێرش بکەنەسەر کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی، چوونکە ئەو کەنارانە بەشێك بوون لە ئاوەکانی ئێران، وەك ناو ئێران هەژمار دەکران، دوای ئەو جەنگە هێزی دەریایی یۆنان بە ڕادەیەك متمانەی بە خۆی پەیدا کرد کە هێرشیان کردە سەر دوورگەی قوبرس.

دوورگەی قوبرس لە دەریای مەدیتەرانە بەشێك بوو لە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی و ناوەندێکی گرینگی بازرگانی بوو، یۆنانییەکان ئەوێیان بە رکابەری بازرگانی خۆیان دەناسی، دوای ئەوەی هێزی دەریایی هەخامەنشیی لە یۆنان گەڕایەوە و کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی لە جەنگی میکاڵ لەنێوچوون، یۆنانییەکان بڕیاریاندا ئەو دوورگەیە داگیربکەن. هەر بە هەمان شێوە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدە لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی دووەم دا، چوونکە قوبرسیان بە ناوەندێکی گەورەی بازرگانی لە مەدیتەرانەی

ڕۆژهەڵات و بە ڕکابەری بازرگانی خۆیان دەزانی، بیریان کردەوە، کە بە هەر ڕێگەیەك بێت ئەو دوورگەیە لە دەست کۆماری ڤێنیزیا دەربێنن، دواجار پاش شەڕێکی درێژخایەن لەنێو دوورگەکەدا کە ساڵێکی خایاند، ئەو دوورگەیان خستە ژێردەستی خۆیان.

یۆنانییەکان هەموو هەوڵێکیان خستەگەڕ بۆ لەنێوبردنی ڕکابەرە بازرگانییە بەهێزەکەی خۆیان (ئێران) لە قوبرس، لە ساڵی (٤٧٧ پ. ز) بە پاڵپشتی هێزێکی دەریایی گەورە، هێرشیان کردە سەر ئەو دوورگەیە، تا دوایین سەربازی هەخامەنشیی لەو دوورگەیە نەکوژرا، نەیانتوانی ئەو دوورگەیە بگرن.

توسیدید دەڵێت دوای ئەوەی یۆنانییەکان توانیان ئەو دوورگەیە بگرن، سێ هەزار تالان کەلوپەلی بازرگانی هەخامەنشییەکان کەوتە بەردەستی ئەوان. ئەگەر تالان بەپێی بیرۆکەی پرۆفیسۆر بارن بە چوارسەد لیرە هەژمار بکرێت، بە نرخی نێزیکەی ملیۆنێك و دووسەد هەزار لیرە لە کاڵا بازرگانییەکانی هەخامەنشیی کەوتە دەست یۆنانییەکان، بە سەرەنجدان لە بەهای بەهێزی پارەی ئەوکات، دەبێت کاڵایەکی زۆر کەوتبێتە دەست یۆنانییەکان.

دەی نۆنی مێژوونووس دەڵێت: کچێکی جوان بە ناوی پریدیس خەڵکی وڵاتی لیدی بوو، هێندە جوان بوو، کە وشەی جوانی ئیرەیی پێی دەبرد، لە جەژنە مەزنەکانی شاری سارد ئەو کچەیان لەسەر تەخت دادەنیشاند و خەڵك بۆ بینینی جوانی ئەو دەهاتن.

ماسیس تەس برای خەشایار کاتێك چوو بۆ شاری سارد، ئەو کچەی بینی، داخوازی ئەوی لە دایك و باوکی کرد، باوانی ئەویش پریدیسیان بە برای پاشای هەخامەنشیی بەخشی، برای خەشایار لە بەرانبەردا شیربایی بەو کچە بەخشی، کە تا ئەوکات کەس ئەو ڕێژە لە شیربایەی نەبیست بوو، کە کچێك وەری بگرێت. بەپێی وتەی دەینۆن: ماسیس تەس شازادەی هەخامەنشیی، پێنج هەزار گا و مانگای کە لە باختەردا هەیبوو، وەك شیربایی بە پریدیسی بەخشی، ماسیس تەس فەرمانڕەوای باختەر بوو، ویستی ئەو کچە کە هێشتا هاوسەرگیری لەگەڵدا نەکردبوو، لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ باختەر، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات خەشایار شای برای ئەو کچەی بینی و کەوتە بەر دڵی و ڕێگری کرد لە ڕۆیشتنی پریدیس بۆ باکتریا، پەیامی بۆ ماسیس تەس نارد، کە ئەو دەتوانێت هەرکاتێك بیەوێت بڕوات بۆ باختەر، بەڵام پریدیس دەبێت لە سارد بمێنێتەوە.

کەتزیاس دەڵێت کاتێك ماسیس تەس زانی براکەی ی پریدیسە، دەستی لێهەڵگرت، ئەو کچەی بۆ براکەی لە سارد بەجێ هێشت، بەڵام کەتزیاسیش وەك دەی نۆن دەڵێت کە ماسیس تەس کینەی بەرانبەر براکەی لە دڵدا هەڵگرت و بڕیاریدا ئەو ڕۆژەی لە سارد دەڕوات خۆی بکاتە پاشای هەخامەنشیی.

باکتریا یاخۆ باختەر ناوەندێکی مەزنی ئاینی سنووری هەخامەنشییەکان بوو، ئاگرخانەیەکی هەبوو، کە تا ئەو دواییانە مێژوونووسە ئەورووپاییەکان بوونی ئەو ئاگرخانەیان نەدەسەلماند، دواجار دانیاننا بە بوونی ئەو ئاگرخانەیە، کە دوای سەردەمی هەخامەنشیی و ئەشکانییەکان، لە سەردەمی ساسانییەکاندا ناوی لێنرا ئاگرخانەی (بەهار).

لە سەردەمی خەشایار سەرۆکی ئەو ئاگرخانەیە ناوی (پاتید) بوو، لەلایەن پاشای ئێران لەکار لادرا و کەسێکی دیکەی لە شوێن دانرا، پاتید لە داخی لابردنی لەو پۆستە، بە سەختی دڵگران بوو، خۆی لە خەڵك بە دوورگرت و پەنای بردە بەر ناوچەیەکی شاخاوی، بەڵام دانیشتووانی باختەر کە پاتیدیان زۆر خۆش دەویست، ئەویان بە تەنیا جێ نەدەهێشت، بەردەوام سەردانیان دەکرد و دیاریان بۆ دەبرد و پێشنیازیان بۆ دەکرد کە هەر لەو ناوچە شاخاوییە ئاگرخانەیەکی بۆ ساز بکەن، بەڵام ئەو لە ترسی خەشایار و ماسیس تەسی برای ئەو پێشنیازی پەسەند نەدەکرد.

دوای ئەوەی ماسیس تەس لە سارد گەڕایەوە، گەیشتە باختەر، لە یەکەم هەنگاویدا ناردی تا پاتید لە ناوچە شاخاوییەکە بێننەوە و کردیەوە بە سەرۆکی ئاگرخانەکە، گەڕاندییەوە خۆی، سەرۆکی ئاگرخانەکە هاوکات بەڕێوەبەری داراییش بوو، هەموو داهات و بەخششەکانی ئاگرخانە لەژێر چاوەدێری ئەودا خەرج دەکران. ئەو بە دووبارە وەرگرتنەوەی پۆستەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، ماسیس تەس تەنیا بە دانانەوەی ئەو لە شوێنی خۆی نەوەستا، ئەو پێنج هەزار گا و مانگایەی بڕیار بوو بۆ شیربایی پریدیس بنێرێت، بە ئاگرخانەی بەخشی و داوای لە پاتید کرد بۆ پاشایەتیی پاڵپشتی لێ بکات.

کاتێك پاتید زانی ئەو دەیەوێت ببێتە پاشا، دریغی لە یارمەتیدانی نەکرد و بە خەڵکی وت باشترین کەس بۆ پاشایەتیی ئێوە ماسیس تەسە، کە ئێوە بە باشی دەناسێت و هێندە بەخشندەیە کە پێنج هەزار گا و مانگای بە ئاگرخانە بەخشیوە، خەڵك کە زۆر لاگیری پاتید

بوون، پاڵپشتیان لە وتەکەی کرد و ڕەزامەندبوون بەبۆچوونەکەی پاتید، ڕەزامەندی نواند کە ماسیس تەس لە ئاگرخانەدا ڕێوڕەسمی بوون بە پاشا و تاجکردنە سەر بەڕێوە ببات.

ئاگرخانەکانی کۆن گوڵستانیش بوون، لەنێویاندا گوڵ پەروەردە دەکرا، گوڵستانی بەهار هێندە ناسراو بوو، کە پێویست بەباسکردنی ناکات، چوونکە گوڵەکان لە دووەمین مانگی بەهاردا دەپشکوتن، ئاگرخانە زۆر جوان دەبوو، ماسیس تەس بە ڕەزامەندی پاتید بڕیاریدا لە دووەمین مانگی ساڵی (٤٧٦ پ. ز) ئەو ڕێوڕەسمە بەڕێوە ببات، لە ئاگرخانە تاج لە سەری بنێت و سککەی بەناوی خۆی لێدا.

ماسیس تەس دوای ڕێوڕەسمی تاج دانان، داوای لە تەواوی پاشاکانی ناوچەکانی دەوروبەری کرد تا پاشایەتییەکەی بە فەرمی پەسەند بکەن، ئەوانیش پاشایەتیی ئەویان بە فەرمی ناسی. ئەو دەیزانی دوای ئەوەی هەواڵی تاج دانان بگاتە خەشایاری برای، ئەو لە دژیدا پەنا بۆ جەنگ دەبات، بۆیە پێویستە خۆی بۆ جەنگ ئامادە بکات. هەر بۆیە بلەز کەوتە کۆکردنەوەی سەرباز و دابینکردنی پێداویستیی بۆ ئەوان و لە پاشاکانی دەوروبەری داوای یارمەتی کرد.

ئەو پاشایە ناوچەییانەی یارمەتییان بۆ ئەو نارد بریتی بوون لە:

١) پاشای پارۆپانی شاد لە رۆژهەڵاتی سیستان.

٢) پاشای پاراك تازەن کە لە سەردەمی ئیسلام بە تەخارستان ناسرا.

٣) پاشای سۆڵدیان کە لە سەردەمی ئیسلام بە سەغدیان یاخۆ سەغد ناسرا.

٤) پاشای ئیمائۆم کە لە سەردەمی ئیسلام بە خارەزم ناسرا.

دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان تەنیا سەربازیان بۆ ماسیس تەس نەنارد، بگرە یارمەتی داراییشیان بۆ ئەو نارد، لە ئاکامدا ماسیس تەس لەشکرێکی مەزنی پێکهێنا، دوای ئەوەی ماسیس تەس بڕیاری پاشایەتیی خۆیدا، پێوەندیی نێوان باختەر و پایتەختی هەخامەنشیی پچڕا و داوای لە پاشاکانی ناوچەکانی دەوروبەریش کرد تا هەواڵی ناوچەکە بۆ خەشایار نەنێرن، ئەوانیش پەسەندیان کرد، بەو شێوەیە خەشایار شا نە تەنیا لە باختەر هیچ هەواڵی پێ نەدەگەیشت، بگرە لە سەغدیان و ئیمائۆم و پارۆپانی شاد و پاراك تازێنیش هیچ هەواڵی پێ نەدەگەیشت.

نەبوونی هەواڵ و زانیاریی لەو شوێنانە، خەشایاری تێ گەیاند کە یاخیبوونێك لەو ناوچەیە ڕوویداوە، گومانی برد کە سەرکردەی ئەو یاخیبوونە ماسیس تەسی برای بێت، بە هۆی

پەیامنێرێکەوە پەیامی بۆ نارد، بەڵام ماسیس تەس پەیامنێرەکەی بەبێ وەڵام ناردەوە. هەرچەندە پەیامنێرەکە وەڵامێکی نووسراوی بۆ خەشایار نەهێنایەوە، بەڵام لە باختەر بە چاوی خۆی زۆر شتی بینی، دوای گەڕانەوە ئەوەی بینیبووی و بیستبووی بۆ خەشایاری گێڕایەوە، ئەویش زانی کە پێویستە لەگەڵ ماسیس تەس بجەنگێت، بۆیە ئارتابانووسی فەرماندەی گاردی جاویدی بانگ کرد.

خەشایار بە فەرماندەی گاردە تایبەتەکەی خۆی وت: من نامەم بۆ ماسیس تەس نارد و داوام لێکرد تا دەست لە یاخیبوون هەڵگرێت و بێتە پایتەخت تا لێی خۆش ببم، بەڵام ئەو پەیامنێرەکەی منی بێ وەڵام ناردۆتەوە، ئەو بێ شەرمییە نیشاندەری ئەوەیە، کە نایەوێت دەست لە یاخیبوون هەڵبگرێت، من تۆ دەکەمە فەرماندەی ئەو سوپایەی کە پێویستە بچێتە سەغدیان، ماسیس تەس دەسگیر بکە و دوای دەسگیرکردنی بیخەرە ناو قەفەسێکی ئاسنین و بۆ منی بنێرە، ئەگەر لە جەنگدا کوژرا سەری ئەو بۆ من رەوان بکە.

لەو کاتەی ماسیس تەس پاشایەتیی خۆی ڕاگەیاند، لەشکر بۆ شەڕکردن لە ئێرانەوە کەوتەڕێ، ساڵێکی خایاند، هۆکاری ئەو بە درەنگ کەوتنەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی خەشایار ماوەیەك لە یاخیبوونی براکەی ئاگەدار نەبوو، دوای ناردنی پەیامنێر و هاتنەوەشی ماوەیەکی پێچوو، دواتر پایز و زستان هاتن، وەرزی لەشکرکێشیی کۆتایی هات. بۆیە ئارتابانووس فەرماندەی گاردی جاوید و فەرماندەی ئەو لەشکرەی دەچوو بۆ باکتریا لە بەهاری ساڵی (٤٧٥ پ. ز) لەگەڵ لەشکرەکەی لە (راگس) واتە شاری (رەی) بەرەو رۆژهەڵات کەوتەڕێ.

ڕێڕەوی لەشکری ئارتابانووس بۆ جەنگ وەك ڕێڕەوی هەر لەشکرێکی دیکە برێتی بوو لە رێگەیەکی دوور کە بە ناوچە ئاوەدانەکاندا دەڕۆیشت، هێشتا کوشتار و شەڕ و سوانی زەوی و گۆڕانی ئاو و هەوای زەوی ئەو ناوچانەی نەگۆڕی بوو بە بیابان. لە رێگەدا دەستە سەربازی ناوچەکانی سەر رێگە پێوەست دەبوون بە لەشکری ئارتابانووس، ئەو بۆ ئەوەی بە ناوچەی شاخاویدا نەڕوات، سووڕایەوە و ویستی لە وڵاتی پاراك تازێن تێپەڕ ببێت، بەڵام پاشای ئەو شوێنە هاوپەیمانی ماسیس تەس بوو، لە خۆی ڕانەدەدیت لەگەڵ ئارتابانووس بجەنگێت، بۆیە"لێدە و دەرباز بە" واتە شەڕی پارتیزانی لەگەڵ ئەودا کرد. ئارتابانووس زۆر تەنگوچەڵەمەی بینی تا گەیشتە سنووری باکتریا، لەوێندەر وێستا، نامەیەکی بۆ ماسیس تەس نارد کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

(تۆ دەزانی لە سەردەمی باوکت داریوشی گەورە لەنێو لەشکر لە خزمەتی سەربازی بووم، لە هەموو جەنگەکانی سەردەمی پاشایەتیی ئەودا بەشدار بووم، دوای ئەوەی خەشایاریش بۆوە پاشا، دیسان کاری من هەر جەنگ بووە، بۆیە لە جەنگ ناترسم، تەنانەت ئەگەر دڵنیا بم لە کوژرانم، بەڵام لە ناخمدا حەز ناکەم شمشێر بەرانبەر بە تۆ ڕابگرم، چوونکە باوکت پاشای من بوو، ئێستە براکەت پاشای منە، من لە منداڵی تۆم بینیوە و ئاگەداری گەورە بوونی تۆ بووم، دوور لە پلەی شازادەیی تۆ، من وەك کوڕی خۆمت دەبینم و حەز ناکەم شمشێر بە ڕووی تۆدا بەرز بکەمەوە، بۆیە پێم باشترە کە بانگهێشتی براکەت پەسەند بکەی و لەگەڵ مندا بۆ پایتەخت بێی، بێگومان ئەو کارەی تۆ کە نیشانەری پەشیمانی و دەست هەڵگرتن لە یاخیبوون، دەبێتە مایەی بەخشینی تەواوت لەلایەن خەشایار، هەروەك جاران پلەی گەورەت دەبێت).

بەشێك لەو نووسینە دەبێت لە هزرماندا بمێنێت، ئەویش ئەو شوێنەیە کە ئارتابانووس دەڵێت نایەوێت شمشێر بەڕووی کەسێکدا ڕابگرێت، کە باوك و برای پاشا بوونە، دواتر دەبینین کە ئەو پیاوە چ دەکات. دەتوانین بڵێین لە کاتی نووسینی ئەو نامەیەدا ئەو دۆست نەبووە و ڕانەگرتنی شمشێرەکەی بە ڕووی کەسێکدا کە باوکی پاشا بووە، هۆکاری دیکەی لە پاڵ بووە، ئارتابانووس پێشبینی دەکرد کە لەگەڵ ماسیس تەس دووچاری جەنگێکی سەخت ببێت و ڕوون نەبوو، کە سەرکەوتوو دەبێت، بۆیە بە باشی زانی بە ئامۆژگاریکردنی ناچاری بکات دەست هەڵبگرێت لە یاخیبوون.

لە باختەر جەنگێکی تایبەتی هەبوو، کە بە فارسی بە جەنگی (بالێست) دەناسرا، ئەو وشەیە چووە نێو زمانە ئەورووپاییەکان و گۆڕا بە جەنگی بالێستیك واتە زانستی تیرهاوێژی و نیشانەشکاندن[1]. ئەو جەنگە بە پیرۆز دەزانرا و تەنیا کەسایەتییەکی دیاری ئاینی دەیتوانی ئەو جەنگە ڕابگەیەنێت، هاوکات ئەو جەنگە بە جەنگێکی نەتەوەییش هەژمار دەکرا.

ماسیس تەس بۆ ئەوەی ئارتابانووس تێبگەیەنێت، کە نابێت چاوەڕوانی سەرکەوتن بێت، داوای لە پاتید سەرۆکی ئاگرخانە و پێشەوای گەورەی زانا ئاینییەکانی ئەوێ کرد تا جەنگی

(١) وشەی بالێستیك بە هەمان شێوە لە زمانی فارسی هەبووە، دەتوانن بۆ زانین چاو بدەنە واژەنامەی پەهلەوی لە نووسینی د. فەرە وەشی مامۆستای زانکۆ، ئێستە ئێمە وا بیر دەکەینەوە کە ئەو وشەیە ئەورووپییە، لە ڕاستیدا بە تەواوەتی وشەیەکی فارسییە. (زەبیحوڵڵا)

بالیست ڕابگەیەنێت. لە کاتی ڕاگەیاندنی ئەو جەنگە، هەموو ئەو پیاوانەی تەمەنیان لە نێوان (٢٠ بۆ ٥٠) ساڵ بوو، دەبووایە دەست لە کارەکانیان هەڵبگرن و بچن بۆ جەنگ.

دەی نۆن نووسیویەتی کە ماسیس تەس لەسەر ئامۆژگاری پاتید سەرۆکی ئاگرخانە، جووتیارانی لە ڕۆیشتن بۆ جەنگ ئازاد کرد، چوونکە وەرزی کشتووکاڵ بوو، لەو کاتەدا ئەگەر جووتیاران بۆ جەنگ چووبان، لە باکتریا قاتوقڕی و نەبوونی چێ دەبوو، ئەو نووسیویەتی لەبەرئەوەی جووتیاران نەهاتن بۆ جەنگ و سەرگەرمی کاری خۆیان بوون، مامەڵەچی و پیشەوەرەکان چوونە جەنگ، پەنجا هەزار شەڕڤان بۆ جەنگ ئامادە بوون.

ماسیس تەس جگە لە ئەوان ژمارەیەك سەربازی لە وڵاتە دراوسێکانی هەبوو، لەوانەش سەربازەکانی (پارۆپانی شاد) کە پیاوی باڵابەرز و بەهێز بوون و دەنگی بەرز و بەهێزیان هەبوو و بە تەلوار دەجەنگان.

ئارتابانووس کە هیواخواز بوو نامەکەی ببێتە هۆی ئەوەی برای خەشایار بەبێ جەنگ خۆی بەدەستەوە بدات، کاتێك زانی ئەو نایەوێت خۆی بەدەستەوە بدات، فەرمانی بە لەشکرەکەی کرد تا بەرەو شاری بەلّخ پایتەختی باختەر بجولاێن، براکەی خەشایاریش بە لەشکرێکی بەهێزەوە کە پیاوانی پارۆپانی شادیش لەنێویدا بوون، بۆ ڕێگرتن لە ئارتابانووس کەوتنەڕێ و لە ناوچەی (گووڕی) هەردوو لەشکر گەیشتنە یەکدی.

دیارکردنی شوێنی گووڕی لەنێو مێژووەکەی دەی نۆن کارێکی قورسە، چوونکە ئەو وشەیە بۆ هەر پێدەشتێك بەکار دێت کە لە نێوان شاخە سەرکەشەکاندا بێت، ئەو شوێنانە بەرانبەر بە شاخەکان قووڵ و چەماوە دەردەکەون.

ئارتابانووس نەیتوانی لە بەرانبەر هێرشی تووند و سەختی ماسیس تەس کە لەشکرێکی بەهێزی هەبوو، خۆی ڕابگرێت و سەربازەکانی پارۆپانی شاد بە تەلوارە درێژ و تیژەکانیان سەربازەکانی ئارتابانووسیان پارچەپارچە دەکرد، هەر گورزێکی ئەوان بەر سەربازەکانی ئارتابانووس دەکەوت، ئەو بەشەی جەستەی لێ دەکردنەوە کە بەری دەکەوت.

جەنگی گووڕی یەکێکە لە جەنگە گەورەکانی مێژووی ئێران، کە بە داخەوە دەی نۆن نەیتوانیوە بەتێڕووتەسەلی جەنگەکە باس بکات، هەر هێندەی نووسیوە، کە ماسیس تەس توانی لەو پێدەشتەدا، گەمارۆی لەشکری ئارتابانووسی فەرماندەی گاردی خەشایار بدات، ئەویش تەنیا یەك ڕێگەی بۆ هەڵاتن لە باشوور دۆزییەوە، پاشماوەی لەشکرە شکاوەکەی لەوێوە

دەرچواند، بەڵام ماسیس تەس کەوتە دووی ئارتابانووس، هێندە بەدوویدا ڕۆیشت، کە ئارتابانووس دەیویست بگەڕێتەوە بۆ ئێران، پاش بڕینی مەودایەك بەرەو باشوور، ڕێگەی ڕۆژئاوای گرتەبەر و گەیشتە ڕووباری هیرمەند.

دەی نۆن و گەزنەفوون نووسیویانە کە هێشتا سەرکێشی ئاوی زێی هیرمەند کە لە بەهاردا دەگەیشتە سێ سەد مەتر کۆتایی نەهاتبوو، ئارتابانووس بۆ هەڵاتن لە دەست ماسیس تەس لەو ئاوە پەڕییەوە و بەشێك لە سەربازەکانی لەنێوچوون تا توانی بپەڕێتەوە.

ئارتابانووس دوای ئەو شکست خواردنە خۆی گەیاندە سیستانی ئێستە، نەیدەزانی چ بکات، چوونکە ئەگەر گەڕابایەوە بە دڵنیاییەوە دەکەوتە بەر ڕق و تووڕەیی خەشایار شا، چوونکە شکستی خوارد بوو، ژمارەیەك لە سەربازەکانی کوژرا بوون یاخۆ بریندار ببوون، نەیدەتوانی خەرجی ئەوان دابین بکات، بۆیە لە ترسی خەشایار پەنای بۆ کارێك برد کە ئەوکات بە تاوانی گەورە دەزانرا و بڕیاریدا بڕواتە (گدرۆزیا) و لەوێ لە ڕێگەی داگیرکردنی سەرمایە و بوونی خەڵك خەرجی لەشکرەکەی دابین بکات و بە سەربەخۆیی بژی، دۆخی ئەوکاتی هەرێمی گدرۆزیا لەگەڵ سەردەمی ئێستە جیاوازە، ئێستە گدرۆزیای کۆن و (بلوچستانی ئێستە) زۆرتر بیابانە و نەبوونی ئاو ئەو هەرێمەی بە بیابان کردووە. زەوی و زارەکانی بلوچستان سوێر نین تا بۆ کشتوکاڵ نەبن، ئێستەش وەك دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ بەر لەئێستە، ئەگەر ئاو دەست کەوێت بە پیت و سەوز دەبن. دووسەد ساڵ دوای خەشایار کاتێك ئەسکەندەر بە گدرۆزیادا بەرەو هیندستان ڕۆیشت، زیاتر بەو ناوچانەدا ڕۆیشت کە باخ و بێشە و کێڵگەی لێبوو، تا ئێستەش بێشەزارەکانی بلوجستان لەنێونەچوون، دارەکانی ماون، داری بەهێز بەو مەرجەی دووچاری مێرووەکان نەیێت، هەزاران ساڵ خۆڕادەگرێت.

پییەر لووتی نووسەر و جیهانگەردی فەرەنسی لە پەڕتووکی خۆی بە ناوی (بەرەو ئەسفەهان) باس لەوە دەکات کە چۆن دوای گەیشتنی بۆ وێرانەکانی پێرسپۆلیس کەوتووەتە لێکۆڵینەوە لەوێندەر و پارچەیەکی بچووك لە داری سەدری بەردەست کەوتووە، گومانی نییە ئەو دارە سەدرە هی بنمیچی کۆشکەکەیە، چوونکە بنمیچی ئەو کۆشکە بەو جۆرە دارە چێ کرابوو، پاشماوەی بێشەزارەکانی بلوچستان نیشاندەری ئەوەن کە لە رابردوودا ئەوێ ناوچەیەکی سەرسەوز بووە، بێ ئەوەی شاخی زۆری هەبووبێت، تا لە شاخەکان ژمارەیەك زێ بێتە خوارەوە و زەوییەکان ئاو بدات.

بارانە بەردەوام و زۆرەکان ئەو ناوچەیەیان پڕ ئاو کردبوو، لێ بە داخەوە ئێستە ئەو بارانانە نەماون.

ئەوکات و پێش (٢٥) سەدە گدرۆزیا سەوز و بە پیت بوو، ئارتابانووس و پاشماوەی لەشکرەکەی رۆیشتنە ئەو شوێنە و لەوێ نیشتەجێ بوون. ئارتابانووس دەسەڵاتداری ئەو شوێنەی گرت و بۆ دابینکردنی خەرجی لەشکرەکەی دانیشتووانی ناچار کرد تا لەو وەرزەدا باجەکەیان بدەن. لە سنووری ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی لە وەرزی پایزدا جووتیارەکان باجیان دەبەخشی، چوونکە لە کۆندا ژیانی زۆرینەی دانیشتووان لە رێگەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەرێوەدەبرا، بە گوتنی ئێستە ئابووری وڵات ئابوورییەکی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بوو، زۆرینەی بەخشینەکان لە پایزدا دەکران.

کاتێك ئارتابانووس گەیشتە سیستان، یەکەمین مانگی هاوین بوو، هێشتا جووتیاران بە تەواوەتی بەرهەمی خۆیان هەڵنەگرت بۆوە، نەریت نەبوو ئەوکات ئەوان باج بدەن، بەڵام ئارتابانووس ناچاری کردن تا باجەکانیان پێش وەختە بدەن، چوونکە ئەو رێژە باجەی وەریگرت بوو، بەشی خەرجی لەشکرەکەی نەدەبوو، دانیشتووانی ناچار کرد تا رێژەیەکی دیکە باج بە شێوەی پارەی زێڕ یاخۆ زیو بدەن، ئەوەش بۆ دانیشتووان کارێکی سەخت بوو. خەڵکی ئەوکات لە هەموو جیهاندا هەندێ لە پێداویستییەکانیان بە گۆڕینەوەی کاڵا بە کاڵا دابین دەکرد، بۆ نموونە گەنمیان دەدا و کوتاڵیان وەردەگرت، تەنیا دەسەڵاتدار و بازرگانان توانایان هەبوو بە رێژەیەکی زۆر پارە خەرج بکەن.

ئارتابانووس دانیشتووانی ناچار کرد تا پارە بدەن، ئەوانیش بۆ دابینکردنی پارەی پێویست ناچار بوون زەوی و کێڵگە و باخەکانیان بفرۆشن، چوونکە فرۆشیار زۆر و کڕیار کەم بوو، نرخی زەوی و زار زۆر دابەزی. گزنفۆن نووسیویەتی بۆ هەر سەد مەتر دووجا لە زەوی یەك ئارشیك (دوو داریك) زێڕ واتە دوو سککەی پێنج گرامی دەدرا. کەتزیاس نووسیویەتی هەندێك لە جووتیاران دەیانزانی ئەگەر زەوییەکانیان بفرۆشن، ئەوا بۆ ساڵی داهاتوو ناتوانن داهاتیان هەبێت و لە برسان دەمرن، بۆیە کوڕەکانیان دەفرۆشت و پارەکەیان دەدایە ئارتابانووس.

ئارتابانووس وەك وتمان فەرماندەی گاردی جاوید بوو، ئەگەر کەسێك متمانە پێکراو نەبووایە، نەدەگەیشتە ئەو پلەیە. خەشایار کە متمانەی بەو هەبوو، هەواڵی جەنگی گووڕی تەنیا لە ئارتابانووس وەرگرت و دڵنیابوو ئەو جەنگە هەر بە هەمان شێوە بووە، کە ئەو لە

نامەکەیدا بۆی نووسیوە. ئارتابانووس لە نامەکەیدا بۆ خەشایاری نووسیبوو کە لە جەنگی گووڕی لەشکری ماسیس تەسی شکست داوە و ئەو هەڵاتووە و ڕۆیشتووە بۆ ناوچە شاخاوییەکانی باکتریا، بۆیە بە باشی نەزانیوە کە بەدوای بکەوێت و بەڕێوەبردنی ئەو ناوچەیەی بە (هالووك) دەسەڵاتداری ناوچەکە سپاردووە.

ئارتابانووس گومانی نەبوو کە درۆکەی ئاشکرا دەبێت و لە لایەکی دیکە بۆ چوونی خۆی بۆ گدرۆزیا دەبووایە بیانوویەك بدۆزێتەوە، چوونکە ئەو دوای گەڕانەوەی لە باکتریا دەبووایە ڕاستەوخۆ بچێتەوە بۆ فارس و بەرەو باشوور نەڕوات، بۆیە نامەیەکی بۆ خەشایار شا نووسی و وتی چوونکە دەسەڵاتداری گدرۆزیا یاخی ببوو، بە باشم زانی پێش هاتنەوەم بۆ فارس ئەو سەرکوت بکەم و ئەوکات بێمەوە، بەڵام خەشایار تێگەیشت کە دۆخێکی ناسرووشتی بۆ ئارتابانووس هاتووەتە پێش، ئەگەرنا ئەو نەدەبوو بچێتە گدرۆزیا. ماسیس تەسیش هیچ نامەیەکی بۆ خەشایار نەنارد و نەیویست ئەو ئاگەدار بکاتەوە لە شکستی سەختی ئارتابانووس، چوونکە دەیزانی ئەگەر هەواڵی سەرکەوتنی خۆی بۆ براکەی بنێرێت، لەوانەیە لەشکرێکی بەهێزتر بۆ جەنگی ئەو بنێرێت و لەوانەشە خۆی بێتە ئەو جەنگە، چوونکە خەشایارشا هەڵسوکەوتی ئارتابانووسی نائاسایی دیت، داریوشی کوڕی خۆی نارد بۆ گدرۆزیا تا لێکۆڵینەوە بکات لەبارەی چوونی ئارتابانووس بۆ ئەو هەرێمە.

# ناپاکی

ئەو ڕێگەیەی لە چین دەهاتە ڕۆژئاوای ئاسیا، ئەمڕۆ بە ڕێگەی ئاوریشم ناسراوە (چوونکە کوتاڵی ئاوریشمی چینی بەو ڕێگەیەدا دەهاتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست)، ڕێگەی ئاوریشم دوو لقی هەبوو، یەکێك لەو دوو لقانە بە باکتریادا (باختەر) تێپەڕ دەبوو، دەگەیشتە ئێران، ئەو ڕێگەیە لە لای ئێمە تەنیا بە ناوی ڕێگەی ئاوریشم ناسراوە، لە ڕابردوودا ناوێکی نەخوازراوی هەبوو، کە برێتی بوو لە (ڕێگەی خوێن)، مێژوونووسی چینی (کیم لی چۆنگ) لە وڵاتەکەیدا ناوبانگێکی وەك ناوبانگی (ویل دیۆرانتی) ئەمەریکی هەیە، نووسەری سەردەمێکی مێژووی شارستانییەتە، لە مێژووەکەی خۆیدا نووسیویەتی: "لە چین بەرات نەدەهاتە کایەوە، تەنیا ئەگەر کوشتارەکانی ڕێگەی خوێن نەبووایە."

چەتە و ڕێگرەکانی ئەو ڕێگەیە دەیانزانی ئەو بازرگانانەی لەو ڕێگەیەوە دەڕۆن، خودان سەرمایە و بە توانان و زێڕی زۆریان پێیە، بۆیە بۆسەیان بۆ دەنانەوە و هەڵیان دەکوتایە سەریان، هەرچییەکیان پێ بووایە لێیان دەستاندن، ئەگەر بەرگریشیان بکردبایە، دەیانکوشتن، بە وتەی کیم لی چۆنگ چینییەکان لە ترسی ئەو ڕێگەیە و بۆ ئەوەی پارەکانیان لەگەڵ خۆیاندا نەبەن بەراتیان داهێنا، هەر بۆیە ئەو ڕێبوارانەی بە ڕێگەی ئاوریشمدا دەڕۆیشتن، دەگەیشتنە ئێرانێ و چۆنییەتی شکستی ئارتابانووسیان بۆ خەڵك باس دەکرد.

ماسیس تەس برای خەشایار و پاشای بەکتریا، دوای ماوەیەك لە شکستی ئارتابانووس لە پێدەشتی گووڕی[(١)]، پێوەندیی لەگەڵ ئێراندا نوێکردەوە، کە ماوەیەك بوو پچڕاندبووی، چوونکە داهاتی ئەو ڕێگەیە زۆر لەوە پتر بوو، کە ئیدی بکارێت بەهەندی وەرنەگرێت.

---

(١) نازانین دەشتی گووڕی کە ئارتابانووس لەو شوێنە لە بەرانبەر خەشایاردا شکستی خوارد، هەمان ئەو ناوچەیە کە دواتر بە دەشتی غوور، غووری یاخۆ غوورستانە ناسرا یان نا، هەرچەندە لە نێوان گوری و غوری و غورستان زۆر لێکچوون هەیە، نابێت بێ لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ئەوان رامان بلێین، لە ناسینی رەگی وشەکان، نابێت تەنیا بە لێکچوونی ناوەکان بڕیار لەو بارەوە بدرێت."زەبیحوڵڵا"

ئارتابانووس دەیزانی ئەستەمە شکستەکەی لە پێدەشتی گووڕی بشاردرێتەوە و خەشایار پێی نەزانێت، خەشایاریش بۆی دەرکەوت، کە ئارتابانووس لە بەرانبەر ماسیس تەس شکستی خواردووە، ئەوەی لەبارەی رۆیشتنی بۆ گدرۆزیا بۆ ئەوی نووسیوە بە پێچەوانەی ئەوەی وتوویەتی بۆ بەرفەرمان کردنەوەی فەرمانڕەوای یاخی بووی ئەو شوێنە نەبووە، ئەو بۆیە چۆتە گدرۆزیا تا لە خەشایار دوور بێت. دوای ئەوەی خەشایار ئەو بابەتەی بۆ ڕوون بۆوە، پتر لە براکەی تووڕە بوو، بڕیاریدا بۆ خۆی بچێت بۆ تەمبێکردنی ئارتابانووس.

دەی نۆن نووسیویەتی: کاتیك خەشایار بڕیاریدا بۆ تەمبێکردنی ئارتابانووس بڕوات، سەرەنجیدا کە پێویستە لەشکرێکی دیکە بۆ جەنگ لەگەڵ ماسیس تەسی برای بنێرێت. ئەو دەیزانی هۆکاری ئەوەی براکەی گوێڕایەڵی نەبووە و لێی یاخی بووە، خۆشەویستی کچێك بوو بە ناوی پریدیس، خەشایار بۆ ئەوەی براکەی ملکەچ بکاتەوە، بڕیاریدا پریدیس بنێرێت بۆ لای براکەی.

خەشایار بە پریدیسی وت: نامەوێت دۆخێك بێتە پێش کە خوێنی براکەم بڕێژم، دەمەوێت من و ئەو ئاشت ببینەوە، تۆ ببە بە ئامرازی ئەو ئاشتەواییە، بە ماسیس توس بڵێ تۆ هەر وەك ئەو رۆژەی کە بۆ یەکەمجار ئەو تۆی بینیوە، من بۆ ئەوەی براکەم لە خۆم نەڕەنجێنم، دەستم لە تۆ کێشاوەتەوە و بۆ ئەوم ناردووی.

پریدیس دوای ئەوەی لەلایەن خەشایارەوە ڕاهێندرا، زانی کە دەبێت چۆن لەگەڵ ماسیس تەسدا ڕەوتار بکات، نامەیەکی لە خەشایار وەرگرت و بەرەو باکتریا کەوتەڕێ. خەشایاریش فەرمانیدا لەشکر کۆبکەنەوە، بۆ ئەوەی زووتر ئارتابانووس سەرکوت بکات، هێزێکی لە رێگەی دەریاوە بۆ گدرۆزیا (بلوچستان) نارد، خۆشی لە رێگەی وشکانییەوە کەوتەڕێ.

هەڵبەتە خەشایار لە کەنداوی فارس، دەریای عومان و زەریای هیند، هێزێکی دەریایی هەبوو، دەیتوانی لە کاتی پێویست ئەو هێزە لە گەرووی داریوش لە میسر بپەڕێنێتەوە و بگاتە دەریای مەدیتەرانە، خەشایار لە رێگەی ئەو هێزە دەریاییەی کە لە کەنداو و دەریای عومان هەیبوو، لەشکرێکی لە رێگەی دەریاوە ناردە گدرۆزیا.

دەی نۆن نووسیویەتی کەشتییەکانی خەشایار بە رێگەی ماسیدا رۆیشتن تا گەیشتنە گدرۆزیا.

(نەئارك) دەریاسالاری ئەسکەندەر، کە دوو سەد ساڵ دواتر لە شوێنی گەیشتنی ڕووباری سند بۆ دەریا (لە هیندستان) لەگەڵ چەند کەشتییەك رێی دەبڕی و بە درێژایی کەنارەکانی باشووری پاشایەتیی هەخامەنشییدا دەڕۆیشت تا گەیشتە کۆتایی رۆژئاوای کەنداوی فارس، لە

گەشتنامەکەیدا نووسیویەتی لەو ڕۆژەوە کە بە ڕێگەی ماسیدا دەڕۆیشتین لە تەواوی کەنارەکانی کەنداوی فارس، ئاژەڵدارەکان ماسیان دەدایە ئاژەڵەکانیان، بۆیە گۆشتی ئاژەڵەکان تام و بۆن ماسی لێ دەهات.

دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕ بووە، کەچی هێشتا کەنداوی فارس یەکێکە لەو دەریایانەی زۆرترین ڕێژەی ماسی تێدایە، لە دنیادا دەریایەك نییە بەبارتەقای کەنداوی فارس ماسی تێدا بێت.

ئەو لەشکرەی خەشایار لە ڕێگەی دەریاوە ناردی، گەیشتنە بەندەرێك کە دواتر بە (سیراف) ناسرا، ئارتابانووس لەوەش ئاگەدار بۆوە، کە لەشکرێکی دیکەیش بە فەرماندەیی خەشایار لە ڕێگەی وشکانییەوە لە گدرۆزیا نێزیك دەبنەوە، ئەوکات هێشتا داریوشی کوڕە گەورەی خەشایار لە گدرۆزیا بوو، ئارتابانووس لە ترسی گیانی خۆی، ئەوی بە بارمتە گرت، بە ئەنجامدانی ئەو کارەش بەپێی خووخدە و نەریتی هەخامەنشییەکان، بەو کردەیە دووچاری مەزنترین هەڵەی کوشندە بوو، کە لێخۆشبوونی نەبوو، لە ڕاستیدا بەم ڕەوتارش فەتوای کوشتنی خۆی دەرکرد، کە لەو سەردەمانەشدا برێتی بوو لە "داماڵینی پێست بە زیندوویی".

بە وتەی دەی نۆن لە بەهاری ساڵی (٤٧٣ پ. ز) خەشایار بەرەو گدرۆزیا کەوتەڕێ، کەتزیاسیش بەهاری (٤٧٠ پ. ز) بە جووڵەی خەشایار دەزانێت، بەڵام چوونکە ئەو بەروارەی کەتزیاس نووسیویەتی مەودای لەگەڵ یاخیبوونی ئارتابانووس زۆرە، بە دوور دەزانرێت ئەو بەروارە ڕاست بێت، بە تایبەت کە خەشایار پاشایەك نەبووە، بۆ چەند ساڵێك بە یاخیبوونی ئارتابانووس ڕازی بێت و هەنگاو بۆ سەرکوتکردنی هەڵنەگرێت.

کاتێك خەشایار بەرەو گدرۆزیا کەوتەڕێ نەیدەزانی ئارتابانووس، داریوشی کوڕی بە بارمتە گرتووە. ئارتابانووس داریوشی بە ناوی میوان لە تەلاری حکوومەتەکەی گلدابووە، وای دەردەخست کە دەیەوێت میوانداری لێ بکات، دوای چەند ڕۆژێك داریوش بۆی دەرکەوت، کە میوان نییە و چاوەدێری دەکرێت، چوونکە ڕێگەیان نەدەدا لە تەلاری حکوومەت دەربچێت. داریوش بۆ لای ئارتابانووس ڕۆیشت و وتی: من ڕاهاتووم کە بچمە دەرێ و لەو شوێنانە بگەڕێم نێچیری هەبێت، دەخوازم سەرگەرمی ڕاو بم، دانیشتن و مانەوە منی لێرە قەڵس کردووە، فەرمان بدە تا ڕێگر نەبن لە دەرچوونم بۆ دەرێ.

ئارتابانووس وتی: باوکت فەرمانی بە من کردووە، کە نەهێڵم لە تەلاری حکوومەت دەربچی.

داریوش بە سەرسووڕمانەوە وتی: ئایا بابم بە تۆی وتووە من لێرە لەژێر چاوەدێری دابنێی؟

ئارتابانووس وتی: بەڵێ.

داریوش وتی: بۆ ئەو فەرمانە لەلایەن باوکمەوە دەرچووە؟

ئارتابانووس وتی: من هۆکارەکەی نازانم، بەڵام تۆ خۆت دەزانی چیت کردووە، کە خەشایارت بەرانبەر بە خۆت ئاوا تووڕە کردووە، هۆکاری ناردنی تۆ بۆ ئێرە، تەنیا ئەوەیە کە کەوتوویەتییە بەر کینە و تووڕەیی بابت.

داریوش هەرچەندە بیری دەکردەوە، کە چ ڕەوتارێکی ئەنجام دابێت کە دوور بێت لە خووخدە و نەریت و ڕێسا و یاساکان تا باوکی بەو ڕادەیە تووڕە کردبێت، ئەویش ناردبێتی بۆ گدرۆزیا بۆ ئەوەی لەژێر چاوەدێری بێت، هیچ شتێکی وەهای بەخۆی شك نەبرد.

ئارتابانووس بیری کردەوە ئەگەر بە داریوش بڵێت بە فەرمانی خەشایار ئەوی خستووەتە ژێر چاوەدێری باشترە، لە ئەوەی بڵێت بە ویستی خۆی ئەوی لەژێر چاوەدێری داناوە.

ئەو دەیزانی لە گدرۆزیا هەمووان دوژمنی ئەون و ئارەزوو دەکەن لەنێو بچێت، تەنیا ئەوانە نەبێت کە سەربازی ئەو بوون و مانەوەی ئەویان بۆ بەردەوامبوونی حەز و ئارەزووەکانیان بەپێویست دەزانی. ئەگەر داریوش زانیبای کە زیندانییە و بە ویستی ئارتابانووس گیراوە، هەوڵی هەڵاتنی دەدا، چوونکە هەمووان دەیانزانی ئەو کوڕە گەورەی پاشایە، بێگومان لێی کۆدەبوونەوە، ئەو دەست نیشان دەکەن بۆ ئەوەی بە فەرماندەیی داریوش بەرانبەر ئەو یاخی بن، بەڵام ئەگەر داریوش بزانێت بە فەرمانی باوکی لە تەلاری حکوومەت لەژێر چاوەدێریدایە، لەو شوێنە ناچێتەدەر و هەوڵی هەڵاتن نادات.

داریوش وتی: من بەرفەرمانی فەرمانەکەی باوکم دەبم، چوونکە ئەو هەم باوکمە، هەمیش پاشای منە، ئاهورامەزدا بەرفەرمانی کردنی ئەوی بۆ من کردووە بە ئەرك، بەڵام بیرم زۆر پەرێشانە، چوونکە نازانم چ هەڵەیەکی من بۆتە مایەی تووڕە بوونی بابم و فەرمانی دەستبەسەرکردنی منی لەلای تۆ دابێت، تەنانەت ئەو ڕۆژەی لە باوکم جیابوومەوە تا بێمە ئێرە پێی نەوتم کە هەڵەم کردووە و بۆ سزادان دەنێردرێم بۆ گدرۆزیا، بگرە بە منی وت بێم بۆ ئێرە و بزانم تۆ سەرگەرمی چ کارێکی.

ئارتابانووس وتی: کاتێك تاوانبارێك بۆ شوێنی سزاکەی دەنێرن، پێی ناڵێن چ هەڵەیەکی کردووە، کە بۆ ئەو شوێنەی ڕەوان دەکەن، چوونکە ئەگەر ئەو بابەتە بزانێت ناچێتە ئەو شوێنە و هەڵدێت.

داریوش وتی: بەڵام من وانیم و نابم، ئەگەر باوکم بە منی وتبایە بچمە گدرۆزیا تا بکوژەکان سەرم لە لاشەم بکەنەوە، هەڵنەدەهاتم و دەهاتمە ئێرە و خۆم ڕادەستی بکوژەکانم دەکرد.

ئارتابانووس وتی: باوکت نەیزانیوە کە تا ئەو ڕادەیە بەرفەرمانی ئەوی و بە ئەسپایی جووڵاوەتەوە.

داریوش وتی: تا ئەو کاتەی نەزانم چ هەڵەیەکم کردووە، کە بابم لە سۆنگەیەوە سزام دەدات، ئاسوودە نابم، چوونکە تۆش نازانی چ هەڵەیەکم کردووە، نامەیەك بۆ باوکم دەنووسم و ڕوون کردنەوەم لێی دەوێت.

ئارتابانووس دەیزانی کە باوکی بە زوویی دەکەوێتەڕێ، کاتێك ئەو نامەیەی کوڕەکەی بۆی ڕەوان دەکات لە ڕێگە دەیگاتێ، ئەو دەیتوانی ڕێگر بێت لە نووسینی ئەو نامەیە لەلایەن ئەو، بەڵام دەیزانی نووسینی ئەو نامەیە و ناردنی بۆ خەشایار پێچەوانە نییە، لەگەڵ بە بارمتە گرتنی داریوش.

نامەکەی لە داریوش وەرگرت تا بۆ خەشایاری ڕەوانە بکات، بەڵام ئەو نامەیەی نەنارد، نامەیەکی دیکەی لە جیاتی نووسی بۆ خەشایار، کە تیایدا بە ناوی داریوش نووسیبووی: باوکە بۆ گدرۆزیا مەیە و لەشکرکێشیی بۆ مەکە، بە پێچەوانەوە من دەکوژرێم.

خەشایار بە بینینی نامەکە دووچاری سەرسووڕمان بوو، چوونکە چاوەڕوان نەبوو ئارتابانووس کارێکی وەها بکات و کوڕەکەی بە بارمتە بگرێت. داریوش لەو نامەیەی بە ناویەوە نووسرابوو نەینووسی بوو، کە بە بارمتە گیراوە، بەڵام خەشایار تێگەیشت کە ئەو بارمتەیە، چوونکە ئەوکات بارمتە گرتن نەریت بوو، بە یەکێکیش لە ئامرازە گرینگەکانی دەستەمۆکردنی خەڵك هەژمار دەکرا.

خەشایارشا دەیتوانی وەڵام بۆ ئارتابانووس بنێرێت کە دەست لە یاخیبوون هەڵبگرێت و بەرفەرمان بێت و بۆ پایتەخت بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی لێی خۆش ببێت، بەڵام ئەو کارەی بە بێ دەسەڵاتیی دەزانی، ویست و ئازایەتی ئەو، ڕێگەی کارێکی پێ نەدەدا کە ئارتابانووس و خەڵکی

دیکە بۆ ئەو بە بێ دەسەڵاتیی و لاوازی بزانن، بۆیە بڕیاریدا بچێتە گدرۆزیا و لەگەڵ ئارتابانووس بجەنگێت، تەنانەت ئەگەر کوڕەکەشی بکوژرێت.

لەوکاتەدا کە خەشایار لە ڕۆیشتن بەرەو گدرۆزیا بەردەوام بوو، پریدیس گەیشتە باکتریا و ماسیس تەس بە هاتنی ئەو زۆر سەرسام بوو، پرسیاری کرد: بۆچی هاتووی بۆ ئێرە.

پریدیس وتی: ئەی تۆ خوازیاری من نەبووی؟

ماسیس تەس وتی: من ڕەتی ناکەمەوە کە سەردەمێك تۆم دەویست، بەڵام ئەوکاتە ڕۆیشت و ئێستە تۆ و من لە ڕەوشی جیاوازداین.

پریدیس وتی: واتە ئێستە تۆ خوازیاری هاوسەرگیری نیت لەگەڵ مندا و ڕەتم دەکەیتەوە؟

ماسیس تەس وتی: بەڵێ، تەنانەت نامەوێت لەو بارەوە بدوێم، تکا لە تۆش دەکەم، کە ئەو بابەتە لە بیر بکەی.

پریدیس پرسیاری لێ کرد: ئێستە من دەبێت چ بکەم؟

ماسیس تەس وتی: من هەر ئەمڕۆ لەگەڵ گەورەی موبێدەکان دەدوێم، ڕێکارێك دەگرمە بەر کە بە زووترین کات بگەڕێیەوە، دواتر فەرمانی کرد زۆر بە باشی پێشوازی لە پریدیس بکرێت بۆ ئەوەی دوای چەند ڕۆژێك لە پشوودان، ڕێکاری گەڕاندنەوەی جێبەجێ بکرێت، بەم شێوەیە بەرنامەی خەشایار کە بۆ نەهێشتنی دڵگرانی براکەی دایبانوو، بە ئاکام گەیشت.

لە لایەکی دیکە خەشایار شا ناوەرۆکی ئەو نامەیەی بە ناوی داریوشی کوڕییەوە هاتبوو، بۆ هەموو سەردارەکانی لەشکرەکەی خوێندەوە، ئەوانیش بۆ ئەفسەرەکانی دیکەیان باس کرد، بە هەمان شێوە بۆ سەربازەکانیش باسکرا، دواجار لە باکتریا برای خەشایار ئەو هەواڵەی بیست، بە بیستنی ئەو هەواڵە لە بێ شەرمی ئارتابانووس هێندە تووڕە بوو، کە نامەیەکی بۆ خەشایار نووسی و وتی: من پریدیسم نەویست، چوونکە دڵم ڕازی نەبوو، کە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێك بکەم کە جارێکی دیکە لەگەڵ کەسێکی دیکە هاوسەرگیری کردووە، بەڵام ئەو بابەتە ڕێگر نییە لە ئەوەی ئەرکی برایەتی بەجێ بگەیەنم و بە خێرایی دێم بۆ (هاراواتیس)، لە ئەو شوێنەوە هێرش دەکەمە سەر ئارتابانووس، ئەگەر هێرش بۆ ئەو پیاوە ناپاکە بکەم، بە زوویی بە سزای کارەکانی دەگات.

(هاراواتیس) کە ماسیس تەس دەیویست خۆی بگەیەنێتە ئەوێ، ناوچەیەك بوو لە ڕۆژهەڵاتی بلوچستان کە ئێستە بەشێکە لە خاکی پاکستان و کەوتبۆوە نێوان گدرۆزیا و سند، مەبەستی

ئارتابانووس ئەوە بوو، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هێرشی بکاتەسەر و خەشایاری براشی لە ڕۆژئاواوە، بەو شێوەیە لەدوولا هێرش بکەن و بە زوویی لەنێوی ببەن.

هەستەکانی پاشایەتیی لەنێو هەخامەنشییەکان هێندە بەهێز و پیرۆز بوو، کە بە بیستنی هەواڵی ئەو ناپاکییە، ماسیس تەس کە دڵی هێشابوو، نەیتوانی چاوپۆشی لەو ناپاکییە گەورەیە بکات و بەرەو هاراواتیس ڕۆیشت. لە کاتێکدا خەشایار لە ڕۆژئاواوە بەرەو بلوچستان دەڕۆیشت، براکەشی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهات.

کریستەن سێنی دانیمارکی نووسیویەتی ئەوکاتەی هەردوو لەشکر لە گدرۆزیا نێزیك دەبوونەوە، ئەردەشێر برای بچووکی داریوش لە گدرۆزیا بووە و ڕوونی دەکاتەوە کە نازاندرێت بۆ ئەردەشێر ئەوکات لە گدرۆزیا بووە، دەڵێن ئەردەشێر لایەنگری ئارتابانووس بووە، چەند مێژوونووسێك دەڵێن ئارتابانووس لە منداڵییەوە ئەردەشێری خۆش ویستووە، دوای ئەوەی ئەردەشێر گەورە بوو، دوژمنایەتی کەوتە نێوان ئارتابانووس و خەشایار، ئارتابانووس بە ئەردەشێری وت من تۆ دەگەیەنم بە تەختی پاشایەتیی و لە جیاتی بابت دەتکەم بە پاشا.

ئەردەشێر وتی: دوای بابم پاشایەتیی بۆ داریوشە، چوونکە ئەو لە من گەورەترە.

ئارتابانووس وتی: بۆ گەیشتنی تۆ بە پاشایەتیی، من داریوش لەنێو دەبەم.

هەرچەندە هەموو مێژوونووسەکان نووسیویانە کە ئەردەشێر دەستی هەبووە لە کوشتنی داریوشی برای، بەڵام نەزانراوە لەوکاتە بۆ لە گدرۆزیا بووە. ئەگەر بوونی ئەو لەوکاتە و لەو شوێنە پەسەند بێت، دەبێت بگوترێت ئەو بێ مۆڵەت وەرگرتن لە باوکی چۆتە ئەوێ و بۆتە پاڵپشتی ئارتابانووس، چوونکە باوکی دەیزانی یەك لە کوڕەکانی بارمتەی ئارتابانووسە، کوڕەکەی دیکەی نەدەناردوو بۆ گدرۆزیا تا هەردووکیان ببنە بارمتە.

گێڕانەوەیەکی دیکە دەڵێت کاتێك هێرشی خەشایار دەستی پێکرد، ئارتابانووس نەیدەویست بارمتەکە، واتە داریوش بکوژێت، چوونکە دەیزانی ئەگەر ئە داریوش بکوژێت بە دڵنیاییەوە دەکوژرێت، تاکە شانسی ئەو بۆ زیندوومانەوەی، ترساندنی خەشایار بە کوشتنی کوڕەکەی بوو، کە بڵێت ئەگەر لێی نێزیك بکەوێتەوە، کوڕەکەی دەکوژێت، بەڵام دوای کوشتنی کوڕەکەی، هیچ ئامرازێکی دیکەی بۆ ترساندنی بابی نابێت، خەشایار زۆر بێ بزەییانە هێرش دەکات و لەنێوی دەبات. بەو لێکدانەوانە ئەردەشێر تێگەیشت کە ئارتابانووس نایەوێت براکەی بکوژێت و بیری کردەوە ئەگەر داریوش زیندوو بمێنێت، بە دڵنیاییەوە لە دوای باوکی دەبێتە پاشا، بۆیە براکەی

خۆی کوشت تا خۆی ببێتە پاشا. کوشتنی داریوشی کوڕە گەورەی خەشایار بە ڕادەیەك خەڵکی ئێرانی خستە ماتەم کە ماوەیەك دوای مردنیشی خەڵك پرسەی هەبوو، دوای ئەو ڕۆژە، هەموو ساڵێك لە ساڵڕۆژی کوشتنی داریوشدا پرسە دادەنرا و سرۆودی خەم (لاواندنەوە) دەوترایەوە، ئەو لاواندنانەوە بوونە هێمای پرسە، هەر کات کارەساتێك بۆ بنەماڵەیەك هاتبایە، ئەو لاواندنەوە و سرۆودانەیان دەوت.(٢)

ئارتابانووس بە هۆی پەیك و بە وتەی دەی نۆن بە هۆی کۆتر وەڵامی بۆ خەشایار نارد، کە ئەگەر نەگەڕێتەوە، داریوشی کوڕی دەکوژێت. خەشایار کەسێکی خاوەن هەڵوێست و بڕیار بوو، هیچ وەڵامی نەدایەوە و لە سیراف نێزیکتر بۆوە. بۆ دووەمین جار ئارتابانووس وەڵامی بۆ نارد تا بگەڕێتەوە و هێزە دەریاییەکەشی بباتەوە، بە پێچەوانەوەی ئەو کارە ناچار دەبێت داریوش دەکوژێت، دیسان خەشایار گوێی پێنەدا.

ئارتابانووس دەیزانی کەس لەنێو لەشکرەکەی دەست بۆ کوشتنی داریوش نابات و خۆشی ئازایەتی ئەنجامدانی ئەو کارەی نەبوو، چوونکە هەمووان دەیانزانی ئەو کوڕی خەشایارە و لەنێو هەخامەنشییەکان پێگە و ڕێزی شازادە زۆر بوو، بۆیە هانی ئەردەشێری برای داریوشیدا تا ئەو بکوژێت.

سیراف لە کەناری دەریا بوو، دیوارێکی بەرز و بەهێز دەیپاراست. لەشکری خەشایار لە ڕۆژهەڵات و لەشکری ماسیس تەس لە ڕۆژئاواوە لە سیراف نێزیك بوونەوە، چوونکە خەشایار زووتر گەیشت، گەمارۆی شارەکەیدا. نەریت بوو کاتی گەمارۆدانی شارێك، وەك دوا وتە وەڵامیان بۆ ڕەوان دەکرا، ئەگەر خۆیان ڕادەست بکەن زیندوو دەمێنن، بە پێچەوانەوە دەکوژرێن، بەڵام خەشایار ئەو کارەی بەرانبەر ئارتابانووس نەکرد، چوونکە خۆی بە گەورەتر لەوە دەزانی بەرانبەر ئارتابانووس

---

(٢) ئارتۆر کریستن سن ڕۆژهەڵاتناسی دانیمارکی بۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی ئێران زۆر ماندوو بوو، بڕوای وایە سیاوەش کە لای ئێرانییە کۆنەکان زۆر ناسرابوو، هەمان داریوشە کە بەبێ تاوان کوژرا، هەموو خەڵکی ئێرانی خستە ماتەم. بە باوەڕی ئەو گومان نییە، ناوی سیاوەش لە داریوش وەرنەگیراوە، سیاوەش پیاوێکی دیکە بووە، بەڵام بنەما و پایەی بەسەرهاتی سیاوەش و پرسەگێڕانی ئێرانییە کۆنەکان لە پرسەی ئەو لە هەموو ساڵێکدا، دەگەڕایەوە بۆ بێ تاوانی داریوش لەو کارەساتەدا."زەبیحوڵڵا"

که ناپاکی کردبوو، ئەوکارە بکات. بۆیە لەگەڵ گەمارۆدانی شارەکە، کەوتە خۆئامادەکردن بۆ پەلامار و چوونە نێوشار.

دەی نۆن دەڵێت داریوشیان لەسەر دیوارەکە و بەرانبەر خەشایار ڕاگرت و ئارتابانووس هاواری کرد با خەشایار بگەڕێتەوە، بە پێچەوانەوە کوشتنی داریوشی کوڕی بە چاوی خۆی دەبینێت، خەشایار گوێی بەو هەڕەشەیە نەدا و بەردەوام بوو لە جەنگ. ئەوکات سەربازەکانی نێوشار و دەرەوەی شار بە هەراسانییەوە بینیان ئەردەشێری دەستدرێژکەر دەرکەوت، شمشێرێکی بە دەستی ڕاستەیەوە بوو، لە تەنیشت داریوش وێستا. بە وتەی دەی نۆن تا ئەوکات لە دنیا ڕووی نەدابوو کوڕێك لەبەر چاوی باوکی ڕابگیرێت و براکەی بە شمشێرەوە، خۆی بۆ کوشتنی ئامادە بکات.

هەڵوێست و بڕیاری خەشایار هێندە بەهێز بوو، تەنانەت دوای بینینی ئەو دیمەنەش بڕیاری خۆی نەگۆڕی، ئەوکات هەمووان بینیان کە شمشێری ئەردەشێر لە دواوە بەر ملی داریوش کەوت و سەری لە لەشی جیا بۆوە و خوێن لە دەمارە بڕاوەکانی هەڵچۆڕا.

(ڤلادیمێر مینۆرێسکی)[٣] ڕۆژهەڵاتناسی سەردەم ماوەیەك لە ئێران ژیاوە، دواتر ڕۆیشتە بەریتانیا و لە زانکۆی کامبریج مامۆستا بوو، دواجار هەر لەو شارە مرد، پێی وایە ئەو باسەی دەی نۆن سەبارەت بە کوشتنی داریوش بە دەست ئەردەشێر گێڕاویەتییەوە، ئەفسانەیە و دەستکاری کراوە و ئەو دەڵێت:

(گومان لە کوژرانی داریوشی کوڕی خەشایار بە دەست ئەردەشێری برای نییە، چوونکە هەموو سەرچاوە مێژووییەکان ئەو بابەتە پشتڕاست دەکەونەوە، بەڵام بەو شێوە نییە کە دەی نۆن باسی دەکات و داریوش بە دەست ئەردەشێری برای و لە شەوی کوژرانی خەشایاردا کوژرا.

ئەردەشێر لە یەك شەودا دوو تاوانی گەورەی ئەنجامدا، سەرەتا لە کوشتنی باوکیدا بەشدار بوو، دواجار بە دەستی خۆی داریوشی برای کوشت. خەشایار شا بە دەست ئەردەشێر نەکوژرا، بەڵام لە پیلانی کوشتنی ئەودا بەشدار بوو، دەی نۆن ویستوویەتی کوژرانی داریوش بە دەست ئەردەشێر

---

(٣) (مینۆرێسکی بە ڕەگەز ڕووسی بوو، زمانەکانی فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، ئیسپانی، سویدی، یۆنانی کۆن، سریانی، عارەبی، فارسی، تورکی، ئەرمەنی و گورجی بە باشی زانیوە، بە تەواوەتی سوودی لە ئەو سەرچاوانە بینیوە کە بەو زمانانەن. "زەبیحوڵڵا"

وەك کارەساتێکی لە بیر نەکراو لیّ بکات و نووسراوەکانی دەی نۆن لە هەستێکی دراماتیکی ئەو سەرچاوەی گرتووە، چوونکە ئەو شانۆنووسیش بووە.)

ئەو هۆکارەی ئەو زانایە بۆ رەتکردنەوەی وتەی دەی نۆن سەبارەت بە کوشتنی داریوش بە دەستی ئەردەشێر دەیخاتەڕوو، برێتییە لەوەی ئەگەر بەو شێوەیە و بە بەرچاوی هەمووانەوە ئەو کارەی کردبایە، ئەستەم بوو دوای مردنی باوکی بتوانێت ببێتە پاشا، ئەگەر خەشایار خۆی سزای ئەردەشێری نەدابووایە، بە دڵنیاییەوە هەست و نەریت و رێساکان ئەو دەرفەتەیان نەدەدا، ئێرانییەکان پاشایەتیی کەسێکیان نەدەویست کە لە بەرانبەر چاوی بابی، براکەی خۆی بکوژێت.

ئێرانییەکان نەیاندەزانی ئەردەشێر لە کوشتنی بابی بەشدار بووە و برای خۆی کوشتووە، بۆیە پاشایەتیی ئەویان پەسەند کرد، ئەو بابەتە دوای ماوەیەك بە هۆی دوژمنایەتی ئارتابانووس ئاشکرا بوو، بەڵام ئەوکات ئەردەشێر بەهێز بوو، ترسی لە ئارتابانووس نەبوو، دەبینین کەچی بەرانبەر بە ئەو کرد.

خەشایار بیّ گوێدان بە هەڕەشەی ئارتابانووس بەردەوام بوو لە هێرش بۆ سەر شاری سیراف، ئەوکات و تا ئەم دواییانەش نەریت بوو لە قەڵاکان رێگەیەکی نهێنی بەژێر زەویدا چیّ دەکرا، تا ئەگەر قەڵاکە گەمارۆ درا و گەمارۆدراوەکان توانای بەرگریان نەبوو، بەو رێگەیەدا ڕابکەن، بە وتەی دەی نۆن دوای کوشتنی داریوش، ئارتابانووس و ئەردەشێر بەو رێگە ژێرزەمینیدا هەڵاتن، بەڵام ئایا دیسان دوای ئەوەی بەشێك لە نووسینەکانی دەی نۆن تاوانی دەستکاریان خرایە پاڵ، دەتوانین متمانە بەو بڕگەیە بکەین؟

مینۆرێسکی ئەو بابەتە پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێت ئارتابانووس لەو رێگەیەوە هەڵات و داریوشی لەگەڵ خۆیدا برد نەك ئەردەشێر.

لە هەندیّ سەرچاوەدا هاتووە کە دوای هەڵاتنی ئارتابانووس و ئەردەشێر یاخۆ داریوش لەو رێگەیەوە، سەربازەکانیشی هەوڵی ڕاکردنیان لەو رێگەیەوەدا و دانیشتووانی شاریش کاتێك زانیان ئەوان ڕادەکەن، هەوڵی ڕاکردن بە هەمان رێگەیاندا، بەڵام ئەو رێگەیە وەك هەموو رێگەکانی دیکەی ژێرزەمینی تەنگ بوو و بەرزیەکەی کەم بوو و توانای پەڕینەوەی ئەو هەموو دانیشتووانەی نەبوو.

سەربازەکان کاتێك بینیان دانیشتووانی شار رێگرن لە تێپەڕبوونی ئەوان، بیّ بەزەییانە کەوتنە کوشتنی ئەوان، هەر کەسێك کە رێی دەگرتن، کوشتیان. چوونکە هەندیّ لە

کوژراوەکان خۆیان دەکەوتنە ناو ڕێڕەوەکە، تەنانەت ڕێگە بۆ ڕۆیشتنی سەربازەکانیش داخرا، ناچاربوون لاشەکان لەو ڕێڕەوە درێژە بهێننەدەر تا بتوانن لەو ڕێڕەوە تێپەڕ بن و ڕابکەن و گیانیان بە سەلامەتی دەرباز بکەن.

دوای ئەوەی سەربازەکان هەڵاتن و خەڵکی شار زانیان شارەکە بێ بەرگریکار ماوەتەوە، خۆیان بەدەستەوەدا، خاشایاریش لە بێ تاوانی خەڵکی شارەکە دڵنیا بوو، بۆیە کەسی لە خەڵکی بێ تاوان نەکوشت، بەڵام فەرمانی کرد قەڵاکانی شارەکە بڕوخێنن بۆ ئەوەی جارێکی دیکە نەبێتە پەناگەی یاخیبوونێکی دیکە.(٤)

هێرتزفێڵد یەکێکی دیکەیە لە ئێرانناسە هاوچەرخەکان دەڵێت، دوای ماوەیەك ئارتابانووس بەخشرا، بەپێچی پەتی و چاوی بەستراو هاتە لای خەشایار، ئەوەش بەڵگە بوو، کە داریوش لە سیراف نەکوژراوە، چوونکە ئەگەر لە سیراف و بە فەرمان یاخۆ ڕەزامەندی ئارتابانووس کوژرا بووایە، ئەستەم بوو ئارتابانووس بەخشرابووایە.

لە ئێرانی کۆن نەریت بوو کە گەورە تاوانباران بۆ بەخشرانیان پێڵاوەکانیان پڕ خۆڵ دەکرد، بەهەردوو لا ملیانەوە شۆڕیان دەکردەوە و چاویان بە دەسەسرێك دەبەست، شمشێرێکیان بە دەستەوە دەگرت، ئەگەر کوڕیان هەبووایە، کوڕەکەیان و ئەگەر نا یەك لە خزمەکانیان قووڵیان دەگرتن و دەیانهێنانە بەردەم پاشا. شمشێر و خۆڵ و چاوبەستنەکە واتای ئەوەبوو، ئەگەر من نابەخشی، بەو شمشێرە بمکوژە و ئەو خۆڵە بڕێژە ناو گۆڕەکەم.

---

(٤) وای بۆ دەچن کە وێرانکردنی سیراف هەر لەوکاتەوە دەستی پێکردبێت، لە کاتی کۆتایی هاتنی زنجیرەی پاشایەتی هەخامەنشییی ئەو شارە بە تەواوەتی وێران ببوو، لەسەردەمی ئەشکانییەکانیش ناوی نەبوو، بەڵام کاتێك ئەردەشێری ساسانی هاتەسەر دەسەڵات، بیری کردەوە کە ئەو بەندەرە وێرانە دەبێت ئاوەدان بکرێتەوە، چونکە لە باشووری ئێران هیچ یەکێك لە بەندەرەکان توانای ئەو بەندەرەیان نەبوو.

ئەو کەنداوەی بەندەری سیرافی لەخۆ گرتبوو، بە شێوەیەك بوو کاتێك لە دەریادا زریان هاتبایە، لە ئەوێ شەپۆلەکان ئاسایی بوون، ئەو کەنداوە بەندەری سیرافی لە گێژەلووکە و جووڵە و شەپۆلەکانی ئاو دەپاراست، زارکیی کەنداوەکە بە شێوەیەك بوو،یتەنانەت ئەو بەندەرەی لە هەڵکشان و داکشانی ئاویش دەپاراست، هەر بۆیە هەڵکشان و داکشانی ئاوی ئەو کەنداوە زۆر کەم بوو. "زەبیحوڵڵا"

چاو بەستنی تاوانبار بە هێمای ئەوە دەهات، کە خۆی پیێ زۆر تاوانبارە و ناتوانێت چاو لە ڕووخساری پاشا بکات و بیبینێت، ئارتابانووسیان بە هەمان شێوە بردە لای خەشایار، پاشا ئەوی بەخشی، دوای ماوەیەکیش هەمان پۆستی جارانیان پیێ بەخشییەوە، هەروەها جەنگی سیراف مایەی ئاشتبوونەوەی پاشا و ماسیس تەسی برای...وەك ئاماژەمان پێکرد کاتێك ماسیس تەس بەیاخیبوونی ئارتابانووسی زانی، بە لەشکرەکەیەوە کەوتەڕێ تا یارمەتی براکەی بدات.(٥)

---

(٥) سەبارەت بە ماسیس تەس و خەشایاری برای چیرۆکێکی دیکەیش هەیە، کە لە پەڕتووکی (ئێرانی باستان)یشدا دەبینرێت، ئەو ڕووداوە هێمای ئەوەیە کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی دەسەڵاتداری خەشایار ئەو پاکی و ڕەوشتبەرزی و جوامێری و لەخۆبوردەییەی دەگەڕێندرایەوە بۆ کوروش و داریوش، بچووکترین نیشانەکانی نەمابوو، ڕووداوەکان دەرخەری ئەوەن، کە ئەو پاشایە لە دوای گەڕانەوەی لە یۆنان بە تەواوەتی داماڵرابوو لە جوامێری و گەورەیی، کاتەکانی تەمەنی پتر بە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی دەبردەسەر، بۆوە خودان کۆمەڵێك حەرەمسەرا و کورتەی چیرۆکەکە بەم شێوەیە:

خەشایار عاشقی خێزانی ماسیس تەس بوو، چونکە ئەو ژنە بە هیچ شێوەیەك ڕووی نەدەدایە، دواتر خەشایار کچی ئەو بۆ داریوشی کوڕ دەهێنێت، پاشان عاشقی بوکەکەی خۆی دەبێت، دوای ڕووداوگەلێك نهێنییەکەی ئاشکرا دەبێت، براژنەکەی خۆی دەداتە دەست ژنە ڕق ئەستوورەکەی خۆی تا ببێتە قوربانی تۆڵەی ئەو، چونکە ماسیس تەسی تووڕە و ناڕازی بەرەو باختەر دەڕوات، بۆ ئەوەی لەگەڵ یاوەرەکانیدا لە دژی خەشایار ڕابپەڕێت و خەشایاریش بەمە دەزانێت و فەرمانی کوشتن و لەنێوبردنیان دەدات، لەئاکامدا ماسیس تەس دەکوژرێت.)

# کوژرانی خەشایارشا و دەسەڵاتیی ئەردەشێر

یەکێکی دیکە لە ڕووداوە نائاساییەکان کە لە سەردەمی خەشایار شا ڕوویدا، بەخشرانی ئارتابانووس بوو، ئەوەبوو لە دوای یاخیبوونەکەی گەڕایەوە، وەك ئاماژەی پێکرا هێندەی نەبرد گەڕایەوە سەر پۆستە کۆنەکەی و جاریکی دیکە بۆوە فەرماندەیی گاردی جاوید.

ڕاسپاردنەوەی ئەو پۆستە دوای یاخیبوونەکەی، پێچەوانەیە و لەوانەیە دوای ئەوەی هەستیان بە پەشیمانی ئەو کردووە، کارێکیان پێ دابێتەوە، بەڵام گەڕاندنەوەی پیاوێك کە ناپاکی کردبێت و جارێکی دیکە پۆستی فەرماندەیی گاردی پاشایەتیی پێ بدرێتەوە، بە بڕیارێکی نائاسایی دێتە ناسین، بەڵام دوو لە مێژوونووسان دەڵێن، کە ئەو پۆستە لەسەر داوای خۆشەویستە جوولەکەکەی خەشایار بە ئارتابانووس ڕاسپێردرایەوە، ئەو ژنە خەشایاری دڵنیاکرد، کە ئارتابانووس لەمەو پاش بە ئەمەك و خزمەتکار دەبێت لە هەمبەریدا.

سەبارەت بە خۆشەویستە جولەکەکەی خەشایار ئەفسانەیەك هەیە، ئەمڕۆ ئەگەر کەسێك بڵێت ئەوە ئەفسانەیە، دووچاری تاوانی مێژوویی و ئەدەبی دەبێت، ڕاهاتووین کاتێك ئەفسانە دەبێتە جێگرەوەی ڕاستی، ئەستەمە بتوانرێت بگۆڕدرێت، خۆمان لە باسکردنی ئەو ئەفسانەیە دەپارێزین، بە هۆی ئەوەی زۆر ناسراوە و کەس نییە زانیاریی لەسەر نەبێت، بەپێی ئەو چیرۆکە خەشایار دەیویست هەموو جوولەکەکان بکوژێت، بەڵام لە پێناو گەیشتنی بە کچێکی جوولەکە بە ناوی (ستارە) کە ناوە یۆنانییەکەی (ئەستێر) بووە، دەستبەرداری ئەوکارە بووە.[1] خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە ئێمە ڕووداوە مێژووییەکان لە روانگەی مێژوویی دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە و لە روانگەی گێڕانەوە ئاینییەکانی نێو تەورات بەو کارە هەڵناستین، هەمووان دەزانن مێژووی تەندروست جیایە لەوەی لە گێڕانەوە ئاینییەکاندا هاتووە، ئەو

---

(١) ئەو بەسەرهاتە سەبارەت بە کوروشیش، بە هەمان شێوە باس دەکرێت و دەوترێت ستارە خۆشەویستی ئەو بووە، نەك هی خەشایار. "زەبیحوڵڵا"

بابەتەمان باسکرد تا نەبینە جێگەی ڕەخنە لەسەر ئەوەی کە چیرۆکی ئەستێر لە پەڕتووکی ئاینی جوولەکەکاندا هاتووە، بۆیە ناکرێت بە ئەفسانەی بزانین.

ئاشکرایە کە بوونی ئافرەتێك بە ناوی ئەستێر ئەفسانە نییە، کچێك بەو ناوە هەبووە، بەڵام بابەتی ئەوەی خەشایار یاخۆ کوروش ویستبیان کوشتارگەی جوولەکەکان ئەنجام بدەن، لەگەڵ هۆگربوونی ئەوان بە ئازادی ئاینی، بۆ ئەوانەی لە سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەیاندا دەژیان، یەك ناگرێتەوە.

سەبارەت بە بەسەرهاتی کوژرانی خەشایار لە سەرچاوە مێژووییە یۆنانی و لیدی و رۆمییە کۆنەکان زۆر گێڕانەوە هەیە، بەپێی ئەو گێڕانەوانە کە بەشێکیان ئەفسانەن و جێگەی متمانە نین، خەشایار لە شەوێك لە شەوەکانی پایزی ساڵی (٣٦٤ پ. ز) کوژراوە.

بە وتەی دەی نۆن، ئارتابانووس دوای گەڕانەوەی بۆ سەر کارەکەی، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بۆوە خاوەن سەرمایەیەکی زۆر، ئەو بابەتە بۆ خەشایار جێگەی گومان بوو. هەموو مێژوونووسە کۆنەکان لەبارەی پاشا هەخامەنشییەکانی سەرەتای زنجیرەکە یەکڕان، کە خاوەن سەرمایەی تایبەتی خۆیان نەبوون، کۆکردنەوەی موڵك و سەرمایەی زۆر لە سەردەمی ئەردەشێری کوڕی خەشایار بە دواوە بووە بە نەریت.

ئارتابانووس کە سەرمایە و موڵکی زۆری بە دەست هێنابوو، کەوتبۆوە بەر گومانی خەشایار و خۆی لە مەترسیدا دەبینی، نەیدەتوانی دەست لە سەرمایەکەی هەڵبگرێت. بە وتەی دەی نۆن و دیۆدۆر، خەشایار وای لێکدایەوە کە ئارتابانووس ئەو موڵك و سەرمایەیەی بە زۆر لە خەڵك سەندووە، بۆ ئەمەش سوودی لە پلە و پایەی خۆی بینیوە.

پاشای هەخامەنشیی بەپێی وتەی ئەو دوو مێژوونووسانە، یەکێك لە باوەڕپێکراوەکانی خۆی بۆ بەدواداچوون لەو بارەوە ڕاسپارد تا بزانێت ئەو سەرمایەیە لەلایەن ئەو پیاوە بە چ شێوە و ڕێگەیەك بە دەست هاتووە.

ئارتابانووس بەو بابەتەی زانی و هەستی بە هەڕەشەکرد لەسەر گیانی خۆی، بۆیە بە وتەی پلین و دەی نۆن دەستی بە گفتوگۆ لەگەڵ ئەردەشێر کرد، لەبارەی بوونی بە جێنشینی خەشایار شا، بەپێی نەریتەکان دوای مردنی خەشایار داریوشی کوڕە گەورەی دەبوو بە پاشا، بەڵام ئەگەر ئەو لەنێو بردرابووایە، ئەوا ئەردەشێر دەبوو بە پاشا.

بە وتەی خانتۆس ئەردەشێر برایەکی دیکەی بە ناوی (وێشت ئەسپ) هەبوو، کە لە خۆی گەورەتر و لە داریوش بچووکتر بوو، ئەگەر داریوش مردبایە، پاشایەتیی دەبوو بە هی ئەو، نەك هی ئەردەشێر، هەر ئەو مێژوونووسە دەڵێت ئەردەشێر دوای ئەوەی داریوشی برای کوشت و بەشدار بوو لە کوشتنی باوکی، پاشایەتیی خۆی ڕاگەیاند، وەیشت ئەسپیش لە دژی ڕاپەڕی. بە بۆنەی هاتنی یەکێك لە جەژنەکانی پایزی ساڵی (٤٦٤ پ. ز) خەشایار شا رۆیشت بۆ پێرسپۆلیس، لەکاتێکدا هێشتا کۆشکی پێرسپۆڵیس تەواو نەببوو، بەڵام ڕێوڕەسمی جەژنەکان لەو کۆشکە ئەنجام دەدران. کاتی چوونی خەشایار بۆ پێرسپۆڵیس، ئارتابانووس بە هۆی ئەو پۆستەی هەیبوو یاوەری خەشایار شا بوو، هەروەها داریوش و ئەردەشێری کوڕیشی لەگەڵدا بوون، بەڵام وێشت ئەسپ لە پێرسپۆڵیس نەبوو.

شەوی ئەو ڕووداوە دیار نییە و هیچ یەك لە مێژوونووسەکان دیاریان نەکردووە، کەتزیاسی نۆشدار ماوەی بیست ساڵ لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا لە ئێران بووە، دەڵێت شەوی ئەو رۆژەی دەبوو بە جەژن، ئەو بویەرە ڕوویداوە، لە ئاکامدا رۆژی دواتر ڕێوڕەسمی جەژنەکان بە ئەنجام نەگەیشتن.

ئەو شەوە دوای ئەوەی خەشایار و داریوش نووستن، ئارتابانووس و ئەردەشێر خۆیان بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە ترسناکە ئامادە کرد، لە پێرسپۆڵیس سەربازەکانی گاردی جاوید پاسەوان بوون، ئەستەم بوو کەسێك بکارێت، بچێتە ئەو بەشەی خەشایاری لێ دەنووست، تەنیا یەك کەس بۆی هەبوو بە هەموو بەشەکانیدا بگەڕێت کە پاسەوانی لێ بوو، ئەویش ئارتابانووس بوو، "داریوش"یش لە بەشێکی دیکەی کۆشکەکە خەوتبوو، ئەردەشێریش لە هەمان بەشدا بوو، ئەردەشێر بێ ئاریشە دەیتوانی بچێتە نێو شوێنی حەوانەوە و نووستنی داریوش، دوو تاوانبار پیلانیان دانابوو، کە لە یەك کاتدا ئەو دوو تاوانە ئەنجام بدەن.

نازانین ئەو دوو کەسە دوای چوونیان بۆ شوێنی نووستنی ئەوان، چۆن لێیان نێزیك بوونەوە، چیان بینی، ئایا دڵ و دەستیان دەلەرزی لەوەی کە تاوانێکی ئاوا ئەنجام دەدەن یاخۆ نا؟ بەڵام دەگوترێت کە کوژرانی ئەوان تا بەرەبەیان ئاشکرا نەبوو، دوای ئەوەی رۆژ بۆوە، ئەردەشێر پاشایەتیی خۆی ڕاگەیاند.

مێژوونووسە کۆنەکان ئەردەشێر تەنیا بە بکوژی براکەی دەزانن و نووسیویانە کە بەشداری کوشتنی بابی نەکردووە، بەڵام مێژوو و ئەقڵ ئەردەشێر بە بەرپرس لە کوشتنی بابی دەزانن، چوونکە ئەو بەشداری پیلان بوو، دەیزانی ئارتابانووس چ ئامانجێکی هەیە.(٢)

دەی نۆن نووسیویەتی لەگەڵ بەرەبەیاندا ئارتابانووس، ئەردەشێری زیندانی کرد و خۆی بە پاشا ناساند، هەر بەپێی هەمان سەرچاوە، ئارتابانووس بۆ ماوەی حەوت مانگ بۆتە پاشا، دواجار بە دەست ئەردەشێر دەکوژرێت.

بە بڕوای پرۆفیسۆر ڤلادیمێر مینۆرێسکی، پێی وایە ئەو بەشەی نووسینی دەی نۆن تەندروست نییە، لە تێگەیشتنی بە هەڵەی بەسەرهاتێکی مێژوویی وەرگیراوە، کە بریتییە لەوەی کە دوای کوژرانی خەشایار، ئارتابانووس بۆ ماوەی حەوت مانگ پاشای ڕاستەقینەی هەخامەنشیی بووە، واتە تا ئەوکات ئەردەشێر بە ڕواڵەت پاشا بوو، لە ڕاستیدا ئارتابانووس دەسەڵاتیی بەڕێوە دەبرد و لەسەر تەختی پاشایەتیی دانەنیشت بوو، چوونکە ئەو شازادە نەبوو، تا بکارێت لە جیاتی خەشایار ببێتە پاشا، لەکاتێکدا شازادە ئەردەشێر و وێشت ئەسپیش هێشتا لە ژیاندا بوون، کەواتە ئارتابانووس ناکارێت ببێتە پاشا.

دوای ئەوەی حەوت مانگ بەسەر مردنی خەشایار تێپەڕی، ئەردەشێر بکوژەکەی بابی کوشت، بەڵام ئەو کارەی نەبۆوە هۆی سڕینەوەی پەڵەی ڕەشی ئەو ناپاکییە مەزنەی کردبووی، ئەوەی ئەو ڕووداوەی زۆر گەورەتر کرد، ئەو ڕووداوە بوو لە پێرسپۆلیس ڕوویدا، لەکاتێدا ئەو شوێنە لە

---

(٢) سەبارەت بە کوژرانی خەشایار و داریوشی کوڕی، تەنانەت وەك لە پەڕتووکی (ئێرانی باستان) لە نووسینی پیرنیادا (موشیر ئەلدولە) هاتووە، گێڕانەوەکانی مێژوونووسە کۆنەکان وەك بابەتە لێك چووەکان لەگەڵ یەکدیی جیاوازن. بەسەرهاتێکی دیکە ئەوەیە کە ئارتابانووس (ئەردەوان) بە تەنیا یاخۆ لەگەڵ یەکێك لە گەورەکانی حەرەم بە ناوی مهرداد بە شەو چووە بۆ کوشتنی خەشایار و ئەوی کوشت، دواتر هەواڵی بۆ ئەردەشێر نارد کە داریوش بابی خۆی کوشتووە و تێی گەیاند کە ئەو تاوانبار کراوە، لەژێر کاریگەریی ئەو هەواڵە بوو، کە ئەردەشێر بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی بابی، دەستی بە خوێنی براکەی سوور کرد و داریوشی کوشت. هەڵبەت ئەوە ڕواڵەتی بابەتەکە بووە، بابەتی جێنشینی پاشا و کێشمەکێشە توندەکانی نێو حەرەمسەرای پاشایەکی خۆشگوزەرانی وەك خەشایار خۆیان دەتوانن ببنە بیرۆکەی ئەو کارە."زەبیحوڵڵا"

سەردەمی هەخامەنشییەکان بە پیرۆز دەزانرا و ڕێوڕەسمە ئاینییەکان و جەژنە مەزنەکانی وڵات لەوێندەر ئەنجام دەدران و کەس باوەڕی نەدەکرد ئەو شوێنە پیرۆزە بە خوێن پیس بکەن.

هیچ زانیارییەك لەبارەی گۆڕی داریوشی کوڕی خەشایار نییە، بەڵام مێژوونووسان دەڵێن کە تەرمی خەشایار لە گۆڕستانی پاشا هەخامەنشییەکاندا نێژراوە، ئەو گۆڕستانەش هێشتا ماوە و گۆڕی پاشاکانی هەخامەنشیی لە فارس دەبینرێن.

ئەردەشێری یەکەم ناسراو بە ئەردەشێری دەستدرێژ، دوای خەشایار شا گەیشتە سەر تەختی پاشایەتیی، وەك هەندێك لە شازادەکانی هەخامەنشیی دەیتوانی بە دوو دەست ڕم هەڵبدات، چوونکە هەڵدانی ڕم دەستی مرۆڤ درێژ دەکات، بۆیە دەستەکانی ئەویش درێژبوون لە کاتی وێستان دەگەیشتنە سەر ئەژنۆکانی، ئەو بابەتە ئێستە لەگەڵ یاساکانی زیندەوەرزانی کۆکە و هەندێ وەرزشکار کە دیسك هەڵدەدەن یاخۆ بۆکسێن دەکەن، دەستەکانیان دە تا دوازدە سانتیمەتر درێژ دەبن، لە هەڵدانی دیسك تەنیا دەستێك درێژ دەبێت، چوونکە دیسك بە یەك دەست هەڵدەدرێت، بەڵام لە بۆکسێندا هەردوو دەستدرێژ دەبن، بەو پێوەرە درێژبوونی هەردوو دەستی ئەردەشێر بە هۆی هەڵدانی ڕم، ڕووداوێکی نائاسایی نییە، بەڵام هەندێ کەس باوەڕیان وایە (دەستدرێژ) واتای تایبەتی هەیە، ئەو ناوە کە بێگومان یۆنانییەکان بۆ ئەویان دانا، بەو واتایە دێت کە ئەردەشێر بە دەسەڵات بووە و دەسەڵاتیی گەیشتووەتە هەموو شوێنێك.

ئەردەشێر دوای کوشتنی ئارتابانوس و کوڕەکانی کە بۆ ماوەی چەند مانگێك کاروباری وڵاتیان گرتبوو دەست، سەرەنجی دایە وێشت ئەسپی برا گەورەی کە فەرمانڕەوای باکتریا بوو. لەوانەیە بە هۆی ئەوەی پاشایەتیی بە مافی خۆی دەزانی، یاخیبوونێکی گەورەی لێ کەوتووەتەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەسەڵاتیی پتر بوو بێت. ئەردەشێر لەشکرێکی بۆ شکاندنی ئەو نارد و جەنگ بەرپابوو، بەڵام لە کوژرانی سەربازان پتر هیچ ئاکامی لێنەکەوتەوە، ئەردەشێر ناچار هێزی دیکەی نارد، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی وێشت ئەسپ، ئەوەبوو لە ساڵی (٤٦٣ پ. ز) ئەوی شکستدا.

ئەو سەرکەوتنە ئەردەشێری لە مەیدان بەدەرخست و دەسەڵاتیی ئەوی بەسەر تەواوی سنووری ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشییدا پتەوتر کرد، دوای ئەوە ئەردەشێر فەرمانڕەوایانی هەموو ئەو ویلایەتانەی لادان کە گومانی دەکرد لە داهاتوو بۆی ببنە مایەی کێشە،

کەسانێکی دانا کە لایەنگری خۆی بوون و توانای بەڕێوەبردنی کارەکانیان هەبوو. هەروەها هەوڵیدا تا ناڕێکییەکانی سەردەمی خەشایار کۆتایی پێ بێنێت، بۆیە هەندێ چاکسازی لە بوارەکانی سەربازی و دارایی ئەنجامدا. زۆرترینی مێژوونووسە کۆنەکان پێیان وایە کە ئەردەشێری دەستدرێژ لە ساڵانی سەرەتای دەسەڵاتداری خۆیدا، لە پێناو چاك کردنی بارودۆخی وڵات تێکۆشاوە، سەردەمی دەسەڵاتداری ئەردەشێر یەکێکە لە سەردەمانی دیاری مێژووی ئێرانی کۆن، بە تایبەتی لە بواری زانست، ئەدەب و هونەر زۆر دیار بوو، ئەمەش بەپێی پەڕتووکی ئەو کەسانە باس دەکەین کە هەردەم بەپێی رێساکان دوژمنی ئێران هەژمار کراون، ئەوانەش مێژوونووس و جیهانگەرد و زانا یۆنانییەکانن.

هێشتا ماوەیەك بە سەر دەسەڵاتداری ئەردەشێردا نەڕۆیشت بوو، کە سەرۆك کۆماری ئەسینا (تیمیستۆکیل) کە بە قارەمانی جەنگی سالامیسیش ناسرا، پەنای هێنا بۆ دەرباری پاشای هەخامەنشیی، لە سەردەمانی نوێشدا تەنیا یەك هاوتا بۆ ئەو شێوە پەناهەندەبوونە هەیە، برێتییە لە پەناهەندەبوونی ناپلیۆنی یەکەم ئیمپراتۆری فەرنسا لە بەریتانیا، بەڵام بەریتانیا ئەو پەنابەرەیان دوورخستەوە بۆ دوورگەیەکی دوور بە ناوی (سێنت هێلن) تا لە ئەوێ بمرێت، ئەردەشێریش بە پێچەوانەوە، دوژمنەکەی واتە سەرۆك کۆماری یۆنانی بە شکۆوە پەسەند کرد و شاری ئەکباتان (هەمەدان) کە لە شارە دڵڕفێن و ئاووهەوا خۆشەکانی ئێران بوو، وەك شوێنی نیشتەجێی ئەو دیاری کرد.

(شارۆنی) یۆنانی وەك تەواوی ئەقڵمەند و زاناکانی دیکەی ئەوکات هاتە ئێران، ماوەی چەند رۆژ لە کۆشکی تیمیستۆکیل مایەوە، نووسیویەتی ژیانی تیمیستۆکیل لە یۆنان وەك ژیانی کارمەندێکی پلەبەرز بوو، بەڵام لە هەمەدان ژیانی ئەو لە ژیانی پاشاکانی رۆژهەڵات دەچوو، خزمەتکارەکانی کۆشکەکەی ئەو پتر لە سەد کەس بوون، بەپێی نەریتی ئێرانییەکان رۆژانە دووجاران خواردەمەنیان دادەنا، هێندە خواردن لەسەر خوان دەبوو، کە مرۆڤ نەیدەزانی کامیان بخوات. تیمیستۆکیل ماوەیەك لە هەمەدان بوو، دواتر لەلایەن ئەردەشێرەوە پاشایەتیی سێ وڵات لە وڵاتەکانی ئاسیای بچووکی پێ ڕاسپێردرا.

هیرۆدۆت یەکێکە لەو کەسانەی زۆر بەناوبانگە، ماوەیەك لە سەردەمی ئەردەشێری دەستدرێژ لە ئێران ژیاوە، ئەگەر هیرۆدۆت ئارەزووی کردبایە دەیتوانی تا دوایین ساتەکانی تەمەنی لەوێندەر بمێنێتەوە، بەڵام چوونکە دەیویست گەشت بکات، دوای ماوەیەك مانەوە لە

ئێران ڕۆیشت. تۆسیدید مێژوونووسی یۆنانی کە هەموو لێکۆڵەرە مێژوویییەکان وتەکانی ئەویان لا پەسەندە، نووسیویەتی کە هەر زانا و وتاربێژ و شاعیرێکی یۆنانی کە دەڕۆیشتە ئێران، لەلایەن ئەردەشێرەوە مووچەی مانگانەی بۆ دیاری دەکرا، مووچەکەی هێندە هەبوو کە دەیتوانی لەوێ بە شکۆوە بژێت.

شارۆنی مێژوونووس، دوای چوونی بۆ ئێران ساڵانە مووچەی دووسەد سککەی زێڕی داریك[٣] بووە، لە کاتێکدا ناو و ناوبانگی شاعیر و فەیلەسووفە یۆنانییەکانی دیکەی نەبوو. بۆیە نابێت دووچاری سەرسووڕمان بین، کە زانا و ئەدیب و فەیلەسووف و وتاربێژە یۆنانییەکان وڵاتی خۆیان جێ دەهێشت و لە ئێران دەمانەوە، هەندێکیان دوای ئەوەی پاشکەوتێکی بەرچاویان بوو، گەڕانەوە بۆ نیشتمان و هەندێکیان لەوێ مردن.

لەوانەیە بگوترێت ئەردەشێر زمانی یۆنانی وەك زمانی فارسی زانیوە، ویستوویەتی بایەخی زانست و ئەدەبی یۆنانی بۆ دەربکەوێت، بۆیە خاوەن ئەقڵ و هزرڤانانی یۆنانی لە وڵاتەکەی وەردەگرت، بەڵام زانا و پیشەوەری وڵاتانی دیکەیش لە کاتی کۆچیان بۆ ئێران، لەلایەن ئەردەشێر پێشوازی دەکران و مووچەیان بۆ دەبڕایەوە.

هێشتا لە یۆنان ئەکادیمی و مۆزەخانە نەببوو باو، بۆ ئەوەی مێژوونووسە یۆنانییەکان لە پەڕتووکەکانیاندا بنووسن کە ئێران ناوەندی ئەکادیمی و مۆزەخانەکان بوو، ئەفلاتوون هێشتا لە دایك نەببوو تا ناوی ئەکادیمی بۆ ناوەندەکانی زانست دابنێت، هەرچەندە ماڵی خوداوەندیانی هونەری یۆنانیان بە مۆزەخانە دەناسی، بەڵام هێشتا ماڵی ئەوان وەك مۆزەخانە دەرنەدەکەوت، بەڵام لە سەردەمی ئەردەشێردا لە ئێران ناوەندی زانست و هونەر هەبوون، ئایا کۆکردنەوەی زانا یۆنانییەکان لەلایەن ئەردەشێر بۆ خۆشەویستی زانست و هونەر بوو یاخۆ پاشای هەخامەنشیی ئامانجی دیکەی هەبوو؟

ماریژان مۆڵە دەڵێت: ئەردەشێری دەستدرێژ ئامانجی سیاسییشی هەبوو، دەیویست بەو شێوەیە لەگەڵ یۆنانییەکان ببێتە دۆست و لە مەترسی ئەوان پارێزراو بێت، بەو مەبەستەش گەیشت، لە سەردەمی ئەردەشێردا ئاشتی لە نێوان هەخامەنشیی و یۆنانییەکان هاتەکایەوە،

---

(٣) ژاك دۆشمەن گیۆم دەڵێت هێزی کڕینی دووسەد داریك زێڕ بەر لە بیست و پێنج سەدە وەك هێزی کڕینی سەد هەزار فرانکی فەرەنسی هاوسەردەمی خۆی بووە. "زەبیحوڵڵا"

ئەو ئاشتییە کۆتایی بە جەنگەکانی نێوانیان هێنا، هاوکات دەست ڕۆیشتوویی هەخامەنشییەکانی لە یۆنان پتر کرد، ئەردەشێر و جێنشینەکانی دەستیان دەخستە نێو سیاسەتی ناوەخۆی یۆنان، چوونکە ئێران ببوو بە خانەخوێی زانا یۆنانییەکان، ناوە ناوە بە ناو فەیلەسووف و زاناش دەهاتن و دەچوونە نێو ریزی زاناکان و مووچەیان وەردەگرت، ئەو بابەتە بۆوە هۆکاری ئەوەی (دیۆدۆری) یۆنانی بڵێت: "کۆمەڵێك لەو کەسانەی لە ڕووداو خولقێن بوون) لە ئێران کۆبوونەتەوە، بەڵام ئەو یۆنانییانەی کە ئێرانیان بە وڵاتی دووەمی خۆیان دیاری کرد، هەموویان لەو کەسانە نەبوون، لەنێویاندا کەسانی دیاری وەك (تیمیستۆکیل سەرۆکی ئەسینا، بوکراتی نۆشداری ناسراو، بە وتەی یۆنانییەکان باوکی نۆشداران، ئاریستۆڤانی نووسەری دراماتیك، سی دیاسی پەیکەرساز، دیۆژێن و شارۆنی مێژوونووس و...هتد)، ئەو شانۆنامانەی ئاریستۆڤان بەر لە بیست و پێنج سەدە نووسیویەتی تا ئێستەش بەرچاون و لەوانەیە پەیکەرەکانی سی دیاس دروستی کردوون تا ئێستە لە دنیا مابن.

هەر بۆیە ئەمە وایکرد سەبارەت بە بوکرات بکەونە گومان، چوونکە کاتێك پاشای هەخامەنشی داوای کرد نەخۆشی لەشکرەکەی چارەسەر بکات کە لەوانە بوو نەخۆشی (پەتا) بوو بێت، ئەو پەسەندی نەکرد، وتیان کەسێکی ئاوا نیشتمانپەروەر و دەمارگیر ناچێتە ئێران، بەڵام دوای ئەوەی ئاشتی لە نێوان ئەو دوو وڵاتە جێگیر بوو، بوکرات ڕۆیشتە ئێران، هەروەها کەسایەتییەکی دیکە کە لە سەردەمی ئەردەشێردا لە یۆنانەوە چۆتە ئێران، لوقمان بوو، ئەگەرچی هەندێك ئەو و بوکراتیان بە هەڵە بەیەك کەسایەتی زانیوە.

بوکرات بێگومان هەبووە و بەرواری لەدایکبوون و مردنی دەزانین، دەزانین چ کارە بووە و لە کوێ ژیاوە، بەڵام سەبارەت بە کار و ژیان و لە دایکبوون و مردنی لوقمان هیچ زانیاریمان نییە، تەنیا دەزانین فەیلەسووف بووە، وشەی لوقمانیش لە ڕۆژهەڵات ناسراو بووە، لە سەرچاوە مێژووییە ڕۆژئاواییەکان ناوی لوقمان نەهاتووە، مێژوونووسەکانی ئەوێش وتوویانە کەسێك لە ڕۆژهەڵات بەو ناوە هەبووە، کە هەمان فەیلەسووفی یۆنانی (ئێزۆپ) بووە، کە بە باوەڕی ئەو (زمان باشترین دۆست و خراپترین دوژمنی مرۆڤە، دەیوت هەر بەدبەختییەك کە ڕوو لە مرۆڤ دەکات و هەر سەرکەوتنێکیش کە لە کۆمەڵگەدا بۆی بێت، هەروەها دۆستی زۆری دەست کەوێت، هەموویان بەرهەمی زمانی مرۆڤن).

بە گشتیی بە پێچەوانەی وتەی دیۆدۆر ئەو یۆنانییانەی لە سەردەمی ئەردەشێری دەستدرێژ لە ئێران بوون، خەڵکی نەزان و نێزیك كێشە نەبوون، لە نێوانیاندا خەڵكی دیاری زانست و ئەدەب و هونەر هەبوون. نەوەكانی سی دیاسی پەیكەرتاش لە ئێران مانەوە، بەردەوامبوون لەسەر پیشەی بابیان، سی دیاسیش هەندێك پەیكەری بۆ پێرسپۆڵیس چێ كرد، كە هیچ شوێنەواریان نەماوە، چوونكە هەموو پەیكەرە جوانەكانی ئەو كۆشكە لەنێوچوون و نەوەكانی سی دیاس كە لە ئێران مانەوە بۆ پاشا و گەورەكانی هەخامەنشیی پەیكەریان داتاشی، كاتێك ئەسكەندەر هاتە ئێران، نەوەكانی سی دیاس لە ئێران كاری پەیكەرتاشیان دەكرد.

لە سەردەمی ئەردەشێردا هێندە پیاوی یۆنانی لە ئێران بوون، كە پیاوانی ئێرانیش بە لاسایكردنەوە و چاودانی ئەوان كەوتنە ریش تاشین، ئاشكرایە كە گەنجان پێشەنگ بوون، چوونكە هەموو مۆدێلێكی نوێ لەلایەن گەنجانەوە وەردەگیرێت. توسیدید نووسیویەتی لە سەردەمی ئەردەشێردا لەبەر كردنی جلوبەرگی كورتی یۆنانی لە ئێران پەرەی سەند.

ئێرانییەكان باڵاپۆشیان لە بەردەكرد، بەڵام یۆنانییەكان زانا ئاینییەكان و خەڵكی دیكەیش جلی كورتیان لە بەردەكرد. ژنانی یۆنانی لە ماڵەكانیان جلوبەرگی كورتیان دەكردەبەر و پیاوەكانیان لە دەرەوەش هەر جلوبەرگیان كورت بوو، ئایا جلوبەرگی كورتی ئەوان لە وەرزشگە و ئۆلەمپیادەكانەوە هات، ئەوان لە ئۆلەمپیادەكان، بۆ وەرزش جلوبەرگی كورتیان دەكردە بەریان، ئایا ئەوە بۆیان بوو بە نەریت؟ لەوانەیە وا بووبێت و مۆدێلی جلوبەرگی كورتی یۆنانییەكان بە وتەی تۆسیدید لە سەردەمی ئەردەشێر هاتە ئێران، بەڵام تا كۆتایی سەردەمی هەخامەنشییەكان نەبوو بە پۆشاكی گشتیی لەوێندەر و هەندێك وەك جاران باڵاپۆشیان هەبوو، هەروەها تۆسیدید دەبێژێت لە سەردەمی ئەردەشێردا زمانی یۆنانی لە ئێران برەوی سەند، هۆكارەكەش ئەوەبوو كە زانا و ئەدیب و هونەرمەندە یۆنانییەكان بە مووچە باشەكانیان چینێكی تایبەتیان پێكهێنابوو، كە تەواوی خەڵك دەیانەویست یۆنانی فێر بن بۆ ئەوەی لەو شێوە ژیانەی ئەوان بەهرەمەند بن، یۆنانی زانینی ئەردەشێری دەستدرێژیش لەو بابەتە كاریگەر بووە، بەڵام زمانی یۆنانی نەیتوانی ببێتە جێگرەوەی زمانی فارسی تەنیا لە سەردەمی جێنشینە یۆنانییەكانی ئەسكەندەر نەبێت.

لە وڵاتی لیبیا لە باكوری ئەفریقیا پیاوێكی زۆر باڵابەرز هەبوو، كە ئەگەر كەسێك ویستبای دەستی بگاتە ڕووخساری، دەبووایە بچێتە سەر پێپلكان، ئەو بابەتەی خەڵك

دەیانوت لە ئەفسانە دەچوو، بەلاّم بە وتەی مێژوونووسان لە ئەفریقا کەس لەو پیاوە کە ناوی ئیناڕووس بوو، بالاّبەرزتر نەبووە. پیاوێکی بالاّبەرز ئەگەر زیرەك و بەهۆش بێت، بێگومان لە ژیاندا بە باشی پێش دەکەوێت، چوونکە بالاّی بەرز لە ئامرازەکانی دەست ڕۆیشتوویی بەسەر ئەوانی دیکە هەژمار دەکرێت، ئەو بابەتە بە تایبەتی لە کۆندا زۆر گرینگ بوو، ئەو پیاوە بالاّبەرزە، چوونکە زیرەك و بەهۆش بوو، بە خێرایی پێشکەوت و بووە پاشای لیبیا. تا ئەو کاتەی خەشایار لە ژیاندا بوو، ئەو نەیوێرا بڕواتە میسر و دەستدرێژی بکاتەسەر ئەو وڵاتە، کە بەشێك بوو لە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی، بەلاّم دوای بیستنی هەواڵی مردنی خەشایار، هەوڵیدا کە میسر داگیر بکات، ئەوکات هەخامەنش کوڕی داریوشی گەورە و برای خەشایار، کە دەبووە مامی ئەردەشێری دەستدرێژ لەلایەن پاشای هەخامەنشییەوە ببوو بە فەرمانڕەوای میسر، میسرییەکان ئێرانییەکانیان خۆش دەویست، چوونکە هەخامەنش کوڕی داریوش و فەرمانڕەوای ئەوان، لەگەڵ کەسانی نێزیکی ئەو زۆر ڕێزیان لە ئاینی ئەوان دەگرت، بێ ئەوەی ئاموون خوداوەندی گەورەی میسر، خوداوەندی ئێرانییەکان بێت، چەندە لەلای میسرییەکان بایەخی هەبوو، هێندەش لای ئەوان بە بایەخ بوو.

سەرچاوەکان دەبێژن کە هەخامەنش نەیتوانی لە باکوری میسر پێش بە ئیناڕووس بگرێت، دوای ئەوەی هەواڵی هێرشی ئیناڕووسی پێگەیشت، ئەردەشێر چووە باشووری میسر و ویستی لەوێندەر لەشکرێکی مەزن لە میسرییەکان و خەڵکی سوودان پێك بهێنێت، بەلاّم دووچاری نەخۆشی سکچوونی تووند بەخوێنەوە، بووە هۆی مردنی، بەلاّم دواتر دەبینین ئەو بابەتە ڕاست نییە.

ئەو دامەزراوەی کوروش و داریوشی یەکەم بۆ گەیاندن دایان مەزراند و خەشایار پەرەی پێدا، هێندە توکمە و خێرا بوو، کە دوای سێ ڕۆژان هەواڵی هێرشی ئیناڕووس بۆ میسر، لە هەمەدان گەیشتە ئەردەشێری دەستدرێژ.

ئەگەر مەودای نێوان میسر و هەمەدان بخەینەبەر دیدەمان دەزانین کە خێرایی گەیشتنی هەواڵەکان لەو سەردەمەدا وەك خێرایی گەیشتنی هەواڵەکان لە سەدەی نۆزدەیەم و دوای داهێنانی بێتەل و تەلەگراف بووە.

سێ مێژوونوسی باوەڕپێکراو باسی ئەوەیان کردووە، کە لە ماوەی سێ ڕۆژدا هەواڵەکە گەیشتووە و ئەوانەش بریتین لە:

**یەکەم:** کەتزیاسی یۆنانی کە بیستساڵ پزیشکی کۆشکی هەخامەنشیی بووە.

**دووەم:** گزنفۆن کەسایەتیی سیاسیی و مێژوویی و سەرکردەی سەربازی و نووسەری پەڕتووکی مێژوویی بەناوبانگی (گەڕانەوەی دە هەزار کەس).

**سێیەم:** شلیپۆن مێژوونووسی یۆنانی کە ئەویش لە سەفەری گەڕانەوەی دە هەزار سەربازە یۆنانییەکە بەشدار بووە و پەتووڕکێکی لەو بارەوە نووسیوە، بەڵام وەك پەڕتووکی گزنفۆن ناوبانگی نییە.

ئیناڕووس هەرچەندە لە میسر سەرکەوتوو بوو، بەڵام دەیزانی جەنگێکی گەورەی لە پێشە و ئەستەمە ئەردەشێر دوای ئاگەداربوونی لە هێرشی ئەو بۆ سەرمیسر، هەوڵی سەرکوتکردنی نەدات، بۆیە ویستی داوای یارمەتی لە یۆنان بکات.

ئیناڕووس لە ساڵی (٤٦٠ پ. ز) هێرشی کردەسەر میسر، ئەوکات هێشتا ئاشتی نەکەوتبۆوە نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان.

دەوڵەتی ئەسینا داوای ئیناڕووسی بە مەرجێك پەسەند کرد، کە ئیناڕووس شەراب و کشمیشی یۆنان بکڕێت، ئەوە یەکەمجار بوو لە مێژوودا ئابووری و بازرگانی کاریگەریی ئاشکرای لەسەر سیاسەت هەبێت و دەوڵەتێك بە دەوڵەتێکی دیکە بڵێت کە یارمەتی ئەوان پێوەستە بە کڕینی کاڵاکانیان، بەواتایەکی دیکە ئەسینا ئەوکات کۆگەی کاڵا یۆنانییەکان بوو، کاڵاکانی ئەو وڵاتەی هەناردە دەکرد بۆ هەموو جیهان، بەرهەمی گرینگی ئەوسا و ئێستەی یۆنان و دوای بیست و پێنج سەدە بریێتی بوو لە کشمیش و شەراب. لە میسر ترێی باش دەست نەدەکەوت، لە جیاتی ئەو جۆ بە ڕێژەی زۆر بەرهەم دەهات، میسرییەکان ئاوجۆیان داهێنا، هەموویان ئابجۆیان دەخواردەوە، تا ئەوکات لە میسر خەڵکی ئاسایی شەرابیان نەدەخواردەوە، چوونکە شەراب گران بوو، لە دەرەوە دەهات و توانای کڕینیان نەبوو.

ئیناڕووس مەرجی یۆنانی پەسەند کرد و شەراب و ترێی یۆنانی کڕی. ئەو نەیتوانی میسرییەکان ناچار بکات تا شەراب و ترێ بکڕن، ئەسیناش لە بەرانبەر ئەو کاڵایانە تەنیا زێڕی دەویست، ئیناڕووس بیری کردەوە کە میسرییەکان ناچار بکات لە جیاتی کوشتنیان لە کانەکانی زێڕ کار بکەن و زێڕی بۆ بەرهەم بێنن بۆ ئەوەی پارەی کشمیش و ترێ بدات و پتر لە پێویستی بە دەست بێنێت، لە باشووری میسر چەند کانێکی زێڕ هەبوو، ئیناڕووس میسرییەکانی ناچار کرد، کار لەو کانگەیانە بکەن و کارکردن لەو کانگەیانە هێندە سەخت

بوو، کە بە شێوەیەکی ئاسایی میسرییەکان پتر لە وەرزێك زیندوو نەدەمان، واتە نێزیکەی چوار مانگ دەژیان و وەرزەکان لە میسر چوار مانگ بوون.

ئەسینا کە شەراب و کشمیشیان بە میسر دەفرۆشت و زێڕیان لە ئینارۆس وەردەگرت، دوو سەد کەشتیی جەنگیان بۆ یارمەتی بۆ ئەو نارد، بەو شێوەیە ئیناڕووس بەهێز بوو.

هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن، کە ئیناڕووس نێردەیەکی بۆ ئەسینا نارد، داوای لە حکوومەت کرد، کە یارمەتی سەربەخۆیی میسر بدەن، لە بەرانبەریشدا بەڵێنیدا ئەگەر لە جەنگی ئەردەشێردا سەرکەوتوو بێت، ئەوان لەبەر یۆەبردنی دەسەڵاتیی میسر هاوبەش بکات. ئەسینایییەکان کە سوودیان لە هەر دەرفەتێك بۆ لاوازکردنی هەخامەنشییەکان وەردەگرت، بەرانبەر داواکەی ڕەزامەندیان نواند و دووسەد کەشتی یاخۆ سێ سەد کەشتییان بۆ میسر نارد.

ئەردەشێری بۆ جەنگی ئیناڕووس لەشکرێکی گەورەی سازدا و بڕیاریدا خۆی بچێتە جەنگەوە، بەڵام کەسە نێزیکەکانی بە پەسەندیان نەزانی خۆی بچێت، بۆیە ئەردەشێر مامی خۆی واتە هەخامەنشی برای خەشایار، کە لە هەمەدان بوو، کردە فەرماندەی لەشکرەکە و لە بەهاری (٤٥٩ پ. ز) لەشکرەکە جووڵا.

بەشی رۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانە بە دەست ئەسینا بوو، لەشکری ئەردەشێر توانای نەبوو بە دەریادا بڕواتە میسر، بۆیە بە وشکانیدا کەوتنەڕێ. ڕێڕەوی ئەو لەشکرە دوای دەرچوون لە پشتێنەی ئێران، بە بەشێك لە فەڵەستینی ئێستەدا تێپەڕی، مێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێن کە لەشکری هەخامەنشیی بە ناوچەیەکی سەوزدا تێپەڕی کە دەگەیشتە غەزە، ئەوەش بە بیابانی (نەقەب یاخۆ نەگەب) ناو دەبرێت، ئەو دەمە سەوز و بە پیت بووە.

ئەو لەشکرە دوای ئەوەی گەیشتە غەزە، لە رێگەی کەنارەکانی مەدیتەرانە بەرەو میسر رۆیشت، هۆی هەڵبژاردنی ئەو رێگەیەش لەلایەن هەخامەنشی دەگەڕایەوە بۆ دەستەبەربوونی ئاو بۆ سەرباز و چوار پێکانی، ئاشکرایە کە سەرباز و چوارپێکانی لەشکر نەیاندەتوانی ئاوی دەریا بخۆنەوە، بەڵام ئەوان لە کەنارەکانی دەریا کۆمەڵە بیرێکی ئاویان هەڵدەکەند کە لە هەندێ شوێن تەنیا بە نیو مەتر دەگەیشتنە ئاو و ئاوی ئەو بیرانەیان دەخواردەوە، چوونکە لەشکری هەخامەنشیی لە رێگەی وشکانییەوە بەرەو میسر هاتن، ئیناڕووس نەیتوانی سوود لە دوو سەد کەشتییە جەنگییەکانی ئەسینا وەربگرێت.

لە لایەکی دیکە ئیناڕووسی باڵابەرز کە پیاوێکی دلێر بوو، لەگەڵ سەربازەکانی بۆ ڕێگرتن لە لەشکری هەخامەنشیی کەوتنەڕێ، کاتێك لەشکری ئەردەشێر گەیشتە باشووری دەسپێکی دێلتای نیل، لەپڕ هێزەکانی خۆی ناردە سەر هەخامەنشییەکان. لەشکری ئیناڕووس جگە لە میسرییەکان، خەڵکی لیبیاشی تێدا بوو.

لەو جەنگەدا لەشکری هەخامەنشیی زۆر ئازایەتیان نواند، بەڵام میسرییەکان کە بە یارمەتی یۆنانییەکان لە جەنگدا بوون، لە دۆخێکی باشتردا بوون. لەوکاتەدا هەخامەنش فەرماندەی لەشکری هەخامەنشیی کوژرا، پاشماوەی هێزە شەکەت و زیان لێکەوتووەکەی بەرەو شاری مەمفیس ڕۆیشتن، کە شوێنی فەرمانڕەوایی ساتراپی (فەرمانڕەوا) هەخامەنشیی لە میسر بوو، لەوێندەر دامەزران.

هەخامەنشییەکان لەوێ خۆیان ڕێك خستەوە و دیواری بەرزیان دامەزراند و هێزەکانیان بەرێکی دامەزراند تا کاتی هێرشی دوژمن، توانای بەرگریکردنیان لە خۆیان هەبێت. چوونکە ئەوان دەیانزانی ئەردەشێر دوای بیستنی هەواڵەکانی میسر، هێزی دیکە دەنێرێت و ئیناڕووس و یاوەرەکانی بە توندی تێك دەشکێنێت.

ئەوان لاشەی "هەخامەنش"یان بە نەریتی میسرییەکان مۆمیایی کرد، چوونکە ناردنەوەی لاشەی ئەو لەو ڕەوشە سەختەدا کارێکی دژوار بوو، ئەوان دەیانزانی چەند شازادەیەکی دیکەی گەورەی ئێرانیش لە میسر نێژراون.

ئەردەشێری دەستدرێژ دوای زانینی باڕوودۆخی میسر، نێردەیەکی نارد بۆ وڵاتی ئێسپارت تا لە جەنگی ئەوێ یارمەتییان بدەن، ئێسپارتەکان سەرباری ئەو پێشنیازانەی بۆیان کرابوو، ئەو بابەتەیان پەسەند نەکرد، بۆیە ئەردەشێر داوای لە هەر یەکە لە (ئارتاباز) فەرمانڕەوای (کیلیکییە) و (مێگابیز) فەرمانڕەوای سوریا کرد، کە هاوسەری خوشکەکەی بوو، لە ڕووداوی ئارتابانووس یارمەتی دابوو، تا هێز کۆبکەنەوە و بە زووترین کات خۆیان بگەیەننە میسر و یاخیبوونی ئیناڕووس کۆتایی پێبهێنن.

مێژوونووسان نووسیویانە مێگابیز و ئارتاباز لەشکرێکیان سازدا کە ژمارەی سەربازەکانی دەگەیشتە سێ سەد هەزار کەس، بەڵام یەکساڵی خایاند تا ئەو کەشتییانەی لە قوبرس و فنیقیە و کیلیکیە بۆیان دروست دەکران، ئامادە بن، دوای ئەوە لەشکرکێشیان بۆ میسر کرد.

ئێمە زانیاریمان لەبارەی ژمارەی سەربازەکانی ئەوان نییە، بەڵام دەزانین یۆنانییەکان لەو ژمارەیەدا زێدەڕۆییان کردووە.

ژمارەی کەشتییە هەخامەنشییەکان بە سێ سەد کەشتیی دەخەملێنرێت، کە بە ڕەچاوکردنی ژمارەی کەشتییە یۆنانییەکان، لەوانەیە ڕاست بێت. لەو ماوەیەدا ئیناڕووس زۆرجار هەوڵی تێکشکاندنی هەخامەنشییانیدا کە لەنێو میسر دامەزرابوون، بەڵام وێڕای هەموو هێرشە توندەکانی نەیتوانی لەوکارە سەرکەوتوو بێت و هەخامەنشییەکان خۆڕاگریان لە بەرانبەریدا کرد، سەرەنجام لەشکری هەخامەنشیی گەیشتە میسر، لە کاتێکدا ئیناڕووس و هاوپەیمانە یۆنانییەکانی چاوەڕوان نەبوون کە هێرشیان بکرێتە سەر، لەشکری ئارتاباز بەرەو سەرچاوەی نیل ڕۆیشت و هێزی میگابیز بەرەو مەمفیس ڕۆیشت. لەوێ میسری و یۆنانییەکان چوونە پێشوازی لەشکری هەخامەنشیی و جەنگێکی سەخت لە نێوان ئەوان ڕوویدا، کە سەرەنجام هەخامەنشییەکان سەرکەوتن و ئیناڕووس کە لە دۆخێکی قورسدا بوو، بۆ دوورگەی (پرۆس پی ڕۆس) هەڵات و لەوێ پەنای گرت.

دوورگەی (پرۆس پی ڕۆس) لە نێوان دوو لقی ڕووباری نیلدا بوو، ئیناڕووس بیری دەکردەوە بە جێگیرکردنی هێزەکانی لەوێ، بەپشت بەستن بە هێزی دەریایی یۆنانیش خۆی لە هێرشی هەخامەنشییەکان دەپارێزرێت. چەند پێکدادانێك لە نێوان هەردوولادا ڕوویدا، سەرەنجام هەخامەنشییەکان بڕیاریاندا کۆتایی بەو دۆخە بێنن. مەترسی گەورە کە ڕووبەڕووی ئەوان دەبۆوە، بوونی کەشتییە یۆنانییەکان بوو، هەخامەنشییەکان یەك لە لقەکانی ڕووباری نیلیان بە دابەشکردنی بەسەر چەند لقێکدا وشك کرد، بووە مایەی ڕۆچوونی کەشتییە یۆنانییەکان لەو شوێنەدا.

لە هێرشی هەخامەنشییەکان بۆ سەر ئەو دوورگەیە، ئیناڕووس کە توانای بەرگری نەمابوو، بەو مەرجەی گیانی خۆی و یاوەرەکانی بپارێزرێت، خۆی بەدەستەوەدا. لە نێوان ئەو کەسانەی لەگەڵ ئیناڕووس بۆ بارەگەی مگابیز بردران، نێزیکەی شەست سەربازی یۆنانیش هەبوو، کە ئەوانیش بەڵێنی پاراستنی گیانیان پێدرابوو، پاشماوەی هێزی یۆنانییەکان کە دوای ڕۆچوونی کەشتییەکانیان لەنێو گلێ لە میسر مابوونەوە، ڕێگەی گەڕانەوەیان پێدرا، بەو شێوەیە بە تێکشکانی یاخیبوونەکەی ئیناڕووس، جارێکی دیکە میسر بۆوە بەشێك لە ئیمپراتۆری هەخامەنشیی.

هەرچەندە جەنگەکە زۆری خایاند، بەڵام سەرکەوتنی لەشکری ئێران لە میسر نیشانیدا هەر کاتێك ئێرانییەکان[٤] فەرماندەی لێهاتوویان هەبوو بێت لە سەختترین دۆخەکان، تەنانەت دوور لە وڵاتەکەشیان، توانیویانە سەرکەوتوو بن.

بە وتەی مێژوونووسانیش ئەگەر ئەردەشێر پاشایەکی خاوەن ئیرادەی بەهێز بووایە و بە قسەی دەوروبەرەکەی نەکردبایە، دەیتوانی بە هاوکاری و پاڵپشتی سەرکردەی وەك مگابیز و ئارتاباز برِواتە جەنگی یۆنان و زیانی وایان لێبدات کە نەتوانن پڕی بکەنەوە.

لە کۆتایی جەنگی میسردا، ئیناڕووس و هاوڕێکانی ناردران بۆ ئێران. هەندێ مێژوونووس نووسیویانە ئەوانیان نارد بۆ هەمەدان بۆ پێشگەی ئەردەشێر، هەندێ دەڵێن ئیناڕووس لە شووش خرایە بەر چاوەدێری. ئیناڕووس ماوەی پێنج ساڵ لە شووش بوو، سەرەنجام بە هۆی پێداگری دایکی هەخامەنش، ئەردەشێری دەستدرێژ ئەوی بەو ئافرەتە سپارد، ئەویش لە تۆڵەی کوڕەکەی، ئیناڕووسی لە سێدارەدا.

کوژرانی ئیناڕووس کارێك بوو پێچەوانەی بنەما و نەریتەکانی ئێرانییەکان کە ڕێزیان لە بەڵێنی خۆیان دەگرت و پتر لە هەمووان مگابیزی زاوای ئەردەشێر کە بەڵێنی پارێزگاری گیانی ئیناڕووسی دابوو، لەو بێ بلێنییەی ئەردەشێر تووڕە بوو و لە سوریا یاخی بوو، دواتر ئەردەشێر دڵنەوایی کرد و جارێکی دیکە مگابیز لە حکوومەتی خۆی مایەوە.

ئەوکات نەریت بوو لە وڵاتانی دیکە کوڕ لە جیاتی باب و برا دەکوژران، بەڵام ئەردەشێر دوای ئەوەی ئیناڕووس کوژرا، کوڕەکەی کە ناوی (تانی راس) بوو، کردە پاشای لیبیا. ناوەڕۆکی ئەو فەرمانەی لەلایەن ئەردەشێر بۆ دانانی (تانی راس) بە پاشای لیبیا نووسراوە، تا ئێستە ماوە و مانەوەی ئەو فەرمانە و مانەوەی پەیماننامەی ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان لە چاکەی (پۆمپیۆس) مێژوونووسی یۆنانی هاوسەردەمی ئەردەشێرە، ئەو

(٤) کاتی خوێندنەوەی ئەو پەڕتووکە دەبینین زۆرینەی ئەو کاتانەی هێزەکانی لەشکری هەخامەنشیی لە لایەن شازادە هەخامەنشییەکان بەڕێوەبراوە، شکستیان هێناوە، تەنانەت ئەو ئەفسەرانەی دلاوەریان نواندووە، زۆرینەیان لە شازادەکان نەبوون، بەردەوام زۆرینەی شازادەکان لە بەرەی شەڕ شکاون، تەنانەت لە جەنگی میسر هەخامەنشیی مامی ئەردەشێر بە ئاسانی شکاو و کوژرا، دواتر لەشکرەکانی مگابیز و ئارتاباز کە هی دەرەوەی ئێران بوون، سەرکەوتنیان دەستەبەر کردووە. "وەرگێڕی کوردی"

وشه به وشەی ئەو پەیماننامەیەی لە پەڕتووکەکەی نووسیوە و ئێستە لە کاتی خوێندنەوەی هەردووکیاندا ئێمە دووچاری سەرسووڕمان دەبین و ئەگەر ئێرانی بین هەست بە سەرفرازی دەکەین، سەرسووڕمانی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەرۆکی ئەو فەرمانەی بۆ فەرمانڕەوایی تانی راس لەلایەن ئەردەشێرەوە نووسراوە، تەنانەت لە سیستەمە دیموکراسییەکانی ئێستەی جیهانیش دەگمەنە، چوونکە لە بەرانبەر سەربەخۆیی لیبیا تەنیا مەرجی ئەوە بووە، کە دان بنێت بە گەورەیی پاشای هەخامەنشیی.

بەپێی ئەو فەرمانە پاشای هەخامەنشیی ڕاستەوخۆ دەست ناخاتە ناو بیر و باوەڕی ئاینی و داب و نەریتەکانی لیبیا، ڕێز لە شێوەی بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتە، داب و نەریت، ئاین و زمانی خەڵکی لیبیا دەگرێت.

پاشای هەخامەنشیی بەپێی ئەو فەرمانە باج لە پاشای لیبیا و خەڵکی ئەو وڵاتە وەرناگرێت، لە کاتی شەڕدا داوای سەربازیان لێ ناکات، ئەگەر دوژمنێك هێرش بکاتە سەر لیبیا پاشای هەخامەنشیی یارمەتی لیبیا دەدات بۆ شکاندنی ئەو دوژمنە. لە بەرانبەر تەواوی ئەو خاڵانە تانی راس تەنیا پێویستە باڵادەستبوونی پاشای هەخامەنشیی پەسەند بکات.

سەبارەت بە زمان لە فەرمانەکەی ئەردەشێردا پێویستە ڕوونی بکەینەوە کە لە رابردوودا هەر نەتەوەیەك نەتەوەیەکی دیکەی شکاندبایە، زمانی خۆی بەسەردا دەسەپاندن. یەکەم کەس کە ئەو نەریتەی نەهێشت کوروشی دامەزرێنەری هەخامەنشییەکان بوو، دواتر جێنشینەکانی ڕێزیان لەو نەریتە گرت و زمانی خۆیان بەسەر کەسدا نەسەپاند، لەکاتێکدا یۆنانی و مەغۆل و ئەوانی دیکە ئەنجامیان دەدا.

بۆیە دەبینین نووسراوی پاشاکانی هەخامەنشیی بە چەندان زمان نووسراون، بۆ ئەوەی خەڵك ناچار نەبن ئەو نوساوانە بە زمانی فارسی[٥] بخوێننەوە، دواتر لە سەردەمی

---

(٥) لە ڕاستیدا دەبینین کاتێك کوروش دەسەڵاتی مادەکانی لەنێوبرد، بە وتەی خۆی ڕێنووسی ئەوان ئاسانتر بووە، لە ڕێنووسی هەخامەنشییی واتە فارسەکان، وێڕای ئەوەش نابینین ئەو ڕێزگرتنەی لە زمانی نەتەوەکانی دیکە، گوایە لەلایەن هەخامەنشییەکانەوە هەبووە، چەندی بەر مادەکان واتە باپیرانی ئێمەی کورد کەوتووە، تەنانەت دەبینین هەر دوای هاتنی هەخامەنشییەکان باس لە زمانی ئەو خاوەنە ڕەسەنەی زۆرینەی ئەو

هەخامەنشییەکان دوای ئەوەی بەپێی نەریتی ئەوان لە وڵاتانی ژێردەستی ئەو ئیمپراتۆرییەتە قوتابخانە کرایەوە، پاشاکانی هەخامەنشیی وتنەوەی زمانی فارسیان بە ناچاری نەکرد، تەنیا هەندێ خەڵك بە ئارەزووی خۆیان ئەو زمانەیان دەخوێند.

ئەگەر ئەو ڕەوتارە بەراورد بکەن بە هەڵسوکەوتی پاشا یۆنانییەکانی بوونە جێنشینی ئەسکەندەر، یەکێك لە ئەوان واتە (ئەنتیۆ کۆسی چوارەم) پاشای زنجیرەی سلوکی کە لە سالآنی (١٧٥ تا ١٦٤ پ. ز) پاشا بووە، لە ماوەی یازدە ساڵی پاشایەتیدا سەدان مرۆڤیان بە هۆی نەزانینی زمانی یۆنانییەوە کوشت. نەریتی ئەو وابوو کە پیاوانی خۆی دەنارد بۆ دۆزینەوەی ئەو کەسانەی زمانی یۆنانیان نەدەزانی، هەر پیاوێك زمانی یۆنانی نەزانیبووایە کوشتنی ئەرك دەبوو یاخۆ دەبووایە پارەیەکی زۆر بدات و گیانی خۆی بکڕێتەوە.

وەك کەتزیاس نووسیویەتی یەك لە نەریتەکانی ئێرانییە کۆنەکان خستنەڕووی میوەکانیان بوو بە ئاوازی دڵنشین و خۆش، دوای ئەوەی ماوەیەك بەسەر دەسەڵاتیی یۆنانییەکاندا تێپەڕی، ئەوان ناچار بوون ئەو ئاوازانە بە زمانی یۆنانی بڵێنەوە و ڕۆژێك (دی مێتریۆسی دووەم) دوایین پاشای سلووکی لە کاتی تێپەڕبوونی بە ڕێگەکانی نێوشار، گوێبیستی، میوەفرۆشێك بوو بە ئاوازی ئێرانی کاڵاکانیان دەخەنەڕوو، هەرچەندە وشەکانی میوەفرۆشەکە یۆنانی بوو، بەڵام بە هۆی ئاوازە ئێرانییەکەی بانگی کرد، دوای ئەوەی سووکایەتی پێکرد، فەرمانی کرد تا پەنجا سککەی زێڕی لێ بستێنن تا تێبگات لە داهاتوودا پێویستە ئاوازەکەشی بگوڕێت بە ئاوازی یۆنانی.

بە سەرەنج لەو بابەتانەی سەرەوە دەبێت بگوترێت، پاشاکانی هەخامەنشیی ئەگەر بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان خوێنرێژیش بوو بن، بەڵام ڕێزیان لە ئاین، داب و نەریت و زمانی نەتەوە ژێردەست و شکست خواردووەکان دەگرت، ئەگەر بابیان بە تاوانی ناپاکی بکوشتایە، کوڕەکەیان نەتەنیا نەدەکوشت، بگرە لە جیاتی باوکی دەیانکردە پاشا.

---

خاکەی بە ئێران دەناسرا، نەما، تەنانەت زمانی فارسی بە کەموکوڕی و بێ توانایییشییەوە بووە زمانی فەرمی و ڕێگەی گەشەکردنی لە ڕێنووس و زمانی ماد واتە کوردی گیرا. "وەرگێڕی کوردی"

# ئاشتی نێوان هەخامەنشیی و یۆنانییەکان

یەکێك لە کارە دیارەکانی ئەردەشێری دەستدرێژ کۆتایی هێنان بوو بە جەنگی نێوان یۆنان و هەخامەنشیی و هێنانەدی ئاشتییە لە نێوان هەردوو وڵاتدا.

جەنگەکانی هەخامەنشییەکان و یۆنانییەکان کە لە سەردەمی کوروشدا هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دەستیان پێکرد، لە سەردەمی داریوشی گەورە و خەشایاری کوڕیدا گەیشتە لووتکە، بۆ هەخامەنشییەکان زۆر زیانی هەبوو، چوونکە زیانی لە بازرگانی ئەوان لە مەدیتەرانەی رۆژهەڵات دەدا.

یۆنانییەکان نەتەنیا بە کەشتییەکانیان دەستیان دەگرت بەسەر ئەو کەشتییانەی کاڵاکانی هەخامەنشییان دەگواستەوە، بگرە دوو هەزار و سێ سەد ساڵ بەر لە (ناپلیۆنی یەکەم)، چوار سەد ساڵ پێش (گاندی) سیاسەتی گەمارۆی ئابوورییان لە دژی ئێران پیادە دەکرد و کاڵا ئێرانییەکان بەگشتیی و بە مافووری ئیچرانییانیان بەتایبەتی لە مەدیتەرانەی رۆژهەڵات یاساخ دەکرد، پێویستە بزانرێت مافووری ئێرانیان یەکێکە لە کاڵا هەرە کۆنەکانی هەناردەکراوی ئەو وڵاتە، لە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ بەر لەئێستە، مافووری ئێرانیان یەك لە کاڵا هەناردەکراوەکان بوو، هەندێ لە پاشا هەخامەنشییەکان وەك رێز لە ئاینی نەتەوەکانی دیکە کە لەژێر دەستیان بوون، مافووریان دەکردە دیاری بۆ پەرستگەکانیان، هیرۆدۆت کاتی چوونی بۆ میسر لە یەکێك لە پەرستگە مەزنەکانی ئەو وڵاتە، مافوورێکی بینی کە لەلایەن یەکێك لە پاشاکانی هەخامەنشیی کرابووە دیاری بۆ ئەو پەرستگەیە.

سەرەڕای یاساخبوونی کاڵاکانی هەخامەنشیی لە مەدیتەرانەی رۆژهەڵات، پاشا هەخامەنشییەکان ناچاربوون بەردەوام لە وڵاتانی کەنارەکانی مەدیتەرانە سەربازگەی گەورە و بەهێزیان هەبێت تا رێگری بکەن لە چەتەیی یۆنانییەکان. یۆنانییەکان پتر بە هێزە دەریاییەکەیان چەتەییان لەو وڵاتانەی ئەو کەنارانە دەکرد، هەندێ کات سەربازیشیان دادەبەزاند، دانانی ئەو سەربازگە بەهێزانەش بۆ پاشا هەخامەنشییەکان تێچووی زۆری دەویست.

ئەردەشێری دەستدرێژ بڕیاریدا خۆی لە ئەو تێچووە قورسانەی ئەو سەربازگانە ڕزگار بکات و بازرگانی هەخامەنشییەکان لە مەدیتەرانەی ڕۆژهەڵات ئازاد بکات و برەوی پێبدات، نامەیەکی بۆ سەرۆك کۆماری ئەسینا نووسی کە ناوەرۆکەکەی برێتی بوو لە: "دەزانین یۆنانییەکان بەهێز و ئازان و لە جەنگی ئێمەدا لە مردن ناترسن، ئێمەی ئێرانییەکانیش هەر وەهاین، وێڕای ئەوەش بە باوەڕی من ئەگەر ئاشتی لە نێوانماندا هەبێت، باشترە لە جەنگ..".

دوای ئەو پێشەکییە، ئەردەشێر داوای لە سەرۆك کۆماری ئەسینا کرد تا لە شوێنێك یەکدیی ببینن و سەبارەت بە ئاشتی بدوێن تا بگەنە ڕێککەوتنێك کە ببێتە هۆکاری ئاشتی هەتایی لە نێوانیاندا.

سیمۆن سەرۆك کۆماری ئەسینا سەرەتا بە ڕواڵەت ڕەزامەندی نیشاندا تا لە (کریزۆ پۆلیس)[١] یەکدیی ببینن، بەڵام دواتر بە نامەیەك داوای لە ئەردەشێر کرد تا شاندێك بۆ دانووستاندن ڕەوانە بکات، ئەو دەستەیە تەواوی دەسەڵاتەکانی سەرۆکی کۆماریان دەبێت، ئەردەشێریش چوونکە نیازی پاك هەبوو، لەگەڵ ئەو بابەتە ڕەزامەندیی نواند، شاندی یۆنانی بە سەرۆکایەتیی (کالیاس) کە لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەسینا بوو، دوای ماوەیەك لە شووش لەگەڵ ئەردەشێری دەستدرێژ یەکدییان بینی.

بێگومان بەیەك گەیشتنی پاشای هەخامەنشیی و یاوەرەکانی کە هەموویان ریشی درێژ و لوولیان هەبوو، لەگەڵ نوێنەری سەرۆك کۆماری ئەسینا و شاندی یاوەری کە هەموویان ریش و سمێڵیان دەتاشی، دیمەنێکی سەیری چێ کردووە. جگە لە جلوبەرگیان، هەڵسوکەوتی پاشای هەخامەنشیی و نوێنەری سەرۆك کۆماری یۆنان و هاوڕێکانی، بچووکترین جیاوازیی نەبووە لەگەڵ هەر یەکە لەو کۆنفرانسە سیاسییانەی کە لەنێویاندا نوێنەرە ئاست باڵاکانی وڵاتان لەگەڵ راوێژکار و پسپۆڕەکانیان پێکەوە دانووستاندن دەکەن. پۆمپیۆس مێژوونووسی یۆنانی و

---

(١) کریزۆ پۆلیس ئێستە ناوی ئێسکوتارییە و لە تەنیشت گەرووی بسفۆرە، ئێستە لای ڕۆژهەڵاتی شاری ئیستانبوول پێك دەهێنێت و بەشێك بوو لە ناوچە ژێردەستەکانی هەخامەنشیی. "زەبیحوڵڵا"

هاوسەردەمی ئەردەشێر دەڵێت: پاشای هەخامەنشیی و یاوەرەکانی لە لایەکی مێزەکە دانیشتن و نوێنەری سەرۆك کۆماری ئەسینا و شاندی یاوەری لە لایەکێکی دیکەی مێزەکە.[٢]

پۆمپیۆس دەڵێت لەسەر مێزەکە نەخشەیەکی مەزن هەبوو، کە لایەکی کەنارەکانی رۆژهەڵاتی دەریای سپی و لایەکەی دیکەیش کەنارەکانی دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان کێشرا بوو، ئەم وتەیەی پۆمپیۆس ئەو هەواڵە پشتڕاست دەکاتەوە، کە لە کاتی لەشکرکێشیی خەشایار بۆ یۆنان باسکرا، کە لە ئەو سەردەمەدا نەخشەی جوگرافی دەکێشرا.

بە وتەی پۆمپیۆس شاندەکە پێکهاتبوو لە پیاوانی ئەسینا، مەکەدۆنیا، تسالی و ئێسپارت. بۆیە نوێنەرانی چوار وڵات لە وڵاتە بەهێزەکانی یۆنان لەو دانیشتنە بوون. بوونی نوێنەری دەوڵەتە شارەکانی دیکەی یۆنان لەو شاندە پێویست نەبوو، چوونکە پاشای هەخامەنشیی چاوی دەسکەوتی لەو وڵاتانە نەبوو، داوای زەویوزاری ئەوانی نەدەکرد، هیچی لەو چوار وڵاتەش نەدەویست، ئەوان چوار دەوڵەتەشاری مەزنی یۆنان بوون، دەیانتوانی لە جیاتی ئەوانی دیکەیش بدوێن و لەو دانیشتنە ئامادە بن.

ئەردەشێر وتی: ئێستە دوژمنایەتی خۆتان لەگەڵ ئێمە وەلا بنێن، ئێمە ئامادەین پێشنیازە باشەکانتان پەسەند بکەین.

کالیاس وتی: داوای ئێمە ئەوەیە، پاشای هەخامەنشیی هیچ داوایەکی بەرانبەر دوازدە دوورگە یۆنانییەکە و قوبرس نەبێت.

لە کاتی سازدانی ئەو کۆبوونەوەیە دوازدە دوورگە یۆنانییەکە و دوورگەی گەورەی قوبرس لەژێر داگیرکاری یۆنانییەکان بوون، لە ڕاستیدا یۆنانییەکان بە دەستەواژەی ئەمرۆ، خوازیار (ئێستەتۆکۆ)بوون، واتە ئەوەی لە کاتی گفتوگۆ هەیە وەك خۆی و بێ دەستکاری بمێنێتەوە.

ئەردەشێری دەستدرێژ وتی: من پێشنیازی ئێوە پەسەند دەکەم، کە دوازدە دوورگەکە و قوبرس ببنە هی ئێوە، بەڵام ئێوە لەنێو خۆتاندا چەندین وڵاتن و نازانرێت دوای ئەوە لەنێو خۆتاندا ڕاتان لە بەرانبەر دوازدە دوورگەکە و قوبرس چۆن دەبێت، بۆیە دەمەوێت دۆخی ئەو

---

(٢) مێز ناوێکی فارسییە، لە زمانی فارسییەوە رۆیشتووە بۆ زمانەکانی دیکە، ئێرانییەکان تا کۆتایی سەردەمی ساسانییەکان لە پشت مێز دادەنیشتن و خواردنیان لە پشت مێز دەخوارد، دانیشتن و نان خواردن لەسەر زەوی دوای ئەو سەردەمە لە ئێران هاتەکایەوە. "زەبیحوڵڵا"

دوازدە دوورگە و دوورگەی قوبرس ئارام بێت، چوونکە دەمەوێت دوای بەرقەراربوونی ئاشتی پێوەندیی بازرگانیم لەگەڵ ئەواندا هەبێت.

کالیاس وتی: دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان پەسەندیان کردووە، کە دوازدە دوورگەکە و قوبرس لەبەر دەستی ئەسینا بێت.

ئەردەشێری دەستدرێژ وتی: لە بەرانبەر پێدانی دوازدە دوورگەکە و قوبرس بە ئێوە، من داواکارم هێزی دەریایی ئەسینا هەڵوەشێندرێتەوە، بە تایبەت کە دەزانم تێچوویەکی زۆر قورسی بۆ ئێوە هەیە.

کالیاس وتی: ئێمە ناتوانین هێزی دەریایی خۆمان هەڵوەشێنینەوە، بەڵام هێندەی بتوانین کەمی دەکەینەوە، هۆکاری هەڵنەوەشاندنەوەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەوانەیە دەوڵەتە شارەکانی دیکەی یۆنان هێرش بکەنە سەرمان، ئەو پێشبینییەی کالیاس دروست دەرچوو، جەنگ لە نێوان نەتەوە یۆنانییەکان ڕوویدا، لە مێژوودا بە جەنگەکانی (پلۆپۆنز) ناسرا، تۆسیدید باسی ئەو جەنگە درێژخایەنانەی بە درێژی نووسیوەتەوە.

یۆنانییەکان لە بەرانبەردا پێشنیازیان کرد، کە سەربازگە بەهێزەکانی هەخامەنشیی لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی مەدیتەرانە لابدرێن.

ئەردەشێری دەستدرێژ بە دەم پێکەنینەوە وتی: ئایا ئێوە دەتانەوێت سەربازگەکانم لابدەم تا ئێوە بە ئازادی هێرش بکەنە سەر وڵاتەکانی من.

کالیاس وتی: نەخێر، بگرە لەو روانگەوە دەمانەوێت ئەو سەربازگانە لابچن، چوونکە مەترسیمان هەیە کە ئەوان هێرش بکەنە سەر یۆنان.

ئەردەشێر خۆی دەیویست ئەو سەربازگانە هەڵوەشێنێتەوە، بۆیە بەبێ گرفت بەو پێشنیازە ڕازی بوو، دواتر باس لە دیلەکانی جەنگ کرا و بڕیاردرا تەواوی دیلەکان ئازاد بکرێن، بەڵام ئەو دیلانە کە لە ئێران یاخۆ یۆنان نیشتەجێن بۆیان هەیە بە ئارەزووی خۆیان بمێننەوە. دواتر باسی بازرگانی کرا، رەزامەندی پێشاندرا، کە یاساخبوونی کاڵا ئێرانییەکان لەلایەن یۆنانەوە نەمێنێت.

هەروەها رەزامەندی درا بە ئەوەی هەخامەنشییەکان لە هەر شوێنێکی یۆنان و دوورگەکانی بتوانن کاڵاکانیان بفرۆشن، یۆنانییەکانیش بە هەمان شێوە لە تەواوی سنووری ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی ئازاد بن لە فرۆشتنی کاڵاکانیان. سەبارەت بە

قەرەبووکردنەوەکانی جەنگ نە پاشای هەخامەنشیی و نە نوێنەری سەرۆك کۆمار لەو بارەیەوە ئاماژەیان بە هیچ شتێك نەکرد، دانووستاندنەکانی یۆنان و هەخامەنشیی سێ ڕۆژانی خایاند، لەو سێ ڕۆژەدا یۆنانییەکان میوانی پاشای هەخامەنشیی بوون، بە وتەی پۆمپییۆس مێژوونووسی یۆنانی ئەوان بە شێوەیەکی شاهانە خزمەت دەکران.

ڕۆژی چوارەم کە دانووستاندنەکان تەواو ببوو، پێشەکی پەیماننامەی ئاشتی و دۆستایەتی نێوان هەردوو لایەن نووسرا، دوای پێداچوونەوە بە هەردوو زمانی یۆنانی و فارسی نووسرایەوە. پۆمپییۆس دەڵێت ئەردەشێری دەستدرێژ و نوێنەری سەرۆك کۆماری ئەسینا و نوێنەرانی تیسالی و مەکدۆنیا و ئێسپارت سەرەڕای مۆرکردنی دوو وێنەی نووسراوەکە، پەنجە مۆریشیان لەسەر پەیمانەکە دانا، لێدانی پەنجەمۆریش بەسەر وێنەی نووسراوەکاندا، واتای ئەوەیە ئەوکات زانیویانە هێڵەکانی سەر قامکی مرۆڤەکان، ئامرازی ناسینەوەی مرۆڤەکانە.

کالیاس نوێنەری سەرۆکی ئەسینا، دوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ هەخامەنشییەکان، کەوتەبەر لۆمەی هاونیشتمانییەکانی و تاوانیان خستەپاڵی کە بەرژەوەندییەکانی نەتەوە یۆنانییەکانی قوربانی هەخامەنشییەکان کردووە، تەنانەت تاوانباریان کرد، کە سوودی لە زێڕی ئێران وەرگرتووە، واتە خۆی بە ئەردەشێری دەستدرێژ فرۆشتووە.

لەو کاتە بەدواوە بابەتی زێڕی ئێران لە مێژووە یۆنانییەکاندا بوو بە بابەتێکی هەردەمیی، هەموو مێژوونووسە یۆنانییەکان باسیان کردووە، چوونکە هەخامەنشییەکان وێڕای ئەوەی لەگەڵ یۆنان ئاشتییان کردبوو، بەڵام دەستیان دەخستە نێو کازێی دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان و زێڕیان دەدا بە هەندێکیان.

یەکێك لە ئاکامەکانی پەیمانی ئاشتی نێوان ئەردەشێری دەستدرێژ و دەوڵەتە شارەکانی یۆنان، ئەوە بوو کە ئەفسەر و سەربازە یۆنانییەکان وەك کرێگرتە هاتنە نێو لەشکری هەخامەنشیی و لە لەشکری ئێراندا دەست بەکار بوون.

لە رابردووشدا هەر وەك لە ڕووداوەکانی سەردەمی کوروش و داریوشدا باسمان کرد سەربازە یۆنانییەکان دەهاتنە نێو لەشکری هەخامەنشیی، بەڵام هەموو مێژوونووسەکان ئەو بابەتەیان پشتڕاست نەکردووەتەوە، دەمارگیری و نیشتمانپەروەری ڕێگر بووە، دان بەوە بنێن کە سەربازە یۆنانییەکان چوونە بۆ خزمەتی لەشکری بەربەرەکان، بەڵام دوای ڕێکەوتنی ئاشتی نێوان یۆنان

و هەخامەنشیی، هەموو مێژوونووسە یۆنانییەکان دانیان ناوە بە بەشداری ئەفسەر و سەربازە یۆنانییەکان لە لەشکری هەخامەنشیی وەك بەکرێگیراو، بە هەمان زمان لە بارەیانەوە دواون، ئەفسەر و سەربازە یۆنانییەکان لە بواری جەنگدا هێندە بەها و بایەخیان هەبوو، کە پاشا هەخامەنشییەکان مووچەی یەك جار زۆریان پێدەدان و سوودیان لە ئەوان لە جەنگەکاندا دەبینی.

جێگەی گومان نییە، کە سەربازە پیادە هۆپ لیتەکانی یۆنانی لە ڕووی جەنگییەوە زۆر بە بەها و بایەخ بوون، هەرجارێك لەگەڵ لەشکری هەخامەنشیی دەجەنگان، بەهای خۆیان دەسەلماندەوە، بەڵام لەشکری هەخامەنشیی بێبەش نەبوو لە سەربازی ئازا و دلێر، تا تکا لە یۆنانییەکان بکات لە بەرانبەر وەرگرتنی مووچەی زۆر بێنە نێو لەشکری ئەوان.

لە ڕاستیدا سەربازە یۆنانییەکان کەم دەرامەت بوون، بەو هۆیەشەوە خۆبەخشانە بۆ بەدەستهێنانی ئەو مووچەیەی پاشا هەخامەنشییەکان پێیان دەدان، دەهاتنە نێو لەشکری ئەوان، هەخامەنشییەکانیش بەپێی پێویست مووچەیان پێدەدان، ئەو کاتیش وەك ئێستە یۆنانییەکان ناچاربوون بۆ بەدەستهێنانی بژێویان لە وڵاتەکەیان بڕۆن و کۆچ بکەن، سەربازەکان لە کاتی ئاشتییدا بێکار دەمانەوە، بۆیە خۆبەخشانە دەهاتنە ریزی لەشکری هەخامەنشیی.

یەکەم دەستە لە سەربازە بەکرێگیراوەکانی یۆنانی کە هاتنە نێو لەشکری هەخامەنشیی خەڵکی دەوڵەتە شاری (ئارکادی) لە باشووری یۆنان بوون، پۆمپیۆس ژمارەی ئەوان بە چوارسەد کەس دەزانێت. لە سەردەمانی دواتریش ئەو سەربازە یۆنانییانەی وەك کرێگرتە دەهاتنە نێو لەشکری هەخامەنشیی هی وڵاتانی باشووری یۆنان بوون، کە بە ناوچەی پلۆپۆنز ناسرابوون، چەندین جار سەربازە یۆنانییەکان لە کاتی جەنگدا فێڵیان لە لەشکری هەخامەنشیی دەکرد و بەناوبانگترینیان لە جەنگی داریوشی سێیەم لەگەڵ ئەسکەندەری مەکدۆنی لە کەناری ڕووباری هالیس بوو، لەو جەنگەدا سەربازە یۆنانییەکانی نێو لەشکری هەخامەنشیی لەپڕ لایەکی لەشکرەکەیان چۆڵ کرد و وازیان لە جەنگ هێنا، لە ئاکامدا لەشکری هەخامەنشیی دووچاری شکست هات.

یۆنانییەکان دوای هاتنیان بۆ نێو لەشکری هەخامەنشیی وەك سەرباز و ئەفسەرە ئێرانییەکان بەرەو پێشڤە دەچوون، بەڵام هەرگیز ئەفسەرێکی یۆنانی نەدەکرا بە فەرماندەی یەکەیەکی سەربازی ئێرانییەکان، هەموو مێژوونووسە یۆنانییەکان پشتڕاستیان کردووەتەوە کە لەو ڕۆژەوەی یۆنانییەکان بوونە سەرباز لە لەشکری هەخامەنشیی تا ڕووخانی ئەو زنجیرە

پاشایەتییە بە دەست ئەسکەندەری مەکدۆنی، سەدەیەکی خایاند و لەو ماوەیەدا هەندێك لە ئەوان بوونە هاونیشتمانی ئێرانی، هەندێکیان ژنی ئێرانیان هێنا و بوونە خودان سەرمایە و موڵك وماڵ.

لە سەردەمی ئەردەشێری دەستدرێژ ئێران بووە ناوەندی زانست و هونەر و ئەدەب، هەر کەسێك لەو بابەتانە بەهرەی هەبووایە، دەڕۆیشتە ئێران و دەیتوانی لەو وڵاتە بە ئاسوودەیی بژیت، یەکێك لەو یۆنانییانەی چوو بۆ ئێران بە کولی تۆس ناسرا بوو، ئەو فەیلەسووف بوو، لە ئێران قوتابخانەیەکی نوێی فەلسەفی دامەزراند، کە فەلسەفەکەی بریتی بوو لە: (مرۆڤ تا دەتوانێت، پێویستە بە خۆشی بژیت، بە تەواوبوونی ئامرازەکانی خۆشگوزەرانیش، پێویستە خۆی بکوژێت)، کولی تۆس چارەسەری تەواوی گرفتەکانی ژیانی لە خۆکوشتن دەبینیەوە، بۆیە شوێنکەوتوانی خۆی ئامۆژگاری دەکرد پەنا ببنە بەر خۆکوشتن.

وێڕای ئەوەی ورەی ئێرانییەکان بە شێوەیەك بوو، کە نەیاندەتوانی ئەو بیرۆکەیە پەسەند بکەن، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئەو بیرۆکەیە نوێ و سەرەنجڕاکێش بوو، تا ئەوکات کەس ئەو جۆرە بیرۆکەیەی نەبیستبوو، هەندێ شوێنکەوتووی پەیدا کرد، ئەو فەلسەفەیە، هەمان فەلسەفەی (دالانییەکان)ـە، کە دوای سەدەیەك لە ڕۆژهەڵات لەلایەن زەنوونی قوبرسی دامەزرێندرا، هۆی ناسینی ئەو فەلسەفەیەش بەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زەنوون لە دالانی بازاڕەکاندا وانەکانی ئەو فەلسەفەیەی دەوتەوە، تەنیا مەبەستمانە ئاماژە بەوە بدەین و بڵێین یۆنانییەك هات و سوودی نابەجێی لە خوداوەندی کراوەی ئەردەشێر وەرگرت و بیرۆکەیەکی هێنایە پێش کە نە تەنیا لەگەڵ ورەی ئێرانییەکان نەدەگونجا، بگرە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی هیچ کۆمەڵگەیەکی ڕێك و شارستانی کۆك نەبوو.

ئەردەشێری دەستدرێژ لە سەرەتادا هیچ گرینگی بە فەلسەفەی کۆلی تۆس نەدا، چوونکە فەلسەفەی ئەو پیاوە لەلای ئەو بە رادەیەك پەست بوو کە پێی وابوو هیچ کەس پەسەندی ناکات، بەڵام چوونکە ئەو فەلسەفەیە نوێ بوو، ژمارەیەك خەڵك لە دەوری کولی تۆس کۆبوونەوە، چەند کەسێکیان خۆیان کوشت، ئەمە وایکرد ئەردەشێر فەرمانی گرتنی کۆلی تۆسی دەرکرد، ئەو پیاوە کە دەیزانی لەوانەیە سزا بدرێت، خۆی حەشاردا و شوێنکەوتوانیشی خۆیان شاردەوە، فەلسەفەی ئەو بوو بە فەلسەفەیەکی نهێنی، چوونکە ئەستەم بوو چیدی بتوانێت ئەو فەلسەفەیە بە ئاشکرا

بڵاو بکاتەوە، بۆیە بە ناچاری لە ئێران هەڵات، دوای ڕۆیشتنیشی شوێنکەوتووانی بە گشتیی لاواز بوون، ئەو بزاڤە فەلسەفییەش بە تەواوەتی لەنێو چوو.

وێڕای ئەوەی کولی تۆس سوودی خراپی لە میواندۆستی پاشای هەخامەنشیی بینی، ویستی تۆیەکی زیانبەخش لە ئێران بچێنێت، بەڵام ئەردەشێر خۆشەویستی خۆی لە زانا یۆنانییەکان نەگرتەوە، ئەوان بەردەوام بوون لە جێهێشتنی نیشتمانیان و هاتنیان بۆ ئێران.

ئەگەر نووسینەکانی دەی نۆن بە سەرچاوە وەربگرین، دەبینین کە کەسێکی وەك سوکرات کە لە گەورە فەیلەسووفەکانی یۆنان بووە، لە تەمەنی چل و پێنج یاخۆ پەنجا ساڵی و دوای هەڵاتنی کولی تۆس، سەفەری بۆ ئێران کردووە، کەوتووەتە بەر خۆشەویستی ئەردەشێر، ئەگەر لە ئێران مابایەوە، تا دوا ساتەکانی ژیانی یاخۆ لانی کەم تا دوارۆژی مردنی ئەردەشێر، واتە ساڵی (٤٢٤ پ. ز) بەڕێزەوە لە ئێران دەژیا.

سوکرات تەنانەت دوای مردنی ئەردەشێر دەیتوانی لە ئێران بێت، هەرچەندە ئەوانەی لە دوای مردنی ئەردەشێر تا ساڵی مردنی ئەو لە ساڵی (٣٩٩ پ. ز) بوونە پاشا، بایەخی زانا یۆنانییەکانیان نەدەزانی، بەڵام خەڵکی ئێران بۆ زانا یۆنانییەکان بە گشتیی و بۆ سوکرات بە تایبەتی ڕێزیان هەبوو، ئەو زانا گەورەیە ئەگەر لە ئێران ژیابووایە، ناچار نەدەبوو جامی شوکرانە بخواتەوە و کۆتایی بە ژیانی بێنێت.

مێژوونووسە یۆنانییەکان لۆمەی ژیانی تایبەتی ئەردەشێریان کردووە، تەنانەت ئەو یۆنانییانەی لە سەردەمی ئەردەشێر لە ئێران بوون، دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکەیان لە بیرەوەریەکانیاندا بە باشی باسی ژیانی تایبەتی ئەویان نەکردووە، بەپێی مێژوو دەبێت ئەو بابەتە پشتڕاست بکەینەوە کە ژیانی تایبەتی ئەو بە هەمان شێوە بووە کە باسی کراوە.

بە وتەی یۆنانییەکان ئەردەشێر لە چەند شوێنێکی جیای ئێران هەندێ باخی هەبوون، کە بە (نیکار) ناو دەبران، ئەو وشەیە لە زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی هاتووە و لە پەهلەوی ساسانی واتاکەی بۆتە (نیگارستان) و کەمێك گۆڕاوە.

لە سەردەمی هەخامەنشییەکان نیکار بۆ ئەو شوێنانە بەکار دەهات کە کۆمەڵێك ژنی جوان و شۆخ و شەنگ و نەشمیلی لێ بووایە، لە سەردەمی ساسانییەکان ئەو وشەیە بە شێوەی (نیگارستان) بۆ ئەو شوێنە بەکار دەهات، کە وێنەی جوانی لێ دابنرێت، بە دەستەواژەی نوێ لە سەردەمی ساسانییەکان ئەو شوێنە برێتی بووە لە پێشانگەی وێنە. لە سەردەمی

هەخامەنشییەکان بە حەرەمسەرایەکی گەورە دەوترا کە ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی جوانی لێ دەژیا. بە وتەی یۆنانییەکان لە وڵاتانی دیکە ئافرەتی شۆخیان بۆ ئەردەشێر دەهێنا و لەوێ لەلایەن کەسانی شارەزاوە پەروەردە دەکران تا بزانن بە چ شێوەیەك لەگەڵ ئەردەشێر ڕابوێرن.

پۆمپیۆسی مێژوونووسی یۆنانی دەڵێت، مامانەکان لە نیکار نەدەهاتنە دەرەوە، چوونکە هیچ رۆژێك نەبوو کە ئافرەتێك منداڵی لە ئەردەشێر نەبێت. بێگومان ئەو بابەتە زێدەڕۆیی تێدایە، چوونکە ئەردەشێر یەك نەفەر بوو، لە یەك کاتدا نەیدەتوانی بچێتە شوێنە جیاوازەکانی وڵات و لە هەموو نیکارەکان بێت، هەروەها ئەو جگە لە ڕابواردن کاروباری دیکەیشی هەبوو کە دەبووایە پێیان ڕابگات، بەڵام گومانمان نییە ئەو دوای مردنی ژمارەیەکی زۆر منداڵی زۆڵی لەدوای خۆی بەجێ هێشت، ئەوانیش وەك لە دواتر باسیان دەکەین، دۆخی وڵاتەکەیان بە تەواوی پەرێشان کردبوو.

بابەتێکی دیکە مێژوونووسە یۆنانییەکان و ئەوانەی دیکە لەبارەی ئەردەشێر نووسیویانە، زۆرخۆر بووە، وەك کەتزیاس نووسیویەتی: ئەو ئەگەر بێ ئیش بووایە، بەیانیان لە پشت مێزی نان خواردن دادەنیشت، تا نێزیك نیوەڕۆ هەڵنەدەستا و بەردەوام دەبوو لە خواردن، دواتر دەچوو بۆ ئەسپسواری، دوای ماوەیەکی کورت دەهاتەوە و بەردەوام دەبۆوە لە نان خواردن.[٣]

گزنفۆن سەرکردەی یۆنانی کە لە لەشکری ئێراندا ئەفسەر بووە، نووسیویەتی کە ناوبانگی زۆرخۆری ئەردەشێری دەستدرێژ دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو زۆر بە ئەسپایی و لەسەرخۆ نانی

---

(٣) لە سەدەی بیستەمدا کەسێك هەبووە، کە تەواوی کاتەکانی خۆی، جگە لە کاتی نووستن لە پشت مێزی خواردن بووە، میتەرلینگی بەلژیکی باسی ئەوی نووسیوە و دەڵێت ئەو ئاموزای منە و لە بەلژیك پۆستی (میری ئاوان) بووە، کە پۆستێکی گەورەیە، میتەرلینگ دەڵێت ئەو لە باوکییەوە زۆر سەرمایەی بۆ بەجێ مابوو، ورگی زۆر گەورە بوو، مێزی تایبەتییان بۆ چێ کردبوو، کە پێشی کەوانەیی بوو، ورگی ئامۆزاکەمی دەکەوتە نێو، بەیانی دوای هەستان لە خەو و خۆ شوشتن، جلی دەکردە بەری و دەچۆوە پشت مێزی خواردن، خواردنەکەی فرە جۆر بوو، بۆیە زۆر دەمایەوە تا دەبوو بە نیوەڕۆ، کاتی نانی نیوەڕۆ دەهات، نانی نیوەڕۆی زۆری دەخایەند کە تا دەمژمێر هەشتی درێژدەبۆوە، ئەوکات دەبووایە نانی ئێوارەی پێ بدرێت، تا کاتی نووستن سەرگەرمی خواردنی نانی ئێوارە دەبوو. تاکە کاری ئەو خواردن بوو، لەدوا ساتەکانی ژیانی هێندە قەڵەو ببوو، کە توانای رۆیشتنی نەبوو، کۆئەندامی هەرسی ئەوەندە بەهێز بوو، کە هەموو خواردنەکانی دەست بەجێ هەرس دەکرد، ئەو هەرگیز هەستی بە تێربوون نەدەکرد. "زەبیحوڵڵا"

دەخوارد، لەو بوارەدا ورد بوو، بۆیە ئەو کاتانەی کە هیچ کاروباری نەبووایە زۆر لە پشت مێزی نان خواردن دەمایەوە، بەڵام ڕێژەی خۆراك و خواردنی ئەو پتر نەبوو لە خەڵکانی دیکە. ئێستە دەزانین ئەوانەی بە ئەسپایی نان دەخۆن بە شێوەیەکی ئاسایی لەکاتی نانی ئێوارە ماوەی نێزیکەی سێ دەمژمێران لەسەر مێزی نان خواردن دادەنیشن، نموونەشیان فەرەنسی، سویدی و فنلەندییەکانن، کە کەس بە زۆرخۆریان ناناسێت.

بە گریمانی زۆر کەتزیاس لە ڕووی هەڵەوە ویستوویەتی ئەردەشێر بە زۆرخۆر بناسێنێت، بەڵام ئەگەر ئەردەشێر هێندە زۆرخۆر بووایە نەیدەتوانی لە کاتی جەنگەکاندا لە بەیانی تا ئێوارە بوەستێت بێ ئەوەی هیچ بخوات و زانراوە ئەوانەی بەو شێوە زۆرخۆرن توانای خۆڕاگری لە بەرانبەر برسییەتیان بۆ یەك کاتژمێریش نییە، بەڵام بە دووری نازانین کە ئەو لە ساڵی (٤٣٠ پ. ز) بە دواوە بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشی برسییەتی بەو شێوە زۆرخۆر بوو بێت، ئەو نەخۆشییە ئێستە بە (دیابێت)، واتە نەخۆشی شەکرە ناسراوە، هەندێك لە تووشبوان بەو نەخۆشییە زۆرخۆر دەبن و بەردەوام تینوویان دەبێت.

کەتزیاس کە پزیشك بووە، نەخۆشییەکانی ناسیوە، نیشانەکانی نەخۆشییەکەی ئەردەشێری نووسیوە، ئەردەشێر ماوەی شەش ساڵ ئەو نەخۆشییەی هەبووە، پزیشکەکانی کۆشکەکەی و ئەوانەی لە میسر و یۆنان هاتوون، نەیانتوانیوە ئەو چارەسەر بکەن.

بەر لە باسکردنی ساڵانی دوایینی تەمەنی ئەردەشێر، پێویستە باسی ڕووداوی هاتنی پاشای ئێسپارت و پەناهەندەبوونی بە ئەردەشێر بکەین، تیمیستۆکیل سەرۆکی ئەسینا و دوژمنی هەخامەنشییەکان هات و پەناهەندەی ئەردەشێر بوو، هەڵبەتە ئەردەشێر دووسەد تالآن زێڕی پێدا و وتی:ە"ئەی تیمیستۆکیل، من دووسەد تالآن زێڕم دانابوو تا بدرێت بەو کەسەی تۆ بۆ من دەهێنێت، چوونکە خۆت هاتی ئێستە دووسەد تالآن زێڕەکە بەخۆت دەبەخشم"، دواتر فەرمانی کرد و ئەو بڕە زێڕەیان پێدا. لە ئێران تالآن پێوەری پارە نەبوو، ئەو بابەتە لەلایەن مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە نووسراوە، لە ئێران یەکەی پێوانی زێڕ برێتی بوو لە بەردی هەخامەنشیی و بەشەکانی ئەو.

هەرچەندە پەناهەندە بوونی سەرۆکی ئەسینا ڕووداوێکی مەزن بوو، بەڵام هێندەی پەناهەندەبوونی پاشای ئێسپارت (دێمارات) گرینگ نەبوو، چوونکە تیمیستۆکیل سەرۆك کۆمار بوو، دێمارات پاشا بوو، لە لایەکی دیکە ئێسپارتەکان زۆر پتر لە ئەسیناییەکان

نیشتمانپەروەر بوون، هەستی نیشتمانپەروەری ئێسپارتەکان دوای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ هێشتا ڕووداوێکی دوور لە گومانە، وێڕای هەموو ئەوانە پاشای ئێسپارت وڵاتەکەی بەجێ هێشت و بۆوە پەنابەری پاشای هەخامەنشیی.

سەبارەت بە پەناهەندە بوونی دێمارات، مێژوونووسە کۆنەکان ڕووداوێکیان گێڕاوەتەوە، دەی نۆن ئەو ڕووداوە بە هی دێمارات و پلۆتارکیش بە هی تیمیستۆکیلی دەزانێت. دەی نۆن دەڵێت ئەو ڕووداوە لە کاتی پەنابەرییەتی تیمیستۆکیل ڕوویداوە، پلۆتارك دەڵێت لە کاتی پەنابەرییەتی دێمارات بووە، ئەو باسە زۆر دوور و درێژە، تەنیا بە کورتی دەیخەینە بەرباس.

دێمارات دوای بڕینی ڕێگەیەکی زۆر بە پێ، گەیشتە کۆشکی ئەردەشێر و داوای لە فەرماندەی گاردی جاوید کرد تا ئەو بباتە لای ئەردەشێری پاشا. فەرماندەی گاردی جاوید پرسیاری کرد: تۆ کێی؟

دێمارات وتی: ناتوانم خۆم بە کەسی دیکە بناسێنم، تەنیا دوای ئەو کاتە نەبێت، کە خۆم بە پاشا بناسێنم،.

فەرماندەی گاردی جاوید وتی: لە شێوەزارت دیارە، کە ئێرانی نیت، پێم بڵێ چ نەتەوەیەکی؟

دێمارات وتی: ناتوانم ئەوەش باس بکەم.

فەرماندەی گاردی جاوید وتی: من ناتوانم تۆ ببەم بۆ لای پاشا، چوونکە ئەو لە من دەپرسێت کە تۆ کێی، ئەگەر من ناسنامەکەت بە پاشا نەڵێم، مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەت پێ نادات.

دێمارات وتی: بە پاشا بڵێ من کەسێکم کە ئەگەر پاشا من بناسێت یاخۆ سەرم لە لەشم جیادەکاتەوە یاخۆ بە پەنابەر وەرم دەگرێت.

دوای بیستنی ئەو وتەیە هەستی بەدواداچوونی فەرماندەی گاردەکە زیادی کرد و وتی: هەموو ئەو ئێرانییانەی دەچنە لای پاشا، باوەڕیان وایە کە ئەو لە دوای خوداوەندی گەورە، لە هەمووان گەورەترە، ئایا تۆش لەسەر هەمان باوەڕی.

دێمارات وتی: لە ڕابردوودا ئەو باوەڕەم نەبوو، بەڵام لە ئێستەدا باوەڕم وایە و دەزانم ژیان و مردنی من لە دەست ئەودایە.

باسكرا كە ئافرەت و پیاوانی ئێسپارت هەموویان باڵابەرزن، دێماراتیش پەنجا و پێنج ساڵ بەسەر تەمەنیدا دەڕۆیشت، بە باڵای بەرز و شانی پان و مووی سپی بە شکۆ دەهاتە بەرچاو، فەرماندەی گاردی جاوید زانی کەسێکی گەورەیە، بە پاشای ڕاگەیاند کە کەسێکی لەو شێوەیە هاتووە بۆ بینینی ئەو، ئەردەشێر مۆڵەتی پێدا بۆ هاتنە ژوورەوە، دێماراتیش هێندە لە پاشا چۆوە پێش تا دەنگی بگاتە ئەو، دواتر لەسەر ئەژنۆ دانیشت، لای یۆنانییەکان نەریت وابوو ئەوکاتەی ویستبایان زۆر ڕێز لە بەرانبەر بنێن، لەسەر ئەژنۆ دادەنیشتن. ئەردەشێر گومانی کرد کە ئەو خەڵکی یۆنانە و لێی پرسی: کابرا، تۆ خەڵکی یۆنانی؟

دێمارات وتی: بەڵێ ئەی پاشای ئێران.

ئەردەشێری دەستدرێژ وتی: خەڵکی کام لە دەوڵەتەشارەکانی یۆنانی؟

دێمارات وتی: خەڵکی ئێسپارتم.

ئەردەشێر وتی: لەو وڵاتە کارت چییە؟

دێمارات وتی: من لەو وڵاتە پاشا بووم.

ئەو وتەیە هێندە چاوەڕوان نەکراو بوو، کە ئەردەشێر بە پەلە خۆی بەرز کردەوە و وتی: ئایا تۆ دێماراتی پاشای ئێسپارتی؟

پیرە پیاوەکە وتی: بەڵێ ئەی پاشای ئێران.

ئەردەشێر وتی: بۆچی هاتووی بۆ ئێرە.

دێمارات وتی: هاتووم تا پەنا بێنمە بەر تۆ، ئێستە ژیان و مردنی من لە دەست تۆدایە، ئەگەر ناتەوێت من لە ژیان بەردەوام بم، فەرمانی کوشتنی من دەربکە، ئەگەر ناشتەوێت من بکوژرێم، پەنام بدە.

ئەردەشێر وتی: خەڵکی ئێسپارت ئازان، پاشاکەیان لەنێو پیاوانی ئازا هەڵدەبژێردرێن، ئەو پیاوەی ببێتە پاشای ئێسپارت لە مردن ناترسێت، تەنانەت ئەگەر بزانێت هاونیشتمانییەکانی دەیانەوێت ئەو بکوژن، بۆ پاراستنی ژیانی خۆی لە نیشتمانەکەی دەرناچێت، چ ڕووداوێك بۆتە هۆی ئەوەی کە تۆ ناچار بووی ئێسپارت بەجێ بهێڵی.

دێمارات وتی: ویستیان من ناچار بکەن، کە شەڕ بکەم و شمشێرم بەرەو ڕووی یۆنانییەکان ڕابگرم، منیش چوونکە بەڵێنم دابوو شمشێرم بەرەو ڕووی یۆنانییەکان ڕانەگرم، نیشتمانەکەمم بەجێ هێشت.

ئەو جەنگەی دێمارات باسی کرد، بریتی بوو لە جەنگەکانی ناوەخۆی یۆنان، دواتر ڕوویدا و بە جەنگەکانی پلۆپۆنز ناسرا.

دێمارات دوای ئەوەی لە نیشتمانەکەی دەرچوو، نەیدەتوانی لە هیچ شوێنێك بژیت، چوونکە هیچ سەرمایەیەکی نەبوو، داهاتی ئەو پتر نەبوو لە داهاتی تاکەکانی دیکەی وڵاتەکەی، بۆیە بەرەو کۆشکی هەخامەنشیی هات و ئەردەشێر ئەوی پەنادا، تا ئەو رۆژەی زیندوو بوو، لە ئێران بە خۆشی ژیا.

دوای ئەوەی تیمیستۆکیل سەرۆك کۆماری ئەسینا پەنای هێنایەبەر کۆشکی هەخامەنشیی، ئەردەشێر پاشایەتیی چەند وڵاتێکی ئاسیای بچووکی بە ئەو سپارد، ئەوکات هێشتا ڕێکەوتنی ئاشتی یۆنان و ئێران ئەنجام نەدرابوو، هەندێ جار جەنگ لە نێوانیان ڕووی دەدا. جارێك ئەردەشێر نامەیەکی بۆ تیمیستۆکیل نارد تا بۆ یارمەتیدانی هەخامەنشییەکان بچێتە جەنگی یۆنان و ئەو لە وەڵامی نامەکەدا نووسیبووی: "فەرمانی جەنگی پاشای هەخامەنشیی بۆ جەنگ لەگەڵ هەموو کەس پەسەند دەکەم، بەڵام چوونکە یۆنانیم ناتوانم لەگەڵ هاونیشتمانییەکانم بجەنگم."، دوای نووسینی ئەو نامەیە بۆ ئەردەشێر، تیمیستۆکیل پیالە ژهرەکەی خوارد و خۆی کوشت.

لە کۆندا خواردنەوەی جامی ژهر (شوکران) بۆ سوکرات لە ساڵی (٣٩٩ پ. ز) دەگێڕدرێتەوە، هەر کە باسی ئەو جامە دەکرێت بیرەکان بۆ لای ئەو دەچن، لە کاتێکدا پێش ئەویش و دوای ئەویش زۆر لە کەسانی دیار ئەو کارەیان کردووە، لە یۆنانی کۆن ئەوانەی ئارەزوویان نەبوو، کە بە خەنجەر یاخۆ شمشێر خۆیان بکوژن، باشترین ڕێگە خواردنەوەی شوکران بوو.

کاتێك ئەردەشێر نامەی تیمیستۆکیلی پێگەیشت، دواتر هەواڵی مردنی ئەو، وتی: تیمیستۆکیل پیاوێکی ئازا و بە شەرەف بوو. بەپێی نەریتی ئەوکات ئەو موڵکانەی لە ئاسیای بچووك لە دوای ئەو بەجێ مانەوە، بە کەسوکارەکەی بەخشین.

پلۆتارك مێژوونووسی ناسراو نووسیویەتی: لەو مێژووە و هاوکات لەگەڵ ئەوەی من سەرگەرمی نووسینی ئەو لاپەڕانەم، نەوەکانی تیمیستۆکیل هێشتا لە ئاسیای بچووکن، لە ڕێگەی داهاتی ئەو مۆڵکانەیان کە ئەردەشێر دابووی بە باپیرانیان، ژیانیان دابین دەکەن. پلۆتارك لە ساڵانی شەست و حەوت تا سەد و بیستی زاینیدا ژیاوە، پێنج سەدە لە نێوان کاتی مردنی ئەو و خۆکوژی تیمیستۆکیل

بووە، وێڕای ئەوەش هێشتا نەوەکانی تیمیستۆکیل لە ئاسیای بچووکن، تا نها لەسەر ئەو موڵکانە دەژین، کە ئەردەشێر بە باپیرانی ئەوانی بەخشی بوو.

ئەردەشێری دەستدرێژ لە ساڵانی سەرەتای پاشایەتیدا لە شووش دەژیا، کە دەکەوێتە خوزستانی ئێستە، بەڵام بیست ساڵی دوایی لە پاشایەتییەکەی لە بابل ژیا، دەزانین کە بابل ئەوکات بەشێك بوو لە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی.

مێژوونووسان دەڵێن ئەردەشێر کەسێك بووە، کە بەردەوام بەدووی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بووە، لە دوا ساڵانی تەمەنیشی دووچاری نەخۆشی شەکری خوێن بووە.

دەی نۆن نووسیویەتی کە ئەردەشێر لە دوا ساڵانی تەمەنی کوێر بووە و نەیدەتوانی لە شوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە بڕوات، بۆ هاموشۆکردن دەستیان گرتووە، لە دوای ئەو کاتەوە ئەو بڕیارانەی دەریدەکرد جگە لە ئەوەی خۆی مۆری دەکردن، بۆ ئەوەی سوودی نابەجێ لە کوێربوونەکەی نەبینرێت و فەرمانی بە هەڵەی پێ دەرنەکەن، دوو کەسی دیکە، وەك گەواهیدەر لە کاتی مۆرکردن ئامادە دەبوون و خۆشیان مۆریان دەکرد تا سوودی نادادپەروەرانەیان لێ نەبینرێت.

ئەردەشێری دەستدرێژ رۆژ جارێك، دوو کەسەکەی دەگۆڕی، بەم شێوەیە رێگر دەبوو لە ئەوەی ئەو دوو کەسە فەرمانی دوور لە دادپەروەری یاخۆ بە سوودی خۆیانی پێ مۆر بکەن. وێڕای ئەوەی کوێربوو، فەرمانی دەکرد تا دەسەڵاتداران و بەردەستەکانی لەگەڵ خەڵکدا بە دادپەروەری و نەرمییەوە بجوڵێنەوە. هەموو مێژوونووسە یۆنانییەکان وێڕای ئەوەی زاندراوە کە بەرانبەر ئێرانییەکان ڕەشبین بوون، سەرباری ئەوەی دەڵێن خەشایار بەردەوام بەدوی رابواردنەوە بووە، بەڵام باسی دادپەروەری ئەویش دەکەن و جوامێری ئەویان باس کردووە، کە نموونەیان وەك جوامێری ئەو لەگەڵ پاشای ئێسپارت و سەرۆکی کۆماری ئەسینا و زانا و ئەدیب و هونەرمەندەکان و شاعیر و پزیشکانی یۆنان و نەتەوەکانی دیکە بووە.

مێژوونووسە کۆنەکان نەیانزانیوە هۆکاری نابینابوونی ئەردەشێر لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا چ بووە، بەڵام ئێستە زانراوە کە بە گریمانی زۆر هۆکارەکەی هەمان نەخۆشی شەکری خوێن بووە، ئێستە دەزانرێت کە نەخۆشی شەکری خوێن ئەگەر نەتوانرێت چارەسەر بکرێت، کۆمەڵێك نەخۆشی دیکە بە دووی خۆیدا دەهێنێت، یەکێك لەو نەخۆشییانە کوێر بوونە. ئێستە بە هۆی پێشکەوتنی زانستی پزیشکی و دەرمانەکانیان، پزیشکەکان دەتوانن رێگربن لە کاریگەرییە

لاوەکییەکانی ئەو نەخۆشییە کە یەکیان کوێر بوونە، بەڵام ئەوکات پزیشکەکان نەیانتوانیوە ڕێگربن لە کوێربوونی ئەردەشێر و پزیشکە دیارەکانی یۆنان و میسر و ئێران هەوڵیاندا تا بینایی بۆ بگەڕێننەوە، بەڵام نەیانتوانی، بۆیە ئەردەشێر لە خواردن و خواردنەوە بەدەر هیچ خۆشیەکی دیکەی بۆ نەمابوو.

ئەردەشێر ئەوکاتەی لە بابل بوو بە هۆی نەخۆشی شەکری خوێن هێندە لاواز ، کە نەیدەتوانی بەبێ یارمەتی کەسانی دیکە هەستێتە سەرپێ. ئەوکات چوونکە هەستی کرد مردنی نێزیك بووتەوە، وتی چوونکە دەبێت گۆڕەکەم لە تەنیشت گۆڕی باب و باپیرم بێت، باشترە بچم بۆ پارس و لەوێ ئاهورامەزدا روحەکەم داوا بکات، چوونکە توانای سواربوونی ئەسپی نەبوو، تەختیان بۆ هێنا، کەمێك پێش هاتنی بەهار کەوتەڕێ تا لە ڕێگەی کرماشان بچێتە پارس.

ئەردەشێر گەیشتە کرماشان، لەوێش تێپەڕ بوو، گەیشتە بێستوون کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا شارێکی بچووك بوو، زاندراوە کە داریوش نووسراوە گەورە و تێرووتەسەلەکەی خۆی لەسەر شاخی بێستوون نووسی. ئەردەشێری دەستدرێژیش دەیویست کەتیبەکەی لەو شاخە بنووسێت، پێداویستییەکانی ئەوکارەیان ئامادە کرد، بەشێك لە شاخەکەیان بۆ نووسینی کەتیبەکە لووس کرد، کاتێك ئەردەشیری دەستدرێژ گەیشتە بێستوون، بڕیارِ وابوو کە فەرمانی هەڵکەندنی کەتیبەکە بدات و بڵێت چ لەسەر قەدی ئەو شاخە بنووسن، بەڵام لە ئەوێ باری تەندروستی زۆر تێك چوو، نەیتوانی لەم بارەوە هیچ بڵێت.

ئەردەشێر بە هۆی نەخۆشییەوە ماوەی چەند ڕۆژ لە بێستوون مایەوە و بە هۆی وەرزی بەهار ڕۆژانە باران دەباری و لەکاتی باران باریندا هەواڵیان پێدەدا، چوونکە بەو هۆیە کە دەیزانی باران بارین دەبێتە هۆی باشتربوونی بەرهەمی جووتیاران، دڵخۆش دەبوو.

لەبارەی ڕۆژی مردنی ئەردەشیری دەستدرێژ هیچ زانیاریمان نییە، تەنانەت کەتزیاسی یۆنانی کە بیست ساڵ لە ئێران بووە، ڕۆژی مردنی ئەوی نەنووسیوە، لە دوای مردنی ئەردەشێر تەرمەکەی لەلایەن هاوڕێکانی کە یاوەری بوون، بۆ پارس گوازرایەوە.

# جەنگ و براکوژی

نەریتی پاشاکانی سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی وابوو کە لە کاتی ژیانی خۆیاندا گۆڕەکەیان لەنێو بەردەکانی شاخدا هەڵ دەکەند، جگە لە کوروش هەموو پاشاکانی سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی لە شاخەکان نێژراون، لاشەی ئەردەشێری دەستدرێژیشیان لە شاخ لەنێو گۆڕێك ناشت کە لەنێو بەردی شاخدا هەڵکەندرا بوو، هەیوانەکەی لە وێنەی خاچ بوو[1]، ئەردەشێری دەستدرێژ ئەو دەمەی مرد هەژدە کوڕی هەبوو، بەپێی وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان حەڤدەیان لە ژنە ناشەرعییەکانی بوون، تەنیا خەشایار لە ژنە ڕاستەقینەکەی بوو، خەشایار دوای مردنی ئەردەشێر بوو بە پاشا، بە خەشایاری دووەم ناسرا، ویستی تاج بنێتە سەری، بەڵام بە هۆی هاتنی وەرزی پایز ئەوکارەی نەکرد و چاوەڕوان بوون لە وەرزی بەهاردا ڕێوڕەسمی تاج نانەسەر بەڕێوە ببات.

ئەو ڕۆژەی خەشایاری دووەم بوو بە پاشا، هەموو براکانی کۆکردەوە تا بەڵێنی ئەمەکدارییان لێ وەربگرێت، هەر حەڤدە براکەی سوێند و بەڵێنی ئەمەکداریان پێدا، ئەوان ئەو سوێندەیان لە کۆشکی پێرسپۆلیس بۆ خەشایار خوارد، کە ئەو کۆشکە ناوەندی مەزنی

---

(١) (بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەوەی کە خاچ بۆ یەکەمجار لە ئێران هاتەکایەوە، تەنها بەسە کە دەروازەی گۆڕی پاشاکانی سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی لە شێوەی خاچدایە، دەتوانرێت ئەو گۆڕانە لە هەڵکەندنی ڕۆستەمدا ببینین کە لەنێو شاخدا چێکراوە، جگە لەو تەلارە بەردینانە، شوێنەواری دیکەیش لە ئێران هەن، دەرخەری چێبوونی خاچن بۆ یەکەمجار لە ئێراندا، دواتر شوێنکەوتووانی حەزرەتی عیسا ئەوەیان وەرگرت و کردیان بە هێمای فەرمی خۆیان، وەك زانراوە ئێران پەناگەی کریستییانەکان بووە، ئەمەش بووە مایەی پەرەسەندنی ئەو ئاینە، هەڵبەتە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆم تا سەدەی سێیەمی زاینی تا چ ڕادەیەك یەکجار زۆر دژی کریستییانەکان بوو، ئەوانی لەنێو دەبرد، بەڵام هەر کریستییانێك توانیبای بگاتە ئێران، ژیانی دەپارێزرا، هەمووان ئاگەدارن کە لەسەرەتادا کریستییانەکان شێوەی هێمای ماسییان کرد بە هێمای خۆیان، دواتر خاچ بوو بە هێمای فەرمی ئەوان." زەبیحوڵڵا"

مەعنەوی ئێران بوو، پاشاکانی هەخامەنشیی لەو کۆشکەدا دەگەیشتنە پاشایەتیی و سوێندی ئەمەکداریان لەو شوێنەدا دەخوارد، پاشاکان لە کۆشکی پێرسپۆلیس تاجیان دەنایە سەریان.(٢)

خەشایاری دووەم بەرهەمی هاوسەرگیری شەرعی ئەردەشێر بوو، ئەوددەمە هێشتا ئەردەشێر نەکەوتبۆوە ناو دنیای ڕابواردن و خۆشگوزەرانی، کاتەکانی پشووی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەی بەسەر دەبرد.

مێژوونووسە یۆنانییەکان تاکە سەرچاوەی ئێمەن بۆ زانینی جێنشینەکانی ئەردەشێری دەستدرێژ، چوونکە سەرچاوەی دیکەمان لە بەردەست نییە، ئەوان تەمەنی خەشایاریان دەستنیشان نەکردووە، بەڵام وەك دیارە ئەو تاکە کوڕی شەرعی و کوڕی گەورەی بوو، ئەگەر کوڕی گەورە نەبووایە، حەڤدە براکەی دیکەیان، نەیاندەهێشت بگاتە پاشایەتیی.

پازدە ڕۆژ دوای سوێندی ئەمەکداری براکانی بۆ خەشایاری دووەم، یەکێك لە براکانی بە ناوی (سوکد یانۆس) یاخۆ (سەغد یانۆس) کچێکی شۆخ و شەنگی بە زۆر ڕفاند، دوای تێرکردنی ئارەزووەکانی، ئەوی بەرەڵا کرد، ئەو کردەیەی ئەو لە سەردەمی هەخامەنشیی، واتە پێش سەردەمی هەرج و مەرجەکان، بە تاوانی مەزن دێتە ناسین و بەخشینی نەبوو، گەورەتر بوو لە کوشتنی کەسێك(٣).

باب و دایکی کچەکە چوونە لای پاشا، وتیان براکەت نەتەنیا کچەکەمانی شەرمەزار و بەدبەخت کرد، بگرە ئێمەشی شەرمەزار وڕیسوا کرد، ئیدی ناکارین بگەڕێینەوە بۆ شوێنی

---

(٢) ئەوانەی دەیانەوێت لە دۆخی ئەو کۆشکە تێبگەن کە ئەوکات تەواو ببوو، پێویستە نووسینی کەتزیاس بخوێننەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەو کۆشکە ئەو دەمە پێشانگەی هونەر و پیشەسازی دنیای کۆن بوو، تەنیا شوێنی نیشتەجێی پاشاکانی هەخامەنشیی نەبووە. بە سەرنجدان لەو بابەتە کە پاشا هەخامەنشییەکان لەو کۆشکەدا نەدەژیان، تەنیا لە بۆنەکانی پاشایەتی و ئایینی کە پێویست بووایە لەو کۆشکە دەبوون، لە کاتەکانی دیکە لە پایتەختەکانی دیکەی ئێران دەبوون" زەبیحوڵڵا"

(٣) هەندێك جار زەبیحوڵڵا هەخامەنشییەکان پاك وەك پەڕەی گوڵ دەردەخات، بەپێی بەڵگەکان کە هەر لەو پەڕتووکەدا هاتووە وانەبوونە، ئەوەتا ئەردەشێر لە دوای مردنی هەژدە کوڕی هەبووە، تەنیا یەکێکیان زۆڵ نەبووە، ئەوانی دیکە هەموویان بە ناشەرعی هاتوونەتە دنیاوە. "وەرگێڕی کوردی"

خۆمان، دەبێت کۆچ بکەین، نازانین دواهاتوومان چی بەسەر دێت؟ خەشایاری دووەم داوای کرد سوکد یانووس بێتە لای، بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوەی بداتیێ، بەڵام ئەو نەهات، بەو کارەشی، وتەکانی باب و دایکی کچەکەی پشتڕاست کردەوە، خەشایار وەڵامی بۆ نارد و وتی ئێستە دڵنیاین تۆ ئەوکارەت کردووە، بۆیە وەرە و ئەوە بکە، کە دەبێتە هۆکاری ڕەزامەندیی باب و دایکی کچەکە.

سوکدیانۆس دەیزانی بەپێی نەریت دەبێت پارەیەکی زۆر بداتە باب و دایکی کچەکە، کچەکەش بە پارە خۆی بکاتە هاوسەری کەسێك، چوونکە ئێرانییەکان بۆیان نەبوو، پتر لە ژنێك بێنن، سوکدیانۆس نەیدەتوانی ئەو بکاتە هاوسەری فەرمی خۆی، بۆیە کەوتە هاندانی براکانی بۆ یاخیبوون لە دژی خەشایار.

سەرچاوەی زانیارییەکان تا ئێستەش هەر یۆنانییەکانن، بە وتەی ئەوان سوکدیانۆس بە براکانی وت: (ئەو پیاوە کە ئێستە بە هۆی ئەوەی کوڕی شەرعی بابمانە بۆتە پاشا، ئێمە بە ئاژەڵ و لەوانەشە کەمتر لە ئاژەڵ بزانێت، بەڵام ئێمەش کوڕی شەرعی بابمانین، چوونکە بنەما ڕەزامەندی پیاو و ژنە، کاتێك پیاوێك و ژنێك بە یەك ڕازیبوون، لە جووتبوونیان منداڵێك هاتەکایەوە، ئەو منداڵە شەرعییە، ئەو ڕۆژەی مارە بڕینی دایکی خەشایاری دووەم بۆ بابمان هاتەکایەوە، ئایا ئاهورامەزدا و ئیمشا سپەندەکان واتە (فریشتە مەزنەکان) لە کۆبوونەوەی مارەبڕینی ئەوان بەشدار بوون یاخۆ شەت زەردەشت لە ئەوێ بوو، یان لە کاتوساتی مارەبڕینەکەدا دنیا بە شێوەیەکی دیکە گۆڕا، هۆکاری هاوسەرگیری بابمان و دایکی خەشایار بریێتی بوو لەوەی مووغەکە لە بابمانی پرسی ئایا دەیەوێت ئەو کچە بکاتە هاوسەری خۆی، ئەویش ڕازی بوو، دواتر لەو ژنەی پرسی ئایا ئامادەی ببیە هاوسەری ئەو پیاوە، ئەویش وتی بەڵێ، ئەوەی بۆوە هۆی هاوسەرگیری ئەوان هەر ئەو بەڵێ و پەسەند بوونە بوو کە هەردوولا یەکدییان ویست، ئەو ویستن و پەسەند کردنە لە نێوان ژن و پیاوێك بێتە پێش، ئەوان بە فەرمی دەبنە ژن و مێرد، بابمان خوازیاری هەموو ئەو ژنانە بووە، کە لەگەڵیاندا ژیاوە، ئەو ژنانەش بابی ئێمەیان ویستووە، چوونکە هەردوولا ڕازی بوون، ئێمە کە کوڕانی ئەو ژنانەین بە کوڕانی شەرعی ئەو هەژمار دەکرێین، لە نێوان ئێمە و خەشایاری دووەم لە ڕوانگەی شەرعیبوون، هیچ جیاوازیی نییە).

سوکدیانۆس بەو هۆکارانە براکانی ڕازی کرد، کە کوڕانی شەرعی بابیانن و زۆڵ نین و وتی: (خەشایاری دووەم ئامادە نییە ئەو ڕاستییە پەسەند بکات، چوونکە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کۆك نین، ئەگەر بمانەوێت مافی خۆمان بەسەر یەکێکدا بسەپێنین، دەبێت خەشایاری دووەم بکوژین).

(ئەخۆس) یەکێکی دیکە بوو لە براکانی، وتی: چ لە مووغی مەزن بکەین؟.

سوکدیانۆس بە ئارامی وەڵامیدایەوە: ئەویش دەکوژین.

ئەخۆس بۆیە ناوی گەورەی مووغەکانی هێنا، واتە گەورەترین پێشەوای ئاینی وڵات، چوونکە دوای مردنی ئەردەشێر کوڕە حەڵاڵزادەکەی بە پاڵپشتی موبێدی مەزن لەسەر تەختی پاشایەتیی دانیشت، ئەگەر ئەو پیاوە تەواوی دەستڕۆیشتوویی خۆی نەخستبایە پاڵ خەشایار، بێگومان حەڤدە برا زۆڵەکانی خەشایار کە کینەیان لە بەرانبەریدا هەبوو، نەیاندەهێشت ببێتە پاشا. رك و کینەی ئەو حەڤدە برایە، ماوەیەك بەر لە مردنی باوکیان بەرانبەر خەشایاری دووەم هاتبۆوە کایەوە، چوونکە ئەو لە سەردەمی باوکیدا براکانی خۆی بە پەست دەزانی، چەندین جار بە ئەوانی وت بوو، کە ئێوە زۆڵن، ئەگەر گەورەی مووغەکان پاڵپشتی نەکردبایە، ئەو بە هۆی نارەزایەتی براکانی نەیدەتوانی بگاتە تەختی پاشایەتیی، بۆیە ئەخۆس ناوی مووغی گەورەی هێنا تا بڵێت ئەو ناهێڵێت دوای کوژرانی خەشایاری دووەم، هیچ کام لە ئێمە لەو حەڤدە برایە ببنە پاشا، سوکدیانۆسیش وتی ئەویش دەکوژین.

دوای ئەوە حەڤدە براکە نەخشەی کوشتنی خەشایاری دووەمیان داڕشت، وێڕای ئەوەی حەڤدە کەس بوون، بەڵام ئەو نهێنییە دەرنەچوو، چوونکە هەموویان رقیان لە خەشایار دەبۆوە و بەرژەوەندیی خۆیان لە کوشتنی ئەودا دەبینی، بۆیە بڕیاریاندا کە خەشایار لە شەوی جەژنی سەدە بکوژن.[٤]

---

(٤) بۆ ڕەواندنەوەی لێکچوواندن تا نەوترێت ناوی (سەدە) لە سەردەمی ساسانییەکان هاتووەتە کایەوە و لە سەردەمی هەخامەنشییەکان نەبوو، دەڵێین مەبەستمان لە جەژنی سەدە هەمان جەژنی ئاگرە، کە لە کاتی هەخامەنشییەکان ئەنجام دەدرا، لە سەردەمی ئەشکانییەکان بەردەوام بوو، تا گەیشتە ساسانییەکان ئەودەمە ناوی جەژنی سەدەیان لێنا، بەپێی وتەیەك (سەدە) بە واتای (سێ دە)، کە دەکاتە سی رۆژ) دێت، ئەو جەژنە لە دوای سی رۆژ لە زستان ئەنجام دەدرا، بەڵام کاتی هەخامەنشییەکان جەژنی ئاگر لە یەکەمین شەوی زستان

لە جەژنی ئاگر، لە سەردەمی هەخامەنشییەکان بۆ خۆشی و کات بە سەر بردن، جلوبەرگیان دەگۆڕی، هەمان ئەو کارەی ئێستە ئەورووپاییەکان لە کەرنەڤاڵ و ئاهەنگەکاندا دەیکەن.

سوکدیانۆس بە براکانی وت خەشایار لە شەوی جەژندا جلوبەرگەکانی دەگۆڕێت و کەس نایناسێتەوە، پێویستە یەکێك لە ئێمە بە جلی گۆڕدراو لێی نێزیك ببینەوە و لەگەڵ خۆمان بیبەین بۆ سوچێکی باخەکە و لە ئەوێ بیکوژین، چوونکە بە دوور دەزانرێت، لە یەکەمین شەوی زستان لەنێو باخدا پیاسە و هاتوچۆ بکەن، بۆیە دەڵێین ئەوان ئاگری گەورەیان دەکردەوە، دوای بازبازێن بەسەریاندا بۆ سوود وەرگرتن لە خواردنەکانی خوانی ئەو شەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان.

لە نەخشەی کوشتنەکەدا پێشبینی هەموو ئەگەرێك کرابوو، بڕیاربوو سوکدیانۆس خۆی خەشایار بکوژێت دوای ئەوەی دەیبەنە گۆشەیەکی باخەکە، نەهێڵێت دەنگی لێوە بێت، ئەگەر دەنگیشی هات بە هۆی هەرا و هەنگامەی بازدان لەسەر ئاگر، ئەوا لە باخەکەدا کەس دەنگی نابیستێت.

دەی نۆن دەڵێت پیلانی ئەو کوشتنە تەنیا لە نێوان چەند برایەکدا بوو، ئەوانی دیکە ئاگەداری نەبوون، بەڵام کەتزیاس نووسیویەتی هەموو براکان لەو پیلانە بەشدار بوون، چوونکە تا ماوەیەك دوای سوێند خواردن نەچووبوون بۆ ویلایەتەکان و لە پایتەخت بوون. مەبەستی ئەو لە ڕۆیشتنی براکان بۆ ویلایەتەکان، ئەوە بوو کە هەریەکێك لەوان کاربەدەست بوون، هەندێکیان فەرمانڕەوای ویلایەتە گەورەکان و هەندێکیان فەرمانڕەوای ویلایەتە بچووکەکان بوون، بەڵام هەر بە وتەی ئەو مێژوونووسە ئەودەمە هەموویان لە پایتەخت بوون، هەریەکەشیان بۆ بەشداری لە ڕێوڕەسمی تاج و سوێند خواردن بۆ براکەیان، بە ژمارەیەك سەربازەوە لەوێ بوون، بەم شێوەیە ئەوان لەشکرێکی بچووکیان لە پایتەخت هەبوو.

لە شەوی جەژنی ئاگردا، خەشایار جلوبەرگی خۆی گۆڕیبوو، بۆیە ئەو پاسەوانییەی لە کاتی ئاسایی بۆی ئەنجام دەدرا، ئەو شەوە بۆی نەدەکرا تا کەس نەزانێت کە ئەوە خەشایارە، ئەو و ئەوانی دیکە جلوبەرگیان دەگۆڕی، ڕووخساریان دادەپۆشی تا کەس نەیاننناسێتەوە. یەکێك لە براکان بەپێی پیلانەکە بێ ئەوەی خۆی بناسێنێت، لە خەشایاری دووەم نێزیك بۆوە

---

بوو، چونکە بە شێوەیەکی ئاسایی لە یەکەمین شەوی زستان لە شوێنە فێنکەکان بەفر دەکەوت، ئەو شەوەیان دەکردە جەژن و ئەو جەژنە لەنێو نەتەوە ئارياییەکان زۆر کۆنە. "زەبیحوڵڵا"

و به پێکەنینەوە ئاماژەی کرد تا دوای بکەوێت، هەستی بەدواداچوونی خەشایار، ئەوی پاڵنا تا بەدوویدا بڕواتە گۆشەیەکی باخەکە، لەنێو هەرا و زەنای جەژندا کەس ئاگەداری دوورکەوتنەوەی ئەو دوو کەسە نەبوو، تا گەیشتنە کۆتایی باخەکە، لەوێ سوکدیانۆس چاوەڕوان بوو، لەپڕ هێرشی کردە سەر خەشایار و بە یەك زەربەی شمشێرەکەی قوڕگی ئەوی هەڵدڕی و خەشایار کەوتە سەر زەوی، بێ ئەوەی دەنگی لێوە بێت، کاتێك سوکدیانۆس لە مردنی خەشایار دڵنیا بوو، باخەکەی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی بچێتە لای براکانی کە چاوەڕوانی بوون، هەر یەکە لە براکان جلوبەرگیان گۆڕی و بەرگی ئاساییان لەبەر کردەوە، هەر لەو شەوەدا حەڤدە براکە یاخۆ هەندێك لە ئەوان کە لە پایتەخت بوون، بەرەو کۆشك چوون و داگیریان کرد، هەر ئەو شەوە سوکدیانۆس لەگەڵ کۆمەڵێك لە پیاوەکانی بە نێوی ئەوەی خەشایار کارێکی گرینگ و زۆر بە پەلەی بە گەورە مووغەکانە، چوو بۆ ماڵی ئەو پیاوە، وتی ئەو لە ماڵ بهێننەدەر، دواتر کوشتی، هەر ئەو شەوە لاشەی گەورەی موبیدەکانیان ناشت تا کەس لە کوشتنەکەی ئاگەدار نەبێتەوە، بەیانی هەمان ڕۆژ لەنێو شار جارچییەکان جارِیاندا، لە دەرەوەی شاریش نامەبەرەکان ڕۆیشتن، بە خەڵکیان ڕاگەیاند کە خەشایار ئەو شەوە مردووە، لە جیاتی ئەو سوکدیانۆس یاخۆ سەغدیانووس دەبێتە پاشا، ڕێوڕەسمی پاشایەتیی و سوێندی ئەمەکداری هەر ئەو ڕۆژە ئەنجام دەدرێت، ماوەی پاشایەتیی خەشایار تەنیا چل و پێنج ڕۆژ بوو، تەرمی ئەویش وەك هی باپیرانی لە شاخ نێژرا.

سوکدیانۆس وێڕای کوشتنی براکەی، گەورەی مووغەکانیشی کوشت، لە بواری ژیانی تایبەتی خۆی دووچاری جۆرێك لە لادان بوو، ئێرانییەکان نەفرەتیان لەو کارەی دەکرد، سوکدیانۆس تا ئەو ڕۆژەی نەببوو بە پاشا، لە تێرکردنی حەز و ئارەزووکانی خۆپارێزی دەکرد، بەڵام دوای بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات بێ شەرم بوو، نەفرەتی خەڵك لە بەرانبەری زیادی دەکرد، بەڵام وێڕای ئەوەی پێنج ئاگرخانەکەی ئێران بە دروشمی (مەزدا ویستی) هەوڵیاندا جەنگێکی ئاینی لەگەڵ سوکدیانۆس بکەن، بەڵام توانای ئەو کارەیان نەبوو.

ئاگرخانەکان لەو جەنگەدا سێ ئاریشەیان هەبوو، کە بریتی بوون لە:

یەکەم: نەبوونی بوودجە بۆ جەنگ.

دووەم: نەبوونی فەرماندەیی هاوبەش.

سێیەم: پیاوانی جوامێر و ئازایان ئامادە و گۆش نەکرد بوو.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی ئاگرخانەکان هەوڵەکانیان بۆ دەستپێکردنی شەڕ لە دژی سوکدیانۆس سەری نەدەگرت، سوکدیانۆس کارێکی ئەنجامدا، کە تا ئەوکات لە ئێران پێشینەی نەبوو، هەرچەندە لە ئاشوور ئەو کارە دەکرا، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئێران ئەو کارەیان نەکردبوو، پاشاکانی ئاشوور دوای ئەوەی دەهاتنە سەر تەخت، هەموو ئەو کەسانەیان نابینا دەکرد، کە مەترسیان دەکرد ڕکابەریان بن، هەروەها بەشێکی زۆر لە دیلانی جەنگیان لە دوای هەر جەنگێك کوێر دەکرد، تا لە گاسن یاخۆ گالیسکە یان بەردی ئاشیان ببەستن بۆ کار پێکردن، بەڵام لە ئێران کوێرکردن نەبوو، سزای هەڵواسین بۆ بکوژەکان و سزای داماڵینی پێست بە زیندوویی بۆ ناپاکان هەبوو، بەڵام بە گومانی ئەوەی ڕۆژێك دەبنە ڕکابەر و گرفتیان بۆ چیێ دەکەن، کەسیان کوێر نەدەکرد، پێش ئەنجامدانی تاوان، کەس سزا نەدەدرا، سوکدیانۆس ئەو نەریتە نەفرەت لێکراوەی لە ئێران داهێنا.

براکانی خەشایاری دووەم، دوای کوژرانی خەشایار، بوونی سوکدیانۆس بە پاشا، سوێندی ئەمەکداریان خوارد، دواتر لەگەڵ هاوڕێکانیان گەڕانەوە بۆ سنووری حکوومەتەکانیان، چوونکە هەریەکەیان فەرمانڕەوای بەشێك لە ئیمپراتۆرییەتەکە بوون.

مانگێك دوای گەڕانەوەی براکانی بۆ شوێنەکانی خۆیان، سوکدیانۆس سیێ لە ئەوانی بە ناوەکانی (سەردەس، براکتەس و ئۆدا یا ئۆتا) بانگهێشت کرد، ئەوانیش کە نەیاندەزانی بۆ چ دەچن، جگە لە چەند خزمەتکارێك کەسیان لەگەڵ خۆیان نەهێنا، بە بیێ پاسەوان هاتنە نێو پایتەخت، سوکدیانۆس لە نیوەڕۆدا ئەوانی بانگهێشت کرد بۆ سەر خوانی خواردن، دوای خواردن، بە یەك ئاماژەی ئەو چەند کەسێك هاتنە ژوورەوە، هەرسێکیان دەستگیر کران و بردیانن، ئەو سیێ کەسەیان کوێر کرد. دەی نۆن نووسیویەتی نازانرێت سوکدیانۆس کە دەیەویست ئەوان کوێر بکات، بۆ بانگهێشتی خوانی نان خواردنی کردن.

هەواڵی کوێرکردنی (سەردەس، براکتەس و ئەودا) گەیشتە براکان، ئەخۆس فەرمانڕەوای (هیرکانیا) لە خۆی ترسا. هیرکانیا ناوچەیەك بوو، کە ئێستە بە گۆرگان دەناسرێت، بەڵام هیرکانیای ئەو کات پانتایی لە گۆرگانی ئێستە پتر بوو، لە لای ڕۆژهەڵاتەوە دەگەیشتە (بەیهەق) کە ئێستە بە (سەبزەوار) ناسراوە، ئەو بیابانەی کەوتووەتە گۆرگان، یەکێك بوو لە بەپیتترین شوێنەکانی ئێران و ئاسیای ناوەڕاست، سەرەڕای ڕووبارەکانی (ئەترەك و گۆرگان) کە هێشتا لە ئەویێ ماون، لقێکی گەورەی جەیحونیش دەچۆوە بیابانی گۆرگان.

ڕووباری جەیحون ئێستە دەڕژێتە نێو دەریاچەی ئاراڵ کە لەلایەن مێژوونووسە ئیسلامییەکانەوە بە (دەریاچەی خوارزم) ناسراوە، بەڵام بە لە (٢٥٠٠) ساڵ ئەو ڕووبارە دەڕژایە نێو دەریای مازەندەران، دوای هاتنی بۆ نێو بیابانی تورکمانستان، دەبوو بە دوولق، یەکێ لەو لقانە دەچۆوە ئەو بیابانەی لە گۆرگانە، ئەوی دیکەیان بەرەو مازەندەران دەچوو.[٥]

هیرکانیا کە ئەخۆس فەرمانڕەوای بوو، لە ویلایەتە هەرە دەوڵەمەندەکانی ئیمپراتۆری هەخامەنشیی بوو، ئێسترابوونی جوگرافیناسی بەناوبانگ کە بیست و پێنج ساڵ دوای زاین مرد، نووسیویەتی: (هێرکانیا ناوەندی چاندنی گەنم، برنج، کەنەف، ناوەندی بەرهەمهێنانی ئاوریشم، هەنگوین، میوە هاوینییەکانی وەك (سێڤی، کاڵەك و شوتی) بوو، گەورەترین ناوەند بوو بۆ بەخێوکردنی گا لە سنووری ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی، هەندێ لەوەڕگەی هەیە کە هیچ کات وشك نابن و گاکان لە هەموو وەرزەکانی ساڵ لەو لەوەڕگەیانە دەلەوەڕن، لە باکوری ئەوێ دیوارێك هەیە، بۆ ڕێگری لە هێرشی خێڵە بیابانشینەکان چێ کراوە.)

ئەخۆس فەرمانڕەوای بەداهاتترین ویلایەت بوو، لە گیانی خۆی دەترسا، هەوڵیدا براکانی لە دژی سوکدیانۆس یاخی بکات و یارمەتی لە مووغەکانیش وەربگرێت. لە هێرکانیا بە کەشتیی بەرەو ئازەربایجان چوو، لە بەندەرێك دابەزی کە ئێستە بە (هشت پر) ناسراوە، بە هۆی ئەسپ خۆی گەیاندە (تیر کۆشت)ی برای، کە فەرمانڕەوایی ئاترۆپاتن بوو، ڕاوێژیان بە یەکدیی کرد، تیرکۆشت وتی: ئامادەیە بۆ لادانی سوکدیانۆس لە دەسەڵات یاخی ببێت.

دواتر ئەخۆس و براکەی پێکەوە چوونە ئاگرخانەی چیچەست لە ورمێ، ئەو ئاگرخانەیە ڕەزامەندیان نواند تا ئەخۆس ببێتە فەرماندەی ئەو هێزەی دەچێت بۆ جەنگ دژی سوکدیانۆس، هەروەسا ئاگرخانەی تەختی سلێمانیش ئەو بڕیارەیان پەسەند کرد.

---

(٥) جوگرافیاناسەکان نووسیویانە ڕووباری جەیحوون چەند جارێك ڕێڕەوی گۆڕیوە، لە سەدەی ڕابردوو جارێك ئەو گۆڕانکارییە روویدا، بەڵام چونکە ئێستە سەردەمی تەکنیك و پیشەسازییە، توانرا ڕێی ئەو گۆڕانکارییە بگیرێت، هەروەها پیشەسازی و تەکنیك ڕێگر بوو لە وێرانبوونی شاری تاشکەند بە هۆی لافاوی مێژوویی و بێ هاوتای ڕووباری سەیحوون، ئەگەر پێشکەوتن و تەکنۆلۆژیا نەبووایە، ئەو شارە وێران دەبوو، نیشتەنییەکانی لافاوەکەش شارەکەی نغرۆ دەکرد. "زەبیحوڵڵا"

بەم شێوەیە دوو ئاگرخانە لە پێنج ئاگرخانە مەزنەکەی ئێران یەکەمین هەنگاویان هەڵ هێنا، کە برێتی بوو لە دانانی فەرماندە بۆ جەنگ، بەڵام بوودجەیان نەبوو بۆ جەنگ و کۆکردنەوەی لەشکر. ئەخۆس دەیزانی جەنگ لە دژی سوکدیانۆسی برای پێویستی بە لەشکرێکی بە هێز هەیە، چوونکە هەم هێز، هەمیش پارەی هەبوو، جگە لەو دوو بابەتەش، سوکدیانۆس زۆر بە تووندی ئاگەداری خۆی بوو، دەیزانی چوونکە سێ برای خۆی کوێر کردووە، براکانی دیکەی لە ترسی گیانیان لەوانەیە لێی یاخی بن.

دامەزراوەی پێوەندییەکانی وڵات هەواڵی چوونی ئەخۆس فەرمانڕەوای هیرکانیا بۆ ئازەربایجان، دواتر چوونی ئەو دوو برایە بۆ ئاگرخانەی چیچەستیان گەیاندە سوکدیانۆس، ئەو تێگەیشت ئەوان سەرگەرمی پیلانن لە دژی، بۆ ئەوەی براکانی دیکەی نەچنە نێو ئەو پیلانە، هەموویانی داواکرد تا بێنە پایتەخت، ئەخۆس فەرمانڕەوای هیرکانیا، تیرکۆشت فەرمانڕەوای ئاترۆپاتنیش بانگهێشت کرابوون، بەڵام نەتەنیا ئەو دووانە فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکرد، بگرە براکانی دیکەیش لە ترسی گیانیان بەرفەرمان نەبوون، ترسان ئەگەر بچنە پایتەخت بکوژرێن یاخۆ کوێر بکرێن، دوای ئەوەی براکانی نافەرمانیان نواند، سوکدیانۆس زانی پێویستە لەگەڵیاندا بجەنگێت.

دوای دوو ئاگرخانەکانی ئازەربایجان، هەردوو ئاگرخانەی ڕێی و فارسیش ڕەزامەندیان نواند تا ئەخۆس فەرماندەی لەشکری یاخی بێت، دوای ڕۆیشتن و گەڕانەوەی ئەو، ئاگرخانەی بەڵخیش ڕەزامەندی نواند، براکانیش تێگەیشتن بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ سوکدیانۆس بجەنگن، پێویستە یەك فەرماندەیان هەبێت، لە ڕووی ڕەزامەندی بێت یاخۆ بە هۆی بارودۆخەکە ڕازی بوون تا ئەخۆس فەرماندەیان بێت، ئەمەش بەو واتایە دەهات کە هەر فەرمانێك ئەو بیدات، پێویستە براکان جێبەجێی بکەن، بەم شێوەیە پیلان لە دژی سوکدیانۆس هاتەکایەوە، کە خۆی پیلانگێڕییەکەی لە دژی خەشایاری دووەم ئەنجامدا.

دەی نۆن دەڵێت: ئەگەر لە کێشە و جەنگ و براکوژی کوڕەکانی ئەردەشێری دەستدرێژ لەشکری هەخامەنشیی لێك هەڵ نەوەشایەوە، دەگەڕایەوە بۆ ئەو دامەزراوەی لە سەردەمی کوروش لەو لەشکرەدا دروست کرا بوو، داریوش و خەشایار و ئەردەشێری یەکەم، بەدوای یەکدا ئەو دامەزراوەیان بەهێز کرد و بودجەی لەشکریشیان بڕیار لێدا. لە لەشکری هەخامەنشیی ئەفسەری بەردەست بەرفەرمانی ئەفسەری بەرزتر بوو، هەموویان بەرفەرمانی پاشا بوون.

دەی نۆن دەڵێت ئەگەر لەشکری هەخامەنشیی یەکەی چەسپاو و بەردەوامی نەبووایە، ئەوکاتەی کوڕەکانی ئەردەشێر پێکەوە دەجەنگان، تەنیا ڤاڵانژێکی سێ سەد کەسی یۆنان دەیتوانی بەنێو هەموو ئێران بڕوات و خۆیان بگەیەننە پێرسپۆلیس.

ئەخۆس کە لەلایەن براکانی و ئاگرخانەکانەوە کرایە فەرمانده‌ی لەشکری یاخی بوو، ژنەکەی ناوی (پەریساتیس) یاخۆ (پرۆشات)بوو، ژنێکی ناسراوی ئێران بوو، لە جەنگ لە دژی سوکدیانۆس فەرماندەیی ڕاستەوخۆی لەشکری لە هاوسەرەکەی ستاند، ئەو یەکەمین ژنی ئێران بوو، کە سواری گالیسکەی جەنگی بوو، وەك ژنەکانی پێش مێژوو بە کەوان تیری دەهاویشت، بە وتەی دەی نۆن یەکەمین ژنی ئێرانە، کە پەنجا تالان زێڕ لە هەمبەر سەری دانرا، سوکدیانۆس وتی هەر کەسێك بە زیندوویی یاخۆ مردوویی سەری پەریساتیسم بۆ بینێت، پەنجا تالان زێڕ بە دیاری وەردەگرێت.

کەمتر ڕوویداوە کە ئافرەتێك توانای جەنگی هەبێت، مەبەستمان لە توانای جەنگ، بەڕێوەبردن و فەرماندەیی لەشکرە، ئەگەرنا زۆر ئافرەت توانای جەنگیان هەبووە، لە دووەمین جەنگی جیهانیدا، ژنێکی خەڵکی ڕووسیا کە لە سەربازەکانی سووپای سووری ئەو وڵاتە بوو، لەبەرئەوەی نیشانەی هەڵە نەدەکرد، بە درێژایی ئەو جەنگە (٢٧٩) سەربازی ئەڵمانی کوشتبوو، بەڵام نەبوو بە فەرماندەی جەنگ، پەریساتیس فەرماندەی جەنگ بوو ، بە شێوەیەك جەنگی بەڕێوەبرد کە سوکدیانۆسی شکستدا.

گزنفۆن مێژوونووس و سەرداری یۆنانی، وەك زانراوە لە ئەفسەرە یۆنانییە بەکرێگیراوەکان بووە،لەنێو لەشکری کوروشی بچووك برای ئەردەشێری دووەم، ستایشی ئەو ژنە دەکات و بە یەکێك لە ژنە گەورەکانی جیهانی ناودەبات، ئەو ڕادەربڕینەی ئەو گرینگترە لە ڕادەربڕینی مێژوونووسانی دیکە، چوونکە گزنفۆن یەکێك بووە لە سەردارەکانی جەنگ و باشتر بایەخی جەنگی خەڵکی بۆ دەردەکەوت.

ئەو لە پەڕتووکە مێژووییەکەی بە ناوی (گەڕانەوەی دەهەزار کەس) باسی ناکات، تەنیا لە مێژووی خۆیدا دەڵێت پەریساتیس خانمی ئێران و هاوسەری ئەخۆس لە سەردارە لێهاتووەکانی جەنگ بوو.

یەکێك لەو بابەتانەی دەرخەری لێهاتوویی ئەو وەك سەردارێك بووە، برێتی بووە لە ئەوەی ئەو نەیهێشتووە ئەخۆس جەنگی ڕێك و بەرەیی لە دژی سوکدیانۆس بکات و پێی وت: تۆ

ناتوانی لەگەڵ لەشکری بە هێزی سوکدیانۆس بجەنگی و شکست دەخۆی، ئەخۆس پرسیاری کرد: چۆن لە دژی سۆکدیانۆسدا بجەنگین.

پەریساتیس وتی: شەڕ و هەڵاتنی لەگەڵدا بکە، دواتر ئەو ژنە نەخشەیەکی بۆ جەنگ لە دژی سۆکدیانۆس داڕشت کە بەم شێوەیە بوو: (دوازدە براکەی ئەخۆس، کە هەریەکەیان فەرمانڕەوای بەشێك لە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی بوون، بە لەشکرەکانیانەوە بەرەو پایتەخت بکەونەڕێ بۆ ئەوەی سوکدیانووس ناچار بێت لەشکرەکەی دابەش بکات بە سەر دوازدە بەش، هەر بەشێك بۆ جەنگی برایەك بنێرێت. لە هەر شوێنێك کە یەکێك لە براکان هەست بە بوونی لەشکری بەهێز لە بەرانبەر خۆیدا بکات، پێویستە جەنگ و هەڵاتن بکات، لە هەر شوێنێك سوکدیانۆس لەشکرەکەی لاواز بوو، هێرش بکەن و لەنێوی ببەن، بەڵام ئەگەر سێزدە براکە بیانەوێت هێزەکانیان یەکبخەن، لە یەك گۆڕەپاندا لە دژی سوکدیانۆس بجەنگن، بێگومان شکست دەخۆن).

دوازدە براکە لە شوێنەکانی خۆیان لەگەڵ ئەو لەشکرانەی توانیبوویان ئامادەیان بکەن، کەوتنەڕێ، سوکدیانۆس کە ئەوکات لە شاری (گی)بوو ناچاربوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی براکانی لەشکرەکەی بڵاو بکات، دواتر شاری گی ناوەکەی بە(جی) گۆڕا، هەمان شاری ئیسفەهانی ئێستە بوو، دەکەوتە تەنیشت ڕووباری (زایەندەڕوود). زانراوە کوروش دوای شکستدانی بابل، کۆیلە جوولەکەکانی ئازاد کرد، بەشێك لە ئەوان بە ویستی خۆیان هاتنە کەناری زایەندەڕوود، کوروش زەوی کشتووکاڵی پێدان، ئەوان لە کەناری شاری گیی لە ناوچەیەك کە بە (یۆدە) ناسرا بوو، نیشتەجێبوون، مێژوونووسە ئیسلامییەکان ئەو شوێنەیان بە جوولەکان ناو بردووە.

لەو کاتەوەی جوولەکەکان لە کەناری ئەو ڕووبارە نیشتەجێبوون، هیچ پاشایەك داوای سەربازی لێ نەکردن، بەڵام سوکدیانۆس سەربازی لە ئەوان ویست و وتی: پێویستە ئێوە بڕۆن و جەنگی دوژمنەکانم بکەن، کەتزیاس دەڵێت: ئەوکاتەی ئەو داوای سەربازی لە جوولەکەکان کرد، (ئەرمیشە) پێشەوای ئاینی ئەوان داوای بینینی سوکدیانۆسی کرد.

هەر بە وتەی کەتزیاس کاتێك ئەرمیشە چووە لای سوکدیانۆس وتی: ئێمە لە ڕابردوودا نەتەوەیەکی شەڕکەر بووین، بەڵام دوای ئەوەی ئێمەیان دیل کرد و لە بابل ناچاریان کردین ببینە کۆیلە، دواتر بە دەست کوروش ڕزگار کراین، ڕۆحی ئازایەتی خۆمان لە دەستدا، لە ئەو ڕۆژەوە کە

ئازاد کراوین تا ئێستە تەنیا کارمان کشتووکاڵ بووە، هەرگیز جەنگمان نەکردووە، بۆیە ئەگەر پاشا پیاوە جووتیارەکانی ئێمە بباتە جەنگ، سوود لە بوونیان وەرناگرێت.

کەتزیاس دەڵێت: سوکدیانۆس وتی من دووچاری کەمی ژمارەی سەرباز بووم، چوونکە لە هەموو وڵات ئاگری ئاژاوە هەڵگیرساوە، پێویستە ئەو ئاژاوەیە دامرکێنمەوە، بۆ ئەو ئەرکە پێویستم بە سەرباز هەیە.

ئەرمیشە وتی: ئەگەر پاشا ئێمە لە سەربازی ببەخشێت، من خزمەتێکی مەزنی پێ دەکەم.

سوکدیانۆس پرسیاری کرد: ئەو خزمەتە گەورەیە چییە؟

ئەرمیشە وتی: بیستوومە، کە پاشا دەیەوێت پەریساتیس لەنێو ببات و وتوویەتی هەر کەسێك بەمردوویی یاخۆ بەزیندوویی ئەوی بۆ بێنێت، پەنجا تالان زێڕی پێ دەدات، من دەکارم وابکەم کە پەریساتیس بکوژرێت.

سوکدیانۆس بە سەرسووڕمانەوە وتی: تۆ بە بێ جەنگ دەتوانی پەریساتیس لەنێو ببەی.

ئەرمیشە وتی: بەڵێ ئەی پاشا.

سوکدیانۆس پرسی: چۆن ئەو لەنێو دەبەی.

ئەرمیشە وتی: من خودان زانستێکم، دەکارم لە رێگەی دوورەوە بە هۆی ئەو زانستەوە ئەو بکوژم.

سوکدیانۆس وتی: تۆ کە خودان زانستێکی کە دەتوانی خەڵك لە دوورەوە لەنێو ببەی، بۆ ئەخۆس و براکانی و سەربازەکانیان کە لە دژی من یاخیبوون لەنێو نابەی؟.

ئەرمیشە زۆر بەهێمنی و ئەسپایی بۆ ئەوەی وتەکانی لە داهاتوودا نەبنە هۆکاری ئازاردانی، وتی: ئەی پاشا من ناکارم پتر لە یەك کەس لە رێگەی دوورەوە لەنێو ببەم، دوای ئەوەی یەکێکم کوشت تا ماوەیەکی زۆر ناکارم کەسی دیکە بکوژم، جگە لەوە ناتوانم ئەو کەسانە بکوژم کە فەرماندەن و پلەی مەزنیان هەیە، هەرچەندە ئەخۆس لەو کارەیدا ناپاکە، بەڵام سەرۆك و فەرماندەی ژێردەستەکانی خۆیەتی و ناتوانم ئەو بکوژم، بەڵام دەتوانم پەریساتیسی هاوسەری بکوژم و بەو خزمەتە ڕەزامەندی پاشا بەدەست بهێنم.

سوکدیانۆس پرسیاری کرد: چ کاتێك ئەو دەکوژی؟

ئەرمیشە بە پەنجەکانی دەستی پێوانەی خۆی کرد و وتی: من شەست ڕۆژی دیکە ئەو دەکوژم.

سوکدیانۆس وتی: تۆ کە زانستی کوشتنی خەڵکت لە ڕێگەی دوورەوە هەیە، بۆچی شەست ڕۆژی دیکە ئەو دەکوژی؟ من دەمەوێت هەر ئەمڕۆ ئەو بکوژی.

ئەرمیشە وتی: ئەی پاشا من بۆیە دەڵێم شەست ڕۆژ، چوونکە لە ئێستەوە تا ئەوکات پێویستە بنەماکانی زانستەکەم بخەمە کار تا پەریساتیس بکوژم، ئەگەر ئەو بنەمایانە لە ماوەی شەست ڕۆژدا بەکار نەبرێن، ئەو ژنە ناکوژرێت.

سوکدیانۆس پرسیاری لێکرد: کە زانستی تۆ چییە؟

ئەرمیشە وتی: زانستی من بریتییە لە جادوو. بەشێك لە لێکۆڵەران لەسەر ئەوەی جادوو، سەرەتا لەنێو جوولەکەکان برەوی هەبووە، پشت ئەستورە بەو گێڕانەوە مێژووییە.

سوکدیانۆس وتی: هەرچەندە ماوەی شەست ڕۆژ زۆرە، من ماوەی شەست ڕۆژت کات پێ دەدەم، بۆ ئەوەی پەریساتیس بکوژی، بەڵام ئەگەر لەو ماوەیە ئەوت نەکوشبێت، چوونکە نەتهێشتووە من سەرباز لەنێو ئێوە بگرم و درۆشت لەگەڵ مندا کردووە، ڕووبەڕووی سزای توووند دەبیتەوە.

ئەرمیشە وتی: ئەی پاشا، ئەگەر ئەو ماوەیە ڕۆیشت و من نەمتوانی ئەو کارە بکەم، بۆ هەموو سزایەك ئامادە دەبم، بەم شێوەیە ئەرمیشە لەو ڕۆژەدا بۆوە پێشەنگ بۆ کوشتنی ژنێك لە ڕێگەی دوورەوە، کە بە کردەوە فەرماندەی یاخی بووەکان بوو.

ئایا ئەو ڕۆژەی ئەرمیشە لە پێش سوکدیانۆس ئەو بەڵێنەیدا دەیزانی کە ئەو تا شەست ڕۆژی دیکە زیندوو نامێنێت بۆ ئەوەی سزای بدات؟ بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەو گریمانە هیچ بەڵگەمان نییە، هەرچەندە هەموو براکانی لە دژی سوکدیانۆس یاخی ببوون، بەڵام ئەقڵ ناتوانێت پەسەندی ئەوە بکات کە ئەرمیشە بتوانێت ئەو پێشبینییە بکات. ئەو پیاوە بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەکەی لە سەربازی، بەڵێنێکی گەورەی لە ئەستۆ گرت و دەیزانی دەکوژرێت، ئەگەر نەتوانێت ئەوکارە بکات. بابەتی کوشتن لە ڕێگەی دوورەوە لە نێوان جادووگەرەکان لە کۆندا نەبوو، هەندێ جادووگەر دەردەکەوتن دەیانوت دەکارن لە ڕێگەی دوورەوە خەڵك بکوژن، بێ دەست نیشانکردنی ئەوەی ئەوان توانیویانە یاخۆ تەنیا ئەوە وتە بووە و بەس.

ئەمڕۆ زانست بڕوای بەو بابەتە نییە، تەنیا بە ڕێگەی شەپۆلە کورتەکانەوە لە ڕێگەی دوورەوە دەتوانرێت کەسێك بکوژرێت، بەڵام لە ڕابردوودا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئەو باوەڕە هەبوو، بۆ لەنێوبردنی دوژمنەکانیان، هەندێ کەس تکایان لە جادووگەرێك دەکرد و دەیانەویست لە ڕێگەی دوورەوە دوژمنەکەیان بۆ بکوژێت.

دوای ئەوەی یاخیبوونی ئەخۆس و براکانی بە هێزتر بوو، لە قۆناخی قسەوە گەیشتە قۆناخی کردەوە، ئاگرخانەکان بە هەموو تواناوە کەوتنە یارمەتیدانی یاخی بووەکان. لە لایەك بۆ بەردەوامی جەنگ، زێڕ و شتی گرانبەهایان دەدایە ئەخۆس، لە لایەکی دیکە خەڵکیان هان دەدا، پشتگیری یاخیبووەکان بکەن، دەیانوت ئەرکی هەموو پیاوانە بۆ سەرکەوتنی مەزدا، یارمەتی ئەخۆس و براکانی بدەن لە جەنگدا.

کاتێك گەورەی مووغەکان بە دەستی سوکدیانۆس کوژرا، هەموو مووغەکان و خزمەتکارانی ئاگرخانەکان لە گیانی خۆیان دەترسان، چوونکە پێیان وابوو کە سوکدیانۆس دەست لە کوشتنی پیاوێکی گەورەی وەك گەورەی مووغەکان نەپارێزێت، بێگومان دەست لە کوشتنی ئەوانیش ناپارێزێت.

ڕاپەڕینی ئاگرخانەکان لە دژی سوکدیانۆس تەنیا بۆ تۆڵەی خوێنی مووغی گەورە نەبوو، بگرە ئەوان لە گیانی خۆیان دەترسان، ترسیان هەبوو کە هێزی ئەوان کە لە سەرمایەی ئاگرخانەکانەوە سەرچاوەی دەگرت، لەنێو بچێت. ئاگرخانەکان بەتایبەتی ئەو پێنج ئاگرخانەی ناومان بردن لە وەرگرتنی زێڕ و دیارییەکان بۆ ئاگرخانەکانیان، ببوونە خودان سەرمایە و سامان، دەترسان سوکدیانۆس بۆ لەنێوبردنی دەستڕۆیشتوویی ئەوان، دەست بگرێت بەسەر سامان و سەرمایەکانیان، بۆیە ئەوانیش دوای چێکردنی ناوەندێك لەلایەن ئەخۆس و براکانی بۆ جەنگ لە دژی سوکدیانۆس، بە هەموو تواناکانیانەوە کەوتنە هاندانی خەڵك بۆ یارمەتیدانی یاخیبووان.

پێویستە سەرەنج بدەین کە ئەوکات بە هۆی نەهاتنەکایەوەی سیستەمی چینایەتی لە ئێران، هەموو خەڵك دەیانتوانی لە هەموو کارێکدا ڕای خۆیان بڵێن، لە سەردەمی ساسانییەکاندا لە کاتی بوونی جیاوازیی لە نێوان شازادەکاندا، هیچ کەس جگە لە خودی شازادەکان نەیدەتوانی سەرەنجی خۆی بڵێت. لە سەردەمی ساسانییەکاندا چینەکانی وەك (مووغەکان، شازادەکان، کارمەندانی دەوڵەت، جووتیاران و پیشەوەران) لە چینەکانی دیکە

جیا بوون، هەریەکە لەو چینانە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە سنووریکیان هەبوو، ئەستەم بوو هاوسەرگیری لە نێوان دوو بنەماڵەی کارمەندی حکوومەت و جووتیار بکرێت.

فیردەوسی کە کەسێکی ئەمین بووە، چینەکانی کۆمەڵگەی ئێرانی لە سەردەمی ساسانییەکان لە ڕوانگەی سوودوەرگرتن بۆ ڕێککاری شانامە لە شیعرەکانیدا باس کردووە، بەڵام وەك لە (ئارتور کریستییەن سێن) تێدەگەین لە سەردەمی ساسانییەکاندا کۆمەڵگەی ئێرانی ورد و ڕێکتر بووە لەوەی کە فیردەوسی لە خوداوەندنامە وەریگرتووە، لە شیعرەکانیدا باسی کردووە.

بە هۆی ئەو جیاوازییانەی لە نێوان چینەکاندا لە سەردەمی ساسانییەکان هەبوو، ئەستەم بوو بۆ نموونە بتوانن کارمەندانی حکوومەت لە دژی جووتیاران یاخی بن، لە تەواوی سەردەمی چوارسەد ساڵەی فەرمانڕەوایی ساسانییەکاندا هەرکاتێك جەنگێکی ناوەخۆیی ڕووی دەدا، جەنگێك دەبوو لە نێوان خودی شازادەکان، ئەو جەنگانەی لە نێوان سەربازەکان و شوێنکەوتووانی مانی ڕوویدا، بە جەنگی ناوەخۆ نەدەژمێردران، بەواتایەکی دیکە ئەوانە برێتی بوون لە کردە پۆلیسییەکان.

لە سەردەمی هەخامەنشییەکان جیاوازیی چینایەتی نەبوو، ئاگرخانەکان دەیانتوانی هانی خەڵکی بدەن لە دژی سوکدیانۆس یاخی بن، خەڵکیش ڕاهێنانی سەربازیان کردبوو، چوونکە پیاوان لە سەردەمی هەخامەنشییەکان تا کاتی ئەردەشێری دەستدرێژ، دەبووایە ئەرکی سەربازی بەجێ بگەیەنن، بەڵام دوای ئەردەشێر، لەو سەردەمەی کوڕەکانی ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند، ئەرکی سەربازگیری نەما.

کەواتە ئەو پیاوانەی بە هاندانی ئاگرخانەکان بۆ یارمەتی ئەخۆس و براکانی هاتنە مەیدان، خەڵکی بێ سوود نەبوون، هەریەکەیان شمشێر یاخۆ نێزەیان هەبوو، دەیانتوانی بجەنگن، بەڵام لەشکرە بچووکەکانی براکانی ئەخۆس چەکی قورسیان نەبوو، واتە گالیسکەی جەنگیان نەبوو، چوونکە چێکردنی گالیسکە و بەستنەوەی چەند ئەسپێك پێیەوە کارێکی ئاسان نەبوو، لە بەرانبەریشدا سوکدیانۆس گالیسکەی جەنگی هەبوو. هەڵبەت لە هەموو شارەکانی ئێران گالیسکە دروست دەکرا و ئەسپیش دەست دەکەوت، بەڵام پەروەردەی ئەو پیاوانەی بتوانن بە گالیسکەکان بجەنگەن کارێکی سەخت بوو، هەروەها کاتی پێویست بوو، بەو پێیەی لێخوڕ و گالیسکەچییەکان لە یەك ڕۆژدا پەروەردە نەدەکران، بەڵام پەریساتیس کە

به کردەوە فەرماندەی جەنگ بوو، کارێکی کرد کە لە هیچ شوێنێك سەربازەکانی لەگەڵ گالیسکەکان نەجەنگن.

بەڕێوەبردنی مەیدانێکی فرەوانی جەنگێك کە لە شێوەی هەڵاتن و شەڕکردن یاخۆ بە دەستەواژەی تازە جەنگی پارتیزانی بێت، کارێکی سەختە. پەریساتیس هاوسەری ئەخۆس چاوەدێری هەموو جەنگەکان بوو لە تەواوی ئێران، هەوڵی دەدا تا کردە جەنگییەکانی براکانی هاوسەرەکەی هەماهەنگ بن. لەوانەیە بگوترێت براکانی ئەخۆس لەگەڵ کێدا دەجەنگان، ئایا ئەوان خۆیان فەرمانڕەوا نەبوون و هەموو شتێك لە بەردەستیان نەبوو؟.

بۆ وەڵام دەگەڕێینەوە سەردەمی داریوشی گەورە، ئەو دامەزراوەی بەڕێوەبردنی ئێرانی چەسپاند، هەرچەندە ئەو دامەزراوە لەلایەن پاشاکانی دوای ئەو کەمێك گۆڕانی بەسەردا هات، بەڵام بنەماکانی نەگۆڕا، یەکێك لە بنەماکان برێتی بوو لەوەی فەرماندەی لەشکری ویلایەت یاخۆ دەوڵەتی ژێردەست جیابوو لە فەرمانڕەوای ویلایەتەکە، فەرمانڕەوا نەیدەتوانی کاروباری کارگێڕی و سەربازی پێکەوە بەڕێوە ببات، فەرماندەی لەشکری ویلایەتەکان بەرفەرمانی پاشاکانی هەخامەنشیی بوون، لە هەندێ لە ویلایەتەکان سەربازگەکان لە بەرانبەر لەشکری براکانی ئەخۆس خۆیان ڕاگرت، بەڵام لە هەندێکیان لەنێو بردران یاخۆ نەیانەویست بەرگری بکەن، چوونکە بە هۆی پرۆپاگەندە بەردەوامەکانی مووغەکانی ئاگرخانەکان، سوکدیانۆس کەوتبۆوە بەر نەفرەتی خەڵکی ئێران، هەمووان دەیانزانی ئەو سێ برای خۆی کوێر کردووە و یەکیشی کوشتووە، هەروەها گەورەی مووغەکانیشی کوشتووە. سەرکردەی لەشکرەکان لە ویلایەتەکان تێدەگەیشتن کە پاشایەتیی سوکدیانۆس بەردەوام نابێت، دوای ئەوەی دەیانزانی حوکمران دەیەوێت لەگەڵ براکانی لە دژی سوکدیانۆس یاخی ببێت، دەستیان لەبەر گری هەڵدەگرت، بەڵام لە هەندێ شوێن شەڕی تۆقێنەر لە نێوان یاخیبووان و سەربازگەکان چێ دەبوو، بۆ نموونە سەربازگەی ئاترۆپاتن بەرگری سەختیان لە بەرانبەر یاخیبووان کرد.

فەرماندەی سەربازگەی ئاترۆپاتن ئەفسەریك بوو بە ناوی (کاوا)، لە ناوچەیەك بوو، کە ئەمڕۆ بە (سەرئاب) ناسراوە، بەرگری سەختی کرد، ئەو کات ئەو ناوچەیە بە (ساراب تین) ناسرا بوو، نازانین کە ناوی (سەرئاب) هەر لەو وشەیە وەرگیراوە یاخۆ بە واتای سەرچاوەی ئاو یان سەرەتای ڕووبار دێت.

لەپڕ یاخیبووان دەورەی سەربازگەکەیان گرت، سەرباز و ئەفسەرەکانی گەمارۆ دران، دواتر ئاویان لە سەربازگەکە بڕی، بەڵام کاوا لەنێو سەربازگەکە بیری بۆ ئاو هەڵکەند و خۆی بە دەستەوە نەدا. خواردەمەنی لە سەربازگەکە کەم بوو، بە زوویی تەواو بوو، کاوا فەرمانی کرد بەپێی پێویست ئێستر و ئەسپ سەر ببڕن و بیدەنە سەربازەکان، دواتر فەرمانی کرد بەرە بەرە دارەکانی ناو سەربازگە بۆ سووتاندن ببڕنەوە، چوونکە سووتەمەنی لە دەرەوە نەدەهات.

فەرمانڕەوای ئاترۆپاتن کە برای ئەخۆس بوو، سەربازگەکەی گەمارۆ دابوو، کوڕە گەنجەکەی کاوای گرت و هەواڵی بۆ پەریساتیس نارد کە دەیەوێت بە کاوا ڕابگەیەنێت کە ئەگەر خۆی بەدەستەوە نەدات، کوڕەکەی لەبەر چاوی خۆی دەکوژێت.

پەریساتیس وەڵامی دایەوە کە ئێمە دەجەنگین بۆ ئەوەی پیاوێکی ستەمکاری وەك سوکدیانۆس لەنێو ببەین، نامانەوێت ئەو کردەوانە دووبارە بکەینەوە، کە ئەو کردوویەتی، ئەو وەڵامە ڕێگر بوو لە کوشتنی کوڕە گەنجەکە بە بەر چاوی باوکییەوە.

بە هۆی خۆبەدەستەوە نەدانی کاوا، فەرمانڕەوای ئاترۆپاتن کە ناوی (شاویدۆن) بوو، نەیدەتوانی گەمارۆی سەر سەربازگەکە هەڵبگرێت، چوونکە کاوا دوای شکانی گەمارۆ هێرشی دەکردنە سەر و لەوانە بوو کە پیلانی یاخیبووەکان تێك بشکێت، بۆیە پەریساتیس شاویلۆنی لە بەشداریکردن لە پیلانەکە بەخشی و فەرمانی کرد تا ئەو بەردەوام بێت لە گەمارۆدانی سەربازگەی سەرئاب.

سەربازگەیەکی دیکە کە لە بەرانبەر یاخیبووەکان بەرگری کرد، سەربازگەی پاراتوا بوو، دواتر بە پارت یاخۆ پارس ناسرا، پارتوا بەو ناوچەیە دەوترا کە ئێستە بە خۆراسان ناو دەبرێت. پەریساتیس هەر وەك سەربازگەی ئاترۆپاتن، فەرمانیدا بەردەوام بن لە گەمارۆ و جەنگ لەگەڵ ئەوان تا نەتوانن بگەنە لەشکری سووکدیانۆس و بەهێزتری بکەن.

ئەو فەرمانانەی لەلایەن پەریساتیس دەردەچوون، نیشاندەری لێهاتوویی ئەو بوون، دەیزانی نابێت هەمووان بە قوربانی بەشێك بکات، بە پێچەوانەوە دەبێت بەش ببێتە قوربانی هەمووان. ئامانجی ئەو لەنێوبردنی سوکدیانۆس بوو، سەرکەوتن نەبوو بەسەر سەربازگەکانی پاراتوا و ئاترۆپاتن، نەیدەتوانی کۆی کێشەکە بکاتە قوربانی بۆ ئەو دوو سەربازگەیە، هاوکاتیش نەیدەتوانی دەست لە جەنگی ئەو دوو سەربازگە هەڵبگرێت، چوونکە ئەوان دەچوونە پاڵ لەشکری سووکدیانۆس و بەهێزتریان دەکرد.

لە هەر ناوچەیەك كە سەربازگە بڕیاری بەرگری نەكردنیان دابووایە، یاخیبووەكان هەوڵیان دەدا ئەوان بكەنە هاوپەیمانی خۆیان، هەندێكیان پەسەندیان دەكرد، هەندێكی دیكەیش ڕەتیان دەكردەوە، فەرمانڕەوای ویلایەتەكەش یەكەكانی هەڵدەوەشاندنەوە و بودجەكەی ڕادەگرتن تا نەتوانن لەشكر چێ بكەنەوە.

بە درێژایی ئەو كاتەی پەریساتیس سەرپەرشتی جەنگی لە دژی سوكدیانۆس دەكرد، خودی سوكدیانۆس هیچ ڕێكارێكی نەگرتەبەر بۆ ڕازیكردنی دڵی هەندێ لە سەرۆكەكان لەو ویلایەتانەی یاخی بوونی تێدا هەبوو، لە كاتێكدا كە ئەو پیاوێكی زیرەك بوو، دەبووایە بزانێت لەوكاتەدا ڕازیكردنی دڵی سەرۆكی سەربازگەكان پێویستە. هەروەها هەرچەندە ئەو هەواڵی یاخیبوونی لە ئیالەت و ویلایەتەكان پێدەگەیشت، بەڵام هەنگاوی نەدەنا تا بچێتە ئەوێ و یاخی بوونە ناوچەییەكان دامركێنێتەوە.

ئەگەر ئەو لەشكرە بەهێزەكەی بۆ ئیالەت و ویلایەتەكان بردبا، یاخی بوونەكانی لەنێو دەبرد، بەڵام ئەو لە (گی) نەجووڵا و چاوەڕوان بوو تا ئۆرمیشە لە دوورەوە پەریساتیسی بۆ بكوژێت.

سەرسام دەبین كە چۆن كەسێكی وەك سوكدیانۆس كە خودان لەشكری بەهێز و گالیسكەی جەنگی بوو، بۆ لەنێوبردنی دوژمن پشتی بە جادووگەر بەست، بەڵام ئەو ڕووداوە لە مێژوودا تۆمار كراوە و دەبێت پەسەندی بكەین، سۆكدیانۆس چاوەڕوان بوو كە ئۆرمیشە بە هۆی جادووگەرییەوە لە دوورەوە پەریساتیسی بۆ بكوژێت.

ئەو لەشكرانەی پەریساتیس بەڕێوەی دەبردن، لە شوێنە جیاكانی وڵاتەوە بەڕێكەوتن، لە هەر شوێنێك بەرگریان دەبینی، تێكیان دەشكاند تا خۆیان گەیاندە ناوچەی گیی (ئیسفەهان).

هەموو لەشكری سوكدیانۆس جگە لە ئەوانەی لە ویلایەت و ئیالەتەكان بوون لە گیی جێگیر كرابوون، سوكدیانۆسیش لە ئەوێ بوو، بۆیە پەریساتیس خۆی بۆ جەنگی یەكلاكەرەوە ئامادە كرد.

مێژوونووسە كۆنەكان نووسیویانە كە گۆڕەپانی جەنگی پەریساتیس و سوكدیانۆس ناوچەیەك بووە لە ڕۆژئاوای گیی بە ناوی (ئاپادیس)، كە زۆر لە گیی دوور نەبووە، بۆیە دەتوانین بڵێین گۆڕەپانی جەنگ كەوتبۆوە ناوچەیەك لە ڕۆژئاوای ئیسفەهان كە ئێستە بە (نەجەف ئاباد و دەستگێرد) ناسراون.

ئەو ناوچەیەی لە رابردوو بە (ئاپادیس)[٦] دەناسرا، ناوچەیەکی تەخت و بێ شاخ و خەرەند بوو، بۆچی پەریساتیس کە ئامۆژگاری سەردارەکانی دەکرد خۆیان لە جەنگی گالیسکە جەنگییەکانی سوکدیانۆس بپارێزن، ئەو شوێنەی بۆ جەنگ هەڵبژارد، کە بۆ بەکارخستنی گالیسکەکان زۆر باش بوو؟.

هۆکارەکەی ئەوەبوو کە گۆڕەپانی جەنگ بە هۆی شوێنی بە یەك گەیشتنی لەشکری ویلایەتەکان، بەو شێوەیە بەردەستی پەریساتیسدا سەپێندرا، ئەو نەیدەتوانی نە لە باکور، نە لە باشوور، نە لە رۆژهەڵات بەرەو (گی) بڕوات، تەنیا دەیتوانی لە رۆژئاواوە بڕوات و سوکدیانۆس لەنێو ببات، تا ئەو کاتەش کە جەنگی راستەوخۆی لە دژی سۆکدیانۆس نەکردبایە، ئەو لەنێو نەدەچوو، بۆیە ناچاربوو لەو شوێنە تەخت و هەمواردا بجەنگێت.

بۆ رێگرتن لە گالیسکەکان هێندەی توانای هەبوو کەرەستەی بەرگری دابین کرد، یەك لەو ئامرازانەی بۆ بەرگری هێنا بووی برێتی بوو لە شتێك کە ئێستە بە ددانی ئەژدیها دەناسرێت، برێتییە لە کەند و قۆڵتە باریك و بەرزەکان، تەنانەت تانك ناتوانێت لێی تێپەڕ ببێت. لە کۆندا بۆ رێگرتن لە تێپەڕینی گالیسکە جەنگییەکان هەندێ تیریان بە شێوەی ستوونی لە زەوی دەچەقاند، بە زنجیر یاخۆ پەت پێکیان دەبەستن، ئەگەر کاتیان هەبووایە، هەندێ چاڵی پان و درێژیان هەڵدەکەند و سەریان دادەپۆشین، بەڵام سادە و کاریگەرترین چەك بۆ رێگرتن لە گالیسکەکان، هەمان چەقاندنی تیرەکان بوو، تەنانەت ئەگەر بە پەت و زنجیریش لە یەکدیی نەبەسترابووانەوە، دەبوونە رێگر بۆ گالیسکە جەنگییەکان و هەندێکیان تێك دەشکاندن.

ئەو لەشکرەی پەریساتیس بۆ جەنگ ئامادەی کردبوو، بە هێزبوو، تەنانەت ئەگەر مێژوونووسە کۆنەکان نەشیان نووسی بایە ئەو بە لەشکری بە هێزەوە هاتووە بۆ ئەو جەنگە، دەمان زانی لەشکرەکەی بەهێز بووە، چوونکە ئەو لەشکرە لە هێزی هەموو ویلایەتەکان پێکهات بوو. هەموو ئەو کەسانەی ناوی پارتیزانیان بیستووە، کاتێك دەگوترێت لەشکرێك لەو سەربازانە پێکهاتووە، وا بیردەکەنەوە کە لەشکرێکی کەم بایەخە، چوونکە سەربازی

---

(٦) بە تەواوی دڵنیا نین ئەوەی لە مێژوودا بە ئاپادیس ناوی هاتووە، هەمان نەجەف ئاباد و دەستگردی ئێستەیە، بەڵام چونکە نووسیویانە ئاپادیس شوێنێك بوو لە رۆژئاوای ئیسفەهان و تەخت بوو، گومان دەکەین کە نەجەف ئاباد و دەستگرد بووبێت. "زەبیحوڵڵا"

پارتیزان وەك سەربازی فەرمی لێهاتوو نییە، بۆیە زۆر بە کورتی باسی سەربازانی پەریساتیس دەکەین.

بە وتەی مێژوونووسە کۆنەکان، دوای داریوش لە ئێران لە تەمەنی (١٥-١٦ تا ٢٥)ساڵی گەنجان دەبوونە سەرباز بێ ئەوەی دەست لە ژیانی ئاساییان هەڵبگرن، ئەگەر لەو دە ساڵەدا جەنگ ڕوویدابایە، هەندێك لەو سەربازانەیان دەبرد بۆ جەنگ، بە پێچەوانەوە سەرگەرمی ژیانی ئاسایی خۆیان دەبوون، دوای (٢٦) ساڵ لە فێربوونی هونەرە جەنگییەکان دەبەخشران و بە سەربازی یەدەگ دەژمێردران، لە کاتی ڕوودانی جەنگ و بەپێی یاسایەکی دیاریکراو، بە رەچاوکردنی تەمەن بۆ جەنگ دەبردران.

بەم شێوەیە لەو سەردەمەدا هەموو پیاوان لە هونەرە جەنگییەکانیان دەزانی، سەربازێکی پارتیزان و سەربازێکی فەرمی وەك یەك دەیانتوانی چەك بەکار ببەن، هەروەها جەستەشیان بە هۆی دە ساڵ ڕاهێنان لە هونەرە جەنگییەکان، پتەو و بەهێز دەبوو، بەرگەی رێپێوان و جەنگی دەگرت، بۆیە هەرچەندە سەربازانی پەریساتیس پارتیزان بوون، بەڵام بە وتەی دەی نۆن بایەخی جەنگیان لە سەربازانی فەرمی کەمتر نەبوو، لەشکری پەریساتیس لەشکرێکی کاریگەر بوو.

سەبارەت بە ژمارەی سەربازانی پەریساتیس، هەروەها سەربازانی سوکدیانۆس زانیاریی تەواومان نییە، کەتزیاس نووسیویەتی پەریساتیس پێنج سەد هەزار سەربازی هەبووە، ژمارەی سەربازەکانی سوکدیانۆسی بە سێ سەد هەزار دیارکردووە، کە لە هەردووکیان زێدەڕۆیی هەبووە، تەنیا ئەوە دەزانین کە ژمارەی سەربازەکانی پەریساتیس زۆر بووە، جگە لە پیادە، لەشکری سوارەشی هەبووە.

لە سەرەتای مانگی دووەمی هاوینی ساڵی (٤٢٣ پ. ز) پەریساتیس لە تەنیشت ڕووباری (زایەندە ڕوود) ئۆردووگەی سەربازی خۆی دانا[٧]. هەوا گەرم بوو، بەڵام سەربازەکانی بە هۆی نێزیکیان لە ڕووبار کەمتر کاریگەریی گەرمایان بە سەرەوە بوو.

---

(٧) زایەندە رووود لە کۆندا ناوی زۆری هەبوون کە یەکیان (زەهاك) بوو، کە وشەیەکی فارسی کۆنە، واتای زۆری هەن، یەکێك لە واتاکان، واتە ئاوی رەوان. ئەو ڕووبارە بە ناوچەیەکدا دەڕوات کە رێگەی نەتەوە باکور و باشوورییەکانە، بۆیە کۆمەڵێك جەنگی تێدا روویداوە. لە تەنیشت ئەو ڕووبارە کوروش بەسەر ئاستیاگ پاشای ماددا سەرکەوت، پاشایەتی مادی لەناو برد، کوروشی بچووك هەر لە ئەوێ لەگەڵ براکەی واتە ئەردەشێری دووەم جەنگا و دیلی کرد،

پەریساتیس دوو رۆژ لە تەنیشت ڕووبارەکە مایەوە، چوونکە لەشکری سوکدیانۆس هیچ جووڵەیان نەکرد، بۆ بڕیاریدا خۆی هێرش بکات.

پەریساتیس دەیزانی سەربازە پیادەکان توانای ڕێگریان لە گالیسکەکان نییە، تەنیا ئەسپ سوارەکان دەتوانن پێش بە گالیسکەکان بگرن، بۆیە نێزەی درێژ و بەردەقانی درایە سوارەکان، سوارەکان هەر یەکەیان تیێری ئەسپەکانیان پڕ کرد لە بەرد و کەرەستەی پێویستی دیکە.

فەرمان بە سوارەکان درابوو تا لە ڕێگەی دوورەوە بە بەردی بەردەقانییەکان گالیسکەکان بوەستێنن، لە ڕێگەی نێزیکیش بە نێزەکانیان و بە ئامرازی ڕاگرتنی گالیسکەکان، کە ئەویش برێتی بوو لە بریندارکردن یاخۆ کوشتنی ئەسپەکان، بۆ ئەوەی بکارن گالیسکەکان ڕابگرن. پێش دەستپێکی جەنگ پەریساتیس بە ئەفسەرە سوارەکانی خۆی وتبوو تا بە سەربازەکانیان بڵێن، وەستاندنی گالیسکەکان تەنیا کاری سوارەکان دەبێت، کارەکانی دیکە بۆ پیادەکانە.

پەریساتیس بە ئەفسەرەکانی وت: دڵنیام سوکدیانۆس گالیسکەکانی لە دژی ئێمە دەخاتەکار، ئەگەر بتوانین پێشیان پێ بگرین، شانسی سەرکەوتنمان دەبێت، بە پێچەوانەوە شکست دەخۆین، بە سوارەکان بڵێن ئەوانەی بیر لە گیانیان بکەنەوە، ناتوانن سەرکەون، تەنیا ڕێگە بۆ سەرکەوتن لە جەنگ، قوربانیدانە. لە جەنگدا تەنیا بە خۆئازا دەرخستن سەرکەوتن نایەتەدی، ئەگەر لە نێوان ئێوە کەسێ هەبێت بتوانێت جەنگ بەڕێوە ببات، من دەست لە فەرماندەیی هەڵدەگرم و وەك سەربازێك پێش بە گالیسکەکان دەگرم تا بیسەلمێنم، من کە داواکاری فیداکاریم لە سەربازەکان، خۆم بیر لە گیانم ناکەمەوە.

پەریساتیس پێشبینی دەکرد سوکدیانۆس لە گی دێتەدەر، لەوێ نامێنێتەوە تا گەمارۆ بدرێت، هەر بە هەمان شێوەش بوو، سوکدیانۆس لە شار دەرچوو، لە ئاپادیس گەیشتە پەریساتیس. لە رابردوودا کاتێك دوو لەشکری دوژمن پاش نیوەڕۆ دەگەیشتنە یەك خۆیان لە شەڕ دەپاراست، چوونکە دەیانزانی بە زوویی رۆژئاوا دەبێت. ئەو دوو لەشکرە دژیەکەش ئێوارە پێك گەیشتن، ئۆردووگەی سەربازی هەردوولا لە تەنیشت زایەندە ڕوود دامەزران، ئاوی ڕووبار لە لای پەریساتیس بۆ لای سوکدیانۆس دەڕۆیشت.

---

دواتر ئازادی کرد، تەیموری لەنگیش لە سەدەکانی ئیسلامیدا لە تەنیشت ئەو ڕووبارەوە گەمارۆی ئیسفەهانیدا، دواجار داگیری کرد، ژمارەی جەنگە بچووکەکانیش لە تەنیشت ئەو ڕووبارەوە زۆرن. "زەبیحوڵڵا".

له رابردوودا باو بوو ئەو لەشکرەی دەکەوتە سەرەوە هەوڵی دەدا ڕێگەی ئاو بگۆڕێت تا بۆ ئۆردووگەی ئەویدیی نەڕوات، بەڵام هەرچەندە دووەمین مانگی هاوین بوو، ئاو کەم بوو، بەڵام هێشتا زایەندە ڕوود هێندەی ئاو تێدابوو، کە نەدەتوانرا ڕێبازەکەی بگۆڕدرێت.

شیلو و قوڕاوکردنی ئاو بۆ ئازاردانی دوژمن، کارێکی دیکەی باوی ڕابردوو بوو لەلایەن ئەو لەشکرەی دەکەوتە سەرووی ئاو، بەڵام پەریساتیس ئەو کارەی نەکرد، چوونکە ئێرانییەکان شێلوکردنی ئەو ئاوانەیان بە گوناهی مەزن دادەنا، کە لەبەریان دەڕۆیشت، تەنانەت ئەگەر بۆ ئازار گەیاندن بە دومنیش بووایە، هەرچەندە دوژمن لێیانەوە نێزیك بوو، بەڵام پەریساتیس فەرمانی بە هەموو سەربازەکانی کرد، جگە لەوانەی ئەرکی پاسەوانیان لە ئەستۆیە، پشوو بدەن.

سوکدیانۆس پێش ئەوەی لە گێ بجوولێت، ئۆرمیشەی بانگهێشت کرد و وتی: دەزانم هێشتا ماوەی شەست ڕۆژ کە داوات کرد بوو تەواو نەبووە، بەڵام ئەگەر توانیبات زووتر و بەپێی گونجان ئەمڕۆ یاخۆ سبەی ئەو کارە بکەی باشتر بوو.

ئۆرمیشە وتی: من لە توانام نییە ئەمڕۆ یاخۆ سبەی ئەو بکوژم، بەڵام بەپێی بەڵێنەکەم لەگەڵ تەواوبوونی شەست ڕۆژەکە ئەو ژنە دەکوژرێت، پێویستە پاشا متمانەی تەواوی لەو بارەوە هەبێت.

سوکدیانۆس وتی: دەزانی من بۆچی خوازیاری مەرگی ئەو ژنەم؟.

ئۆرمیشە وتی: ئەی پاشا مادام ئەو دوژمنی تۆیە، پێویستە بکوژرێت.

سوکدیانۆس: وتی گومانم لەوە نییە، کە ئەو دوژمنی منە، بەڵام من بۆیە خوازیاری مەرگی ئەوم، چوونکە نامەوێت لەگەڵ ژنێك بجەنگم.

ئۆرمیشە ئەگەر وێرابووایە ئەوەی بیری لێ دەکاتەوە، بیڵێت، دەیوت: پەریساتیس ئافرەتێکە کە لە زۆر پیاوان پایەی بەرزترە، بەڵام چوونکە نەیدەتوانی بیری خۆی بڵێت بێ دەنگ مایەوە، سوکدیانۆس وتی: ئەو ژنە ئێستە دەیەوێت جەنگی من بکات، من ناتوانم لەگەڵیدا بجەنگم، چوونکە ئەگەر جەنگ نەکەم ئەو دێت و گیی داگیر دەکات، ئەگەر بجەنگم و شکستی بدەم، ژنێکم شکست داوە. ئەگەر پێش ئەوەی جەنگ دەست پێبکات ئەو بکوژرابووایە، ئەوە چیدی نەدەوترا لەگەڵ ژنێك جەنگاوی.

لەگەڵ بەرەبەیانی رۆژی دواتر هەردوولا بۆ جەنگ ئامادە بوون، ئەو ناوچەیەی دەبووایە لێی بجەنگن کەوتبووە باکوری زایەندە ڕوود. پەریساتیس وەك شێوەی تەواوی سەردارە کۆنەکان، لەشکرەکەی کردە چوار بەش، بەشێکی وەك یەدەك دانا، سوارەکانی لە دڵی گۆڕەپانی جەنگ جێگیرکرد، بۆ ئەوەی ئەگەر گالیسکەکان هێرشیان کرد، بتوانن بە خێرایی خۆیان بگەیەننە ئەو بەشەی هێرشی بۆ دەکرێت، لە پشت سوارەکان هەندێ پیادەی دانا، لە لای چەپ و لای ڕاستیش پیادەکانی لێبوون.

بە هەمان شێوە کە پەریساتیس پێشبینی کردبوو، گالیسکەکانی سوکدیانۆس کەوتنە جووڵە و هێرشیان کردە لای ڕاستی لەشکری ئەو، ئەویش بە پەلە سوارەکانی نارده لای ڕاست تا پێش بە گالیسکەکان بگرن. گالیسکەکان هێندە خێرا دەڕۆیشتن کە وەك بەو تیرانە دەچوون، کە لە کەوان دەرچوون. لە هەر گالیسکەیەکدا، جگە لە لێخوڕ چەند کەسێکی تیرهاوێژی لێبوو، کە لەگەڵ رۆیشتنی گالیسکەکاندا، تیریان دەگرتە سەربازەکانی پەریساتیس.

بێ پێشوازیکردن لە مەرگ نەدەتوانرا رێگە لە گالیسکەکان بگیرێت، ئەو سوارانەی دەبووایە گالیسکەکان بوەستێنن لە دوورەوە بە بەردەقانی بەردیان دەگرتە ئەسپ و سەرنشینەکانی گالیسکەکان، خێرایی ئەسپ سوارەکان هێندە بوو، کە توانیان پێش ئەوەی گالیسکەکان بگەنە لای پیادەکان، خۆیان بکەنە دیوارێك لە نێوان ئەوان و پیادەکان. دوای ئەوە سوارەکان پتر سوودیان لە نێزە درێژەکان بینی و بەردەقانی زۆر کەمتر کاری پێکرا.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی سوارەکان بە خێرایی زۆر بەرەو گالیسکەکان دەڕۆیشتن و نێزە درێژەکانیان ڕاست ڕاگرتبوو، قایشی کۆتایی نێزەکان لە کۆتایی قۆڵیان بەسترابوو تا لەگەڵ زەربە لێدانی توونددا، نێزە لە دەستیان دەرنەچێت.

ئەگەر سوارەکان نەبووبانە ئامانجی تیری سەرنشینەکانی گالیسکەکان یاخۆ داسی گالیسکەکان بەر ئەسپی ئەوان نەکەوتبانە و سوارەکەیان نەخستبایە، ئەگەر سوارەکان توانیبایان نێزە درێژەکانیان لە ملی ئەسپی گالیسکەکان رۆبکەن، ئەسپەکە دەکەوت و قورسی لاشەی ئەو ئەسپە خێرایی گالیسکەکەی کەم دەکردەوە و دەیوەستاند، ئەوکات دەرفەت بۆ سوارەکانی دیکە دەبوو تا هێرش بکەنە سەر گالیسکەکە و ئەسپەکانی بکوژن.

مەترسی گالیسکە جەنگییەکان بۆ سوار و پیادەکان، بە تایبەتی بۆ پیادەکان، لە مەترسی تانکەکانی ئێستە بۆ سەر سەربازانی پیادە پتر بوو، ئێستە پیادەکان دەتوانن بە تۆپی دژە

تانك ڕێگری لە تانکەکان بکەن، بەڵام لە ڕابردوودا سەربازە بەرگریکارەکان جگە لەو شوێنانەی ئامراز و بەربەستی ڕێگر بۆ گالیسکەکان هەبوون، تەنیا بە گیان بەخشین نەبووایە نەیاندەتوانی پێش بە گالیسکەکان بگرن، بەڵام هەموو ئەو شوێنانەی پەریساتیس بەربەستی لێ چێ کردبوون بێ سوود بوون، چوونکە سوکدیانۆس لەو شوێنە لەگەڵیدا نەجەنگا.

پەریساتیس ماوەی دوو ڕۆژان لە تەنیشت زایەندە ڕوود مایەوە و بەربەست و ڕێگری لە هەمبەر گالیسکەکان چێکرد، بەڵام بە هۆی نەهاتنی سوکدیانۆس، پەریساتیس خۆی کەوتەڕێ و لە شوێنێك جەنگ ڕوویدا، کە هیچ بەربەست و ڕێگری بۆ گالیسکەکان لێ نەبوو، هەروەها بوار نەبوو تا لە پێش لای ڕاستی لەشکرەکەی بەربەست چێ بکەن، گریمان بە خێرایی زۆر توانیبایان ئەوکارە بکەن، لەوانەبوو گالیسکەکانی سوکدیانۆس هێرش بکەنە لای چەپ یاخۆ دڵی لەشکری پەریساتیس، ئەوکات ناچار دەبوون لەو شوێنانەش بەربەستی دژە گالیسکە چێ بکەن.

لە رابردوودا گالیسکەکان بۆ ئەوەی دوژمن نەکەوێتە دوویان و گەمارۆیان نەدات، بە تەنیا نەدەجووڵان و پیادە لە دواوەیانەوە دەڕۆیشتن، بۆیە کاتێك گالیسکەکانی سوکدیانۆس هێرشیان بۆ لای ڕاست کرد، پیادەکانیش لە دوایانەوە دەهاتن. پیادەکان پڕچەك بوون بەو چەکانەی ئەوکات هەبوو، جلوبەرگی کورتیان لەبەر بوو، چیدی بەرگە درێژەکەی سەردەمی کوروش و داریوش لەبەریان نەدەبینرا، ماوەی جەنگە ئێرانی و یۆنانییەکان هێندە درێژ بوو، کە جلوبەرگی کورتی یۆنانی لە لەشکری هەخامەنشییدا چەسپاند و ئەزموون دەری خست سەربازان بە بەرگی کورت دەتوانن کارا و خێراتر بن، سەربازە ئێرانییەکان تەنیا لە زستاندا باڵاپۆشێکی درێژ لە پشمیان لە بەردەکرد، کە لە پاڵتۆی ئێستە دەچوو، ئەو باڵاپۆشە پشمینانەی لە ئێران دەست دەکەوتن لە باشترینی جۆرەکان بوون.

سەربازە پیادەکانی سوکدیانۆس شمشێری ڕاست و درێژی دوو دەم (لە فارسی بە دەرەك ناوی دێت) تەوری جەنگییان (بە تەبەرزین ناو دەبرا) پێبوو، قەڵغانی دارینی گەورە کە هەندێ کات هەڵیان دەگرت، هەندێ کاتی نا، کە باش بوو بۆ بەرگری لە بەرانبەر تیر و ئەو بەردانەی لە مەنجەنیقەکانی ناو قەڵاکانەوە هەڵدەدران، بەڵام لە گۆڕەپانی جەنگدا دەبۆوە مایەی ئازاری سەربازان و قەبارەی قەڵغانەکەش بەشێك لە شوێنی کاری سەربازەکەی دادەپۆشی، هەندێ کات سەربازی دوژمن لە پشت قەڵغانەکەوە نەدەبینرا، بۆیە لەو شوێنانەی هەڵگرتنی قەڵغان

پێویست نەبووایە، لە شوێنی دانانی پێداویستییەکانی لەشکر دادەنران، بێ قەڵغان دەهاتنە جەنگ.

چەکێکی دیکە سەربازە پیادەکانی لەشکری هەخامەنشیی تیر و کەوان بوو، بەڵام ئەزموون دەری خست بوو، کە ئەو سەربازەی شمشێر و تەور و قەڵغانی پێبوو، ئەگەر تیر و کەوانی هەڵگرتبووایە، بۆی دەبوو بە باریقورسی و نەیدەتوانی سوود لە تیر و کەوانەکە وەربگرێت، بۆیە لە سەردەمی ئەردەشێری دەستدرێژدا ریزی کەوانچییەکان جیاکرایەوە لە ریزی ئەوانی دیکە، ئەوان سەرەڕای تیر و کەوان، نێزە و شمشێریان هەڵدەگرت و لەکاتی شەڕی تاك بە تاك سوودیان لێ دەبینی.

جیاوازیی لە نێوان چەك و جلوبەرگی سەربازانی پەریساتیس و سوکدیانۆس نەبوو، تەنیا جلوبەرگی ئەوان درێژ بوو، چوونکە هەندێ لە نەتەوەکانی ئێران بەرگی درێژیان دەکردەبەر، بە وتەی کەتزیاس جلوبەرگی جووتیارانی ئێرانی کورت بوون.

هاوکات لەگەڵ جووڵەی پیادەکانی سوکدیانۆس لە پشت گالیسکەکانەوە، پەریساتیسیش پیادەکانی خۆی لە دڵ و لای چەپی گۆڕەپانی جەنگ جووڵاند، دوای ماوەیەکی کەم هەردوو لەشکر گەیشتنە یەك و جەنگ لەو دوو شوێنە دەستی پێکرد، بەڵام لە لای ڕاست سوارەکان ببوونە بەربەست لە نێوان گالیسکەکانی سوکدیانۆس و پیادەکانی پەریساتیس و نەیاندەهێشت بگەنە یەك.

پیادەکانی پەریساتیس هەموویان باوەڕیان وابوو، کە لە پێناو ئاهورامەزدا دەجەنگن، چوونکە مووغەکان وایان باوەڕ پێهێنا بوون، کە جەنگ لەگەڵ سوکدیانۆس وەك جەنگە لە پێناوی خودا، چوونکە ئەو دوژمنی مەزدا و مەزداپەرەستەکانە، بەڵام سەربازەکانی سوکدیانۆس بێ پاڵپشتێکی دەروونی دەجەنگان، دڵیان بە فەرماندەکەیان خۆش نەبوو، دەیانزانی ئەو براکانی خۆی کوشتووە و کوێر کردووە، وێڕای ئەوەش وەك سەرباز جەنگیان بە ئەرك دەزانی، بەردەوام بوون لە شمشێر و تەور وەشاندن، بەردەوام دەنگی ئەوانەی شمشێر و تیریان بەردەکەوت دەهات و ئەوانەی زەربەی توونديان بەردەکەوت، نەیاندەتوانی رێ لە هاواری خۆیان بگرن.

پەریساتیس بە سواری ئەسپ سەری لە هەموو شوێنێك دەدا، بە ئامادەبوونی خۆی سەربازەکانی هان دەدا و لە هیچ شوێنێك پیادەکانی سوکدیانۆس نەیاندەتوانی پیادەکانی ئەو

بشکێنن یاخۆ درز بخەنە ریزەکانیان، بەڵام لە لای ڕاست هێرشی گالیسکەکان دۆخێکی مەترسیداری بۆ ئەوان چێ کردبوو، سوارەکانی لە بەرانبەر گالیسکەکان هەڵدەوەرین، هەندێکیان لەژێر سمی ئەسپەکان و تایەی گالیسکەکان پان دەبوونەوە.

پەریساتیس سەرەنجیدا ئەگەر گالیسکەکان بەو شێوەیە بەردەوام بن و سوارەکان بکوژن، لای ڕاستی لەنێو دەچێت، پاش ماوەیەك گالیسکەکان لەو ناوچە تەختانییەدا کە هیچ بەربەستی لێ نەبوو، دڵ و لای چەپی لەشکرەکەشی لەنێو دەبەن، بۆیە بۆ ڕاگرتنی گالیسکەکان پەنای بۆ فێڵێك برد و بە هەندێ لە سوارەکانی وت بچن، لە بەرانبەر گالیسکەکاندا هاوار بکەن: "سوکدیانۆس کوژرا و چیدی بەرگری ئێوە سوودی نییە."

سوارەکان ڕۆیشتن و بەرانبەر گالیسکەکان بێ پسانەوە هاواریان دەکرد: "سوکدیانۆس کوژرا و چیدیی بەرگری ئێوە سوودی نییە"، هێندە ئەو ڕستەیەیان دووپات دەکردەوە، کە گالیسکەکان ساردبوونەوە، چوونکە پەریساتیس سوودی لەو فێڵە بینی، کە لە لای ڕاستی خۆی کردی، هەمان فێڵی لە لای چەپیش کە دەیزانی سوکدیانۆسی لێ نییە بەکارهێنا، لەوێش پیادەکان سست بوون.

کاتێك پەریساتیس بۆی دەرکەوت فێڵەکەی لە لای ڕاستیش کاریگەری هەبوو، بڕیاریدا تاقی کردنەوەیەکی دیکە بکات، بە هۆی پیاوەکانی خۆی لە بەرانبەر پیادەکانی لای ڕاستی سوکدیانۆس وتی: پاشا و فەرماندەی ئێوە کوژراوە و سەری لە لەشی کراوەتەوە، لەمەودوا یەکەکانتان هەڵدەوەشێنەوە، ئێوە چیدیی مووچە و پیشەتان نابێت، بەڵام ئەگەر بێنە لای ئەخۆس نەتەنیا پیشە و مووچەتان دەبێت، بگرە بەخشیشیش وەردەگرن.

وەك مێژوونووسەکان نووسیویانە ئەو فێڵەش کاریگەری خۆی هەبوو، لای ڕاستی سوکدیانۆس چوونە پاڵ لای چەپی پەریساتیس، ئەم ڕووداوە بۆ ئێمە جێگەی سەرسووڕمانە و دەپرسین بۆ لای ڕاستی سوکدیانۆس ئەفسەری نەبوو، چۆن ئەفسەرەکانیان ڕەزامەندییان نواند، بۆ ئەوەی سەربازەکانیان دەست لە جەنگ هەڵ بگرن و ببنە بەشێك لە سوپای پەریساتیس؟، بەڵام وەك مێژوونووسان دەڵێن ئەفسەر و سەربازەکانی سوکدیانۆس بە هۆی ئەو تاوانەی لە کوشتن و کوێرکردنی براکانی و مووغی گەورە کردبووی، نەفرەتیان لێدەکرد و قینیان لێ بوو.

## داریوشی دووەم (ئەخۆس) و پرۆشات

دوای ئەوەی سوکدیانۆس گەورەی مووغەکانی کوشت، لە تەواوی ئێران هەر کەسێك ئەو هەواڵەی دەبیست، پێشبینی دەکرد، کە ئەو دەکوژرێتەوە، بۆیە کاتێك ئەفسەر و سەربازەکانی هەواڵی کوژرانی ئەویان بیست بە ڕووداوێکی ئاساییان دانا، ئەوان چاوەڕوانی ئەو ڕووداوە بوون، بۆیە بڕوایان کرد کە سوکدیانۆس کوژراوە، چوونکە دوای کوژرانی سوکدیانۆس، ئەخۆسی برای دەبوو بە پاشا، ئەو مەترسییە بۆ سەرباز و ئەفسەرە لێهاتووەکان هەبوو، کە لەلایەن ئەخۆس دەربکرێن، بۆیە بە ڕەچاوکردنی ئەو دۆخە بیریان دەکردەوە کە چیدیی سوکدیانۆس نەماوە، بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدا دەبینیەن کە بچنە پاڵ ئەخۆس، هەر بۆیە لای ڕاستی لەشکرەکەی سوکدیانۆس بەم شێوەیە کەسی لێ نەما.

پەریساتیس فەرمانی کرد تەواوی ئەو سەربازانەی هاتوونەتە پاڵ لەشکرەکەی، بچنە پشت گۆڕەپانی جەنگ، هێشتا متمانەی نەبوو بتوانێت ئەوان لە دژی سوکدیانۆس بەکار بێنێت، بە لای چەپی خۆی هێرشی کردە سەر سوکدیانۆس. سوارەکانی پەریساتیس دوای ساردبوونەوەی گالیسکەکان، بە فەرمانی فەرماندەکەیان گالیسکەکانیان بەجێ هێشت و هێرشیان کردە سەر پیادەکانی لای چەپی سوکدیانۆس.

دواتر پەریساتیس بۆ ئەوەی بتوانێت گەمارۆی سوکدیانۆس بدات، هێزی یەدەگی خۆشی خستە نیچو جەنگ، سوار و پیادەکانی لە پشت سوکدیانۆس، واتە لە ڕۆژهەڵات پێك گەیشتن.

کاتی پێك گەیشتنیان سوکدیانۆس لای چەپ و ڕاستی نەما بوو، لای ڕاست خۆیان بە دەستەوە دابوو، لای چەپیش لێك پرژابوون، تەنیا دڵی لەشکرەکەی مابۆوە، بەڵام گالیسکە جەنگییەکان دوای ئەوەی دەستیان لە شەڕ کێشایەوە و پێوەندییان بە سوکدیانۆسەوە نەما، گومانیان کرد کە کوژراوە، نەیاندەزانی چی بکەن.

لە پێش گالیسکەکان، واتە لە ئاراستەی ڕۆژئاوا کەس نەبوو، تا هێرشی بکەنەسەر، چوونکە پەریساتیس تەواوی هێزی خۆی لە دژی سوکدیانۆس بەکار خست بوو. ئەوان بۆ

ئەوەی هێرش بکەن، دەبووایە بگەڕێنەوە، هێرش بکەنەسەر پیادەکان، بەڵام پەریساتیس بە هۆی نێردراوەکانی داوای لێ کردن بچنە پاڵ ئەخۆس، لە لایەکی دیکە وێستانی جەنگ ئامادەیی و تینوویەتی ئەوانی بۆ جەنگ نەهێشت، لە هەمووشیان پتر بێ خاوەن بوون، ورەی ئەوانی تێك شکاند بوو.

پەریساتیس بە تەواوی هێزەکەیەوە هێرشی کردەسەر دڵی لەشکری دوژمن و لە هەشت لاوە هێرشی برد تا ریزی سەربازەکان تێك بشکێنێت و بەرگریان نەهێڵێت. بەهێزتربوونی هێزی پەریساتیس بە رادەیەك بوو، کە دڵی لەشکری سوکدیانۆس نەیتوانی بەرگری بکات و تێك شکا. سوکدیانۆس گەمارۆ درا، ویستی لەگەڵ هەندێ لە سەربازە تایبەتەکانی گەمارۆکە بشکێنێت، سەرکەوتوو نەبوو و دەستگیر کرا، دوای دەستگیرکردنی، جەنگ بە تەواوی کۆتایی هات.

لەو کاتەدا هێشتا گالیسکە جەنگییەکان دوودڵ بوون، پەریساتیس دەترسا ئەوان هێرش بکەنەوە و بۆی ببنە مایەی ئاریشە، بۆیە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت سوکدیانۆس مردووە فەرمانی کرد تا قوڕگی ببڕن، بێ ئەوەی سەری لە جەستەی بکەنەوە، ئەوکات لەسەر تەختی رەوان پاڵی پێ بدەن بە شتێك تا نەکەوێت، هەمووان بتوانن ڕووخساری ببینن، دواتر بە بەرانبەر گالیسکە جەنگییەکاندا تێپەڕیان کرد، ئەوانیش بە بینینی تەرمی ئەو، بە تەواوەتی دەستیان لە جەنگ هەڵگرت و خۆیان بە دەستەوەدا.

ئەخۆس سەرزەنشتی خێزانەکەی کرد، کە بۆچی لە دوای دەستگیرکردنی، یەکسەر سوکدیانۆسی کوشت، پەریساتیسیش وتی دوژمنێکی شکستخواردووی ئاوا، لەوانەیە دوای چەند رۆژ یاخۆ چەند مانگ دیسان یاخی ببێتەوە، منیش ناچار بووم ئەو کارە بکەم، تا گالیسکەکانی بزانن کە ئەو کوژراوە و نەماوە، بۆ ئەوەی دەست لە جەنگ هەڵبگرن. بەم شێوەیە سوکدیانۆس کوژرا و ئەخۆس سەرکەوت.

جەنگی ئەو رۆژە هێندە پەریساتیس و سەربازەکانی ماندوو کرد، کە ئەو رۆژە نەیانتوانی بەرەو ئیسفەهان (گی) بچن و لە تەنیشتی زایەندە ڕوود مانەوە. شەوی دوای جەنگێکی گەورە، تەنانەت بۆ لەشکری سەرکەوتووش پڕ لە خەم بوو، چوونکە ئەفسەر و سەربازەکان دەیانزانی لە گۆڕەپانی جەنگ هەزاران لاشە بەجێ ماوە، کە لەو شەوەدا دەکەونە بەر هێرشی ئاژەڵە مردووخۆرەکان، بە تایبەتی کەمتیار. زۆر بوون ئەو بریندارانەی

لەنێو لاشەی مردووەکان دەمانەوە، بە هۆی سەختی برینەکانیان توانای هاوارکردنیان نەبوو، ئەگەر هاواریشیان بکردایە، سەربازەکان نەیاندەبیست، چوونکە لێیانەوە دوور بوون.

کوروشی گەورە دوای ئەوەی یەك رۆژ جەنگی دەکرد، نەدەخەوت تا هەموو بریندارەکانیان کۆدەکردەوە، بەڵام پەریساتیس هەرچەندە فەرماندەیەکی دیار بوو، بەڵام خەسڵەتە جوامێرانەکانی کوروشی نەبوو، تا سەربازە ماندووەکانی ناچار بکات کەمێکی دیکە بەرگە بگرن و بریندارەکان لە گۆڕەپانی جەنگ دەربێنن. کاتێك فەرماندەی لەشکر بیر لە بریندارەکان نەکاتەوە، ئەی چ کەسێك بیریان لێ بکاتەوە.

لە هەر لەشکرێك بەشێکی تایبەت بە تەندروستی هەبوو، کە بەرپرس بوو لەوەی هێندەی دەیتوانی لە کاتی جەنگدا بریندارەکان تیمار بکات، ئەگەر نەکرا لە کۆتایی جەنگ ئەو کارە ئەنجام بدەن، بەڵام لەشکری پەریساتیس پارتیزان بوون و ئەو دامەزراوەیان نەبوو، سەربازەکانیش ماندوو بوون، دوای ئەوەی شەو هات هەوڵیان نەدا بریندارەکان لە گۆڕەپانی جەنگ دەربێنن، بۆیە ئاساییە کە تا بەیانی بەشێك لە بریندارەکان بە هۆی خوێن بەربوونی زۆر مردن.

پەریساتیس نەیدەتوانی لەگەڵ هاوسەرەکەی بچێت بۆ ئیسفەهان، چوونکە دەبووایە لەشکرەکەی رێك بخاتەوە و بریندار و کوژراوەکانیش کۆبکاتەوە، هەروەها هاتنی دوو بەشی گەورە لە لەشکری سوکدیانۆس بۆ نێو لەشکرەکەی، کۆکردنەوەی خۆراك و پێداویستیی پتری دەویست، دوای بەرەبەیان یەکە پڕاگەندەکانی لەشکری سوکدیانۆس دەهاتن و خۆیان بەدەستەوە دەدا.

پەریساتیس ماوەی پێنج رۆژ لە ئاپادیس مایەوە، دواتر بەرەو ئیسفەهان رۆیشت، هەروەها خەڵاتی بەو سەربازە پیادانەی سوکدیانۆسی بەخشی کە پێشنیازەکەیان پەسەند کرد و خۆیان بە دەستەوەدا، بەڵام گالیسکە جەنگییەکانی خەڵات نەکرد، چوونکە خۆیان بەدەستەوە نەدا تا تەرمی سوکدیانۆسیان نەبینی.

کەتزیاس کە ماوەیەکی زۆر لە ئێران بووە، بە رواڵەت باشتر شارەزای مێژووی هەخامەنشییەکان بووە و نووسیویەتی: چوونکە دایکی ئەخۆس کەنیزەکێکی بابلی بوو، دوای سەرکەوتنی بەسەر سوکدیانۆسی برای، ناوی خۆی بە داریوش گۆڕی، چوونکە پێش ئەو داریوشی دیکە هەبوو، بۆیە خۆی کرد بە داریوشی دووەم. ئەو ڕوونی نەکردووەتەوە چ

پێوەندییەك لە نێوان ناوی داریوش و بابلی بوونی دایکیدا هەیە، بۆچی کەسێك کە دایکی خەڵکی بابل بێت دەبێت ناوی داریوش بێت؟ وێڕای ئەوەی دایکی داریوشی یەکەم ئێرانی بوو، بەڵام ناوی داریوشیان لێنا. مێژوونووسەکانی دیکەیش هیچ ڕوونکردنەوەیان لەبارەی وتەی کەتزیاس نەداوە تا بزانین بۆچی ناوی کوڕی دایکێکی بابلی دەبێت داریوش بێت؟

هەروەها داریوشی سێیەم کە دوایین پاشای هەخامەنشیی بووە، کوڕی شازادە خانمێکی ئێرانییە، ناوی داریوشیشی بۆ دانراوە، لەوانەیە لە نووسینی کەتزیاس لەبارەی دایکی ئەخۆس شتێك نەنووسرا بێت، لە ئاکامدا پێوەندیی دایکی ئەخۆس لەنێو چووە.

ئەخۆس لە ئیسفەهان خۆی بە داریوشی دووەم ناساند و بووە پاشا، بەڵام چوونکە ڕێوڕەسمی تاج لەسەر نانی پاشاکان دوای تەواوبوونی کۆشکی پێرسپۆلیس لەو کۆشکە ئەنجام دەدرا، لە یەکەمین ڕۆژی بەهاری ساڵی (٤٢٢ پ. ز) و بە ئامادەبوونی سەرۆکەکانی پێنج ئاگرخانەکانی ئێران، داریوش لەو کۆشکە تاجی نایەسەر، هەر هەمان ڕۆژ لە نێوان سەرۆکی ئاگرخانەکاندا گەورەی مووغەکان دیاری کرا.

داریوشی دووەم کوڕی ئەردەشێری دەستدرێژ، بە ڕواڵەت بووە پاشای هەخامەنشیی، لە ڕاستیدا پەریساتیس پاشا بوو، پەریساتیس یەکەمین کەس بوو، کە یەکەیەکی سەربازی تایبەت بە ئافرەتانی پێکهێنا و بەرگی فەرمی پێدان.

لەوانەیە لە سەردەمانی پێش مێژوو، کە گێرشمەنی فەرەنسی دۆزیوییەتییەوە، تیایدا هەزار تا سێ هەزار ساڵ ژنان دەسەڵاتیی ئەو خاکە بوون، بەڵام دوای ئەوەی مێژوو نووسراوەتەوە، یەکەمین کەس کە یەکەیەکی سەربازی لە ژنان دامەزراندووە، پەریساتیس بوو، دوای ئەویش تا ڕووخانی هەخامەنشییەکان هیچ کەس دەرنەکەوت، کە سوپایەك لە ژنان چێ بکاتەوە.

پەریساتیس بە دڵنیاییەوە لە هەڵکەوتووەکانی سەردەمی خۆی بووە، زۆر جوان بووە، بەڵام وێڕای نقورچەگرتنە بەردەوامەکانی مێژوونووسە یۆنانییەکان لە ئێرانییەکان، لە سەرچاوە مێژووەییە یۆنانییەکاندا نەبینراوە بگوترێت ئەو ئافرەتە ڕەوشت و ئاکاری خراپ بووبێت. ئەو فەرمانده ئازایە ژنێکی پاك دامێن بوو، بەڵام ئامادەیی و توانای دەسەڵاتداری و چاکسازی نەبوو، خەسڵەتی وەك خەسڵەتەکانی کوروش و داریوشی یەکەم نەبوو، بۆیە هیچ سەرەنجی لەسەر چاکسازی ژیانی ئێرانییەکان نەبوو.

له کاتێکدا کوروش تەواوی ئەو سەرمایەی لە ئاستیاگ پاشای ماد و نابۆنید پاشای بابل و کرزۆس پاشای لیدی زەوت کردبوو، لە ئاوەدانکردنەوەی وڵات و باشترکردنی ژیانی خەڵکی خەرج دەکرد، بەڵام پەریساتیس وێڕای ئەو ئازایەتییەی هەیبوو، ژنێکی فێڵباز و پیلانگێڕ و زۆر بێ بەزەیی بوو، تەنیا بیری لای لەبەرکردنی جلوبەرگی جوان و گلاران بوو، دەیەویست سواری گالیسکەزێڕینەکان ببێت و شکۆی خۆی بگەیەنێتە خەڵکی دیکە.

دەی نۆن دەڵێت کاتێك پەریساتیس سواری ئەسپ دەبوو، سەربازە پاسەوانەکانی ئەو بە سواری ئەسپ بە دووی دەکەوتنەڕێ، هێندە بە شکۆ و جوان دەبوو، لەوە دەچوو یەك لە خوداوەندەکان بێت.

هەر جارێك کە لەسەر بابەتێك جیاوازیی دەکەوتە نێوان پەریساتیس و داریوشی هاوسەری، هەمووان دەیانزانی سەرکەوتن بۆ پەریساتیسە، داریوش ناچار بوو لەگەڵ رای ژنەکەی بێت. ئەو ژنە بێ گەڕانەوە بۆ پیاوەکەی بڕیاری کوشتنی ئەو کەسانەی دەردەکرد، کە پێی وابوو پێویستە بکوژرێن و لەبەر چاوی خۆی تاوانبارەکانیان دەکوشت ،کەس نەیبینی کە ئەو ژنە لە کوشتنی تاوانبارێك، کاریگەریی بکەوێتە سەر.

یەك لە براکانی داریوش کە برای باب و دایکی داریوش بوو، ناوی (ئارسیت) بوو، لە یەك دایك و باب بوون. ئارسیت لە رۆژی تاج لەسەرنانی براکەی لە پێرسپۆلیس سوێندی ئەمەکداری خوارد و بەڵێنیدا کە بەردەوام پاڵپشتی بکات.

داریوشی یەکەم ئەو برایەی کرد بە ساتراپ (فەرمانڕەوا) لە سوریا، ئەویش دوای ساڵێك فەرمانڕەوایی لە سوریا، تاجی پاشایەتیی کردەسەر و خۆی بە پاشا ناو برد و لەشکرێکی پێکهێنا کە بەشێك لە سەربازەکانی برێتی بوون لە کرێگرتە یۆنانییەکان.

پەریساتیس بە لەشکرێکەوە بەرەو سوریا کەوتەڕێ، بە وتەی دەی نۆن بە پارە تەواوی سەربازە یۆنانییەکانی کڕی، دواتر لە جەنگێکی گەورە لە نێزیك دیمەشق ئارسیتی شکستدا، دەستگیری کرد، بێ ئەوەی هەواڵ بۆ هاوسەرەکەی بنێرێت، کە مەبەستی بوو، ئەو بە کوشتن سزا بدات، سزای مردنی بەسەردا سەپاند، بە شێوە ئەشکەنجەیەك کوشتی کە مووی جەستەی مرۆڤ گرژ دەبێت، فەرمانیدا بە زیندوویی پێستی جەستەی داماڵن، ئەو کاتەی جەلاد سەرگەرمی ئەو کارە بوو، پەریساتیس خۆی بێ ئەوەی کاری تێ بکات چاوی لێ

دەکرد، هەرچەندە ئەو پیاوە دەپاڕایەوە تا بە یەك لێدان بیکوژن، تۆزقاڵێك کاریگەریی لە دڵی ئەو نەکرد.

ئەردەشێری دەستدرێژ توانی بەشێوەیەکی تەندروست کۆتایی بە جەنگە درێژەکانی هەخامەنشیی و یۆنان بهێنت و خۆی لە تێچووەکانی ئەو جەنگانە بپارێزت، بیٚ ئەوەی بۆ بەدەستهێنانی ئاشتی قوربانی گەورەی بدات یاخۆ خاکە زۆرەکانی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی دۆڕاندبێت، بەڵام پەریساتیسی هاوسەری داریوشی دووەم ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشیی تێکدا، سەرسام دەبین کە ببیستین ئەو ئاشتییە بۆچی تێك چوو، تەنیا دوو منداڵ لەسەر ئەو بابەتانە شەڕ دەکەن.

ئەوکاتەی پەریساتیس لە لازقییە بوو، زۆر کەیفی بە بۆنی قوبرس دەهات، (ئەورووپاییەکان بە بۆنی شیپەرز ناوی دەبەن)، کە هێشتا هەر ئەو جۆرە بۆنە بەو ناوە ماوە، بەڵام ئەو بۆنەی جاران نییە، هەوڵیدا لەو بۆنە چیٚ بکات، بەڵام بە ئەویان وت کە لەو بۆنە چیٚ ناکرێت، تەنیا لە قوبرس نەبێت، ئەو بۆنە تەنیا لە شیلەی گوڵ بە دەست نایەت، بگرە بۆ بە دەستهێنانی ئەو هەندیٚ کار ئەنجام دەدەن، کە تەنیا نهێنییەکەی لای بۆنسازە قوبرسییەکان هەیە.

دوورگەی قوبرس بەپێی پەیمانی ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشیی ببوو بە بەشێك لە سنووری یۆنان و دانیشتووانەکەی شوێن کەوتەی یۆنان بوون.

پەریساتیس فەرمانی کرد بڕۆن، سیٚ کەس لە دروستکەرانی ئەو بۆنە لە قوبرسەوە بێنن بۆ لازقییە، ئەوانیان هێنان، پەریساتیس لە ئەوانی ویست تا ڕێگەی دروستکردنی ئەو بۆنەی بۆ شی بکەونەوە، ئەوانیش ناوی چەند گوڵێیان پیٚ وت، وتیان ئەوانە تێکەڵ بەیەکدیی دەکەن، دوای تێکەڵبوون، دەیان بەن بۆ لای مامۆستاکەیان، ئەویش شتێکی تێدەکات، ئەو بۆنە بەرهەم دێت.

پەریساتیس پرسیاری کرد ئەوەی ئێوە لەو گیراوەیەی دەکەن چییە؟ ئەوانەی بۆنەکەیان ئامادە دەکرد وتیان زانیاریان نییە، ئەو شتە تەنیا لەلایەن مامۆستاکەیان ئامادە دەکرێت و لە نهێنییەکانە.[1]

پەریساتیس فەرمانی کرد تا بچن و مامۆستای بۆن دروستکردنەکە لە دوورگەی قوبرس بێنن، وەستاکەش کە زانی پەریساتیس دەیەوێت نهێنی ئەو بابەتەی لێ وەربگرێت، نەهات، پەریساتیس فەرمانی کرد تا بە زۆر ئەو بێنن و فەرمانڕەوا یۆنانییەکەی قوبرس لەو کردەیە ڕێگری کرد، کاتێك پەریساتیس بیستی فەرماڕەوای یۆنانی ئەو دوورگەیە ڕێگر بووە لە هێنانی وەستاکە بۆ لازقییە، خۆی بە بریندارزانی، فەرمانیدا تا کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك و سوریا لە لازقییە کۆببنەوە، بەو لەشکرەوە کە بۆ جەنگی ئارسیتی برای هاوسەرەکەی هێنابووی، بە پاڵپشتی هێزی دەریای بۆ داگیرکردنی قوبرس بکەوێتەڕێ.

گریمان ئەو ویستبای بۆ تەواوی تەمەنی بۆنی قوبرس بەکار بێنێت، هەر دەیتوانی ئەو بۆنە لە بازاڕ بکڕێت، تەنانەت ئەگەر نرخەکەی بە دە بەرانبەری نرخی بازاڕیش بووایە، ئەو هێندەی داهات هەبوو، کە بۆی ئاسایی بێت. ئاشکرایە کە بابەتی بۆنەکە بۆ ئەو گرفت نەبوو، ئەو لەو بابەتە تووڕە ببوو، کە فەرانەکەیان جێ بەجێ نەکردبوو، فەرمانڕەوا یۆنانییەکە ڕێگر بوو لە بردنی وەستا بۆن سازەکە بۆ دەرەوەی قوبرس.

ئەو بیانۆیەی پەریساتیس بۆ هێرشکردن بۆ سەر دوورگەی قوبرس هێنایەوە بە پێوەرەکانی ئەمڕۆ زۆر منداڵانەیە، دەبێت ئەوەش پشتڕاست بکەینەوە کە خاوەن

---

(١) ئەو بابەتە تا ئێستەش هەروایە، لە هەموو کارگەکانی بۆن لەو سەردەمەدا مادەیەك تێکەڵ بە بۆنەکان دەکەن، کە بەشێکن لە نهێنییەکانە، هیچ کرێکارێك لە کارگەکە ئاگەداری نین. لە کاتێکدا کە ئەمڕۆ بۆنەکان لە مادە کیمیاییەکان وەردەگیرێن، لە رابردوودا لە دڵۆپاندنی گلۆسی بەردین دروست دەکران، ئێستە لە نەوتی خاو وەردەگیرێن. وێڕای ئەوەش هەر کارگەیەکی دروستکردنی بۆن، مادەیەکی شاراوەی هەیە، کە تێکەڵ بە بۆنەکە دەکرێت، بۆنی تایبەتی هەر بۆنێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مادەیەی کە تێی دەکەن، بەو هۆیەشەوە کارگەکانی چێکردنی بۆن ناتوانن لاسایی یەکدیی بکەنەوە لە بەرهەم هێنانی بۆنەکاندا. "زەبیحوڵڵا"

دەسەڵاتەکان ناتوانن بەرگەی ئەوە بگرن کە فەرمانەکانیان جێبەجێ ناکرێت. ئێمە خۆمان دەپارێزین لە باسی وردەکارییەکانی تایبەت بە لەشکرکێشیی پەریساتیس.

یۆنانییەکان کە لە قوبرس بوون پێشبینیان نەدەکرد کە پەریساتیس لە پێناو نەبردنی بۆنسازێك بۆ لازقییە، لەشکرکێشیی بکات بۆ قوبرس و هەوڵی ئەوە بدات ئەو دوورگەیە داگیر بکات. قوبرس ئامرازەکانی بەرگری نەبوو، پەریساتیس کاتێك گەیشتە قوبرس ڕووبەڕووی بەرگرییەکی بەرچاو نەبۆوە، بێ گرفت ئەو شارەی داگیرکرد، کە ئێستە بە (فاماگۆست) ناسراوە، فەرمانڕەوا یۆنانییەکەی بانگ کرد و پێی وت وەستای بۆنەکە بانگ بکات، بە ئەوی وت کە بۆچی فەرمانەکەمت جێبەجێ نەکرد و نەهاتی بۆ لازقییە؟.

ئەو دانی نا کە لە ترسی گیانی نەهاتووە و ترساوە بکوژرێت، پەریساتیس وتی تۆ پێویستە نهێنی چێکردنی بۆنەکە بۆ من باس بکەی و من تۆ ناکوژم.

وەستاکە وتی من نەمدەتوانی نهێنی چێکردنی ئەو بۆنە بە تۆ بڵێم، چوونکە ئەگەر نهێنییەکە بزانرێت تەواوی ئەو کەسانەی بە هۆی ئەو بۆنەوە رۆژانەیان دەستەبەر دەکەن، لە برسان دەمرن.

پەریساتیس وتی تۆ ئەو نهێنییەت نە بە من وت نە بە کەسانی دیکە، ئایا تۆ وا بیرت کردەوە، کە من دەست لە پاشایەتیی هەڵدەگرم و تەمەنی خۆم بە بۆن چێکردن دەبەمە سەر و لەگەڵ تۆ و شاگردەکانت دەبمە رکابەر.

وەستاکە وتی من ئەقڵم هەیە، دەزانم شاژنێکی وەك تۆ هەوڵ نادات لە بەرهەمهێنانی بۆن لەگەڵ کەسانێکی وەك ئێمە ببێتە رکابەر، کە بەو رێگەیە رۆژانەمان دەستەبەر دەکەین، بەڵام ئەوەی بۆ من و هاوکارەکانم، ژیانی پێوە بەندەن بۆ تۆ شتێکی بێ نرخە، لەبەرئەوەی لە ژیانی تۆدا ئەو بابەتە بێ بایەخە، بەڵام بە کەسانی دیکەت دەوت، ئێمەش تووشی برسییەتی دەبووین.

پەریساتیس وتی راست دەکەی، ئەو بابەتە بۆ من بێ بایەخ بوو، ڕەنگە بە کەسانی دیکەم وتبایە، بەڵام ئێستە من پێت دەڵێم، دەبێ پێم بڵێی چ لەنێو بۆنەکە دەکەی، بە کەسانی دیکە ناڵێم، ئەگەر رازەکەشم بۆ نەدرکێنی ئەوا دەتکوژم.

وەستای بۆنەکە وتی ئەی شاژن رێگەم بدە تا بە گوێچکەتدا بچرپێنم، بۆ ئەوەی کەسانی دیکە، کە لێرە دانیشتوون، نەیبیستن.

پەریساتیس  ڕێگەی پێدا تا لێی نێزیك ببێتەوە، بە گوێیدا بچرپێنێت، بە وتەی دەی نۆن ئەو پیاوە لە شاژن  نێزیك کەوتەوە و دەمی نا بە گوێچکەی شاژن، وتی ئەوەی لەنێو بۆنەکەی دەکەین زاخی شینە (مووروی شین) بە ڕێژەی یەك بەرانبەر بە سەد.

پەریساتیس بە بیستنی ئەو قسەیە سەرسام بوو، وتی من پێم وابوو ئەوەی لە بۆنەکانی دەکەن بریتین لە بابەتی زۆر دەگمەن.

وەستاکە وتی تۆ سوێند دەدەم بە خوداوەندانی خۆتان و خوداوەندانی ئێمە، کە ئەو بابەتە بۆ هیچ کەس نەدرکێنی.

پەریساتیس وەستای بۆنەکەی ئازاد کرد، فەرمانی کوشتنی فەرمانڕەوا یۆنانییەکەی دوورگەی قوبرسیشی دەرکرد، جارێکی دیکە بێ گەڕانەوە و ڕاوێژکردن بە هاوسەرەکەی، بڕیارەکەی خۆی جێبەجێ کرد و گەڕایەوە، تەنانەت بێ ئەوەی کەس لە دانیشتووانی دوورگەکە ئازار بدات، چوونکە لە لایەك بە فەرمانڕەوای دوورگەکەی سەلماند، کە دەتوانێت بڕیاری خۆی بەسەریدا بسەپێنێت، تەنانەت ئەگەر لە نێو ئەو دوورگەیەشدا بێت، لە لایەکی دیکەش هەستی ملومۆکردنی تێر بوو، چوونکە زانی ئەو مادە تایبەتە چییە کە لەنێو بۆنەکەی دەکەن، بەڵام ئەو ڕووداوە ڕێککەوتننامەی ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشیی تێکدا، هەردوو دەوڵەتی تسالی و ئەسینا، کە فەرمانڕەوای دوورگەکەیان دیاری دەکرد و بودجەکەیان دەدا، بە زۆر تووڕە بوون و بڕیاریاندا تۆڵەی ئەو کارە بکەنەوە، ئەوان هەوڵیاندا وڵاتانی یۆنان هان بدەن بۆ ئەوەی لەشکر کۆبکەنەوە تا بتوانن بە لەشکرێکی بەهێز هێرش بکەنە سەر ئێران، بەڵام جگە لە ئێسپارت هیچ یەك لە وڵاتانی دیکە رازی نەبوون، لەشکر بۆ ئەو کدەیە ئامادە بکەن.

ئێسپارتیش بۆیە لەشکری خۆیان کۆکردەوە تا ئەسینا پارەیان پێبدات، لە لایەکی دیکە ئێسپارتییەکان خوازیاربوون، کە دەسکەوتی جەنگییان هەبێت. ئێسپارت هێزی دەریایی نەبوو، بەڵام ئەسینا و تسالی هێزی دەرباییان هەبوو، بە تایبەتی هێزی دەریایی ئەسینا بەهێز بوو.

پەریساتیس دوای گەڕانەوەی لە قوبرس لە لازقییە نەوەستا، ڕێگەی ئێرانی گرتەبەر، حکوومەتەکانی تسالی و ئەسینا و ئێسپارت لەشکرێکی یەکگرتوویان پێکهێنا، بە پشتیوانی هێزی دەریایی خۆیان هێرشیان کرد بۆ ئاسیای بچووك و شارە یۆنانییەکانی

ئاسیای بچووکیش یاخیبوون و کەوتنە یارمەتیدانی یۆنانییەکان. لەشکری یۆنان دوای ئەوەی لە ئاسیای بچووك دابەزین، کەوتنە پێشڕەوی، وەك تۆڵەکردنەوە لە هەر شوێنێك فەرمانڕەوایەکی هەخامەنشییان دەبینی، دەیان کوشت.

گزنفۆن دەڵێت کاتێك لەشکری یۆنان بەرەو ئاسیای بچووك رۆیشت، من کوڕێك بووم لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا، بەڵام هێندە تێدەگەیشتم، کە ئەو لەشکرە دەڕوات تا تۆڵەی کوژرانی فەرمانڕەوا یۆنانییەکەی دوورگەی قوبرس بکاتەوە. گزنفۆن دەڵێت ئەو لەشکرە یۆنانییەی گەیشتە نێو ئاسیای بچووك لە دوو فەرمانڕەوای هەخامەنشی پتری نەکوشت، ئەوانی دیکە خۆیان رزگار کرد، بەڵام تۆسیدید نووسیویەتی کە چوار فەرمانڕەوای هەخامەنشیی کوژران.

لەشکری هێرشبەر هیچی لە سەربازەکانی هەخامەنشیی نەدەکرد، تەنیا ئەوکاتەی بەرگرییان کردبایە، ئەوانیان دەکوشت، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر بوو لە نێوان یۆنان و هەخامەنشیی ئاشتی هەبوو، هەخامەنشییەکان لە ئاسیای بچووك سەربازگەی بەهێزیان نەبوو، تا پێش بە لەشکری یۆنان بگرێت. هەروەك چۆن هێرشی پەریساتیس بۆ دوورگەی قوبرس چاوەڕوان نەکراو بوو، بە هەمان شێوەش هێرشی یۆنان بۆ ئاسیای بچووك بۆ سەر هەخامەنشییەکان، چاوەڕوان نەکراو بوو.

کاتێك داریوشی دووەم هەواڵی هێرشی لەشکری یۆنانی بۆ ئاسیای بچووك بیست، سەرسام بوو، تا ئەوکاتەی هەواڵی هێرشی پەریساتیسی بۆ سەر دوورگەی قوبرس بیست، چوونکە دوای گەڕانەوەی پەریساتیسیش بۆ ئێران، هەواڵی ئەو هێرشەی بە هاوسەرەکەی نەگەیاند، چوونکە ئامرازەکانی پێوەندیی سوریا لە دەسەڵاتیی ئەوابوون، کەس نەیدەتوانی ئەو هەواڵە بە داریوش بگەیەیەنێت، گریمان ئەگەر هەواڵەکەشیان بە داریوش گەیاندبایە:

یەکەم: ئەو ڕووبەڕووی کردەیەك دەبۆوە کە ڕوویداوە، لەکاتێکدا ئەو دوای هێرشەکەی پەریساتیس ئەو هەواڵەی پێگەیشت.

دووەم: وەك دەزانرێت داریوشی یەکەم لە بەرانبەر هاوسەرەکەی بێ دەسەڵات بووە، تەنانەت نەیدەتوانی ئەو بخاتە بەر لێپرسینەوە، کە بۆچی ئەو هێرشەی بۆ دوورگەی قوبرس ئەنجام داوە، کە بووەتە مایەی تێکدانی ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان.

گزنفۆن و تۆسیدید که هەردووکیان له مێژوونووسه باوەڕپێکراوەکانن، نووسیویانه لەشکری یۆنان له ئاسیای بچووك دەستیان بۆ کوشتنی خەڵك نەبرد، بەڵام سامانی خەڵکیان به تالان برد، سەربازەکان تالانییەکانیان بەره بەره بۆ کەنارەکانی ئاسیای بچووك دەگواستەوه تا به هۆی کەشتییەوه بۆ یۆنان بگوازرێنەوه.

ئەگەر سەرمای زستان نەگەیشتبایه و سەختی سەرما و سۆڵه له ئاسیای بچووك له ناوچه شاخاوییەکان لەشکری یۆنانی رانەگرتبایه، لەوانەبوو ئەو لەشکره خۆی بگەیاندایه سنوورەکان، چوونکه هەخامەنشییەکان له ئاسیای بچووك سەربازگەی قایم و بەهێزیان نەبوو، فەرمانڕەواکانی ناوچەکانیش، ڕاسته هەموویان بەرفەرمانی هەخامەنشیی بوون، بەڵام له سنووری خۆیان سەربەخۆییان هەبوو، بۆیه به هۆی هێرشی لەناکاوی یۆنانییەکان ئامادە نەبوون بەرگریی له خۆیان بکەن و بەر به هێرشی یۆنانییەکان بگرن.

داریوشی دووەم دوای ئەوەی زانی، هاوسەرەکەی ئاشتی نێوان ئێران و یۆنانی تێك داوە، نەسەرزەنشتی کرد، نەداوای لێکرد تا بچێت و پێش به یۆنانییەکان بگرێت و ئەوان له ئاسیای بچووك وەدەرنێت.

پەریساتیس وتی: من به دڵخۆشییەوه سەرکردایەتیی ئەو لەشکره دەکەم که دەبێت جەنگی یۆنانییەکان بکات، ئەو جەنگه دەبێت له سەرەتای بەهاردا دەست پێ بکات، هەرچەنده زستان له هەندێ شوێنی ئێران وەك (ئازەربایجان، کوردستان و خۆراسان) سەخت بوو، پەریساتیس هاوسەرەکەی ناچار کرد، بۆ ئەوەی داوای بەشێك له سەربازی ویلایەتەکان بکات، تا رەوانەی ئازەربایجان بکرێن، بۆ ئەوەی لەگەڵ توانەوەی بەفر و هەڵکردنی بای گەرم بتوانێت بۆ جەنگ بکەوێتەڕێ.

گزنفۆن دەڵێت پەنجا هەزار سەربازی پیادە و سواره له سەربازگەکانی ویلایەتەکانەوه بۆ ئازەربایجان ڕەوانەکران، پەنجا هەزار سەربازیش له لەشکری بەردەوامی هەخامەنشیی که له پایتەخت بوون، بەو لەشکرەوه گرێدران، بەشی هەره زۆری گالیسکه جەنگییەکانی ئێران له ڕێگه بەناوبانگەکەی پاشایەتییەوه، که له سەردەمی داریوش چێ کرابوو، بەرەو ئازەربایجان ڕۆیشتن، وەك زانراوه ئەو ڕێگەیه که باشووری ئێرانی دەبەستەوه به هەریەکه له ئازەربایجان و ئاسیای بچووك و ئیستانبۆڵی ئەمڕۆ، هێنده بەرین بوو، که چوار گالیسکەی‌له تەنیشت یەك دەیانتوانی لەو ڕێگەیەوه بڕۆن، نەتەنیا به ڕێگەیەکی بازرگانی دادەنرا، بگره

ڕێگەیەکی ستراتیژیش بوو، هەر کاتێك پاشاکانی هەخامەنشیی ویستبایان لەشکر بەرەو ئاسیای بچووك بنێرن، بە خێرایی هێزەکەیان لەو ڕێگەیەوە بۆ ئاسیای بچووك دەنارد، ئەو ڕێگەیە دوای بەستنەوەی بە ئاسیای بچووك، چەند لقێکی لێ جیا دەبۆوە، لقێك بۆ باکور، یەکێکیش بۆ باشوور دەڕۆیشت، لقەکانیش وەك ڕێگە سەرەکییەکە پان و پتەو بوون، بە شێوەیەك چێ کرابوون، کە دوای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ بەر لە نها، هێشتا لە هەندێ شوێن شوێنەواری بەردڕێژی ژێرەوەی لەنێو نەچووە، ئێستەش دەکرێت سوودی لێ ببینرێت، بیست و پێنج سەدە با و باران و بەفر و هەتاو نەیتوانیوە بناخەی ئەو ڕێگە لەنێو ببەن.

لەشکرەی لە ئازەربایجان کۆبۆوە، پێکهاتبوو لە سەد هەزار سەربازی پیادە و سوارە، جگە لە گالیسکەی جەنگی، مەنجەنیق و بورجە گەڕۆکەکان، ئەوانیش وەك گالیسکە جەنگییەکان لە چەکە قورسەکانی لەشکری هەخامەنشیی بوون، ئەگەر ڕێگەی شیاو هەبووایە، ئەو ئامرازەشیان بۆ جەنگ دەبرد، مانگێ بەر لە توانەوەی بەفر، پەریساتیس بۆ ئازەربایجان ڕۆسشت بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی ئەو لەشکرە بگرێتە ئەستۆ، کە بەرەو ئاسیای بچووك پێشڕەوی دەکرد، هەرکە بەفرەکان توانەوە، پەریساتیس لەشکرەکەی بەرەو ڕۆژئاوا خستە جووڵە بۆ ئەوەی بلەز بگاتە یۆنان، ئەو پێشبینی دەکرد کە دوای گەرمبوونی کەشوهەوا، یۆنانییەکان دەست بە جووڵە دەکەن، دیسان لە ئاسیای بچووك پێشڕەوی دەکەن، ئەو دەمەش دەرکردنیان لەوێندەر قورستر دەبێت، بۆیە پێویستە هەر ئێستە ڕووبەڕوویان ببێتەوە، بەر لەوەی ئەوان بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکیش داگیر بکەن، دەبێ لەگەڵ یۆنانییەکان بجەنگێت.

ئەو ڕێگەیەی پەریساتیس بۆ ڕۆیشتن بەرەو ڕووی یۆنانییەکان گرتبوویە بەر، هەمان ئەو ڕێگەیە بوو کە کوروشی دامەزرێنەری زنجیرەی هەخامەنشیی بۆ جەنگی گرزۆس، بەرەو لیدی گرتبوویە بەر، تەنیا جیاوازیی ئەوە بوو، ئەو کاتەی کوروش لەو ناوچە شاخاوییانە تێپەڕ دەبوو، ڕێگەی پان و پتەو و بەردڕێژ نەبوو، بەڵام پەریساتیس لە ڕێگەیەکی بەردڕێژکراوی پان دەڕۆیشت، کە گالیسکە و بورجە گەڕۆکەکانی لەشکری هەخامەنشیی بێ کێشە و گرفت لەو ڕێگانەوە تێپەڕ دەبوون.

گزنفۆن نووسیویەتی ئەو شارێیەی ئاسیا لەلایەن پاشاکانی هەخامەنشیی چێ کرا بوو، لە بەندەری کری زۆپۆڵس (بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیستانبۆڵی ئێستە) دەستی پێدەکرد، دوای

تێپەڕبوونی بە تەواوی ئاسیای بچووك و ئێران، لە بەندەری سیراف کە کەوتبۆوە باشووری ئێران کۆتایی دەهات، کاڵاکانی چین و هیندستان لەو ڕێگەیەوە بۆ وڵاتانی ئەورووپا دەڕۆیشت، کاروانەکان لەو ڕێگەیە نەدەپسانەوە، بەردەوام لە هەردوو لای ڕێگەکەوە، ڕێبوار و کاروانەکان بەرانبەر یەکدیی تێپەڕ دەبوون.

شارێگەی ئاسیا لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا تاکە ڕێگەی گواستنەوەی خێرا و دڵنیا بوو، لە نێوان ئاسیا و ئەورووپا، لەوی گاڤان لە نێوان ئێران و ڕۆژهەڵات ڕێگەیەکی دیکە هەبوو، ناوی (ڕێگەی ئاوریشم) بوو، بەڵام ئەو ڕێگەیە وەك شاڕێی ئاسیا پان و بەرین نەبوو، لە لایەکی دیکەیش بەردەوام تەناهی و ئاسایشی نەپارێزراو بوو، لە کاتێکدا کە شاڕێی ئاسیا سەرەڕای پان و بەرینی ڕێگەکە، بەردرێژ و پارێزراویش بوو.

گزنفۆن نووسیویەتی ئەو ڕێگەیە لە هەر شوێنێك کە گەیشتووەتە ڕووبارێك، پردیان بۆ چێ کردووە، زانست و هونەری چێکردنی پردەکان لە شارستانییەتی مرۆڤاندا پێشینەیەکی یەکجار کۆنی هەیە.

پەریساتیس هێندەی دەیتوانی بە پەلە ڕێگەی دەبڕی، تا زووتر بگاتە یۆنانییەکان، دەیزانی پێش ئەوەی یۆنانییەکان پردی هالیس بگرن، دەبێت لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە، پردی سەر ڕووباری هالیس (قزل ئایەرماق) یەکێك بوو لە مەزنترین پردەکانی سەر شاڕێی ئاسیا، شاژنی هەخامەنشیی زانیاریی هەبوو، ئەگەر یۆنانییەکان ئەو پردە بگرن، پەڕینەوەی لەشکرەکەی لەو وەرزەدا کە وەرزی هەڵکشانی ئاوی ڕووبارەکان بوو، زۆر سەخت دەبوو.

ڕووباری هالیس لە وەرزی توانەوەی بەفر و بارانە بەهارییەکاندا سیخناخ دەبوو لە ئاو دەبوو، ئەگەر یۆنانییەکانیش پردەکە داگیر بکەن، ئەو دەمەش پەریساتیس نەیدەتوانی لەشکرەکەی لە ئاوی ڕووبارەکە بپەڕێنێتەوە، ئەگەر سوارەکانیش بێ مەترسی بکارن پیادەکان بپەڕێننەوە، ئەوا گالیسکە جەنگییەکان و ئەو گالیسکانەی بورجەکان دەگوازنەوە ئاو دەیبردن، ئەگەرچی ئەسپەکان توانایان هەبوو، بە مەلە لەمبەری ڕووبارەکە بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە بپەڕنەوە، بەڵام ئەسپەکان بە گالیسکەوە نەیاندەتوانی مەلە بکەن و لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە، لە لایەکی دیکەیش لە کاتی هەڵکشانی ئاوی ڕووبارەکە، ئاو تەنانەت ئەسپەکانیشی دەخنکاند و نقوومی دەکردن.

کەواتە ئەگەر یۆنانییەکان پردی هالیسیان بە دەستەوە بووایە، بێگومان کەناری ڕۆژهەڵاتی ڕووبارەکەش دەکەوێتە ژێر دەستیان، ئەو دەمەش پەریساتیس ناچار دەبوو لە کەناری ڕاستی ڕووبارەکە لەگەڵ یۆنانییەکان بجەنگێت، بۆ ئەوەی بتوانێت پاشەکشەیان پێ بکات و پردەکە بگرێتەوە، کەناری لای ڕاستی ڕووبارەکەش نارێك بوو، بەرزی و نزمییەکانیشی ڕێگر دەبوون لە بەکارخستنی گالیسکە جەنگییەکان، لە کاتێکدا کەناری چەپی ئەو ڕووبارە لە تەنیشت پردەکەوە بۆ بەگەڕخستنی گالیسکەکان زۆر باش بوو، هەرچەندە ڕووباری هالیس لە باکورەوە چەند بوارێکی بۆ پەڕینەوە هەبوو، بۆیە پەریساتیس دەیتوانی لە یەکێك لەو بوارانەوە بپەڕێتەوە، بەڵام دوای گەیشتنی بە یۆنانییەکان لە لای ڕۆژهەڵاتی زێیەکە بواری پەڕینەوە لە ڕووبارەکە نەدەدەما، تا ئەوکاتەی یۆنانییەکانی شکست نەدابایە، بۆیە پەریساتیس ناچار دەبوو لەگەڵ یۆنانییەکان بجەنگێت بۆ ئەوەی پاشەکشەیان پێ بکات.

ئەگەر پەریساتیس بە خێرایی نەڕۆیشتبایە، یۆنانییەکان پردی هالیسیان داگیر دەکرد، چوونکە بە خێرایی ڕێگەی دەبڕی، ڕۆژێك بەر لە یۆنانییەکان گەیشتە سەر پردەکە و ئەو شوێنەی داگیرکرد، لەشکرەکەی لە پردەکە پەڕاندەوە، لەشکرەکەی لە کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری هالیس قایم کرد.

یۆنانییەکان کاتێك زانیان لەشکری هەخامەنشیی پردی سەر ڕووباری هالیسی داگیرکردووە، وێستان، پەریساتیس تەواوی لەشکرەکەی پەڕاندەوە بۆ ڕۆژئاوای ڕووبارەکە و خۆی بۆ جەنگ ئامادەکرد، هەندێ لە سەربازەکانی نارد، بۆ وەرگرتنی زانیاریی بەرەو لای یۆنانییەکان، تا بزانن هێزی ئەوان چەندە، یۆنانییەکانیش بە هەمان شێوە، دەستەیەك لە سەربازەکانی خۆیان نارد تا زانیاریی لەبارەی هێزی هەخامەنشیی کۆبکەنەوە.

هەردوو یەکە سەربازییەکە گەیشتنە یەك و لە نێوانیان جەنگ بەرپابوو، چوونکە سەربازەکانی یۆنانی لە تاقمی هۆپ لیت بوون، سەربازە هەخامەنشییەکان نە زرێ و نە قەڵغانیان هەبوو، هەموویان کوژران یاخۆ بریندار بوون، دوو سەربازیش لەنێویاندا بە دیل گیران و بردیانن بۆ فەرماندەی سوپای یۆنان کە ناوی (کۆلیۆس) بوو.

فەرماندەی یۆنانی لە سەربازە هەخامەنشییەکانی پرسی ژمارەی سەربازەکانی ئێوە چەند دەبێت؟

کەتزیاس کە ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە، بەم شێوەیە دەدوێت:

سەربازەکان وتیان ژمارەی دەستەکانی ئێمە سەد کەسە.

کۆلیۆس وتی ژمارەی سەربازەکانی یەکەی ئێوەم نەپرسی، بگرە پرسیارم کرد، کە ژمارەی سەربازەکانی سوپای ئێوە چەند کەسن.

ئەو دوو سەربازە وتیان ئێمە ئەو بابەتە نازانین.

کۆلیۆس وتی: مێزی قامچی لێدان بێنن، کە بریتی بوو لە مێزێك لە کانزا چێ کرابوو، دەتوانرا قەد بکرێت، دوای ئەوەی کە دەکرایەوە، دەبۆوە خاوەنی چوار پێچکەی بەهێز، تاوانباریان لەسەر ئەو مێزە دادەنا، دەست و قاچیان بە پەتك دەبەستایەوە و بە قامچی لێیان دەدا، یەکێك لە دوو سەربازە ئێرانییەکەیان دوورخستەوە، بە فەرمانی کۆلیۆس ئەوەی دیکەیان لە مێزەکە بەستەوە، کۆلیۆس پرسیاری کرد، کە ئایا پێمان دەڵێی ژمارەی سەربازەکانی هەخامەنشیی چەندن؟

سەربازە دیلەکە وتی: ژمارەی سەربازانی هەخامەنشیی نازانم، تەنیا هێندە دەزانم کە یەکەی ئێمە سەد کەسە.

بە فەرمانی کۆلیۆس دەستیان کرد بە قامچی لێدان لە پشتی ئەو سەربازە، بەڵام لە دەمی ئەو سەربازە نە دەنگیناڵاندن و نە هاوار نەبیسترا.

دوای ئەوەی بیست قامچیان لە پشتی دیلەکەدا، کۆلیۆس وتی: بوەستن، قامچی لێدەر وێستا، کۆلیۆس لە دیلە بەدبەختەکە نێزیك بۆوە و پرسیاری کرد، ئایا هەست بە ئازار ناکەی، دیلەکە نەختێك سەری ڕاتەکاند، بێ توانایانە لەسەر مێزەکەی دانایەوە، کۆلیۆس وتی ئایا دەتوانی گەمە بە من بکەی؟ ڕادەسپێرم هێندە بە قامچی لێت بدەن، تا گیانت دەردەچێت یاخود تەواوی ئەو زانیارییانەی هەتە، پێمی دەبەخشی.

ئەوکات بە فەرمانی کۆلیۆس دەست کرایەوە بە قامچی لێدان، هێندە لەو دیلە بەدبەختەیاندا تا کۆلیۆس خۆی ماندوو بوو، وتی بوەستن، کاتێك ویستیان دیلەکە لە تەختەکە دابەزێنن بینییان بوراوەتەوە، لەسەر زەوییان درێژکرد، پێش ئەوەی شەو ڕابکشێت ئەو دیلە بەدبەختە مرد، بە وتەی کەتزیاس ناوی (پاد) بوو، خەڵکی گوندی (راگس) بوو.

دەستیان کرد، بە قامچی لێدان لە سەربازەکەی دیکە، تاکو چی دەزانێت لەبارەی لەشکری هەخامەنشیی بیدرکێنێت، کەتزیاس ناوی ئەو سەربازەی نەنووسیوە، بەڵام دەڵێت ئەویش هەروەك سەربازی یەکەم خۆی لە بەخشینی هەر جۆرە زانیارییەك پاراست.

لە باسی ژیانی داریوشدا نووسیومانە کە بڵاوکراوەیەکی بۆ دیلەکانی جەنگ نووسیوە، یەکێك لە بەندەکانی ئەو بڵاوکراوەیە ئەوەیە، کە بۆ وەرگرتنی زانیاریی نابێت دیل بخرێتە بەر ئازار، بەڵام کۆلیۆس پێڕەوی لەو بڵاوکراوە نەدەکرد، یەکێك لە دیلەکانی کوشت، ئەوی دیکەیشی تا بەرەبەیان ئازاردا، بەڵام هەروەك چۆن دیلی یەکەم لەژێر زەبری قامچیدا مرد و هیچی نەدرکاند، دیلی دووەمیش بەرگەی ئازارەکانی گرت و هیچی بۆ کۆلیۆس نەدرکاند، کەتزیاس دەبێژێت سەربازە هەخامەنشییەکان کاتێك بە دیل دەگیران، پتر لە سەربازە یۆنانییەکان بەرگەی ئەشکەنجەدانیان هەبوو، نهێنییەکانی لەشکری خۆیان نەدەدرکاند.

ئەو شەوە نە پەریساتیس توانی ژمارەی سەربازە یۆنانییەکان بزانێت، نە کۆلیۆسی فەرماندەی یۆنان زانی ژمارەی سەربازە هەخامەنشییەکان چەندن، بەڵام مێژوونووسان دۆخی سەربازە یۆنانییەکانیان نووسیوە و دەڵێن ئەوان پیادەبوون، تەنیا ئەفسەرەکان ئەسپیان هەبوو، چەکی قورسی لەشکری یۆنان برێتی بوو: لە مەنجەنیق، هەموو مەنجەنیقەکان پێچکەیان هەبوو، بە ئەسپ ڕادەکێشران، لە کاتی جەنگدا دەیانتوانی بەشی خوارەوەی مەنجەنیقەکە بە شێوەیەك جێگیر بکەن کە نەجووڵێت.

یۆنانییەکان چەندان جار لەگەڵ هەخامەنشییەکان جەنگاون و دەیانبینی کە ئەوان سوارە و گالیسکەی جەنگییان هەیە، بەڵام بۆ خۆیان هیچ هۆگری سوارکاری نەبوون، چوونکە زۆر شانازییان بە پیادەکانیان بە تایبەتی لە شێوەی هۆپ لیت دەکرد.

ڕۆژی دواتر لە نێوان سوپای هەخامەنشیی و سوپای یۆنان دوو فەرسەخ مەودا هەبوو، پەریساتیس فەرمانی ئارایشی جەنگیدا، لەشکری هەخامەنشیی بەم شێوەیە کەوتە جووڵە:

گالیسکە جەنگییەکان لە نێوەڕاستی سوپا جێگیر کران، پیادەکانیش لە هەردوو لای ڕاست و چەپ دامەزران. بورجە گەڕۆکەکانیان کردە دووبەش، بەشێك لای ڕاست، بەشەکەی دیکەش لە لای چەپ دانران، سوارەکانیش ڕاسپێردران تا لە پشتەوەی لەشکر، وەك یەدەگ بمێننەوە، لە کاتی پێویستدا بێنە نێو جەنگ، چوونکە زەوییەکە ڕێك و تەخت بوو،

پەریساتیس دەیەویست زۆرترین سوود لە گالیسکەکانی وەربگرێت، بۆیە ئەوانی لە نێوەڕاستی لەشکرەکەی دانا.

کۆلیۆس گالیسکەکانی بینی، بە سەربازەکانی خۆی وت: ئەو پیادانەی لە هەردوولا و لە بەرانبەر خۆتان دەبینن هێندە گرینگ نین، بورجە جوولاوەکانیشیان زۆر کاریگەر نین، تەنیا دەستەیەك لەنێو بورجەکانن، تیرتان تێدەگرن، بەڵام گالیسکەکان چەکی بەکارن، ئەگەر بتوانن گالیسکەکان لەکار بخەن، سەرکەوتوو دەبن، هەموو سەربازە هۆپ لیتەکان، دەبێت خۆیان تەرخان بکەن بۆ لەنێوبردنی گالیسکە جەنگییەکانی دوژمن.

هۆپ لیتەکان سەرەڕای کاسکێت، زرێی چەرمی و ئاسنینیان لەبەر بوو، زرێکان لە چەرم چێ کرابوون، پارچەی چوارگۆشەیی قورقوشمیان پێوە لکێنرابوو، ئەو جۆرە لە زرێ باشتر بوو، ئەو جۆرەی کە بە تەواوەتی لە کانزا بوو، ڕێگری نەدەکرد، بۆیە جەستەی مرۆڤ ئاسوودە بوو. سەربازە هۆپ لیتەکان وێڕای ئەوەی زرێیان لەبەر بوو، رانبەند، قاچبەند و بازووبەندیان هەبوو، تیر، شمشێر و نێزە کاریگەریی لێیان نەدەکرد، تەنیا لەو شوێنانی جەستەیان نەبێت، کە پارێزەی نەبوو، وەك ئانیشك، ئەژنۆکان و ڕووخساریان.

گالیسکەکانی هەخامەنشیی لە نێوەڕاست بوون، بۆیە کۆلیۆسیش رایسپارد گالیسکەکان لە نێوەڕاست و بەرانبەر ئەوان بن، بۆ ئەوەی لە کاتی بەردبارانکردنی یەکدی بۆشایی نەیەتە دی.

مەودای رۆیشتنی بەردە مەنجەنیقە گەورەکانی ئەوکات سەد مەتر بوو، یەك جیاوازییان لەگەڵ چەکی ئاگرینی ئێستە ئەوە بوو، کە ئەگەر گوللە سارد ببێتەوە و لە ئاسمانەوە بەربێتەوە، زیانێکی ئەوتۆی نابێت، وەك بەردۆچکەیەك وایە کە بەر مرۆڤ دەکەوێت، بەڵام بەردی مەنجەنیق لە کاتی بەربوونەوە لەوانە بوو بتوانێت مرۆڤ بکوژێت یاخۆ بە سەختی بریندار بکات، بە مەنجەنیقێك دەتوانرا یەك بەردی گەورە یاخۆ چەندان بەردی بچووکتر پێکەوە هەڵبدرێت، ئەگەر بەردی گەورە بە گالیسکەیەك بکەوتایە، گالیسکەکەی لەکار دەخست، کاتێك بەردە وردەکانیش بەر ئەسپەکان بکەوتنایە، ئەوا ئەو ئاژەڵانەیان دەکوشت یاخۆ بە شێوەیەك بریندار دەکرد کە توانایان نەدەما.

کۆلیۆس بە مەنجەنیق هاوێژەکانی وت ئێوە بۆ لەنێوبردنی گالیسکەکانیان، تەنیا نیو ئەستاد واتە سەد مەترتان هەیە، ئەو مەودایەش لەلایەن گالیسکەکانی دوژمن لە چاو

تروكاندنێكدا دەبڕدرێت، بۆیە دەبێت ئێوە بە شێوەیەك بەردیان بەسەرد ببارێنن، كە هەر لەو ماوە كەمەدا ئەوان تێك بشكێنن. بەم پێیە لە تەنیشت هەر مەنجەنیقێك گردۆڵكەیەك لە بەردیان كەڵەكە كردبوو، سەبەتەی تایبەتی تژی لە كەڤران ئامادە كرابوون، كە بە یەك جووڵە لە مەنجەنیق دابندرێن و ناچار نەبن بەردەكان یەك یەك لەنێو مەنجەنیق دابنێن، هێندەی لە توانابووایە بەردە گەورەكانیان دەخستە ناو مەنجەنیقەكان.

كاتێك چارەكێك لە رۆژ تەواو بوو، لەشكری هەخامەنشیی گەیشتە ئەو شوێنەی كە پەریساتیس توانی فەرمانی هێرشی گالیسكەكان دەربكات، گالیسكەچییە بەهێزەكان هەوساری ئەسپەكانیان بەردا، ئەسپەكان بە شێوەیەك بلەز رۆیشتن، وەك ئەوەبوو كە گالیسكەیان پێ نەبێت و تەنیا كایان لە پشتە، هەر كە گالیسكەكان كەوتنە جووڵە، پێش ئەوەی بگەنە بەر مەودای گەیشتنی بەردەكان، مەنجەنیقەكان دەستیان بە بەردباران كرد، تا گالیسكەكان نێزیكتر دەكەوتنەوە، مەودای هەڵدانی مەنجەنیقەكانیش كورتتر دەكرایەوە و بەردە گەورە و بچووكەكان زۆر زیانیان بە گالیسكە و ئەسپ و سەرنشینەكانیان دەگەیاند.

گالیسكەكانی هەخامەنشیی گەیشتنە شوێنێك، كە ئیتر مەنجەنیقەكان نەیاندەتوانی بە بەرد لێیان بدەن، سەرنشینەكانی نێو گالیسكەكان بە تیر لە مەنجەنیق هاوێژەكانیان دەدا، ئەوانیان ناچار دەكرد، كە دەست لە مەنجەنیقەكان هەڵبگرن و بیر لە پاراستنی خۆیان بكەنەوە. ئەوانیش خۆیان لە پشت مەنجەنیقەكان حەشار دەدا و لە پشتیانەوە بە تیر لە سەرنشینی گالیسكەكانیان دەدا، بەڵام وێڕای ئەوەی چیدی مەنجەنیقەكان بەردیان نەدەباراند، بەڵام خۆیان ببوونە بەربەست لە رێگەی گالیسكەكان و داس و تەوری گالیسكەكان توانای لەتكردنی مەنجەنیقەكانیان نەبوو، بۆ ئەوەی رێگەی گالیسكەكان ببێتەوە، دەبووایە مەنجەنیقەكان بە تەور پارچە پارچە بكرێن.

پەریساتیس دەستەیەك لە سەربازە سوارەكانی، كە یەدەكبوون بە تەورەوە بۆ لای گالیسكەكان نارد، ئەركی ئەو سوارانە ئەوەبوو، مەنجەنیقەكان تێك بشكێنن و رێگەی رۆیشتنی گالیسكەكان بكەنەوە، سوارەكان بە تەورە قورسە جەنگییەكانیان كە زۆر تیژ بوون، هێرشیان بۆ سەر مەنجەنیقەكان كرد، ئەو تەورانە هێندە تیژ دەكران، كە وەك گوێزان دەكرا مووەكانی جەستەی پێ ببڕن، بەڵام هێرشی ئەو سوارانە بۆ سەر مەنجەنیقەكان وەك پێشوازی لە مەرگ بوو، یۆنانییەكان بە نێزە، رم، تیر و تەور دەیانكردنە ئامانج، ئەو

تیرانەی بە کەوانە لاق هاوێژەکانیان دەیانهاویشتن، زۆر مەترسیدارتر بوون، لەو تیرانەی بە کەوانی دەستی دەیان هاوێژران، کەوانی پێ هاوێژ کە لە داهێنانی یۆنانییەکان بوو، ژێیەکەی بە پێ ڕادەکێشرا و دەهاوێژرا، لە کەوانی دەستیدا، ئەو دەستەی ژێی کەوانەکە ڕادەکێشێت ناکارێت کەڵك لە هێزی تەواوی جەستەی وەربگرێت، تەنیا سوود لە هێزی باسك و مەچەکی وەردەگرێت، بەڵام لە کەوانی پێدا ژێی کەوانەکە بە گووشاری دوو قاچ رادەکێشرێت، کەوانچی تەواوی هێزی خۆی دەخاتە سەر دوو قاچەکانی و ژێی کەوانەکە هێندە ڕادەکێشرێت، کە تەنیا نووکی پەیکانی تیرەکە لەسەر کەوانەکە دەمێنێت و تیر بە خێراییەکی بێ ئەندازە دەدەپەڕێت.

ئەو سوارانەی بە تیرەکانیان هێرشیان کردە سەر مەنجەنیقەکان، دەیانزانی بۆ تێپەڕبوون لە گالیسکەکان پێویستە گیانیان بەخت بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن بەربەستەکان لەسەر رێگە لابدەن، لەو رۆژەوە کە جەنگ لە نێوان مرۆڤەکان چێ بووە، لە کۆنترین سەردەمەکانەوە یاسایەك لە جەنگەکاندا نەگۆڕاوە، بریتییە لە یاسای خۆبەختکردن، تا ئەوکاتەی هەموو سەربازەکانی لەشکرێك ئامادە نەبن بە دڵ و گیان خۆیان بەخت بکەن، سەرکەوتن بە دەست ناهێنن، لە بیست و پێنج سەدە بەر لەنها، کە پەریساتیس بە شمشێر و تیر و گالیسکەوە لەگەڵ یۆنانییەکان دەجەنگا، ئەمڕۆش کە بە ئامێرە بزووێنەرەکان و چەکی ئاگرین دەجەنگن، ئەو یاسایە هەر بەردەوامە.

لەو کاتەی سوارە تەور بەدەستە هەخامەنشییەکان مەنجەنیقەکانیان دەشکان، گالیسکەکان بە تەواوەتی بێ کار نەمان، هەندێکیان توانیان لە هەردوولای راست و چەپ هێرش بکەنە سەر سەربازە یۆنانییەکان، کۆلیۆس فەرماندەی سوپا فەرمانی بە سەربازە هۆپ لیتەکانی یۆنان کرد، کە پێش بە گالیسکەکان بگرن، سەربازە هۆپ لیتەکان بەرەو گالیسکەکان رایان کرد.

پێویستە بزانرێت سەربازەکانی ئەم سەردەمە کاتێك بە تۆپێکی دژە تانك یاخۆ بە چەکی بازۆکا بەرەو تانك دەڕۆن تاکو لەکاری بخەن، زۆرتر لەو سەربازە کۆنانە شانسی سەرکەوتنیان هەبوو، کە بەرەو گالیسکە هەخامەنشییەکان دەچوون. سەربازێکی هۆپ لیتی یۆنانی بێننە بەرچاوی خۆتان کە کاسکێتی لەسەر و زرێی لەبەرە و چوار ئاوێنە و قاچبەند، بازووبەند و

نێزەیەکی درێژی بەدەستەوەیە، شمشێرێکی لە کەمەرە و دەیەوێت گالیسکەیەکی جەنگی لەکار بخات.

گالیسکە بە خێرایی چوار ئەسپی سەرکێش، بەرەو لای سەربازە هۆپ لیتەکان دەڕوات، خێرایی ئەسپەکان نێزیکەی خێرایی چل ناڵە، بە پێوەری ئەمڕۆ شەست کیلۆمەتر لە دەمژمێرێکدا دەکات. ئەگەر سەربازەکە لە پێشەوە هێرش بکات، دووچاری داسی گەورە و تیژی گالیسکەکە دەبێت، داسەکە دوو پارچەی دەکات، کەواتە تەنیا چارەسەر بۆی ئەوەیە، کە لە لای چەپ یاخۆ راستەوە هێرش بکاتە سەر گالیسکەکە، تاکو ڕووبەڕووی داسەکە نەبێت، بەڵام گالیسکەکە بە خێرایی شەست کیلۆمەتر تێپەڕ دەبێت، سەربازی هۆپ لیت تاکو بیردەکاتەوە کە خۆی هەڵداتە تەنیشت گالیسکەکە، لەوانەیە گالیسکەکە تێپەڕ بوو بێت یاخۆ خۆی کەوتبێتە بەر تیری سەرنشینە کەوانچییەکانی گالیسکەکان.

سەربازە هۆپ لیتەکانی یۆنانی بۆ کوشتنی ئەسپەکانی گالیسکەکان دوو ڕێگەیان هەبوو: یەکەم ئەوە بوو کە لە پێشەوە هێرش بکەن و خۆیان بخەنە ژێر داسی گالیسکەکان، چوونکە داسەکە بە ناڵبەندەکەوە بەستراوەتەوە، ناکەوێتە ژێر گالیسکەکە، لەو ڕێگەیەوە دەتوانن خۆیان بگەیەننە ئەسپەکان. ڕێگەی دووەم ئەوەیە کە لە لای راست یاخۆ چەپەوە خۆیان بگەیەننە ئەسپەکانی گالیسکەکان، هەر دوو ڕێگە مەترسی مردنیان لێ دەکرێت.

وێڕای ئەوەش سەربازی هۆپ لیت بۆ ڕاگرتنی گالیسکەکان، گیانی خۆیان بەخت دەکرد، سەربازی هۆپ لیت بەو نێزە درێژەوە، کە بە دەستییەوە بوو لە لای راست یاخۆ چەپەوە وەك تیرێك کە لە کەوان دەردەچێت، خۆیان هەڵدەدایە سەر ئەسپی گالیسکەکان. ئەوان بیریان لە ژیانی خۆی نەدەکردەوە، لەو دەمەدا تەنیا بیریان لای ئەوە بوو، کە چۆن ئەسپەکان بکوژن تاکو گالیسکەکە بوەستێت، چوونکە کوشتنی ئەسپێك بۆ وێستانی گالیسکەیەك بەس بوو، چوونکە تاکو لاشەی ئەسپەکەیان لە گالیسکەکە دادەبڕی، ماوەیەکی دەخایاند، لەو ماوەیەشدا سەربازی یۆنانی کاتی بۆ دەستەبەر دەبوو تا سێ ئەسپەکەی دیکەیش بکوژێت یاخۆ سەرنشینەکانی گالیسکەکانیش بکوژن.

کۆلیۆس بە سەربازەکانی خۆی وتبوو کە تاکە شتی هەخامەنشییەکان بەسەر ئێمەوە گالیسکەکانیانە، ئەگەر بتوانین ئەوان لەنێو ببەین، سەرکەوتن بۆ ئێمە دەبێت. کۆلیۆس پێش ئەوەی بێتە جەنگی هەخامەنشییەکان، واتە بە لەوەی بەرەو ئاسیای بچووك بێت،

ڕۆیشتبووە پەرستگەی دۆلفی، لە فالچی پەرستگەی پرسی بوو کە لە خوداوەندکانیان بپرسێت، ئاخۆ ئەو لە جەنگدا سەردەکەوێت یاخۆ نا؟ فالچییەکەی پەرستگەی دۆلفیش وتبووی بەڵێ، بەڵام بەو مەرجەی لەنێو ئاودا نەبێت.

کۆلیۆس وتی من هەرگیز لەنێو ئاودا ناجەنگم، چوونکە لە دەریادا ناجەنگم، ئەوکات بەرەو ئاسیای بچووك کەوتەڕێ. ئەو شوێنەش کە کۆلیۆس تیایدا دەجەنگا، هەرچەندە لە تەنیشت ڕووبارەوە بوو، بەڵام ئاوی لێ نەبوو، سوپای یۆنان لەنێو ئاودا نەدەجەنگان.

سەربازە هۆپ لیتەکان دەستیان لە گیانیان هەڵگرتبوو، زیانی سەختیان بە گالیسکەکان گەیاند، بەڵام دەستەیەك لە گالیسکەکان لە لای ڕاستی هەخامەنشییەکان کە دەبۆوە لای چەپی یۆنانییەکان، پێشڕەویان دەکرد، چوونکە سەربازی هۆپ لیت لەو شوێنە نەبوون، کۆلیۆس کە گالیسکەکانی لە نێوەندی سوپای هەخامەنشیی بینی بوو، هۆپ لیتەکانی لە نێوەندی سوپای خۆی دانابوو.

لە لای ڕاستی هەخامەنشییەکانەوە سەربازە پیادەکان لە دوای گالیسکەکانەوە هێرشیان کرد، لە پشت ئەوانیشەوە بورجەکان جووڵە، کاریگەریی ئەو بورجانە ئەوە بوو، کە ئەوان لە شوێنێك کە دوور بوو، لە شوێنی پێکدادانی ڕاستەوخۆ، بە بەرد و تیر لە سەربازانی دوژمنیان دەدا و ئەوانیان پەست و تەنگەتاو دەکرد، ئەوانیش نەیاندەتوانی تۆڵە بکەنەوە، تیر و بەردەکانیان نەدەگەیشتە بورجەکان، ئەگەر گەیشتباش ئەوا سەربازەکان لەنێو بورجەکان لە پەنا دیوارەکان بوون، زۆر زیانیان پێ نەدەگەیشت. کەموکورتی بورجەکان برێتی بوو لە قورسی ئەوان، نەیاندەتوانی ئەوان لەگەڵ لەشکر بگوازنەوە، تەنیا لەو شارێیانە نەبێت کە فەرماندەکانی هەخامەنشیی چێیان کردبوون.

پەریساتیس کاتێك بینی سەربازەکانی لە لای چەپی یۆنانییەکان لە پێشڕەویدان، ناوەندی سوپاش بۆتە گۆڕستانی گەورەی گالیسکەکانی، فەرمانیدا تا هێرش و گووشار بۆ لای چەپ پتر بکەن، تاکو بتوانن بەرگریی لای چەپ لەنێو ببەن و خۆیان بگەیەننە پشت کۆلیۆس، ئەگەر توانیبایە بگاتە پشت کۆلیۆس، سوپای یۆنان شکستی دەهێنا.

کۆلیۆس کاتێك گووشاری سەختی هەخامەنشییەکانی لە دڵ و لای چەپی لەشکرەکەی بینی، سەربازەکانی لای ڕاستی خۆی وەك یەدەك نەجووڵاند تاکو ئەگەر دۆخەکە توند بوو، سوود لە سەربازە حەساوەکانی لای ڕاست بۆ بەهێزکردنی ناوەند و لای چەپ وەربگرێت.

پیادە هەخامەنشییەکان لە لا راستی خۆیان لەگەڵ ئەو سەربازانەی یۆنان دەجەنگان، کە لە ڕووی بایەخی جەنگییەوە هاوتای خۆیان بوون. نە پیادە هەخامەنشییەکان زرێیان لەبەر بوو، نە سەربازە یۆنانییەکان، هەردووکیان بە شمشێرە درێژ و راستەکان دەجەنگان، هەردوو لا قەڵغانیان هەبوو، تێدەکۆشان کە بەرانبەرەکەیان بشکێنن، هەریەکەیان بۆ ئەو مەبەستە جۆرێك لە هونەرە جەنگییەکانی بەکار دەهێنا، کە لە تەواوی گۆڕەپانی جەنگەکەدا لە چەند جۆرێکی تێپەڕ نەدەکرد.

یەکێك لە تاکتیکەکان ئەوە بوو، کە وایان دەردەخست دەیانەوێت قاچی بەرانبەر بپێکن و دوژمن بە بینینی هەڕەشە لەسەر قاچەکانی، قەڵغانەکەی نەوی دەکرد، بەوەش بەشی سەرەوەی جەستەی بێ پارێزگاری دەمایەوە، سەربازەکەی کە وای دەرخستبوو هێرش بۆ قاچەکانی دەکات، بە خێرایی شمشێرەکەی ئاراستەی قاچ یاخۆ سینگ و ڕووخساری دەکرد، هەندێکجار شمشێرە درێژ و نووك تیژ و دوو دەمەکان تا نێوەڕاستیان لەنێو جەستەی بەرانبەر دەچەقی و شەرڤانەکەش دەکەوت.

تاکتیکێکی دیکە ئەوە بوو، سەربازەکە وای دەردەخست کە بریندارە و خۆی دەچەماندەوە، سەربازی دوژمن خۆپارێزی نەدەکرد، قەڵغانی دوور دەخستەوە، ساتێك دواتر بەر شمشێری سەربازی بەرانبەری دەکەوت. یەکێك لە تاکتیکە کاریگەرەکان گۆڕینی شوێنی قەڵغانەکە بوو، کە هەموو کەس ئەوەی بۆ نەدەکرا و نەیدەتوانی قەڵغانەکە بە دەستی راست بگرێت و بە دەستی چەپ شمشێر بوەشێنێت، ئەگەر توانی بایە شوێنی قەڵغان بگۆڕێت، بە دڵنیاییەوە دەیتوانی سەربازی دوژمن لەنێو ببات. ئەوانەی بە دەستی راست شمشێریان دەوەشاند، بە ناچاری قەڵغانی دوژمنیان کە لە دەستی راستیدا بوو، لە بەرانبەر خۆی دەبینی، چوونکە شمشێرکێشان بە قەڵغاندا بێ سوود بوو، هەوڵی دەدا بەشێك لە جەستەی دوژمن بدۆزێتەوە کە نەپارێراو بێت و هێرشی بکاتەسەر.

گالیسکە جەنگییەکان لە لای چەپی یۆنانییەکان رێگەیان دەکردەوە و پێشڕەویان دەکرد، لە پشتیشیانەوە پیادە هەخامەنشییەکان، هێرشیان بۆ سەر پیادە یۆنانییەکان دەکرد.

کۆلیۆس لە لای راستی خۆی پیادەکانی نەخستنە جەنگەوە، بەڵام شاژنی هەخامەنشیی فەرمانی کرد سەربازە پیادەکانی لای چەپی لەشکرەکەی هێرش بکەنە سەر لای راستی لەشکری یۆنان و بورجە جووڵاوەکان پاڵپشتی پیادەکانیان دەکرد و بەرد و تیریان بەسەر یۆنانییەکاندا

دەباراند، دوای تێپەڕبوونی ماوەی نیو دەمژمێر لە جەنگ لە لای ڕاست، دەرکەوت کە لە ئەو بەشەدا یۆنانییەکان بە باشی بەرگری دەکەن، هۆکارەکەشی ئەوە بوو، کە پەریساتیس لە لای چەپی لەشکرەکەیدا گالیسکەی نەبوو، هەموو گالیسکەکانی لە نێوەند و لای ڕاستی لەشکرەکەی خۆیدا بەکارخستبوون.

دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان و حیلەی ئەسپەکان و سرِوودی سەر لێوی جەنگاوەران و موزیکی جەنگ تەواوی مەیدانی جەنگی داگیرکردبوو، نەعرەتەی جەنگاوەرەکانیش پسانەوەی نەبوو. لەو کاتەدا کە دەنگەکانی نێو گۆڕەپانی جەنگ دەگەیشتە ئەو کەسانەی دەرفەتی گوێگرتنیان هەبوو، دەنگێکی دیکە هاتەبەر گوێ، کە جیابوو لە دەنگەکانی مەیدانی جەنگ، هەرکە دەنگەکە بیسترا، زانیان ئەو دەنگە جیایە لەو دەنگانەی کە مرۆڤ یاخۆ ئاژەڵ دەتوانێت دەریان بکات، لە سەرووی ژیانی ئاسایی مرۆڤەکان و ئاژەڵەکانەوە دێت.

کاتێك ئەو دەنگە بەرگوێی جەنگاوەرەکان کەوت کە دەرفەتیان هەبوو دەنگەکە ببیستن، ئازاترینی ئەوان لە ترسان لەرزی، چوونکە مرۆڤ هەرچەندە ئازا و دلێر بێت، لەو جەنگانە دەترسێت کە لە جیهانی ژیانی ئاسایی ئەو دەردەچن، پەریساتیسیش وێڕای ئەو هەموو ئازایەتی و بوێریەی هەیبوو، کاتێك ئەو دەنگەی بیست لە ترسا چریکاندی.

ئەوکاتەی کە دەنگەکە گەیشتە بەر گوێ، ئەسپەکان لە هەردوو گۆڕەپانی جەنگی یۆنانی و هەخامەنشییدا جووڵەی نائاساییان دەست پێکرد، باڵندەیەکی زۆر ئاسمانیان داپۆشی، بە دەنگە دەنگێکەوە کە دەزانرا لە ترسەوەیە، بە ئاسماندا دەڕۆیشتن، کاتێك جەنگاوەرەکانی هەردوولا بینیان کە ناتوانن لەسەر قاچەکانیان بوەستن، هەندێك لە ئەوان بە ڕادەیەك بە توندی بەر زەوی کەوتن، کە نەیاندەتوانی هەستنەوە، ئەسپی گالیسکەکان وێڕای ئەوەی لە گالیسکەکان بەسترابوونەوە، کەوتنەسەر زەوی، بورجە جووڵاوەکانی ئێرانییەکان سەراوژێر بوون و سەرنشینەکانیان کوژران یاخۆ بریندداربوون.

کۆمەڵە دەنگێك دەگەیشتە بەرگوێی سەربازەکانی هەردوولا، کە لە دەنگی دنیا خراپبوون دەچوو، هاوکات دووکەڵێکی ئەستوور لە زەوییەوە بەرز بۆوە و بەرەو ئاسمان چوو، هێندە ئەو دووکەڵە چڕبوو کە بەری ڕووناکی هەتاوی گرت، لەو دەمەدا کە دەنگەکان بەردەوام بوون، لافاو گۆڕەپانی جەنگی هەخامەنشییەکانی داگیرکرد، لە ئەوێوە بەرەو گۆڕەپانی یۆنانییەکان ڕۆیشت.

هیچ کەس لەو کاتانەدا کە ئەو ڕووداوانە ڕووی دەدا نەیدەتوانی بڕیار وەربگرێت یاخۆ بیر بکاتەوە.

کۆلیۆس لە سوپای یۆنان و پەریساتیس لە سوپای هەخامەنشییدا خۆیان ون کردبوو، هەموو ئەفسەرە یۆنانی و هەخامەنشییەکانیش لە ترسان نەیاندەزانی دەبێت چ بکەن، چجای سەربازەکان. تەنیا هێندەیان زانی کە بوومەلەرزەیەك لەو ڕووداوەدا هەیە، بەڵام بەهێزتر و تووندتر لە تەواوی ئەو بوومەلەرزانەی بینیویانە. بە هۆی ئەو بوومەلەرزەیەوە، کە یەکێك بوو لە تووندترین بوومەلەرزەکانی ئاسیای بچووك، هەندێ لە شاخەکان پرژان و ڕووخان، زەوی بە شێوەیەك شەپۆلی دەدا، کە ڕێڕەوی ڕووباری هالیس لەو شوێنە گۆڕا، ئاو بەرەو رۆژئاوا کەوتە جووڵە و گەیشتە گۆڕەپانی جەنگی هەخامەنشییەکان، دواتریش گەیشتە یۆنانییەکان.

ڕێژەی ئاو لەنێو ئەو پێدەشتە هێندە نەبوو، کە بتوانێت هەمووان نقووم بکات، سەربازەکان، گالیسکەکان، ئەسپەکان و شتەکانی دیکە ببات، بەڵام ئاو هەموو پێدەشتەکەی گرتەوە، کەس نەیتوانی ماوەی بوومەلەرزەکە دەست نیشان بکات.

دەی نۆن نووسیویەتی کە ماوەی بوومەلەرزەکە چەند کاتژمێرێك بووە، ئەو بابەتە زێدەڕۆییە، ئەگەر بوومەلەرزە چەند کاتژمێر بخایەنێت، نەتەنیا ئاسیای بچووك، بگرە بەشەکانی دیکەی ئاسیای رۆژئاواش بۆ هەردەم لەنێو دەچوون.

جووڵەی توووند و سەرەتایی بوومەلەرزە بە شێوەیەکی ئاسایی لە نێوان چەند چرکە تاکو دوو خولەك و  پتریش دەبێت، پێشینان وەك ئەمڕۆ ئامێری وردی پێوانەکردنی بوومەلەرزەیان نەبوو، تاکو ماوەکەی و گوڕەکەی دەست نیشان بکەن، تەنانەت ئێستەش ئەوانەی کاتژمێریان لایە، لە کاتی بوومەلەرزەدا بە شێوەیەك دەترسن کە دیسان پێوانەکردنی کاتەکەیان لێ تێك دەچێت، ئەو پێوانەکردنانە لەلایەن ناوەندەکانی بوومەلەزە و کەشناسی و لە مەودای دوورتر لە شوێنی ڕووداوەکەدا دەپێورێت.

ئەگەر ڕێڕەوی ڕووباری هالیسیش نەگۆڕابووایە، دیسان هەرچەند دەوەستا، گۆڕانی ڕێڕەوی ئەو ڕووبارە لەو شوێنە بووە هۆی وەستانی جەنگ بە یەکجاری و پێشبینی فاڵگرەوەی پەرستگەی دۆلفی راست دەرچوو، ئاو گۆڕەپانی جەنگی یۆنانییەکانی بە تەواوی داگیرکرد، ڕووباری هالیس لەو پێدەشتەدا بەرەو رۆژئاوا رۆیشت، ئەمەش بووە ڕێگر و بەربەست، بەرەو باکور و رۆژهەڵات رۆیشت و گەڕایەوە ناو ڕێڕەوی جارانی خۆی.

# جەنگی دوو برا

لەوکاتەوە کە سەردەمی پێش مێژوومان تێپەڕاندووە و هاتووینەتە نێو مێژوو، زۆر ناوی کەتزیاسی یۆنانی دەبەین، وتەکانی بە گەواهیدەر دێنینەوە، ئێستە کاتی ئەوەیە کە باسی ئەو پزیشك و مێژوونووسە بکەین، ئەو بە بۆنەی ئەو بابەتانەی لەبارەی مێژووی ئێران نووسیویەتی شایستەی ئەو باس کردنەیە.

پێش هاتنی بوومەلەرزە و وەستانی جەنگ، لەشکری هەخامەنشیی ژمارەیەك سەربازی یۆنانییان دیل کرد بوو، یەکێك لە دیلەکان پزیشکێکی نێو لەشکرەکە بوو بە ناوی (کەتزیاس). بالآی ئەو پیاوە مامناوەند و مووەکانی ڕەش و چاوەکانی خۆڵەمێشی بوون، وەك خۆی باسی دەکات ئەو رۆژەی بە دیل گیرا تەمەنی سی و شەش ساڵ بوو.

پێش دەستپێکردنی جەنگ لە کەنارەکانی هالیس، پەریساتیسی شاژنی هەخامەنشیی و فەرماندەی لەشکر، هەستی بە ئازاری قاچی کرد، دوای بڕانەوەی جەنگ ئازاری پتر بوو، ئەو پزیشکانەی لە لەشکرەکەی بوون، توانایان نەبوو چارەسەری ئازارەکەی بکەن، ئەفسەرەکان هەواڵیان گەیاندە شاژن کە لە نێوان دیلە یۆنانییەکان، پزیشکێکی تێدایە، شاژن فەرمانی کرد ئەو بێننە لای و وتی: من دووچاری ئازاری قاچەکانم بووم، ئایا تۆ دەتوانی من چارەسەر بکەی و ئازاری قاچم نەهێڵیت یاخۆ کەمی بکەیتەوە؟.

کەتزیاس کۆمەڵە پرسیارێکی سەبارەت بە ئازارەکە لە شاژن کرد، تاکو بزانێت ئازارەکە لە کوێیە و چ کاتێك ئازارەکە پتر دەبێت، بەڵێنیدا ئازاری قاچی شاژنی هەخامەنشیی بنبڕ بکات، بۆ ئەم مەبەستە دەرمانێکی پێدا کە لە یۆنانی بە (کۆلێن سێن)(١) ناو دەبرێت. کۆلێن

---

(١) ئەو دەرمانە لە زمانی فارسی بە (قۆلێنجان) ناسراوە، لە زمانە ئەورووپییەکانی ئێستە بە (کۆلێن شین) ناو دەبرێت، شیلەکەی بە ناوی (کول شی سین) بۆ نەهێشتنی ئازاری قاچ لە دەرمانخانەکان دەفرۆشن. "زەبیحوڵڵا"

سێن وەك هەموو دەرمانەكانی دیكەی ئەوكات ڕووەكی بوو، كەتزیاس چەند جارێك شیلەی ئەو ڕووەكەی دایە پەریساتیس و ئازارەكانی پەریساتیس نەما.

بە هۆی سەركەوتنی لە چارەسەر كردنەكە، ئەستێرەی بەختی كەتزیاس درەوشایەوە، پەریساتیس بانگهێشتی پزیشكە یۆنانییەكەی كرد تاكو خەڵات یاخۆ پاداشتی بكات.

كەتزیاس دیل بوو، جەنگی نێوان یۆنان و هەخامەنشییەكان بەردەوام بوو، كەس نەیدەزانی كەی كۆتایی دێت، كەتزیاس دەبووایە تا كۆتایی جەنگ بە دیلی بمێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر بیست ساڵیشی خایاند بووایە، بەڵام ئەگەر هاتبایە بەر خزمەتی شاژنی ئێران لە دیل بوون رزگاری دەبوو، دەبووە یەكێك لە پیاوانی كۆشك. هێندە یۆنانی دەڕۆیشتنە ئێران و لەوێندەر دەمانەوە، بۆیە چوونیان بۆ خزمەتی یەكێك لە گەورەكان لە كۆشكدا، نائاسایی نەبوو، كەتزیاسیش بیانووی تایبەتی هەبوو بۆ هاتنی بۆ خزمەتی شاژن، لە بەردەم هاونیشتمانییەكانی دەیوت من دیلم و دەبێت بەرفەرمان ببم بۆ هەموو ئەو شتانەی پێم دەوترێت.

بەم شێوەیە كەتزیاس هاتە خزمەتكردن بە پەریساتیس شاژنی هەخامەنشیی، دواتر كەوتە خزمەتی ئەردەشێری دووەم پاشای هەخامەنشیی و كوڕی پەریساتیس.

كەتزیاس پیاوێك بوو كەڵكەڵەی خوێندنی هەبوو، دوای ئەوەی هاتە خزمەت شاژن، زمانی فارسی فێر بوو، ئینجا هەرچی لە ئێران دەبینی و دەیبیست، دەینووسییەوە. ئەگەر ئەو پەڕتووكانەی كەتزیاس لە ماوەی مانەوەی لە ئێران نووسیویەتی تا ئێستە مابان، سەبارەت بە مێژووی هەخامەنشییەكان هێندەمان زانیاریی دەبوو كە لەبارەی مێژووی سەردەم نەماندەبوو، چوونكە كەتزیاس تەنیا مێژووی سیاسیی نەنووسیوەتەوە، بگرە سەبارەت بە جوگرافیا و فولكلۆری ئێران و ئاژەڵ و ڕووەكەكان و ڕەگەز و نەتەوە جیاكانی ئێران پەڕتووكی نووسیون، مێژوو و ژیانی ئەوانی بە وردی باس كردووە، ئەگەر ئەو پەڕتووكانە نەفەوتایەن، ئێمە لەبارەی مێژووی كۆنی ئێران تا سەردەمی خودی كەتزیاس پڕ زانیاریی دەبووین.

كەتزیاس هێندە پەڕتووكی نووسیون كە مرۆڤ دووچاری سەرسووڕمان دەبێت لەوەی ئەو چ كاتێك سەرگەرمی پزیشكی و نان خواردن و نووستن دەبوو، هەموو ئەو پەڕتووكانەش پێوەستبوون بە ئێران، تەنیا یەك پەڕتووكییان لەبارەی مێژووی هیندستان بوو، كە وەك هەریەكە لە پەڕتووكەكانی دیكەی لەنێوچوو، هۆی لەنێوچوونی ئەو پەڕتووكانە ئەوە بوو، كە كەتزیاس بۆ مەبەستی پاراستنی پەڕتووكەكانی، هەموویانی بە پەڕتووكخانەی پاشایەتیی لە

کۆشکی پێرسپۆلیس سپاردبوو، ئەسکەندەری مەکدۆنی دوای ئەوەی هاتە ئێران، ئەو کۆشکەی ئاگر تێبەردا، تەواوی پەڕتووکەکان، لەنێویاندا پەڕتووکەکانی کەتزیاس سووتان و لەنێو چوون.

وەك زانراوە لە رابردوودا پەڕتووکەکان تەنیا یەك دانەیان لێ دەنووسرایەوە، ئەگەر ئەو دانەیە لەنێو چووبایە، پەڕتووکەکە لەنێو دەچوو. لە سەردەمی ژیانی کەتزیاسدا، کەسێکی یۆنانی بە ناوی (فۆتۆس) هەوڵ دەدات دانەیەك لە پەڕتووکی (پرسیکا) بۆ خۆی بنووسێتەوە، (پرسیکا) بە واتای (ئێراننامە) یاخۆ (مێژووی ئێران) دێت، کە فۆتۆس دانەیەکی لێ نووسییەوە و بۆ یۆنانی برد، تەنیا ئەو پەڕتووکەی کەتزیاس لە دەستی لەنێو چوون ڕزگاری بوو، ئێستە هەرچی لە زمانی کەتزیاسەوە لەلایەن مێژوونووسان دەوترێت، لەو پەڕتووکەوە وەرگیراوە.

راولین سۆنی بەریتانی کە لە سەدەی نۆزدەیەم نووسراوی بێستوونی لە کرماشان خوێندەوە، رەخنەی لە هەندێ لە بەشەکانی مێژووی کەتزیاس گرت، کە ئێستە لەبەر دەستمانە، هەندێ لەو بەشانە تایبەتن بە کاتی پاشایەتیی داریوشی گەورە، کە لەگەڵ نووسینەکانی کەتیبەی بێستووندا کۆك نین، چوونکە ناتوانرێت گومان لە ڕاستی نووسینی کەتیبەکانی بێستوون بکرێت، بە ناچاری دەبێت بیرۆکەکانی راوڵین سۆن پەسەند بکەین، بەڵام وێڕای ئەوەی بە وتەی راولین سۆن، هەندێ بەش لە پەڕتووکی پێرسیکا لەگەڵ کەتیبەکان کۆك نین، دیسان لەبەرئەوەی ئەو پەڕتووکە بە کەشاکەکانی نووسەر دێنە ناسین یاخۆ ئەو بە چاوی خۆی بینیویەتی، جێگەی سوودە، بە هۆی ئەوەی کەتزیاس لە سەروبەندی مانەوەی لە ئێران یەکێك بووە، لە پیاوانی کۆشکی هەخامەنشیی، ئەو بابەتانەی باسیان دەکات بەڵگەنامەن، چوونکە خۆی بە چاوی خۆی بینیویەتی، لەوانەش کوژرانی زاوای پەریساتیس بەدەستی خودی ئەو ژنە.

* * *

(تری تۆشم) زاوای داریوشی دووەم و پەریساتیس بوو. کەتزیاس دەڵێت لە ئێران کچی جوانتر لە (ئامیس تریس) کچی داریوشی دووەم و پەریساتیسی لێ نەبوو، پیاوێك بە جوانی تری تۆشمیش نەدەدۆزرایەوە. ئەو کوڕ و کچە هێندە جوان بوون، کە کاتێك مرۆڤ چاوی تێدەبڕین، نەیدەتوانی چاو هەڵبگرێت.

داریوشی دووەم فەرمانڕەوایی ئاشوورستانی بە تری تۆشم سپارد بوو، نابێت ئاشوورستان لەگەڵ ئەو ئاشوورستانە کە لەساڵی (٦١٢ پ. ز) بە دەستی پاشای ماد لەنێو چوو بە یەك بزانین، بگرە ئاشوورستان بەشێك بوو لە ئاشووری کۆن، کە دەکەوتە باکوری میزووپۆتامیا، لە سەردەمی هەخامەنشیی و ئەشکانی و ساسانییەکان بە ئاشوورستان ناودەبرا.

ئامیس تریس لە ئاشوورستان بە هۆی جوانییەکەیەوە سەرەنجی زۆر لە گەورەکانی ئەوێی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، بووە هۆی ئەوەی ببێتە جێی گومانی هاوسەرەکەی و پەنا بۆ کوشتنی ببات. ئامیس تریس بێ ئاگەداری مێردەکەی هەواڵی بە دایکی واتە پەریساتیس گەیاند، کە گیانم لە مەترسیدایە، تری تۆشم دەیەوێت بمکوژێت، هێندە سنوورداری کردووم کە ناتوانم هەڵبێم و بێمە لای تۆ.

بە وتەی کەتزیاس، تری تۆشمیش پەیامێکی دیکەی بۆ پەریساتیس نارد و وتی: کچەکەت تەنیا دەبێت هی من بێت، بە پێچەوانەوە من دەیکوژم بۆ ئەوەی نەبێتە هی خەڵکی دیکە.

پەریساتیس دوای وەرگرتنی پەیامی تری تۆشم، لەگەڵ گاردی تایبەتی پاسەوانی خۆی و ژمارەیەك گالیسکەی جەنگی کەوتەڕێ بەرەو ئاشوورستان و پێی وت: ئایا بە چاوی خۆت بینیوتە کە کچەکەم ناپاکیت لێ بکات.

تری تۆشم وتی: نەخێر ئەی پەریساتیس.

خەسووی پرسیاری کرد: ئەی کەواتە چوون دەتەوێت بیکوژی؟

تری تۆشم وتی: گومانم بەرانبەری هەیە.

پەریساتیس پرسیاری کرد: ئایا دەتەوێت کچەکەم بکوژی؟

تری تۆشم وتی: چارەیەکی دیکەم نییە.

پەریساتیس وتی: وەرە پێشەوە تا شتێکت بە گوێدا بچرپێنم.

تری تۆشم بە گومانی ئەوەی خەسووی دەیەوێت شتێکی بۆ باس بکات، لێی نێزیك بۆوە، پەریساتیس ئەوی لەسەر لاچاو ڕاگرت تا بە رواڵەت بابەتێکی بۆ باس بکات، لەپڕ خەنجەرێکی کە هیچ کات لە خۆی دوور نەدەخستەوە و بەردەوام بە کەمەرییەوە بوو، لە کالان دەرکرد و بە یەك لێدان تا دەسکەکەی لە سینگی رۆچوو. تری تۆشم هاوارێکی لێ هەستا و کەوت.

پەریساتیس ئامیس تیسی کچی بانگ کرد و سواری گالیسکەی کرد و لە ئاشوورستان گەڕایەوە، تری تۆشم دەست بەجێ گیانی سپارد و تەرمەکەی لەوێندەر نێژرا، پەریساتیس هێندە بە لەسەرخۆیی ئەو پیاوەی کوشت کە ژنانی دیکە ناتوانن بەو شێوەیە چۆلەکەیەك بکوژن.

هەندێ مێژوونووس ئەو ڕووداوەیان بە شێوازی دیکەیش باس کردووە، کە بەم شێوەیە: "تری تۆشم ویستوویەتی لەگەڵ (ڕۆکسانا) کە خوشکی بووە، ببنە هاوسەر، ئامیس تریسی هاوسەری ئەو بابەتەی بە پەریساتیسی دایکی گەیاندووە و داوای یارمەتی لێ کردووە، پەریساتیسیش زاواکەی خۆی کوشت، دواتر باوك و دایك و ئەندامانی دیکەی بنەماڵەکەیانی کوشت، ویستی (ئەستاتێرا)ی خوشکی زاواکەشیان بکوژێت، بەڵام (ئارسیکاس)ی کوڕی پەریساتیس، هاوسەرەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست، داوای لە ئەو و داریوشی دووەم کرد تا دەست لە کوشتنی ئەستاتێرا هەڵبگرن، هەرچەندە پەریساتیس لە بووکەکەی زۆر بێزار ببوو، بەڵام لە بەرانبەر پاڕانەوە و تکای کوڕەکەی دەستی لەو کارە هەڵگرت.

مێژوونووسە کۆنەکان ناوی (ئارسیکاس)یان بە شێوەیەك نووسیوەتەوە، بۆیە ئەو ناوە لە پەڕتووکە کۆنەکانی یۆنان بە (ئارسیك) یاخۆ (ئەسك) یان (ئەشك) هاتووە، هەمان کوڕی پەریساتیسە، کە دواتر بە ناوی ئەردەشێری دووەم دەبێتە پاشای هەخامەنشیی.

زۆر زوو لە نێوان پەریساتیس و ئەستاتێرای بووکی ناکۆکی سەری هەڵدا، وەك نەریت ئەو ناکۆکییانەی لە نێوان بووك و خەسوو ڕووی دەدا لەسەر بابەتی بچووك و بێ نرخی وەك جلوبەرگ و ڕازاندنەوەی پرچ دەهاتە کایەوە.

دوو هەزار پێنج سەد ساڵ بەر لە نها هەر وڵات و هەندێ کات هەر شارێك بۆ ڕازاندنەوەی زوولفی ژن و پیاوان مودێلی تایبەتیان هەبوو، هەندێ جار ژن و پیاوان لاسایی مۆدێلی شار یاخۆ وڵاتانی دیکەیان دەکردەوە.

تاکە مێژوونووسی ئێرانی سەردەمی هەخامەنشییەکان کە ناوی (پرۆس) بووە، پەڕتووکەکەی بە هۆی یۆنانییەکانەوە پارێزراو بووە، باس لە کۆمەڵێك مۆدێلی پرچی پیاوان و ژنان دەکات، لەوانەش: (سەردی واتە تایبەت بە پایتەختی لیدی، بابلی، شووشی، مەسلی واتە تایبەت بە ماساڵ پایتەختی تالێش کە هێشتا بەو ناوەیە، پارتی و پارسی.)

له رابردوو تەنیا ژنان له مۆدیلەکان لاساییان نەبوو، بگره پیاوانیش لاسایی مۆدیلەکانیان دەکردەوە و ئارایشکاره بازاڕییەکان برەویان هەبوو.

پەریساتیس بە روالّەت مۆدێلی جلوبەرگ و ئارایشی زوولفی ئەستاتیرای بووکی خۆی پەسەند نەدەکرد، ئارسیکاس ـ ی هاوسەرەکەی خۆی خۆشدەویست، بەلاّم له ترسی ئەوەی دایکی دەست نەبات بۆ کوشتنی هاوسەرەکەی، داوای کرد رەوانی بکەن بۆ ئیّسپارت، پەریساتیس و داریوش ڕەزامەندیان بۆ داواکەی نواند، ئارسیکاس لەگەڵ ژنە گەنجەکەی بەرەو ئیّسپارت رۆیشتن.

ناردنی ئارسیکاس کوڕە گەورەی پاشای هەخامەنشیی بۆ ئیّسپارت دوو هۆکاری هەبوو، یەکەم دیار بوو کە ئارسیکاس دەیەویست هاوسەرە خۆشەویست و جوانەکەی له دایکی دوور بخاتەوە، هۆی دووەمیش بە وتەی میّژوونووسان میّژوویی بووە، پەریساتیس ویستوویەتی بەو ریّگەیەوە جیاوازیی بخاتە نیّوان نەتەوە یۆنانییەکان.

وەك زانراوە تەنانەت له سەردەمی جەنگە دریّژخایەنەکانی یۆنان و هەخامەنشییەکان کە له سەردەمی داریوشی یەکەم دەستی پیّکرد، تاکو سەردەمی ئەردەشیّری دەستدریّژ بەردەوام بوو، بەردەوام هەندیّ له نەتەوە یۆنانییەکان لەگەڵ هەخامەنشییەکان دۆست بوون، بە هەمان شیّوە کە ئەمەریکا لە دوای دووەمین جەنگی جیهانی یارمەتی هەندیّ لە نەتەوەکانی جیهانی دەدا، پاشاکانی هەخامەنشییش یارمەتی نەتەوەکانی دیکەیان دەدا، بە تایبەتی یۆنانییەکان، ئەو یارمەتییانە دۆستایەتی ئەو نەتەوانەی بۆ ئیّران دەپاراست، بۆ نموونە نەتەوەی ئیّسپارت لەگەڵ ئیّران دۆست بوون، زیّڕی پاشاکانی هەخامەنشیی هۆکار بوو بۆ فەرامۆشکردنی بیرەوەری ناخۆشی کوژرانی سیّ سەد سەربازی ئیّسپارت و پاشاکەیان (لئیۆنیداس) لەلایەن ئیّسپارتییەکانەوە.

پەریساتیس دەیویست ئیّسپارت ئیّسپارت و ئەگەر بکریّت نەتەوەکانی دیکەی یۆنان، له دژی ئەسینا ڕابکیّشیّتە نیّو جەنگ، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە دەبووایە لە ئیّرانەوە نویّنەریّك بچیّتە یۆنان، کە پایەیەکی گرینگی هەبیّت، ئاخۆ چ نویّنەریّك لە کوڕە گەورەی پاشا باشتر دەبیّت؟.

ئارسیکاس توانی لە ئیّسپارت ئاگری جەنگ لە نیّوان ئیّسپارت و ئەسینا خۆش بکات، لە ماوەیەکی کەمدا دەوڵەتە شاری تسالیش هاتە پاڵ ئیّسپارت، ئەسینا ناچار بوو ئەو هیّزەی لە ئاسیای بچووك هەیبوو، بیگەڕیّنیّتەوە، ئیّسپارت و تسالی تا ساڵی (٤٠٤ پ. ز) بەو زیّڕەی

لە هەخامەنشییەکان وەریان دەگرت لەگەڵ ئەسینا جەنگان، ئەوکات ئەسینا بە ڕادەیەك لاواز ببوو کە نەیتوانی لەسەر جەنگ بەردەوام بێت، ناچار لەژێر هەندێ مەرجی قورسدا لەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتە شارە ڕێك کەوت.

لە بەهاری (٤٠٤ پ. ز) نەتەوە یۆنانییەکان ئاشتییان پێکەوە ڕاگەیاند، لە هاوینی هەمان ساڵ داریوشی دووەم، کە ماوەیەکی زۆر بوو بێ توانا بوو، نەخۆش کەوت.

تا ئەو دەمە ڕێگە نەدرابوو بە کەتزیاس کە داریوشی دووەم چارەسەر بکات، بەڵام بە هۆی سەختی نەخۆشییەکەی کەتزیاسیان هێنایە سەرینی، ئەویش پرسیاری زۆری لێکرد تا بتوانێت نەخۆشییەکەی بدۆزێتەوە، لە کاریگەریی و دەرکەوتەکانی نەخۆشییەکەی پرسی، دواجار وتی: نەخۆشی پاشا هەوکردنی گورچیلەکانە.

داریوشی دووەم پرسیاری کرد: ئەو نەخۆشییە چۆن چارەسەر دەکرێت؟

کەتزیاس وتی: خواردنی هەموو ئەو خواردەمەنییانەی ئاودارن، یەکجار بەسوودە لەو ڕووەوە.

وەرز هاوین بوو، شووتی و کاڵەك زۆر بوو، کەتزیاس بە هاوڕێیانی پاشای وت هێندەی تواناپان هەیە کاڵەك و شووتی بە پاشا بدەن، بەڵام ماوەیەك بەسەر نەخۆشی داریوشی دووەمدا تێپەڕ ببوو، نەخۆشییەکە تەشەنەی سەندبوو، وێڕای ئەوەی نەخۆش بە فەرمانی پزیشك زۆری لەو چارەسەرانە دەخوارد، چاك نەبۆوە، بەر لە تەواوبوونی وەرزی هاوین مرد.

سەبارەت بە منداڵەکانی داریوشی دووەم جیاوازیی لە بیروڕای مێژوونووسەکاندا هەیە، کەتزیاس لە زمانی پەریساتیس دەڵێت کە ئەو یازدە منداڵی هەبووە، بەڵام کەتزیاس خۆی تەنیا ناوی حەوت کەسیانی هێناوە، کە دووانیان لە مێژوودا ناسراون (ئەردەشێری دووەم و کوروش)بوون، یۆنانییەکان بۆ ئەوەی کوروش لەگەڵ کوروشی یەکەم تێکەڵ نەبێت، بە کوروشی بچووك ناویان بردووە، لەوانەیە بەهۆی ئەوەی کوروش بچووکترین منداڵی پەریساتیس بوو، لای ئەو زۆر خۆشەویست بوو، بە شێوەیەکی ئاسایی دایکەکان دوایین منداڵی خۆیان پتر لە ئەوانی دیکە خۆش دەوێت.

کاتێك داریوشی دووەم نەخۆش بوو، پەریساتیس لەگەڵیدا لە ناوچەیەك لە باکوری ئێران بوو، بانگهێشتی کوروشی کوڕی کرد، کە فەرمانڕەوای لیدی لە ئاسیای بچووك بوو، شاری سارد پایتەختی بوو، پەریساتیس داوای لە داریوشی دووەم کرد تا کوروش بکاتە جێنشینی

خۆی، وێڕای ئەوەی داریوشی دووەم لە بەرانبەر هاوسەرەکەیدا پیاوێکی لاواز و بێ دەسەڵات بوو، ئەو داوایەی پەسەند نەکرد، بۆیە دوای مردنی، ئارسیکاسی کوڕە گەورەی بوو بە پاشا، ناوی (ئەردەشێری دووەمی) بۆ خۆی هەڵبژارد.

لە کاتی تاج لەسەر نانی ئەردەشێری دووەم، کوروشی برای بە بیانووی نەخۆشی ئامادە نەبوو، دواتر بە ناوی ئەوەی دەیەوێت داوای لێبوردن لە پاشا بکات، بۆ ئامادە نەبوونی لە ڕێوڕەسمی تاج لەسەر کردنەکەیدا، لەگەڵ سێ سەد سەربازی بە کرێگیراوی یۆنانی بەرەو پایتەخت هات.

گزنفۆن مێژوونووسی یۆنانی لە لەشکری کوروش خزمەتی کردووە، کوروشی زۆر خۆش ویستووە، بە دیارترین شازادەی هەخامەنشیی دوای کوروشی گەورەی دەزانێت، نووسیویەتی لە ئێران جوانتر و قۆزتر لە کوروشی برای ئەردەشێری دووەم نەبوو. گزنفۆن پێی وایە پەریساتیس هاندەر بووە بۆ ئەنجامدانی ئەو سەفەرەی کوروش. ئەو وتبووی نەفرەت لە ئەستاتێرای بووکەکەی خۆی دەکات، کە دەکاتە خێزانی ئەردەشیری دووەم .

دوای ئەوەی ئەردەشێری دووەم بوو بە پاشا، ئەستاتێرای هاوسەری بوو بە شاژنی هەخامەنشیی. پەریساتیس نەفرەتی لە ئەستاتێرا کردبوو، نەیدەتوانی بیبینێت، کە ئەو شاژنی هەخامەنشییە، بۆیە کوروشی کوڕی هاندا تا بە بیانوویەك لە لیدییەوە بێتە پایتەخت و ئەردەشێر لە پاشایەتیی لابدات و خۆی لەسەر تەختی پاشایەتیی دابنیشێت.

کوروش و سەربازە یۆنانییەکانی کە لە هۆپ لیتەکان بوون، هاتنە نێو پایتەخت، کوروش مۆڵەتی لە ئەردەشێری برای وەرگرت بۆ ئەوەی بچێتە خزمەتی، دوو ڕۆژان دوای گەیشتنی بۆ پایتەخت، لەگەڵ سێ سەد سەرباز بەرەو کۆشکی پاشایەتیی کەوتنەڕێ.

لە بەرانبەر کۆشکی پاشایەتیدا ئەفسەری گاردی جاویدی پاشایەتیی، ڕێگەی لە سەربازە یۆنانییەکان گرت و مۆڵەتی نەدا بچنە ژوورەوە، چوونکە هەر کەسێك بۆ بینینی پاشا هاتبایە بۆ کۆشکی پاشایەتیی، خۆی بە تەنیا دەچۆوە لای پاشا، سەربازەکانی لە دەرەوە جێ دەهێشت.

کوروش بە ئەفسەرەکەی گاردی پارێزگاری پاشای وت ئەو سەربازانە لەگەڵ منن، ئەویش دوای دەربڕینی ڕێز بۆ کوروش، وتی بەپێی یاسا ناتوانێت ڕەزامەندی بنوێنێت بۆ چوونی سەربازەکان بۆ نێو کۆشکی پاشایەتیی.

پێش ئەوەی کوروش بچێتە نێو کۆشکی پاشایەتیی، پێشبینی کرد بوو، کە لەوانەیە ڕێگری بکەن لە چوونە ژوورەوەی ە یۆنانییەکان، بە فەرماندەکەیانی وت ئەگەر ڕێگر بوون لە هاتنتان بۆ کۆشکی پاشایەتیی، لە دەرەوەی کۆشك چاوەڕوانی بیستنی دەنگی من بن، بە بیستنی هاواری من کە دەڵێم: (هۆپ لیت فریام بکەون)، وەرنە نێو کۆشك، هەموو ئەوانە بکوژن، کە ڕێگرتان دەبن لە هاتنە ژوورەوە، تا دەگەنە من، ئەوکات کە گەیشتنە لای من پێتان دەڵێم چ بکەن.

کوروش بە تەنیا چۆوە نێو کۆشکی پاشایەتیی و بەرەو شوێنی پاشا ڕۆیشت، پێش چوونە ژوورەوە ئەفسەرێکی گاردی جاوید بە ڕێزەوە لێی نێزیك بۆوە و داوای کرد شمشێرەکەی بداتێ، دوای هاتنەوەی لێی وەربگرێتەوە، بەڵام کوروش بە تووڕەیی لە سینگی ئەفسەرەکەیدا، ئەوی بۆ لایەك هەڵدا و خۆی بەرەو شوێنی پاشا چوو.

ئەو هاوارە گەیشتە بەرگوێی پاشا و یەکێك لە سەرکردەکانی بە ناوی (تیسافرەنس)، کە لە خزمەتی پاشادا بوو، هەردووکیان زانیان ڕووداوێك بە پێچەوانەی یاساکان ڕوویداوە، هاوکات کوروش هاتە نێو بارەگە و بێ بەجێ هێنانی ڕێوڕەسمی پێویست، شمشێرەکەی هەڵکێشا و بەرەو ئەردەشێری دووەم دەستی بە ڕاکردن کرد. ئەردەشێری دووەم بە بینینی ئەو هەستا و بەرەو دواوەی بارەگە ڕایکرد، بەڵام لەوێ دەرگەی لێ نەبوو، ناچار بوو بگەڕێتەوە، بینی تیسافرەنس لەگەڵ کوروشدا سەرقاڵی کێشمەکێشە.

کاتێك تیسافرەنس بینی کوروش بە شمشێری ڕووتەوە بەرەو براکەی ڕادەکات، خۆی هاوێشت و ڕێگەی گرت، کوروش زەربەیەکی توندی لە دەستی چەپیدا و بە سەختی بریندااری کرد، لەگەڵ ئەوەشدا تیسافرەنس کوروشی گرت و نەیهێشت خۆی بگەیەنێتە ئەردەشێری برای، بێگومان لەوکاتەدا تیسافرەنس گیانی ئەردەشێری رزگار کرد.

ئەفسەرەکەی گاردی جاوید کە لە دەرەوە ویستی شمشێری کوروش وەربگرێت، دەنگی هاواری تیسافرەنسی بیست و ڕایکرد و بینی ئەو پیاوە و کوروش لە کێشەدان و خۆی گەیاندە تیسافرەنس بۆ یارمەتیدانی، کوروش شمشێرەکەی لە دەست کەوت و هاواری کرد: (هۆپ لیت فریام بکەون)، بەڵام دەنگی نەگەیشتە ئەوان، لە ئاکامدا نەیانتوانی بێنە یارمەتی کوروش. ئەفسەرەکەی گاردی جاوید بە یارمەتی تیسافرەنس و دوو لە پاسەوانەکان، کوروشیان بەستەوە، لە ژوورێکدا زیندانیان کرد تاکو بزانن ئەردەشێری دووەم چ بڕیاریکی لەبارەوە دەدات.

ئەردەشێری دووەم وتی کوروش زیندانی بکەن، بەڵام پەریساتیس کەوتە نێوانیان و گووشاری زۆری خستە سەر ئەردەشێر تاکو ڕەزامەندی نواند، کە کوروش ئازاد بکرێت و بگەڕێتەوە بۆ شوێنی فەرمانڕەوایی خۆی.

تەنانەت گزنفۆن کە ڕێزی بێ پایانی بۆ کوروش هەبووە، کردەوەی ئەردەشێری بۆ ئازادکردنی کوروش و گەڕاندنەوەی بۆ سەر تەختی دەسەڵاتەکەی، بە هەڵەیەکی گەورەی سیاسیی زانیوە و دەڵێت ئەردەشێر نەدەبوو ئازادی بکات، چوونکە دوای ئەوەی کوروش شکستی خوارد و کەوتە زیندان، بەرانبەر ئەو کینەی ڕاستەقینەی پەیدا کرد، دوای ئەوە تاکە ئامانج لە ژیانی تۆڵەکردنەوە لە ئەردەشێری برای و لادانی ئەو لە تەختی پاشایەتیی.

کوروش سەرەتا بۆ لادانی ئەردەشێر لە پاشایەتیی هەوڵیدا لەگەڵ یۆنانییەکان یەك بگرێت و لەشکرێکی بەهێز لە سەربازەکانی خۆی و یۆنان چێ بکات و بچێت بۆ جەنگی ئەردەشێر، بەڵام یۆنانییەکان بە هاوپەیمانی لەگەڵ کوروش لە دژی ئەردەشێر ڕازی نەبوون، چوونکە سوودیان لێ نەدەدیت.

پەیماننامەی ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشیی ماوەیەکی کەم بوو مۆر کرابوو، شکاندنی ئەو هاوپەیمانییە بۆ یۆنانییەکان سوودی نەبوو، چوونکە هیچیان لە کوروش دەست نەدەکەوت، بەڵام بە بەردەوامبوونی ئاشتی لەگەڵ ئەردەشێری دووەمدا سوودمەند دەبوون، بە وتەی مێژوونووسان چوونی زێڕی ئێران بۆ یۆنان بە هەمان شێوە بەردەوام دەبوو.

کوروش سەرەڕای فەرمانڕەوایی بە سەر لیدیدا، فەرمانڕەوای وڵاتی (کاپادۆکی) بوو، کە یەکێك لە وڵاتانی ئاسیای بچووك بوو، وڵاتەکانی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی باجیان بە کوروش نەدەدا، کوروش خۆشی ئەوانی لە باجدان بەخشی بوو، بەڵام ئەو نەریتە نەما و ئەو پاشایانەی دوای کوروش هاتن باجیان وەرگرت، باجی هەردوو وڵاتی کاپادۆکی و لیدی دەبۆوە بڕێکی باش، کوروش دەیەویست لەگەڵ براکەی بجەنگێت، بۆیە چیدی باجی ئەو دوو وڵاتەی بۆ ئەردەشێر نەنارد، لە بەرانبەر داواکارییەکانی ئەردەشێری دووەم تەنیا گەمەی بە کات دەکرد.

کوروش سەربازانی پیادەی یۆنانی بە باشترین سەربازی جیهان دەناسی، هەوڵیدا تا پیادەکانی یۆنان بە کرێ بگرێت و لەشکرێك لە ئەوان ئامادە بکات و بچێتە جەنگی ئەردەشێری دووەم.

وەك دەزانرێت لە یۆنانی کۆندا خزمەتی سەربازی هەبوو، پیاوان ماوەیەك سەرباز دەبوون، دواتر مۆڵەت دەدران، هەروەها زانراوە کە وەرزش لە یۆنان بەشێکە لە باوەڕە ئایینییەکان و بە

ئەرك دادەنرا، پیاوان پێش ئەركی سەربازی و دواتریش وەرزشیان دەكرد، بۆیە پیاوە یۆنانییەكان بەهێز بوون، دوای تەواوكردنی ئەركی سەربازی خۆیان، بۆیان هەبوو بچنە بەر ئەركی سەربازی دەسەڵاتدارانی دیكە.

ئەفسەرە یۆنانییەكانیش وەك سەربازەكانیان ماوەیەك ئەركی سەربازی بە زۆریان هەبوو، دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە دەیانتوانی بچنە بەر خزمەتی پاشاكانی دەرەوە، زانین و ئاستی رۆشنبیری ئەفسەرەكانی یۆنان بەرزتر بوو لە ئاستی رۆشنبیریی سەربازەكانیان.

دەی نۆن مێژوونووسی ناسراو دەڵێت كەس نەدەبوو بە ئەفسەر ئەگەر زانایانی یۆنان، حەوت خوداوەندكانی هونەری یۆنانی نەناسیبووایە و مێژووی یۆنانی نەزانیبایە، دەبووایە بتوانێت بەشێك لە شیعرەكانی هۆمێر لە (ئیلیاد) لەبەر بكات، بەڵام سەربازە یۆنانییەكان نەخوێندەوار بوون، لە نێوانیاندا خوێندەوار بە كەمی دەست دەكەوت.

یەكێك لەو ئەفسەرانەی دوای تەواوكردنی ئەركی سەربازی ویستی بێتە بەر خزمەتی پاشایەكی دەرەكی، گزنفۆن بوو. ئەو بیستبووی كە فەرمانڕەوای لیدی سەرباز و ئەفسەر دادەمەزرێنێت و بە ئومێدی وەرگیرانی لە لای كوروش، بەرەو لیدی بەرێكەوت.

كوروش بە گزنفۆنی وت جلەكانت دابنێ، چوونكە هەر وەك ئێستە كاتێك دەیانەویست كەسێك بۆ سەربازی وەربگرن، ئەویان لە ڕووی تەندروستییەوە دەپشكنی تا بزانن تەواو تەندروستە یاخۆ نا، ئەو كاتیش پێش وەرگرتنی سەرباز، لە ڕووی جەستەییەوە پشكنینیان بۆ دەكرد، تاكو بزانن سینگ و بازووی بەهێزی هەیە یاخۆ نا، چوونكە چەكەكانی ئەوكات شمشێر، ڕم، تیر، نێزە و تەور بوون، بەكاربردنی پێویستییان بە هێزی بازوو هەبوو.

گزنفۆن خۆی ڕووتكردەوە، كوروش سینگ و بازووەكانی ئەوی پەسەند كرد و وتی جلەكانت لەبەر بكە. دواتر پرسیاری كرد: خەڵكی كوێی و بۆ بیرت كردەوە تا بێی خزمەتی من بكەی؟.

گزنفۆن وتی: خەڵكی ئاركادیم، بۆ دابینكردنی ژیانم بیرم لە خزمەتی فەرمانڕەوای لیدی كردووەتەوە، بە ڕای مێژوونووسان گزنفۆن خەڵكی ئاركادی بووە، بەڵام بە گریمانی زۆر ئەو خەڵكی ئەسینا بووە.

كوروش وتی: من ئەمڕۆ تۆ لەنێو لەشكرەكەم وەردەگرم و فەرمان دەدەم دەست بەكار بوونت بنووسن، مووچەكەشت لە ئەمڕۆوە هەژمار دەكرێت، لە سەرەتای خزمەتتدا ساڵانە

سەد و بیست کورووش زێڕ دەبێت، نیوەی ئەو مووچەیە لە سەرەتای خزمەت و دوای دەست بەکاربوون بە تۆ دەدرێت، وا نابینم کە تۆ دوای وەرگرتنی زێڕ ڕابکەی و بڕۆی.

گزنفۆن سوپاسی کورووشی کرد بۆ نیاز چاکی بەرانبەری، هەر هەمان ڕۆژ هاتە نێو ئەرکی سەربازی لەشکرە یۆنانییەکەی کورووش، کورووش بە گزنفۆنی وت سالآنەکەی دەکاتە سەد و بیست کورووش زێڕ(٢).

پێویست بە بیر هێنانەوەیە لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا، ساترابەکان کە فەرمانڕەوای گشتیی بوون دەیانتوانی لە سنووری دەسەلآتیی خۆیان سککەی دراو لێ بدەن، بەلآم دەبوو ناوی پاشای هەخامەنشیی لەسەر سککەکەدا بنووسن، دواتر کە وێنە بوو بە باو، دەبووایە وێنەی پاشای هەخامەنشییش لەسەر دراوەکە بدەن.

هۆکاری ئەو ڕێگە پێدانەش دەگەڕایەوە بۆ هێواشی هۆکانی گواستنەوە و قورسی گواستنەوەی زێڕ و زیو لە لایەك بۆ لایەکی دیکەی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی، بۆیە ئەو دەسەلآتەیان بە ساترابەکاندا تاکو خەڵك بە دەست نەبوونی دراو دووچاری تەنگ و چەڵەمە نەبن، بەلآم عەیاری دراوی زێڕ و زیوی ئەوان نەدەبوو وەك هی پایتەخت بێت، بەلآم دوای پاشاکانی سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی، ئەو یاسایە بەردەوام جێبەجێ نەدەکرا، ئەوان فرتوفێڵ لە زێڕ و زیویان زیاد دەکرد، واتە دراوی ساختەیان دەخستە ساتوسەودایی، لە ئاکامدا خەڵکی زۆر دەخستە ئازار و ناخۆشییەوە، بەلآم ئەوکاتەی گزنفۆن کەوتەبەر خزمەتی سەربازی، لەوێندەر دراوی دروست لەکاردابوو، گزنفۆن شەست لیرەی زێڕی وەرگرت، کە دەیکردە نیوەی مووچەی سالآنەی.

کورووش فەرمانڕەوای لیدی کە بە نیازی پاشایەتیی بوو، لە جیاتی ئەوەی ناوی ئەردەشێری دووەم لەسەر دراوی زێڕ و زیو بدات، ناوی خۆی لەسەر دانا، خەڵکیش کاتێك دەیاندیت دراوەکە دروستە پەسەندیان دەکرد، چوونکە لای ئەوان دراوی زێڕ و زیو گرینگی هەبوو.

گزنفۆن دوای چوونی بۆ لەشکری کورووش، بە فەرماندەی یەکە دانرا، دواتر بە زانینی ئەوەی ئەفسەرێکی لێهاتووە، کردیان بە فەرماندەی سێ یەکە. شوێنی کاری ئەو

---

(٢) دوور نییە قرۆش، کە دواتر لە ئاسیای بچووك بۆوە ناوی یەکەی پارە، هەمان کورووش بوو بێت. "زەبیحوڵڵا"

سەربازگەیەك بوو، لەنێو شاری سارد پایتەختی لیدی، بەڵام ئەو سەربازەکانی بۆ ڕاهێنان لە سەربازگە دەهێنایەدەر و دەیبردن بۆ بیابانەکانی دەوروبەر، ڕۆژانە دوای بردنیان بۆ دەرەوەی سارد، ناچار بە ڕاهێنانی جەنگی، بە تایبەت جەنگ لەگەڵ یەکدیی، بڕوای وابوو هیچ ڕاهێنانێك نابێتە جێگرەوەی جەنگی ڕاستەقینە.

ئامرازەکانی پارێزگاری سەربازەکانی گزنفۆن باش بوون، هەندێکیان قەڵغانیان هەبوو، هەندێکیشیان زرێی سەربازە پیادە هۆپ لیتەکانی یۆنانیان دەکردەبەر، زەربەکانی شمشێر و تیر ئەوانی نەدەکوشت، بەڵام برینداری دەکردن، گزنفۆن دەیوت نابێت لە برین بترسێن. ئەو بۆ خۆشی بەشدار دەبوو لەو ڕاهێنان و جەنگانە، چوونکە وەك چۆن سەربازەکان پێویستییان بە ڕاهێنانی جەنگی بوو، ئەویش پێویستی پێ بوو، تاکو لە ڕۆژی جەنگدا خاو نەبێت و بتوانێت بە باشی بجەنگێت.

دەوترێت کوروش بیست هەزار یاخۆ پازدە هەزار و بە وتەی گزنفۆن سێزدە هەزار سەرباز و ئەفسەری یۆنانی بۆ جەنگی براکەی بەکرێ گرت و بە سەر یەکەی سەد کەسی، سێ سەد کەسی و نۆسەد کەسیدا دابەشی کردن، هەموو ئەو یەکانە بەردەوام لە ڕاهێنانی جەنگی و ڕێپێوان بوون، کوروش کە دەیویست لەشکرەکەی بەرەو ئێران ببات، نەیدەزانی کەی و لە کوێ دەگاتە لەشکری براکەی، بەڵام زۆر متمانەی بە لەشکری خۆی هەبوو، بیری دەکردەوە بەو ژمارەیەی لەشکرەکەی دەتوانێت لەشکری براکەی کە بەرەو ڕووی دەهات، شکست بدات، تەنانەت ئەگەر سەد هەزار سەربازی هەبێت.

گزنفۆن نووسیویەتی کوروش باوەڕی وابوو، کە یەك سەربازی پیادەی یۆنانی بەرانبەر دە سەربازی دیکەیە، بە دووری نازانین ئەوە باوەڕی گزنفۆن بووبێت، نە هی کوروش، چوونکە یۆنانییەکان زۆر شانازییان بە سەربازەکانیانەوە دەکرد و لە جیهاندا بێ وێنەیان دەزانین.

ڕووداوی جەنگی کوروش لەگەڵ ئەردەشێری برای لە مێژووە یۆنانییەکاندا بە درێژی باسکراوە، هۆکاری ئەو باسکردنەش بە گومانی خۆیان ئەوەیە کە دەرفەتیان بۆ بچووك کردنەوەی ئێرانییەکان دەست کەوتووە، لە کاتێکدا یۆنانییەکان لە جەنگ لەگەڵ لەشکری ئێران شکستیان خوارد، بەڵام چوونکە دە هەزار سەربازی یۆنانی توانیان لە ئێران بگەڕێنەوە، مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو گەڕانەوەیان بە سەرکەوتن بۆ یۆنان دیاری کردووە، هێندەی پێیان کراوە بەو بۆنەیە ئێرانییەکانیان بچووك کردووەتەوە.

پێش باسکردنی ڕێپێوانی لەشکری کوروش و جەنگی ئەو لەگەڵ ئەردەشێری برای، پێویستە ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ بکەین:

یەکەم: ئەوەیە کە مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە کە تەنیا یۆنانییەکانی دانیشتووی ئارکادی وەك بەکرێگیراو دەهاتنە نێو لەشکری کوروش، لە کاتێکدا کە ڕێژەی سەربازە یۆنانییەکان لەنێو لەشکرەکە نیشان دەدات کە بەشێك لەو سەربازانە خەڵکی ئێسپارت بوون، واتە هەمان ئەو نەتەوەیەی کە نیشتمانپەروەرییان لە تەواوی نەتەوەکانی دیکەی یۆنان پتر بوو، تەنانەت کوروش فەرماندەیی لەشکرەکەی بە کەسێکی ئێسپارتی بە ناوی (کلێرکۆس) یاخۆ (کێلئارخۆس) سپاردبوو.

دووەم: ئەوەیە کە لە لەشکری کوروشدا نەتەنیا سەربازە بەکرێ گیراوەکانی یۆنانی، بگرە سەربازی نەتەوەکانی ئاسیای بچووك، بە تایبەتی لیدی بەشدار بوون، پرۆفیسۆر بارنی بەریتانی دەڵێت: چوار هەزار سەربازی هەرێمیی واتە سەربازانی نەتەوەکانی ئاسیای بچووك لە لەشکری کوروش بوون.

دوو مانگ پێش وەرزی بەهاریساڵی (٤٠١ پ. ز) کوروش لەشکرەکەی خۆی لە لیدی خستەڕێ تا لە وەرزی جەنگ واتە بەهار بگاتە ئێران.

گزنفۆن بە درێژی باسی ڕێپێوانی لەشکری کوروشی نووسیوەتەوە، بەو باسەی لەبارەی شاخ و لووتکەکانی ڕێگەی لەشکری کوروش کردوویەتی، دەتوانرێت بێ گرفت هەموو ئەو شوێنانەی باسی کردوون بناسینەوە، بە هەمان ڕێگەدا بڕۆین کە کوروشی بچووك لە (٤٠١ پ. ز) پیایدا ڕۆیشتە ئێران. لەوانەیە ڕێگەکانی ئێستە و ئەو ڕێگەیەی کوروش پیایدا ڕۆیشت، جیاوازییان بووبێت جا ڕێگەی پاشایەتیی یاخۆ شاڕێ بووبێت، بەڵام نیشانە گەورەکان هێشتا ماون.

وێڕای ئەوەی هێشتا بەفری زستان نەتوابۆوە، لەشکری کوروش لە ناوچەی شاخاوی تۆرۆس لە نێوان هەر دوو وڵاتی گاپادۆکی و کیلیکی کە ئێستە بەشێکن لە تورکیا تێپەڕ بوو، هەروەها لە ناوچەی شاخاوی ئامانۆس لە نێوان کیلیکی و سوریا تێپەڕ بوو، چۆوە نێو سوریا. کوروش بۆ گەیشتنی بە ئێران ڕاستەوخۆ بەرەو ڕۆژئاوا نەڕۆیشت تاکو بچێتە ناو ئازەربایجان، ڕێگەی دوورتری بڕی و لە ڕێگەی سوریاوە چۆوە ئێران، چوونکە کوروش دەیزانی ئەگەر بچێتە ئازەربایجان، لەوانەیە خێڵە کوردییەکان لەگەڵیدا بجەنگن و لەشکرەکەی لەنێو ببن.

لە دووهەزار و پێنج سەد ساڵ بەر لە ئێستە خێڵە کوردەکان لە (ئازەربایجانی رۆژئاوا و کوردستان و کرماشان)[٣] نیشتەجێ بوون، چوونکە ئەوان بەرانبەر ئەردەشێری دووەم ئەمەکدار بوون بە دڵنیاییەوە گرفتیان بۆ کوروش دەنایەوە، بۆیە رێگەی سوریا بۆ لەشکری کوروش بێ مەترسی بوو، گزنفۆن نووسیویەتی: کاتێك لەشکری کوروش لە شاخی ئامانۆس لە نێوان کیلیکی و سوریا تێپەڕبوو، چووە نێو سوریا، بەهار دەستی پێ کردبوو، هەوا گەرم ببوو، کوروش بە درێژایی ڕووباری فورات بەرەو ئێران کەوتەڕێ تاکو بەردەوام ئاوی لێ نێزیك بێت، مەبەستی کوروش ئەوە بوو پێش گەیشتنی بە ئێران، لەسەر رێگە بابل داگیر بکات و دواتر بچێتە نێو ئێران، داگیرکردنی بابل بۆ ئەو بایەخی سیاسیی و جەنگی هەبوو، دوای داگیرکردنی بابل، دەیتوانی لەشکرەکەی بە سەربازە بابلییەکان بەهێز بکات.

بایەخی سیاسییی لەو بابەتە بوو، کە بابل لە سەردەمی پاشایەتیی (کوروش، داریوشی یەکەم و خەشایار) یەکێك بوو لە پایتەختە گرینگەکانی ئێران، بە هۆی پێگەی بازرگانی، داهاتێکی زۆری هەبوو، بابل لە دەست هەر کەسێك بووایە تەواوی میزۆپۆتامیای باشووری لە دەست دەبوو.

کوروش لەشکرەکەی بە درێژایی ڕووباری فورات پێشڕەوی دەکرد، تاکو گەیشتە ناوچەیەك بە ناوی (کۆناخا یاخۆ کۆناك).

ئێستە ئەو ناوە لە ئەتڵەسە جوگرافییەکان نابینرێت، چوونکە ئەو شارە لافاو ڕایماڵیوە، وەك زانراوە زۆرجاران لافاو و هەڵکشانی ڕووباری دیجلە و فورات بووەتە مایەی ئەوەی هەندێ بەش لە شار و لادێکانی نێزیك ڕێڕەوەکەی خۆی ژێر ئاوخستووە یاخۆ بەتەواوەتی نغرۆ بووە، کۆناخا یەکێك لەو شارانە بوو، بەڵام ئێستە دەتوانرێت شوێنی ئەو شارە لە نێزیك شاری سەماوە لە کەنارەکانی فوراتدا ببینینەوە.

هێشتا لەشکری کوروش نەگەیشتبۆوە شاری کۆناخا کە لەشکری هەخامەنشیی بە فەرماندەیی تیسافرەنس (هەر ئەو پیاوە کە گیانی ئەردەشێری دووەمی رزگار کرد) پێشی بە کوروش گرت.

---

(٣) ئەو ناوانە هی پارێزگەکانی ئێرانی ئێستەن، زەبیحوڵڵا ئەو نەخشەیەی لەبەر چاوە،لە ڕاستیدا نە تەنیا ئەو سێ پارێزگەیە، بگرە هەمەدان پایتەختی کوردە مادەکان و ئیلام و ناوچە کوردییەکانی خێڵە لوڕەکان بە گشتیی کوردستانن و بە ئارەزووی کەس ناسڕێنەوە. "وەرگێڕ کوردی"

مێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێن: (کاتێك سەربازە ئێرانییەکان چاویان بە سەربازە یۆنانییەکان کەوت، لە ترسان تۆقین، هەندێکیان هەردوو دەست ڕووخساری خۆیان داپۆشی)، بەڵام ئەگەر سەربازە ئێرانییەکان ترسابان و بە دەستەکانیان ڕووخساریان داپۆشیبووایە، چەکە قورسەکانیان فڕێ دەدا و هەڵدەهاتن، نەك ئەوەی کە هێرش بکەن.

لە لایەکی دیکە کاتێ دوو لەشکر پێك دەگەن، ناتوانن لە دوورەوە ڕووخساری یەکتر بناسنەوە و تەنیا قەبارەی لەشکر دیارە. ئەی سەربازە یۆنانییەکانی کورۆش چۆن بینییان کە سەربازانی تیسافرەنس ترساون و ڕووخساریان دادەپۆشن؟.

گزنفۆن دەڵێت کاتێك بەرایی لەشکری ئەردەشێری دووەممان لە دوورەوە بینی، بە هۆی ئەوەی رۆژ درەنگ بوو، کاتی جەنگ نەمابوو، لە شوێنی خۆمان وەستاین.

کاتێك لەشکری کوروش گەیشتە سوپای ئەردەشێری برای، سی و یەك رۆژ لە بەهاری ساڵی (٤٠١ پ. ز) تێپەڕ ببوو، کوروش لەگەڵ سوپاکەی بوو، بەڵام دەسەڵاتیی سوپاکەی بە دەست کلێرکۆسی ئێسپارتییەوە بوو، ئەو فەرمانی کرد ئۆردووگەیان دامەزراند. وەك گزنفۆن باس دەکات، ئۆردووگەی لە کەنارەکانی فورات دامەزراند، لە دەوروبەری ئۆردووگە لە وشکانی و لای ئاو، پاسەوانی دانا تا ئەگەر هەخامەنشییەکان هێرش بکەن، لەشکرەکەی نەپەشۆکێت، ئەو کاتەی گزنفۆن لەنێو ئۆردووگەکە و لە شەودا دەگەڕا، سەربازە خەوتووەکانی یۆنانی دەبینی، دەیزانی هەندێك لە ئەوان شەوی دواتر زیندوو نامێنن.

ئەگەر گزنفۆن ئەدیب نەبووایە، ئەوکاتە بیری لە بابەت گەلی مردن و ژیان نەدەکردەوە، سەردارەکانی جەنگ لەو شەوانەدا تەنیا بیریان ئەوە دەبێت کە ئاسوودە بخەون، تا بەیانی بێ ماندوو بوون جەنگ بەڕێوەبەرن، بەڵام گزنفۆن ئەدیب بوو، ئەو شەوە لە کاتی گەڕان بەنێو ئۆردووگە و وەرگرتنی هەواڵی پاسەوانەکان، بیری لە فەلسەفەی مردن و ژیان دەکردەوە، بیری لە ئاکامی ئەو ژیانە دەکردەوە، کە مرۆڤ تیایدا بکوژرێت یاخۆ لە سەرینی نەخۆشیدا بمرێت، ئایا باشتر نەبوو، کە نەهاتایە دنیا تا لەنێو نەچێت؟.

گزنفۆن وەك هاوڕەگەزەکانی خۆی باوەڕی بە ژیانی دوای مردن نەبوو، باوەڕی وابوو دوای مردن بە تەواوەتی لەنێو دەچێت، جگە لەنێوچوون هیچ شتێکی دیکەی لێ نامێنێتەوە، ئەویش لە کاتێکدا کە توانیبێتی ناوێك بۆ خۆی چێ بکات.

شەوی کورتی بەهار بە کۆتا هات، گزنفۆن لە دوورەوە دەنگی موزیکی لەشکری ئێرانی بیست. سەربازەکانی لەشکری کوروشیش لەخەو ڕابوون، بەشە خواردنی ڕۆژانەی خۆیان وەرگرت، ریزەکانی خۆیان بۆ جەنگ رێکخست.

هەردوو لەشکر لە رۆژئاوای کەناری ڕاستی فورات بوون، ئەو بابەتە دەیسەلمێنێت لەشکری ئەردەشێری دووەم زانیارییان سەبارەت بە هاتنی لەشکری کوروش هەبووە، لە کەناری رۆژهەلاتەوە خۆیان گەیاند بوو بە کەناری رۆژئاوا تاکو پێش بە لەشکری کوروش بگرن.

گزنفۆن دەڵێت: یۆنانییەکان بە فەرمانی کلێرکۆس فەرماندەی لەشکری کوروش هێرشیان کرد، لەگەڵ دەستپێکی هێرش ئەردەشێر کە سواری گالیسکەبوو، هەلات. مێژوونووسەکانی دیکەی یۆنانیش کە ئەو جەنگەیان لە رێگەی گزنفۆنەوە ناسیوە، هەمان بابەتیان نووسیوە، دەڵێن لەگەڵ دەست پێکردنی هێرش، ئەردەشێر هەلات.

بە دوو هۆکار ئەو گێڕانەوەیە پەسەند ناکرێت:

یەکەم: لە جەنگەکاندا دە هەزار سەربازی پیادە و سوارە و گالیسکەی جەنگی دەورەی پاشای هەخامەنشییان دەگرت و دیوارێکی زیندوو لە دەورەی پاشا چێ دەبوو.

دووەم: هۆکارێکی دیکەش ئەو بابەتە بە درۆ دەخاتەوە، ئەوەیە کە لەشکری هەخامەنشیی بە فەرماندەیی تیسافرەنس لەو جەنگە سەرکەوتوو بوو، لەشکری کوروشی بچووك شکستی خوارد، ئایا دەتوانین پەسەندی بکەین کە فەرماندەی گشتیی لەشکری سەرکەوتوو هەڵبێت؟.

دوور نییە تیسافرەنس داوای لە پاشای هەخامەنشیی کرد بێت، شوێنی خۆی بگۆڕێت تاکو نەکەوێتە بەر هێرشی سوارەکانی لیدی، گزنفۆن کە شوێن گۆڕکێی ئەردەشێری دووەمی بینیووە، وای زانیوە کە ئەو هەڵ دێت.

پێش دەست پێکردنی جەنگ کوروش فەرماندە ئێسپارتییەکەی لەشکرەکەی بانگ کرد و پێی وتی: مەبەستی من لەم جەنگە کوژرانی داریوشی دووەمی برامە، تۆ دەبێت وابکەی کە بکوژرێت یاخۆ دیل بکرێت، ئەگەر ئەو نەکوژرێت یاخۆ بە دیل نەگیرێت، لە روانگەی من سەرکەوتنمان لەو جەنگە بایەخی نابێت، چوونکە ئەگەر ئەو زیندوو بمێنێت دیسان لەشکرێك ئامادە دەکات و دەبێت دووبارە بچمەوە جەنگ، بەڵام ئەگەر بکوژرێت ئەوا من ئاسوودە دەبم و دەبمە پاشای هەخامەنشیی.

ولاّتی لیدی کە کوروش فەرمانڕەوای بوو، سواری زۆر لێهاتووی هەبوو، دەگوترێت یەك لە هۆکارەکانی لێهاتوویی ئەوان ئەوە بوو، کە قاچیان بەردەوام لە ئاوزەنگیان بوو، ئاوزەنگی لیدی لە مێژوودا بەناوبانگ بوو، ئەو واتایە دەدات، کە لە ولاّتی لیدی ئاوزەنگ بۆ زینی ئەسپ کە سوار بەسەر جەنگ و سواریدا بالاّدەست دەکات لەو ولاّتە داهێنراوە.(٤)

سوارەکانی لیدی ئاوزەنگیان هەبوو، نێزەی درێژیان پێ بوو، کاتێك هێرشیان دەکرد، مەترسییەکی گەورە دەبوون بۆ پیادەکان و پیادە ئاساییەکان نەیاندەتوانی لە بەرانبەر نێزەی درێژی ئەوان بەرگری لە خۆیان بکەن، تەنیا ئەو پیادانەی هونەرەکانی شکاندنەوەی سوارکارەکان فێر ببوون، دەیانتوانی بەرگەی هێرشی سوارانی لیدی بگرن.

گزنفۆن دەڵێت کاتێك کلێرکۆس فەرمانی هێرشی سوارەکانی دەرکرد، کوروش بۆ خۆی لەگەڵ سوارەکان رۆیشت و هێرشی کردە سەر گاردی جاوید. ئەو نووسینەی گزنفۆن گێڕانەوەی ئەو سەبارەت بە هەلاّتنی ئەردەشێر رەتدەکاتەوە، چوونکە ئەگەر ئەردەشێر هەلاّتبایە گاردی جاوید لەگەڵیدا دەڕۆیشت و نەدەمانەوە تاکو لەلایەن سوارەکانی لیدییەوە هێرشیان بکرێتەسەر.

رۆیشتنی کوروشیش لەگەڵ سوارەکان سەلمێنەرەیکی دیکەیە لە مانەوەی ئەردەشێر لە مەیدانی جەنگ، چوونکە ئەگەر ئەو لە گۆڕەپانی جەنگ نەبووایە، کوروش کە دەیەویست براکەی خۆی بکوژێ یاخۆ دەستگیری بکات، لەگەڵ سوارەکاندا نەدەڕۆیشت.

---

(٤) دەبێت دان بەو ڕاستییە بنێین کە لیدی لە ناوەندەکانی کۆنی ئەو داهێنانە بوو، کە یارمەتی پێشکەوتنی مرۆڤی دەدا، بێگومان لێدانی سککە و گۆڕینەوەی پارە، واتە دانانی بانك کە پاشاکانی هەخامەنشیی لە ئێران برەویان پێدا و دانی مووچەی مانگانە بۆ سالّمەندان لە داهێنانەکانی خەلّکی لیدی بوو، بەلاّم لە بابەتگەلی ئەسپ و سوارکاری، ئێرانییەکان لە پێش نەتەوەکانی دیکە بوون، چونکە ئێرانییەکان یەکەم نەتەوە بوون، کە ئەسپیان مالّی کرد و یەکەم نەتەوەن کە رێشمەیان بۆ ئەسپ دانا، پرۆفیسۆر پۆپ لە پەڕتووکی هونەرەکانی ئێران کە بە ئینگلیزی لە ژاپۆن چاپ بوو، وێنەی رێشمەی ئەسپی چاپ کردووە، کە دەگەڕێتەوە بۆ هەشت سەد ساڵ پێش زاین، لە ئێران دەست کەوتبوو، بۆیە دەتوانین بلّێین ئاوزەنگ لە داهێنانی ئێرانییەکانە کە لە پەروەردەی ئەسپ لە پێش نەتەوەکانی دیکەن. "زەبیحولّلا"

ئەو بە بۆنەی ئەو کینەیەی لە براکەی هەیبوو، خوازیاری کوشتن یاخۆ دەستگیرکردنی بوو، لەگەڵ سوارەکان رۆیشت، ڕوونە کە فەرماندەیی ئەوانی لە ئەستۆ بووە، پلە و پایەی ئەو ببووە مایەی ئەوەی ببێتە فەرماندەی سواران، کوروشیش وەك سوارە لیدییەکان نێزەی درێژی پێ بوو، کاسکێتی لەسەر و زرێی یۆنانی لەبەر بوو، گزنفۆن کە کوروشی لە لا زۆر جێگەی بایەخ بووە، نووسیویەتی: (ئەو لە پێش سوارەکانەوە ئەسپی تاودەدا، یەکەم کەس کە خۆی گەیاندە گاردی جاوید کوروش بوو، من بینیم ئەو بە هاوڕێیەتی کۆمەڵە سوارێکەوە هێرشی دەکردە سەر گاردی جاوید و ریزەکانی دەشکاندن و بەرەو پێش دەچوو، لە بورجە گەڕۆکەکانی هەخامەنشییەوە تیریان تێدەگرت، بەڵام تیرەکان کاریگەرییان لە کاسکێت و زرێکەی نەدەکرد، من وێڕای ئەوەی خۆم بەشداری جەنگ بووم، نەمدەتوانی چاوی لەسەر لاببەم و لە دڵدا ئازایەتیی ئەوم ستایش دەکرد و دەموت تا شازادەیەکی دلێری وەك تۆ هەبێت، نابێت ئەردەشێری ترسنووك پاشای ئێران بێت، لەپڕ بینیم کوروش لە ئەسپ کەوتە خوارەوە، چوونکە ئیتر ئەوم نەبینییەوە).

دوای کوژرانی کوروش ئەو سەربازە یۆنانییانەی لە لەشکرەکەیدا سەرباز بوون گەڕانەوە، بەڵام بەو رێگەیەدا نەڕۆیشتنەوە کە پیایدا هاتبوون، لە رێگەی باکوری میزۆپۆتامیا، کوردستان و ئاسیای بچووك گەڕانەوە، ئەو گەڕانەوەیە لە سەرچاوە مێژووە یۆنانییەکاندا بە (گەڕانەوەی دە هەزار سەرباز) ناسراوە، مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو گەڕانەوەیە بۆ لاوازی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی دەگەڕێننەوە، نووسیویانە ئەگەر هەخامەنشییەکان زۆر لاواز نەبوونایە ئەو دەهەزار سەربازە ئەو رۆژە لەنێو دڵی ئێرانەوە نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو بابەتەیان نەنووسیوە کە ئەو دە هەزار کەسە ویستیان بچنە بەر خزمەتی ئەردەشێری دووەم و ئەو نەیویستن، پێی وتن پێویستی بە خزمەتی ئەوان نییە، چوونکە هەموو سەربازەکانی لیدی کە لەنێو لەشکری کوروش بوون، دوای کوژرانی ئەو چوونە نێو لەشکری ئەردەشێر.

مێژوونووس و لێکۆڵەری بەناوبانگی ئەڵمانی و خاوەنی بابەتی تایبەت بە ئێران لە فەرهەنگنامەی بەریتانیکا نووسیویەتی ئێرانییەکان لە یۆنانییەکان دەترسان، بۆیە ئەردەشێری دووەم یۆنانییەکانی نەهێنایە بەر خزمەتی لەشکرەکەی، بەڵام ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات، کە ئایا دوای ئەوەی ئەوان بچنە نێو لەشکری ئێران، ئیتر بۆ سەربازەکان لێیان بترسن؟.

سەربازە یۆنانییەکان بەکرێگیراو بوون، بۆ ئەوان جیاوازیی نەبوو خزمەتی لەشکری کوروشی بچووك بکەن یاخۆ ئەردەشێری برای، چوونکە ئەردەشێر ئەوانی پەسەند نەکرد بڕیاریاندا بگەڕێنەوە. درێژەی باسی گەڕانەوەی ئەوان لەلایەن گزنفۆن نووسراوەتەوە کە خۆی یەك لەوان بووە، لە کاتی گەڕانەوەیاندا دانیشتووانی ئێرانیش کێشەیان بۆ نەدەنانەوە، لەو شوێنانەی کە ئەوان نەبوونایە کێشە بۆ دانیشتووان، ئەوانیش هیچ کێشەیان بۆ چێ نەدەکردن.

هەر ئەرکێکیش کە لەلایەن یۆنانییەکانەوە دووچاری دانیشتووانی ئێران بووبێت، بۆ دابینکردنی خواردەمەنی و ئالیك بووە لە رێگەی گەڕانەوەیاندا، ئەو رەخنەیە لە ئەردەشێری دووەم دەگیرێت کە چۆن لەشکرێکی دە هەزار کەسی بەو شێوەیە هێشتووەتەوە لە کاتێکدا زانیویەتی ئەوان لە گەڕانەوەدا بۆ خۆراك و ئالیك ناچارن ببنە ئەرك بەسەر خەڵکەوە، ئایا باشتر نەبوو ئەفسەرێکی ئێرانی بکاتە فەرماندەیان تاکو ئەوکاتەی خاکی ئیمپراتۆرییەتەکەی بەجێ دەهێڵن یاخۆ ئەگەر ئەوەی بە باش نەدەزانی ئەوانی لە لەشکرەکەی وەرگرتبایە، ئەو دەمە لەژێر سەرکردایەتیی ئەفسەرە ئێرانییەکان ئەوانی رەوانەی ئاسیای بچووك بکردایە، لەوێدا کۆتایی بە راچەیان هێنابووایە تا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان؟.

باسی گەڕانەوەی ئەو دە هەزار سەربازە، تەنیا لەلایەن گزنفۆنەوە نووسراوەتەوە، زۆر تایبەتە و کەسی دیکە نەینووسیوەتەوە، بۆیە یان دەبێت پەسەندی بکەین یاخۆ بە تەواوەتی رەتی بکەینەوە، بەپێی نووسینی گزنفۆن ئەو دە هەزار سەربازە دەیانتوانی لە هەر ویلایەتێکی ئیمپراتۆری هەخامەنشیی کە ویستبایان بمێننەوە، چوونکە هەر یەك لە ویلایەتەکان لە بواری ئیداری سەربەخۆ بوو، تەنیا باجی بە ناوەند دەبەخشی، جگە لەوە هیچ شوێنەواری دەسەڵاتیی ناوەند بەسەر ئەو ویلایەتانەوە دیار نەبوو، کە ئەو دە هەزار کەسە پیایاندا تێپەڕ بوون لە کاتی گەڕانەوەیاندا، لەوانەیە ئەو بابەتە لەمەڕ هەندێ لە ویلایەتەکان دروست بێت، چوونکە لە هەندێ ویلایەتەکان فەرمانڕەواکان سەربەخۆ بوون، تەنیا خۆیان بە شوێنکەوتەی پاشای هەخامەنشیی دەزانی، تەنانەت دراویان دروست دەکرد، بەڵام ناوی پاشای هەخامەنشییان لەسەر دەنووسی، بەڵام هەر ئەو ویلایەتانەی سەربەخۆ بوون، جگە لە ئەوەی باجیان دەدا، سەربازیشیان دەدا، ئەو دوو بابەتە بۆ بوونی دەسەڵاتیی ناوەند لە ویلایەتەکان بەس بوو.

لەوانە بوو ئەو دە هەزار سەربازە توانیبایان بۆ ماوەیەك لە هەندێ لە ویلایەتەکان بمێننەوە، کە سەربازگەیان لێ نەبوو، بەڵام نەیاندەتوانی تا هەتایە لەوێندەر بن، ئەردەشێری دووەم کاتێك زانیاریی لەبارەی بوونی ئەوان هەبووایە، هێرشی بۆ دەکردن و لەنێوی دەبردن.

بیست و چوار سەدە بەسەر کوژرانی کوروشی بچووك و گەڕانەوەی دە هەزار سەرباز تێپەڕ بووە، لەو بابەتانەی لە مێژووی یۆناندا پێوەستن بە ئێران، تا ئێستە بە لای یۆنانییەکانەوە گرینگتر لەو ڕووداوە ڕووی نەداوە، مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو بابەتەیان هێندە گەورە کردووە، کە دەبێتە هۆی سەرسووڕمانی خوێنەری بێ لایەن، پرۆفیسۆر نۆڵدکە وێڕای تەواوی ئەو خۆشەویستییەی بۆ ئێرانی هەبووە، نەیتوانیوە خۆی ڕزگار بکات لە کاریگەریی نووسینی یۆنانییەکان، لە بابەتی پێوەست بە مێژووی ئێران لە فەرهەنگنامەی ئێرانیکادا نووسینی مێژوونووسە یۆنانییەکانی لەبارەی گەڕانەوەی ئەو دە هەزار کەسە پشتڕاست کردووەتەوە.

# شاژنێكی كینه لە دڵ

پەریساتیس شاژنی ئێران، كە كوروشی كوڕە بچووكی پتر لە ئەردەشێری كوڕە گەورەی خۆش دەویست، بڕیاریدا تەواوی ئەو ئەفسەرانە بخاتە بەر تۆڵە كە لە كوشتنی كوروشدا بەشدار بوون. گەورەترینی ئەو ئەفسەرانە تیسافرەنس فەرماندەی ئەو لەشكرە بوو، كە جەنگی كوروشی كرد، بەڵام ئەردەشێر ئەوی لە دەست دایكی ڕزگار كرد، واتە تیسافرەنسی كرد بە فەرمانڕەوای لیدی لە هەمان وڵات، كە كوروش لێی فەرمانڕەوا بوو.

پەریساتیس یازدە كەس لە سەرداره هەخامەنشییەكانی كوشت، كە فەرماندەی یەكە سەربازییەكان بوون، لە جەنگی كۆناخا هێندە هێز و دەستڕۆیشتوویی بە سەر كوڕەكەیدا هەبوو، كە نەیتوانی لێ پێچینەوە لەگەڵ دایكیدا بكات، لەسەر ئەوەی بۆچی ئەو ئەفسەرانەی كوشتووە، كە جگە لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەركەكانیان چی دیكەیان نەكردبوو.

هەڵبەتە كە پەریساتیس دژایەتی لەگەڵ ئەستاتێرای خێزانی ئەردەشێر هەبوو، بە دەستەكانی خۆی ئەوی ژەهرخوارد كرد و كوشتی، شەو ژەهری كردە ناو خواردنەكەی، سپێدەی بەیانی كە خزمەتكارەكانی چوون بۆ لای، بینیان ئەو مردووە، هەواڵیان بۆ ئەردەشێر برد، كە هاوسەرەكەی لە خەو هەڵ ناستێت، ئەو بەرەو شوێنی نووستنی هاوسەرەكەی رۆیشت و دەستی لە جەستەی دا، هەستی كرد ساردە، هەردوو چاوەكانی ئەستاتێرا كرابوونەوە.

ئەردەشێری دووەم كەتزیاسی یۆنانی پزیشكی كۆشكی داوا كرد و پرسیاری كرد: ئایا شەوی ڕابردوو ژنەكەم تۆی داوا كردووە و نەخۆش بووە؟.

كەتزیاس وتی: نەخێر، ئێوارەی رۆژی پێشوو كاتێك من ئەوم بینی تەندروست و چوست و چالاك و بە جووڵە بوو، لە تەندروستی منیشی پرسیار كرد.

ئەردەشێر وتی: ئەی چی بووە و چۆن ئەمە ڕوویداوە؟.

كەتزیاس وتی: بۆ زانینی هۆكاری مردنەكەی، پێویستم بە پشكنینییەتی. پاشای هەخامەنشیی دەرفەتی پشكنینی بۆ رەخساند، كەتزیاس بە وردی ئەستاتێرای پشكنی، بە تایبەتی

چاوەکانی و سپییێنەی چاوەکانی تەماشا کرد و وتی: ئەو یان ژەهری خواردووە یاخۆ ژەهر خواردیان کردووە.

ئەردەشێر وتی: ئایا تۆ دەتوانی ئەو ژەهرە بدۆزییەوە، کە خواردوویەتی یاخۆ دەرخواردیان داوە.

کەتزیاس وتی: بێ شەقکردنی لاشەی ئەوەم بۆ دەرناکەوێت، ئەردەشێر مۆڵەتی ئەو کارەی پێدا.

ئەو بابەتە لەوانەیە بۆ ئێمە جێگەی سەرسوورِمان بێت یاخۆ وا بزانین شەقکردنی لاشە داهێنانی سەدەی ڕابردووە و پێشتر ئەو کارە نەبووە، لە کاتێکدا سێ هەزار ساڵ پێش زاین لە میسر شەقکردنی لاشە، بۆ مۆمیاکردن برەوی هەبووە، ئەو زانستە لە میسرەوە چۆتە تەواوی وڵاتانی دیکە، کەواتە زانستی شەقکردنی لاشە لە میسر هاتە کایەوە، دواتر لە وڵاتانی دیکەی جیهان برەوی سەند.

کەتزیاس دوای کردنەوەی سینگی ئەستاتێرا لە دۆخی گەدەی بۆی دەرکەوت، کە ئەو گوێزی مەغریبی خواردووە یاخۆ داویانەتێ، ئێستە بە (ئێستریکنین) ناو دەبرێت، چوونکە ئەو ژەهرە زۆر تاڵە دەبێت لەگەڵ شیرینی یاخۆ خواردنی شیرین بوخرێت.

ئەردەشێری دووەم فەرمانی کرد لاشەکەی بدوورنەوە و بینێژن، ڕۆیشتە لای دایکی و وتی: ئایا تۆ ژەهرت دەرخواردی ئەستاتێرا داوە؟.

پەریساتیس ڕەتی کردەوە، ئەردەشێر وتی: ژنی من ئەو کەسە نەبوو، کە خۆی ژەهر بخوات یاخۆ خۆی بکوژێت بێگومان ژەهرخوارد کراوە، جگە لە تۆ، هیچ کەس هێندە بێباك و دڵڕەق نییە، کە ئەو کارە بکات.

پەریساتیس وتی: بۆ تۆ ژن زۆرە، هەر ژنێکت بوێت دەبێتە هی تۆ، نابێت لە مردنی ئەستاتێرا خەفەت بخۆی.

ئەردەشێری دووەم لە وەڵامی دایکی زانی، کە ئەو بکوژی ئەستاتێرایە، تا ماوەیەك قسەی لەگەڵدا نەدەکرد، بەڵام پەریساتیس هێندە دەستڕۆیشتوو بوو، تەنانەت ئەوکاتەش کە ئەردەشێر ئەوی نەدەدواند، دەستی دەخستە ناو کازیی دەوڵەت. پەریساتیس فەرماندەی لەشکری هەخامەنشیی لە کۆناخا بە بکوژی سەرەکیی کوروش دەزانی، بۆیە دەیویست ئەو بکوژێت، جەنگ لەگەڵ ئێسپارت بیانووی دایە دەست پەریساتیس تا تیسافرەنس لەنێو ببات.

به كورتی تا دەستپێكی سەدەی چوارەمی پێش زاین هەر جارێك لە نێوان یۆنان و ئێران جەنگ بەرپا بووبێت، ولاتی ئاتیك پێشەنگ بووە، كە پایتەختەكەی ئەسینا بووە، بەلام لە سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زاین، ئەسینا دەستڕۆیشتوویی سیاسیی خۆی لە دەستدا، ولاتی بچووكی ئێسپارت لە بواری رامیاری و سەربازی هاتەجێیان، لەمەو دوا نەتەوەكانی یۆنان بە رێبەرایەتیی ئەوان دەجەنگان، دەزانین ماوەی درێژی ئاشتی نێوان یۆنان و هەخامەنشیی لەلایەن پەریساتیس شاژنی هەخامەنشیی تێكدرا.

ئێسپارت كە تا پێش سەدەی چوارەمی پێش زاین، زێڕیان لە پاشای هەخامەنشیی وەردەگرت، بە شێوەیەك لە یۆنان و دەرەوەی یۆنان بەهێزبوون، بەلام نیازیان بە پاشای هەخامەنشیی نەما، چوونكە شارە یۆنانییەكانی ئاسیای بچووك بایەخی بازرگانیان هەبوو و بە داهات بوون. ئێسپارت بە روالەت بە ناوی یەكگرتوویی یۆنان ویستی ئەو شارانە داگیر بكات، بەلام لە راستیدا دەیانەویست سوود لە داهاتی باش و بازرگانی ئەو ولاتانە بۆ خۆیان ببینن، ئەو شارانە بەشێك بوون لە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی.

دۆخی ئەو شارانە هەر وەك دۆخی ئەوان بوو، لە سەرەتای زنجیرەی پاشایەتیی هەخامەنشی، وەك ئەوكات سەربەخۆییان هەبوو، باجیان دەدایە هەخامەنشییەكان، ئەوانیش دەستیان نەدەخستە كازێی ناوەخۆیان و لە كاتی داگیركاری یۆنان یارمەتییان دەدان[1].

---

(١) ئەو شارانە لەلایەن كوروش داگیركران، بەشێك لە ئیمپراتۆری هەخامەنشیی نەبوون، بە زەبر كرانە بەشێك لەو ئیمپراتۆرییەتە، بۆیە وەك لەو پەڕتووكەدا زەبیحوللا هەمیشە دووپاتی كردۆتەوە، دانیشتوانی شارە یۆنانییەكان بەردەوام یارمەتیدەر و رێ خۆشكەر بوون بۆ لەشكرە یۆنانییەكان لە كاتی داگیركردنەوەیان و پێشتریش هەر پالپشتی یۆنان بوون، تەنانەت یۆنانییەكان تەنیا بۆ تۆلە نەبوو بێت نەیان ویستووە لەو شارانە زیاتر داگیر بكەن، ناكرێت ئەوە بە راست دابنرێت كە هەخامەنشییەكان یارمەتی ئەو شارانەیان داوە لە داگیر نەكرانیان لە لایەن یۆنانییەكان، بە پێچەوانەوە بە هۆی داهاتی باش و بازرگانی ئەو شارانە، بەردەوام هەولی داگیركردنی ئەو شارانەیان داوە، ئەوە زۆر ئاشكرایە، هەر كەسێك ئەو پەڕتووكە بخوێنێتەوە ئەو بابەتەی بۆ دەردەكەوێت. ئەوكاتانەی ئەو شارانە لەژێر دەستی یۆنان بوونە، فەرمانرەواكانیان لە خۆیان بوونە، لە كاتی ژێردەستەبوونیشیان بۆ هەخامەنشییەكاندا، تەنانەت فەرمانرەواكانیش هەخامەنشییبوون ."وەرگێڕی كوردی"

لە ساڵی(٣٩٦ پ. ز) ئێسپارت بۆ داگیرکردنی ئەو شارانە هێرشیان کرد، بە لەشکرێکی دەریایی بەهێز، کە پێکهاتوو لە هێزی دەریایی هەموو دەوڵەتەشارەکانی یۆنان، لەشکری خۆیان لە ئاسیای بچووك دابەزاند، هەموو ئەو شارانەی ئاسیای بچووکیان لە کەنارەکانی بۆسفۆر تا دەگاتە ئێزمیر داگیرکرد.

پارێزگاریکردن لەو شارانە ئەرکی تیسافرەنس فەرمانڕەوای لیدی بوو، بەڵام ئەو لە بەرانبەر جەنگی لەناکاوی ئێسپارت پەشووکا بوو، پێش ئەوەی بتوانێت لەشکرێك بۆ جەنگ ئامادە بکات، ئێسپارتەکان تەواوی شارەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووکیان گرت.

پەریساتیس دوای گەیشتنی هەواڵی ئەو هێرشە، بە ئەردەشێری کوڕی وت: بێگومان تیسافرەنس ناپاکی کردووە و هاوکاری ئێسپارتەکان بووە، بە پێچەوانەوە ئێسپارت نەیدەتوانی لە کاتێکی هێندە کورتدا ئەو هەموو شارانە داگیر بکات.

ئەردەشێری دووەم نەیدەتوانی تیسافرەنس بە ناپاك بزانێت و خزمەتە گەورەکانی ئەو لە رابردوو هێمابوون بۆ ناپاك نەبوونی، بەڵام دیاربوو بێ ئاگایی گەورە هەبووە، تیسافرەنس بە تەواوەتی بێ ئاگا بووە لە سنووری رۆژئاواییەکانی، ئەگەرنا ئێسپارت نەیاندەتوانی لە ماوەیەکی کورتدا ئەو هەموو شارانە لە بۆسفۆر تا باشوور بگرن. بۆیە بە هاندانی پەریساتیسی دایکی، تیسافرەنسی لە فەرمانڕەوایی لادا و یەکێك لە پیاوانی کۆشکی بە ناوی (تیس رۆست) لە جیاتی ئەو کردە فەرمانڕەوای وڵاتی لیدی.

تیس رۆست بە ڕاسپاردەی پەریساتیس بوو بە فەرمانڕەوای لیدی، بە وتەی کەتزیاس ئەو پیاوی هەلپەرست و دەسەڵات پەرەستبوو، وەك فەرەنسییەکان دەڵێن ئەو (ئاریۆست) بوو، واتە کەسێك بوو کە درەنگ گەیشتبوو، زوو دەڕۆیشتەوە، پەریساتیس دەیزانی ئەو پیاوە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و سەرمایە دەست لە تاوانیش ناپارێزێت.

پێش ئەوەی تیس رۆست بڕوات بۆ لیدی، پەریساتیس داوای کرد و پێی وت: تیسافرەنس پێنج ساڵە فەرمانڕەوای لیدیە، لەوێندەر رەگاژۆبووە، خودان دەستڕۆیشتووییە، بە ئاسانی ناتوانی جێگەی بگرییەوە، ئەگەر دوای بینینی فەرمانی پاشا بەرفەرمانی خۆی دەربڕی و وتی لە حکوومەت دەکشێتەوە تا تۆ بتوانی ببیە فەرمانڕەوا، فریوی بەرفەرمانی ئەو مەخۆ، چوونکە تیسافرەنس پیاوێکی رواڵەتی و فێڵبازە، بۆیە بەرفەرمان دەبێت تاکو بتوانێت تۆ لەنێو ببات، هەر کە لە جیاتی ئەو بووی بە فەرمانڕەوا بیکوژە تاکو لە دەستی ئاسوودە ببی،

دوای ئەوەی کوشتت سەری ئەو بۆ من رەوانە بکە، ئەو رۆژەی سەری تیسافرەنسم پێ بگات، بیست هەزار سککەی زێڕت بۆ رەوانە دەکەم.

پەریساتیس کە بە هۆی ئەزموونەکانییەوە ببوو بە مرۆناس، بۆ ئەوەی ئەو پیاوە چاوچنۆکە هاندات بۆ کوشتنی تیسافرەنس، تەنیا بە ترساندنی ئەو لە تیسافرەنس نەوەستا، بەڵێنی سەرمایەیەکی باشی پێدا، بۆ ئەوەی تیس رۆست دووچاری دوودڵی نەبێت لە کوشتنی تیسافرەنس، ئەودەمەی تیس رۆست بەرەو لیدی کەوتەڕێ.

تیس رۆست بە گەیشتنی بۆ لیدی، فەرمانی پاشای هەخامەنشیی دایە دەست تیسافرەنس، ئەویش فەرمانەکەی کردەوە و خوێندییەوە، لە فەرمانی لادرانی خۆی ئاگەدار بۆوە، ئەوکات بۆ دەربڕینی رێز بەرانبەر پاشا، فەرمانەکەی لەسەر چاوان، دواتر لەسەر سەری دانا، لەو شوێنەی لێی دانیشتبوو دوورکەوتەوە، لە تیس رۆستی ویست تا لە شوێنی ئەو دابنیشێت، ئەوجار مۆرەکانی حکوومەتی پێی دا، کە ئەوکات لەسەر فەرمانەکانیان دەدان و پلەدارەکانی حکوومەتی داواکردن، فەرمانی پاشای هەخامەنشیی بۆ ئەوان خوێندەوە و وتی من لە حکوومەتی لیدی لادراوم، لە ئەمڕۆ بە دواوە تیس رۆست فەرمانڕەوای وڵات دەبێت، ئێوە پێویستە بەرفەرمانی ئەو بن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن.

ئەوکاتەی تیسافرەنس بەو شێوەیە پێگە و شوێن و دەسەڵاتیی خۆی بۆ تیس رۆست بەجێ دەهێشت، تیس رۆست وتەکانی پەریساتیسی بیرکەوتەوە کە پێی وت بوو: (فریوی بەرفەرمانی ئەو مەخۆ، چوونکە تیسافرەنس پیاوێکی رواڵەتی و فێڵبازە، بۆیە بەرفەرمان دەبێت تاکو بتوانێت تۆ لەنێو ببات.) یەك کاتژمێر دوای بە دەستەوەگرتنی دەسەڵات، ئەو کاتەی تیس رۆست بینی کە بەسەر بەردەستەکانیدا باڵادەستە، فەرمانی دەستگیرکردنی تیسافرەنسی دەرکرد، دواتر لە دووی بکوژی نارد تا لە زینداندا سەری لێ بکاتەوە و بۆی بێنێت، هەر کە سەرە براوەکەی تیسافرەنسیان بۆ هێنا، فەرمانی کرد بیبەن بۆ ئێران و بیدەنە پەریساتیس. بەم شێوەیە سەردارێکی گەورە و خودان ئەزموونی ئێران کوژرا، کە گیانی ئەردەشێری دووەمی پاشای هەخامەنشییشی رزگار کردبوو، دوای ئەوەی تیسافرەنس کوژرا، تیس رۆست نەیتوانی رێگر بێت لە تەشەنەکردنی داگیرکاری یۆنانییەکان.

لەشکری یۆنان کاتی هێرشکردنی بۆ ئاسیای بچووك لەژێر فەرماندەیی (ئاژەزیلۆس) بوو، کە ئێسپارتی بوو، مێژوونووسانی یۆنانی توانا جەنگییەکانی ئەویان پێ باڵاتر بووە لە هی ئەسکەندەر.

ئاژەزیلۆس لە سەرەتادا هەموو شارە یۆنانییەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووکی تاکو ئێزمیر داگیرکرد، دواتر بەرەو باشوور پێشڕەویکرد، هەموو شارە یۆنانییەکانی کەنارەکانی باشووری ئاسیای بچووکی داگیرکرد، بەم شێوەیە تەواوی کەنارەکانی رۆژئاوا و باشووری ئاسیای بچووك کەوتە ژێر داگیرکاری یۆنان.

ئاژەزیلۆس هەوڵی نەدا شاری سارد پایتەختی لیدی داگیر بکات، چوونکە مەبەستی ئێسپارت داگیرکردنی شارە یۆنانییەکان بوو بۆ سوود وەرگرتن لە ڕووی بازرگانییەوە، لە لایەکی دیکە ئاژەزیلۆس پێشبینی دەکرد ئەگەر سارد داگیر بکات، ڕووبەڕووی بەرگری توندی هەخامەنشییەکان دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر شکستیش نەخوات، دەبێت زیانی زۆر بەدووی خۆیداجێ بهێڵێت.

ئەو بۆ داگیرکردنی شارە یۆنانییەکان سوودی لە لەشکری دەریایی وەردەگرت، هەخامەنشییەکان لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك لەشکرێکی دەریایی کاریگەریان نەبوو، تاکو بتوانن رێگە لە یۆنانییەکان بگرن، بەڵام ئاژەزیلۆس بۆ گرتنی شاری سارد توانی سوود وەرگرتنی لە لەشکری دەریایی نەبوو، تەنیا دەبووایە پیادەکانی یۆنانی بەکار بخات، چوونکە شاری سارد لە نێوەڕاستی وشکانی بوو، لە کەنارەکانی دەریا زۆر دوور بوو.

کاتێك سەری براوی تیسافرەنس گەیەندرایە پەریساتیس، ئەو بەڵێنی خۆی بەجێ گەیاند، بیست هەزار سککەی زێڕی بۆ نارد، ئەو بابەتە لە کەتزیاس وەرگیراوە، لەبەر زۆری دراوەکە، بە دووری نازانین کە زێدەڕۆیی تێدا بووبێت. پەریساتیس فەرمانی کرد، گۆشت و پێستی کەللەسەرەکەیان لێکردەوە، کەللەسەرەکەیان وشك کردەوە، ئەوکات ئێسکەکانی دیکەیان لە کەللە سەرەکە کردەوە، تەنیا ئەو بەشەیان هێشتەوە کە لە قاپ دەچوو، چوونکە لێوەکەی نارێك بوو، فەرمانیکرد لە زێڕیان گرت تا رێك بێت، وەك لێوی قاپی لێ بێت، لەو رۆژەوە تاکو رۆژی مردنی، ئەوکاتانەی پەریساتیس لە ماڵ دەبوو، ئاوی لەو قاپەدا دەخواردەوە کە لە کەللەسەری تیسافرەنس چێ کرابوو. لە سەردەمانی دواییش شا ئیسماعیلی سەفەوی سەری شبیك خانی میری ئۆزبەکەکانی لە زێڕ گرت و بەردەوام ئاوی پێ دەخواردەوە.

یۆنانییەکان نازناوی (منەمۆن)یان بۆ ئەردەشێری دووەم دانا بوو، مێژوونووسەکانی ئێمە ئەو نازناوەیان بە واتای (بە هۆش، زیرەك) لێکداوەتەوە، سەردەمی پاشایەتیی ئەو پاشا هەخامەنشییە سەردەمی سەرگەرمبوونی ئێران بوو بە جەنگی یۆنان.

هەڵبەتە ئاشتی درێژخایەنی نێوان هەخامەنشیی و یۆنانییەکان بە هۆی ڕەوتارەکانی پەریساتیس دایکی ئەردەشێری دووەم تێکچوو، تاکو کۆتایی دەسەڵاتیی ئەردەشێری دووەم ئەو جەنگ و ئاریشانە بەردەوام بوون. ئێسپارت پاڵپشت بە هێزی دەریایی خۆیان، تەواوی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووکیان داگیرکرد، تیسافرەنس سەرداری دلێری ئێران بە هاندانی پەریساتیسی دایکی ئەردەشێر کوژرا.

فەرمانڕەوای تازەی لیدی تیس رۆست بۆ وەرگرتنەوەی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك بە لەشکرێکەوە کەوتەڕێ، بەڵام شکستی خوارد، کاتێك هەواڵی ئەو شکستە گەیشت، بە وتەی دەی نۆن ئەردەشێری دووەم ئاخێکی هەڵکێشا و وتی: "ئێستە دەرکەوت، کە تیسافرەنس زیندوو نییە." ئاخ هەڵکێشانی پاشایەکی هەخامەنشیی ڕووداوی تایبەتە و زۆر بە کەمی ڕوودەدات.

ئێسپارت دوای داگیرکردنی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك و بێبەش کردنی هەخامەنشییەکان لە داهاتی ئەو شارانە، هەوڵیاندا تاکو شارەیلی کەنارەکانی وڵاتانی سوریا و لوبنان داگیربکەن، دوای داگیرکردنی ئەو شارانە، دەستدرێژیان کردە سەر خاکەکانی ژێردەستی ئەسینا.

پەریساتیس بە ئەردەشێری کوڕی وت: ئێستە کاتی ئەوەیە کە لەگەڵ ئەسینا بۆ جەنگی ئێسپارت ببیە هاوپەیمان تاکو ئێسپارت بە چۆکدا بخەی.

کاتێك ڕەزامەندی پاشا بۆ هاوپەیمانی هەخامەنشییەکان و یۆنان هاتەدی، پەریساتیس خۆی خۆبەخشانە بۆ گفتوگۆ بەرەو ئەسینا رۆیشت، لەوانەیە بتوانین بڵێین ئەو یەکەم باڵیۆزی ئافرەت بوو، کە بۆ کارێکی گەورەی سیاسیی ئێرانی بەجێ هێشت.

ئەوکات هەخامەنشییەکان نەیاندەتوانی بە رێگەی رۆژئاوادا، واتە لە گەرووی بسفۆر یاخۆ دەریای مەرمەڕە یان گەرووی داردەنێل بچنە یۆنان، چوونکە ئێسپارت دەسەڵاتیان بەسەر ئاسیای بچووك و ئەو شوێنانەدا هەبوو، کەشتییە ئێرانییەکان نەیاندەتوانی بۆ رۆیشتن بۆ یۆنان سوود لەو شوێنانە وەربگرن، بەڵام ئەو ژنە وێڕای ئەو بەربەستانە لە بڕیارەکەی پاشگەز نەبۆوە، لە رێگەی کەنداوی

فارس، دەریای عومان و دەریای قەلزەم، دوای تێپەڕبوون لە کەناڵی داریوش لە نێوان دەریای قەلزەم و ڕووباری نیل، گەیشتە دەریای مەدیتەرانە و خۆی گەیاندە ئەسینا.

پەریساتیس دەیزانی ئەگەر بڕواتە ئەسینا لەوانەیە بکوژرێت، چوونکە ئەو هێرشی کردبووە سەر دوورگەی قوبرس، کە لەژێر دەسەلاتیی ئەسینا و تسالی بوو، فەرمانڕەوای ئەو دوورگەیەی کوشت، لەوانە بوو ئەسینایییەکان ئەو بکوژن تاکو تۆڵەی خوێنی فەرمانڕەوای دوورگەی قوبرس بکەنەوە، بەڵام ئەو ژنە نەترسە دوای گەیشتنی بە میسر، وەڵامی بۆ سەرۆك کۆماری ئەسینا نارد کە وەك نێردەی پاشای هەخامەنشیی دێتە ئەسینا و دەیەوێت خزمەتێکی گەورە پێشکێش بکات، دوای گەیشتنی بۆ ئەسینا، حکوومەتی ئەو وڵاتە ڕێز و شکۆیان لێ نا.

دەی نۆن دەڵێت دایکی ئەردەشێری دووەم هێندە دیاری لەگەڵ خۆیدا هێنابرد بوو، کە دوای هاتنی بۆ ئەسینا بۆ هەر ژن و پیاوێکی ئەسینایی دیارییەکی نارد، تەنانەت تەواوی کۆیلەکانیش دیاریان وەرگرت. ڕەنگە ئەو وتەیە دوور بێت لە زێدەڕۆیی، چوونکە ئەوکات دانیشتووانی ئەسینا هێندە زۆر نەبوو، پەریساتیس دەیتوانی دیاری بداتە هەمووان.

دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمی هاتنی پەریساتیس و بەخشینی دیارییەکان، گفتوگۆکانی ئەو ژنە و سەرۆك کۆماری ئەسینا بە ئامادەبوونی ئەندامانی ئەنجومەنی پیران دەستی پێکرد.

بابەتی گفتوگۆ بریتی بوو لەوەی ئەسینا بە تەواوی هێزی دەریایی خۆی و تسالی و ئەو دەوڵەتە شارانەی یۆنان کە بیانەوێت، بۆ پاڵپشتی ئەردەشێری دووەم لە دژی ئێسپارت بێنە نێو جەنگ و هێزی دەریایی ئێسپارت لەنێو ببەن، پاشای هەخامەنشیی هەرچی کەشتیی هەیەتی بۆ جەنگ لە دژی ئێسپارت بەکاری دەبات و هەموو ئەو شارانەی ئێسپارت داگیری کردوون، وەردەگرێتەوە.

دەسەلاتیی ئەسینا وتیان ئامادەن لە دژی ئێسپارت لەگەڵ پاشای هەخامەنشیی ببنە هاوپەیمان و بچنە نێو جەنگ و دەوڵەتە شاری تسالیش لەو جەنگەدا بەشدار دەبێت، بەڵام جەنگ تێچووی زۆری دەوێت، نە ئەسینا پارەی هەیە و نە تسالی.

پەریساتیس وتی: پاشای هەخامەنشیی دەوڵەمەندە، چەندە پارە پێویست بێت، دەیداتە دەوڵەتە شارەکانی تسالی و ئەسینا.

دامەزراوەی دارایی ئەسینا هەژماریان کرد و وتیان: بۆ هاوپەیمانبوونی دەوڵەتە شارەکانی ئەسینا و تسالی لە دژی ئێسپارت لەگەڵ پاشای هەخامەنشیی و بەکارخستنی هەموو هێزی

دەریایی و وشکانیان، پاشای ئێران ناچارە پەنجا هەزار تالان زێڕ بدات. تالانی زێڕ بە پێوەری ئەمڕۆ چوار سەد سککەی زێڕی بەریتانی دەکات، بەم پێیە دوو ملیۆن سککەی زێڕی بەریتانی داوا کرابوو، ئەوەش پارەیەکی زۆر بوو.

پیاوانی سیاسیی ئەسینا، بۆیە ئەو ژمارەیان باس کرد، چوونکە دەیانزانی پەریساتیس کێشمەکێش دەکات، دوای وتوویژی زۆر، ڕەزامەندیان نواند تا سێ هەزار تالان زێڕ بدرێت بە دەوڵەتە شارەکانی ئەسینا و تسالی، ئەوان لە دژی ئێسپارت بێنە نێو جەنگ، بەڵام هەخامەنشییەکان ئەو پارەیان وەك باج نەدا بە ئەسینا و تسالی، بگرە وەك یارمەتی دایان بە هاوپەیمانێکی هەژار تاکو بۆ یارمەتییان بێتە نێو جەنگ.

ڕێگەی گەرووەکانی بۆسفۆر و داردەنێل و دەریای مەڕمەڕە مەترسیدار بوو، مەترسی لە ئارادا بوو زێڕەکە بکەوێتە بەردەست ئێسپارتەکان، پەریساتیس وتی زێڕی پاشای هەخامەنشیی لە میسر دەدرێتە دەوڵەتە شارەکانی ئەسینا و تسالی، ئەوان پێویستە بە کەشتییەکانی خۆیان بیگوازنەوە بۆ سنووری خۆیان. هەروەها هێزی دەریایی هەخامەنشیی کە لە دەریاکانی باشووری ئاسیایە، لە ڕێگەی کەناڵی داریوش و دەریای قەلزەم دێنە مەدیتەرانە و هێرش دەکەنەسەر هێزی دەریایی ئێسپارتەکان.

ئەسینابییەکان وتیان پێویستە دوای هاتنی بۆ دەریای مەدیتەرانە، هێزی دەریایی هەخامەنشیی بکەوێتە بەرفەرمانی هێزی دەریایی ئەسینا تاکو سوود لە کۆبوونەوەی هێزەکان وەربگیرێت، ئەگەر هێزی دەریایی هەخامەنشیی بە تەنیا ئەو هێرشە بکات ئاکامی باشی نابێت.

پەریساتیس ئەو مەرجەی پەسەند کرد و پرسیاری کرد: فەرماندەی هێزی دەریایی ئەسینا کێیە؟.

لە وەڵامدا وتیان: کۆنۆن فەرماندەی هێزی دەرياییە.

پەریساتیس لە تەمەنی ئەوی پرسیار کرد و وتیان پەنجا ساڵ تەمەنییەتی. ئەو وتی لەو تەمەنەدا پیاو خودان ورە و هێزی جەستەییە، ئەگەر لێهاتوو بێت، دەتوانێت زۆر سوودیان لێ وەربگرێت.

پێیان وت: کۆنۆن پیاوێکی لێهاتووە و بە باشی جەنگ بەڕێوە دەبات.

ئەو رۆژەی پەریساتیس لە ئەسینا گەڕایەوە، پێیان وت تاکو ئەو کاتەی زێڕە بڕیار لەسەردراوەکە لە میسر نەدرێتە تسالی و ئەسینا، نابێت چاوەڕوان بن، کە ئەو دوو دەوڵەتەشارە بێنە نێو جەنگ.

پەریساتیس وتی دڵنیا بن، کە بە زوویی زێڕەکە دەگات، ئەوکات کەشتییە جەنگییەکانی ئەسینا تاکو میسر لەگەڵ پەریساتیس رۆیشتن، ئەویش لەوێوە گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.

پەریساتیس بە گەیشتنی بۆ ئێران، کاری بۆ گواستنەوەی زێڕ بۆ میسر کرد و متمانەی هەبوو کە ئەسینا و تسالی پشت لە بەڵێنەکەیان ناکەن، چوونکە خۆیان لەبەر مەترسی گەورەی ئێسپارتدا دەبینن و پێویستە ئێسپارت بە چووکدا بدەن تا بتوانن بەردەوام بن لە ژیانی خۆیان.

زێڕی هەخامەنشیی توانای خستەوە بەر دەوڵەتە شارەکانی تسالی و ئەسینا، ئەو دوو حکوومەتە توانیان خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن و بڕیاردرا لە دەریادا هێزی دەریایی هاوبەشی ئەوان و هەخامەنشیی، هێزی دەریایی ئێسپارت لەنێو ببات، لەشکری وشکانی هەخامەنشییش لە ئاسیای بچووك ئێسپارتەکان لە شارە یۆنانییەکان دەربکات، دواتر لە کەنارەکانی لوبنان و سوریایان دەربکات.

تەواوی هێزی دەریایی هەخامەنشیی کە لە کەنداوی فارس و دەریای عومان و زەریای هیندی بوو لە رێگەی کەناڵی داریوش و دەریای قەلزەم هاتنە مەدیتەرانە و کەوتنە پاڵ هێزەکانی تسالی و ئەسینا، بەڵام پێش دەستپێکردنی جەنگی وڵاتانی هاوپەیمان لە دژی ئێسپارت، لە ئێران ڕووداوێکی تازە سەریهەڵدا، بریێتی بوو لە ڕاپەڕینی (کادۆسییەکان) کە دواتر بە (قادۆسییەکان) ناسرا.

باسی ئەو ڕاپەرینە لەلایەن هەر سێ مێژوونووسی یۆنانی (دەی نۆن، گزنفۆن و پلۆتارك) کراوە، دەی نۆن کە پێشتر بووە لە ئەوان، لە سەرچاوەی سەرەکیی سوودی وەرگرتووە یاخۆ لە سەرچاوەکە نێزیکتر بووە، بەڵام پلۆتارك کە لە ساڵی (١٢٠ ز) مردووە بە پلەی یەکەم بیوگراف بووە و ژیاننامەی ناودارانی کۆنی نووسیوەتەوە و ڕووداوە مێژوویيەکانی لە پەڕتووکەکەیدا تەنیا لقێکە لە ژیاننامەی پیاوانی ناودار، بەڵام دەی نۆن و پلۆتارك کە هەردووکیان ڕاپەڕینی کادۆسییەکان نووسیوەتەوە، پتر چاویان لە ڕووداوەکان بووە تاکو لە ورەی ناودارەکان.

کادۆسییەکان نەتەوەیەکی ئاریایی بوون، کە برنج خواردنی سەرەکیان بوو، لە کەنارەکانی دەریای خەزەر لە گەیلان و مازەندەرانی سەردەمی ئێستە دەژیان.

گریمانێکی کۆن کە بنەمای زانستی، تەنانەت مێژوویشی نییە، دەڵێت ئەوانەی برنج دەخۆن، نەرم و نیان دەبن، بەڵام ڕاپەڕینەکانی نەتەوەی کادۆسییان لە کۆن و جەنگەکانی نەتەوە برنج خۆرەکانی وەك ژاپۆن لە دووەمین جەنگی جیهان، کۆریا لە ساڵانی (١٩٥٠ تا ١٩٥٣ ز)، ڤیێتنام لە ساڵانی (١٩٦٤ تا ١٩٧٣) ئەو ڕاستییەیە دەخەنەڕوو کە برنج خواردن بەڵگەی بێ توانایی نییە.

کادۆسییەکان لە ناوچەیەکی داپۆشراو بە جەنگەڵ دەژیان، لەگەڵ ئاژەڵە کێوی و دڕندەکان دەژیان، هەندێ کات لە جەنگەڵەکان دەهاتنەدەر و هێرشیان دەکردە سەر وڵاتەکانی باشوور، ئەگەر ڕێیان نەگیرابووایە، تاکو فارسیش دەڕۆیشتن. ئەگەر لە جەنگەڵ باران باریبووایە و بەرهەمی برنجی کادۆسییەکان باش دەبوو، ئەوان ناچار نەدەبوون هێرش بۆ وڵاتانی دەوروبەریان بکەن، ئەگەر وشکەساڵی بووایە و برنج کەم بەرهەم هاتبایە، ئەوان هێرشیان بۆ دراوسێکانیان دەکرد.

لە ساڵی (٣٩٤ پ. ز) لە جەنگەڵێکی گەورەی باشووری دەریای خەزەر باران نەباری و برنج کە پێویستی بە ئاو بوو بەرهەمی نەدا و وشك بوو، کادۆسییەکان دووچاری برسێتی بوون، بە چەکەکانیانەوە کە بەردەوام گۆپاڵ و تەور بوو، بەرەو نەتەوەکانی دراوسێیان کەوتنەڕێ، کە هەموو وەك خۆیان ئاریایی بوون و هێرشیان کردە سەریان، ئەردەشێری دووەم ناچار بوو ئەو لەشکرەی بۆ جەنگی ئێسپارت ئامادەی کردبوو بۆ جەنگی کادۆسییەکانی بنێرێت.

جەنگی لەشکری ئەردەشێر لەگەڵ کادۆسییەکان لە ناوچەکانی باشووری دەریای خەزەر، بە تایبەتی گەیلان هێندەی خایاند کە وەرزی لەشکرکێشیی بۆ ئاسیای بچووك کۆتایی هات و زستان گەیشت، ئەردەشێری دووەم زانی کە تا بەهاری ساڵی دواتر توانای لەشکرکێشیی بۆ ئاسیای بچووك نابێت، بەڵام ڕاپەرینی کادۆسییەکان بە تەواوەتی کۆتایی هات بوو، چوونکە بە هاتنی پایز ماسی زۆر ببوو، کادۆسییەکان لە برسییەتی ڕزگاریان ببوو، بە خواردنی ماسی و باڵندەکان کە لە کەنارەکانی دەریای خەزەر زۆر بەردەست دەکەوتن، خۆیان تێر دەکرد.

دەی نۆن نووسیویەتی کە دوای هاتنی وەرزەکانی پایز و زستان، باڵندەی دەریایی کە تامی گۆشتەکەیان زۆر خۆشە، لە کەنارەکانی دەریای خەزەر هێندە بە فرەوانی دەست دەکەوێت، کە هەموو منداڵێك دەتوانێت لە شەوێکدا چەند دانەیەك بگرێت.

هاوکات لەگەڵ جەنگی ئەردەشێری دووەم و کادۆسییەکان، کانۆن فەرماندەی هێزی دەریایی وڵاتە هاوپەیمانەکان، هێزی دەریایی هەرسێ وڵاتی بەرەو جەنگ ڕێبەرایەتیی دەکرد. لە کۆندا کەمتر ڕوویدابوو کە هێزێکی دەریایی هێندە بەهێز و دامەزراو بۆ جەنگ ئامادە بکرێت.

ئەسینا بەو زێڕەی لە پاشای هەخامەنشییان وەریگرتبوو، هەندێ لە دەوڵەتەشارە بچووکەکانی یۆنانی ناچار بە بەشدار بوون لەو جەنگە کرد بوو، ئەوانیش پەسەندیان کردبوو، ئەو هێزەی کۆنۆن بۆ جەنگی ئێسپارتەکان سەرکردایەتیی دەکرد، لە پێنج سەد کەشتیی جەنگی پێکهاتبوو.

بەڕێوەبردنی پێنج سەد کەشتیی جەنگی کە هی چەند وڵاتێکی جیاواز بن لە شەو و ڕۆژێکدا لە گۆڕەپانی جەنگ کارێکی ئاسان نییە، لێهاتوویی و چاو کراوەیی پێویستە، کۆنۆن لەو ڕۆژەوە کە وەك سەرکردەی دەریایی وڵاتە هاوپەیمانەکان کەوتەڕێ تاکو ئەو ڕۆژەی هێزی دەریایی ئێسپارتی لە (کۆنیدۆس) لەنێو برد بۆ یەك شەویش نەخەوت.

شوێنی ڕوودانی جەنگی نێوان ئێسپارت و وڵاتە هاوپەیمانەکانی تسالی و ئەسینا و ئێران شوێنێك بوو بە ناوی (کۆنیدۆس)، چوونکە هێزی هاوپەیمانان لەوێ توانیان سەربکەون، پێویستە بزانین ئەو شوێنە کوێیە و ئێستە لە چ دۆخێکدایە؟

بیست و پێنج سەدە پێش ئێستە وڵاتێکی بچووك لە ئاسیای بچووك هەبوو، کە ناوی (کاری) بوو، بۆ دۆزینەوەی کاری پێویست لەسەر نەخشەی ئێستەی تورکیادا شاری (ئایدین) ببینین و ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ئایدینی ئێستە، وڵاتی کارییان پێکدەهێنا.

کۆنیدۆس بەندەرێك بوو لە ڕۆژئاوای وڵاتی کاری کە ئێستە لە جێگەی ئەو گوندێك بە ناوی (تێکی ئار) دەبینرێت.

لە ڕابردوودا لە ڕۆژئاوای ئەو شارە دوورگەیەکی بچووك هەبوو، کە ئێستە نەماوە. ئەو شارە لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك لە شارە کۆنەکانی جیهان بوو، هەرچەندە کۆنیدۆس سەر بە وڵاتی کاری بوو، بەڵام سەربەخۆیی خۆی هەبوو، بە دەستەواژەی عارەبەکان بە (مدینە)

دەژمێردرا، ئێستە مەدینە تەنیا بە واتای شار دێت، بەڵام لە کۆندا لە سعودیە بەو شارانە دەوترا کە سەربەخۆییان هەبوو.

هێزی دەریایی ئێسپارت لە رۆژی (٣٩٤/٨/٨ پ. ز) بۆ دەستەبەرکردنی سەوزە و میوەی تازە هاتنە کۆنیدۆس. بارکردنی ئاو لە کۆن وەك ئێستە نەبوو، کارێکی قورس بوو، لەو شوێنانەی ئەسکەلەی لێ نەبوو، دەبووایە بە بەرمیل بگوازرێتەوە نێو کەشتییەکان. بەرمیلە ڤاڵاکان دەخرانە نێو بەلەم و دەبرانە کەنارەکان و تژی دەکران لە ئاو و دەیانگەڕاندنەوە، بۆیە ئاو بارکردن لە رابردوودا بە یەك دوو دەمژمێران یاخۆ یەك رۆژ تەواو نەدەبوو.

هێزی دەریایی ئێسپارت دوای گرتنی کەشتییە جەنگییەکانی شارەکانی کەناری ئاسیای بچووك و فینیقییە (لوبنان) زۆر بەهێز ببوو، لە رۆژی (٣٩٤/٨/١١ پ. ز)، دوای سێ رۆژان لە کۆنیدۆس تەواو بوون، بە گەیشتنیان بۆ دەریا، لەلایەن پێشەنگی هێزی دەریایی هاوپەیمانان بینران و ئاگەداری کۆنۆنیان کردەوە، کۆنۆن زانی ئەوە هێزی دەریایی ئێسپارتە، بە هێما و ئاماژە فەرمانی ئامادەبوون بۆ جەنگی دەرکرد. فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشیی ئەفسەرێك بوو بە ناوی (هۆم تان) بە واتای (نیشتمانپەروەر) دێت، هۆم تان فەرمانی بە کەشتییە جەنگییەکان کرد ئامادەبن بۆ جەنگ.

فەرماندەی هێزی دەریایی ئێسپارت پیاوێکی تەمەن شەستساڵی بە ناوی (تراکاس) بوو، ڕووخساری بە هەتاو و بای دەریا رەش ببوو، ئەو بە چل ساڵی دەچوو، وێنەی جەنگاوەرێکی ئازا و رێکی ئێسپارتی دەنواند.

هەموو لایەك دەزانن کە مەلەوان و خزمەتکارەکان دوای ماوەیەك لە دەریاوانی، ئەوکاتەی دەگەنە بەندەرێك، دوای ئەوەی مۆڵەت دەدران، هەنگاویان دەنایە وشکانی، سەرەتا بەرەو مەیخانە و شوێنەکانی کات بەسەر بردن دەڕوات. لە دووهەزار و پێنج سەد ساڵ بەر لە نها، بەو شێوەیە بوو، مەلەوانەکان دوای دابەزین لە وشکانی، ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو شوێنانە دەڕۆیشتن، چوونکە ماوەیەك بوو لە مەی و ئافرەت دوور بوون، بەڵام تراکاس رێسا و رێککاری پتەوی هەبوو، وێڕای ئەوەی بۆ ماوەی سێ رۆژان لە کەنارەکان وێستابوو، تەنانەت یەك سەربازیشی نەچوو بۆ مەیخانەکان و یەك دڵۆپە شەرابیشیان نەخوارد.

کەشتییەکانی ئێسپارتەکان هێندە خاوێن بوون، کە مەلەوانەکانی دووربوون لە مێش و مەگەز، ئەو بابەتە بۆیە باس دەکەین، چوونکە ئەوکات مێش و مەگەز لە دەریاوانیدا یەکێك

له بەلاكان بوون بۆ کەشتیوانان، زۆر جاران مەلەوانەکانی هێزی دەریایی بە هۆی نەخۆشی مەلاریا، کە لە مێشوولەوە دێت، لەنێو دەچوون.

لە کۆن سابوون نەبوو، لە دەریاشدا گەرماو نەبوو، جگە لە دەریاوانە ئێسپارتەکان کەسی دیکە جلەکانی نەدەشووشت، بۆیە بەربەرەکانی کردنی ئەو مێشوولانەی لەسەر جەستەی مرۆڤ دەژیان ئەستەم بوو. تراکاس پێش هەر گەشتێکی دەریایی رێژەیەکی زۆر (چوبەك[٢]، سەدر و خۆڵەمێشی) دەهێنایە نێو کەشتییەکان، دەریاوانەکان ناچار بوون دوو رۆژ جارێك جلوبەرگەکانیان بە سپۆنە و پێنج رۆژان جارێکیش جەستەیان بە سەدر و خۆڵەمێش بشۆن، هەر دەریاوانێك لە دەریادا سێ دەستە جلی هەبوو، کە بە رێکی دەشۆران.

تراکاس بەردەوام نان و پەنیر و شیراوکەی ترێی دەدایە دەریاوانەکانی، نان لە کەشتییەکاندا دەبرژێندرا، پەنیر لە یۆنانەوە بە شێوەی قالّبی گەورەی بە مۆم داپۆشراو دەهێنرا، شیراوکەی ترێش هەر لە یۆنانەوە دەهات. دەریاوانی کەشتییەکانی تراکاس پتەو، توندوتۆڵ و دوور لە نەخۆشی بوون، چوونکە پاکژتر لە ئاووهەوای سەر دەریا نییە.

تراکاس هەر کە زانی لەلایەن دوژمنەوە بینراوە، بڕیاری جەنگیدا، کەشتییەکانی ئەو کە تاکو ئەوکات بەرەو باکور پێشڕەوییان دەکرد، فەرمانی گەڕانەوەیان پێکرا، بەلام گەڕانەوەی کەشتییەکان ئاسان نەبوو، چوونکە با بەرەو باکور دەشنایەوە، لە کۆندا کە کەشتییەکان بە چارۆگە و سەوڵ دەجولان، ئاراستەی با کاریگەر بوو لە رۆیشتنیان. ئاراستەی با لە باشوور بۆ باکور بوو، بۆیە ئاراستەی شەپولەکانی ئاویش لە باشوور بۆ باکور بوون، کەشتییە ئێسپارتییەکان لە گەڕانەوەدا ڕووبەڕووی هێزی شەپۆلەکانی ئاو دەبوونەوە.

هۆم تان فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشیی داوای لە کۆنۆن کرد، تا رێگەی بدات هێزەکەی ئەوان سەرەتا بچنە نێو جەنگ. پاڵنەر بۆ ئەو داوایەی هۆم تان دلێری نەتەوەیی بوو، چوونکە لە ڕاستیدا ئەو جەنگە هی هەخامەنشیی و ئێسپارت بوو، نەك هی ئێسپارت و هاوپەیواتان، لە لایەکی دیکە هۆم تان ویستی ئەوە بسەلمێنێت، کە ئەگەر هەخامەنشییەکان لە وشکانی بالادەستن، لە دەریاش لە جەنگ ناترسن.

---

(٢) چوبەك هەمان گیای کوردەواری سپۆنە کە دەتوانرێت سوود لە رەگەکەی وەربگیرێت لە جیاتی تایت بۆ پاککردنەوە. "وەرگێڕی کوردی"

مێژوونووسە یۆنانییەکان ژمارەی کەشتییەکانی هاوپەیواتانیان بە پێنج سەد کەشتیی باس کردووە، دوور نییە کە ئەوە زێدەڕۆیی بێت، چوونکە ئێسپارتەکان لەو جەنگەدا شکاون، نەیارانی ئێرانیش بەردەوام بۆ پاساوی شکست، هەوڵیانداوە لەشکری ئێران بە زۆرتر و لەشکری بەرانبەر بە کەمتر دیار بکەن، ژمارەی کەشتییەکانی ئێسپارت بە دوو سەد[٣] و هی هاوپەیواتانیان بە پێنج سەد کەشتیی داناوە، تا بڵێن ئێسپارت لە بەرانبەر هێزێك شکاوە کە دووبەرانبەر و نیوی خۆی بوو.

بۆ زانینی شێوەی جووڵەی کەشتیگەلێکی پێنج سەد دانەیی، دەڵێین لە رابردوو، لە ئێستەشدا کەشتییەکان وەك دەنکی تەسبیح یەك بە دوای یەکدا رێدەکەن، ئێستە هەر کەشتییەك کە بەدوای ئەوی دیکەدا دەڕوات بەلانی کەم نێزیکەی نیو مایلی دەریایی دوور دەبێت لە ئەویدی، هەر میلێکی دەریایی (١٨٢٥) مەترە، کاتێك هەندێ کەشتیی شکێن بەدوا یەکدا رێدەکەن، دەبێت مەودای نێوان هەریەکەیان یەك مایل بێت، چوونکە بە خێرایی (٩٠ تا ١٠٠) کیلۆمەتر لە دەمژمێرێکدا دەجووڵێن، ئەگەر مەودایان کەمتر بێت، بەر یەك دەکەون، بەر یەککەوتنی دوو کەشتیی خێرا دەبێتە هۆی لەنێو چوونی هەردووکیان.

لە رابردوو کەشتییە جەنگییەکان بچووك و هێواش بوون، بۆیە مەودای نێوان دوو کەشتیی لە کاتی رۆیشتندا بە یەك لەسەر دەی مایلێك واتە (١٨٥م) دادەنرا. بە زانینی ئەو بابەتە ئەگەر پێنج سەد کەشتیی هاوپەیواتان لە دە ریزدا کە هەر ریزێك پەنجا کەشتیی دەکات لە جووڵەدا بن، درێژایی هەر یەکە لەو ریزانە دەکاتە نۆ کیلۆمەتر و (٢٥٠م). ئەگەر پێنج ریز بن، هەر ریزێك سەد کەشتیی بێت درێژیەکە بۆ (١٨.٥) کیلۆمەتر زیاد دەکات، بەڕێوەبردنی شەڕگەیەك بەو درێژیە گرفتی زۆرە، تەنانەت ئەگەر نۆ کیلۆمەتریش بێت هەر ئەستەمە، چوونکە ئەوکات بێتەل نەبوو، کەشتییەکان بەردەوام لە جەنگدا بە بێتەل پێکەوە پێوەندییان هەیە و فەرماندەی کەشتییەکە دەکارێت فەرمانەکانی بە هەمووان ڕابگەیەنێت و ڕاپۆرتیان لێ وەربگرێت.

---

(٣) ئەگەر دەوڵەتە شارێکی بچووکی وەك ئێسپارت کە دانیشتووانی ئەوکاتی پتر لە سی هەزار کەس نەبووە، بتوانێت دوو سەد کەشتی ئامادە بکات، بە دڵنیاییەوە پێنج سەد کەشتی بۆ هەخامەنشییەکان و یۆنان هەر زۆر کەمە، دەزانرێت سنووری دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان سەدان ئەوەندەی سنووری دەسەڵاتی ئێسپارت بووە. "وەرگێڕی کوردی"

ئامرازەکانی پێوەندیی لە رابردوودا لەنێو دەریا لە کاتی رۆژ تەنیا ئاڵاَ رەنگاورەنگەکان بوون، لە شەودا ڕووناکی، لە گۆڕەپانێکی جەنگ بە درێژایی نۆ کیلۆمەتر کەشتییەکان هێما رەنگاوڕەنگەکانی خۆیان بە باشی نەدەبینی، ئەگەر شنینەوەی با دەرفەتی دابووانە، دووکەڵیان دەکردەوە تا بەشێك لە کەشتییەکانیان لەبەر چاوی دوژمن بشارنەوە. کاتی چێکردنی دووکەڵ، ئەگەر با دووکەڵەکەی بەرەو دوژمن بردبایە، فەرماندەکەیان نەیدەتوانی هێماکانی خۆی بخاتەکار.

ئەوانە ئەو خاڵانەن کە نیشاندەری ئەو ڕاستییەن، کە ژمارەی کەشتییەکانی هاوپەیمانان پێنج سەد کەشتیی نەبووە، ئێمە بچووکترین زانیاریمان لە سەرچاوە ئێرانییەکان سەبارەت بە جەنگی (کۆنیدۆس) نییە، ئەوەی مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە، دەبێت پەسەندیان بکەین، بەڵام کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکان، سوود لە ئەقڵمان وەردەگرین بۆ ئەوەی بزانین ئەوەی باسیان لێوە کردووە، لەگەڵ ئەقڵدا دەگونجێت.

مێژوونووسە یۆنانییەکان ژمارەی کەشتییەکانی تراکاسیان بە دوو سەد کەشتیی باس کردووە، دواتر دەڵێن ئەو هاتنەی یۆنانییەکان و هەخامەنشییەکان بۆ تراکاس لە پڕ بووە.

بۆیە لێرە سوود لە ئەقڵمان وەردەگرین و دەڵێین بوونی دووسەد کەشتیی دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە تراکاس ئاگەدار بووە، لە هاتنی هاوپەیواتان، خۆی بۆ جەنگ ئامادە کردووە، چوونکە ئەو ژمارەیە لە کەشتیی بە لەشکرێکی دەریایی گەورە هەژمار دەکرا، بۆ خۆشی لە دەریا نەدەسووڕانەوە، بۆ ئەرکە ئاساییەکانیش هەرگیز دوو سەد کەشتیی رەوان نەدەکرا، هەروەك بە لێکدانەوەی ئەندازەکان لە ئەمڕۆدا هەزار تانك بۆ ئەرکێکی ئاسایی، بۆ نموونە بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونێکی ناوچەیی رەوان ناکەن.

ئامادەکردنی ئەو ژمارەیە لە کەشتیی لەلایەن تراکاس نیشاندەری ئەوەیە، کە ئەو خۆی بۆ هاتنی هاوپەیواتان ئامادە کردووە، ئەو بابەتە بۆ ئەو چاوەڕوانکراو بووە.

لە لایەکی دیکە مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە تراکاس بەرەو باکور دەڕۆیشت، کاتێك زانی هێزە هاوپەیمانەکان ئەویان دۆزیوەتەوە، بەرەو باشوور گەڕایەوە.

ئەگەر ئەوە لەناکاو بوو بێت، بۆچی ئەو بەرەو دوژمن نەدەچوو، چوونکە ئەو دەیتوانی سوود لە ئاراستەی با وەربگرێت و خۆی لە (هەخامەنشیی و ئەسینایی و تسالییەکان) دووربخاتەوە، هەر ئەو بۆ خۆی بەهۆی باوەڕی زۆری بە هێزەکەی بەرەو هەخامەنشییەکان

دەرۆیشت، کە لە ریزی پێشەوەی کەشتییە هاوپەیمانەکان بوون، بوونی دووسەد کەشتیی و ئەو ئامادەییەی لە تراکاس هەبوو، ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەو جەنگە بۆ ئەو لەنەکاو نەبووە.

گریمان هاوپەیمانەکان توانیان لەناکاو بە سەر تراکاسدا بدەن، ئەو بابەتە جێگەی دەست خۆشییە بۆ ئەوان، چوونکە لە جەنگەکاندا چ لە وشکانی یاخۆ لە دەریادا، یەکێك لە رێگەکانی سەرکەوتن لە نەکاوبوونی جەنگە، ئەوە ئەو کارە بوو، کە هاوپەیواتان لە کۆنیدۆس لەگەڵ ئێسپارتەکان کردیان، بە شێوەیەك ئێسپارتیان لە دەریادا شکاند کە نەیانتوانی سەر هەڵبدەنەوە.

پێش ئەوەی هەردوولا بەیەك بگەن، شەو بەسەردا هات، ئازاترین سەرکردە دەرياييەکان ناوێرن لە شەودا جەنگ بەڕێ بخەن، چوونکە لە شەودا لەیەك جیاکردنەوەی کەشتیی خۆمانە و دوژمن ئەستەم بوو، لە لایەکی دیکە لە تاریکیدا نەدەتوانرا بجەنگن. کەواتە تەنیا ناچاربوون شەو بەسەر بەرن و چاوەڕوانی هاتنی بەرەبەیانی (١٢ ئوتی ٣٩٤ پ. ز) بن.

رۆژی یازدەی مانگ ئاراستەی با لە باکور بەرەو باشوور بوو، دوای هاتنی شەو شنینەوەی با ئارام بۆوە، شەپۆلەکان هێوور ببوونەوە، بەڵام جوولەی ئاو لە باشوورەوە بۆ باکور بوو، بە ئارامی کەشتییەکانی هاوپەیواتانی لە ئێسپارتەکان نێزیك دەکردەوە، ئەوەش پێچەوانەی ویستی ئەوان بوو، تراکاس کە رۆژی یازدەی مانگ لەگەڵ شەپۆلەکان دەجەنگا، تا خۆی بگەیەنێتە کەشتییە ئێرانییەکان کە لە پێشەوەی هاوپەیمانەکان بوون، ئەو شەوە وردبینی ئەوەی دەکرد، کە خۆی لە کەشتییە جەنگییەکانی هاوپەیواتان بە دوور بگرێت.

هەموو کەشتییە جەنگییەکان چارۆگەیان هەبوو، بەڵام هێشتا قۆناخی سوودوەرگرتن لە چارۆگە بە تەواوەتی پتەو نەببوو، پتر جوولەی کەشتییەکان بەهۆی سەوڵەوە بوو، فەرماندەی کەشتیی نەیدەتوانی بە پێچەوانە دانانی دوو چارۆگە لە کەشتییەکەی، جوولەی کەشتیی ڕابگرێت. ئێستە و دوای بیست و پێنج سەدە کەشتییەکان زۆر گەورەتر و قورسترن، بەڵام ناتوانن کەشتییەك بە تەواوەتی لەئاودا ڕابگرن، واتەبە شێوەیەك رایبگرن کە بە هۆی شەپۆلەکان یاخۆ جوولەی ئاو نەڕوات. چوونکە دەریاکان زۆر قووڵن، هەندێ جار قووڵییان دەگاتە چوار هەزار مەتر، ئەوە ئەو دەریایانە ناگرێتەوە کە پێشتر وشکانی بوون، وەك کەنداوی فارس، هیچ کەشتییەکیش چوار هەزار مەتر لەنگەری پێ نییە، تەنانەت ئەگەر لەنگەریشی پێ بێت دوای ئەوەی لەنگەر هەڵدەدەن، جارێکی دیکە ڕاکێشانەوەی ئەو لەنگەرە گەورانە کە ئاسنە و زۆر ئەستوورن لەنێو دەریاوە ئەستەم دەبێت، چوونکە کەشتییەکان نەدەتوانرا بە هۆی

چارۆگەوە ڕابگیرێن، بۆیە بە هۆی سەوڵەوە جووڵەکانیان هێوور دەکرایەوە تاکو جووڵەی نەرمی ئاو کەشتیی هاوپەیواتان لە ئێسپارتەکان نێزیك یاخۆ دوور نەخاتەوە. سەوڵلێدەرە بەدبەختەکان کە ئەو ڕۆژە لە بەرە بەیان تا شەو نەخەوتبوون، دەیانزانی ئەو شەوەش نابێت بخەون، ماوە ماوە سەوڵ لێ بدەن تا کەشتییەکان، لەیەك دوور بن،یاخۆ زۆر نێزیك نەبنەوە.

لەکاتی نیوەشەودا پاسەوانە ئێرانییەکانی سەر چەند کەشتییەك، بینیان کە کەشتییەکی دیکە بە تەنیا لە ئاودا سەرگردان بووە و ناتوانێت ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە، بەردەوام لەمسەر بۆ ئەوسەر دەڕوات، پێ دەچێت فەرماندەکەی توانای نەبێت شوێنێك بۆ لەنگەرگرتن و وێستانی هەڵبژێرێت، لەو بابەتە دەرگیری سەرسووڕمان بوون. کەشتییەکە لەبەر چاوی ئەوانەی سەرەتا بینیبوویان ون بوو، بەرەو باشوور ڕۆیشت، لە نێوەڕاستی کەشتییە جەنگییە ئێرانییەکان ون بوو، ڕووناکییەکەشی کوژایەوە.

هۆم تان فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشی، کە لە نێوەڕاستی گۆڕەپانی کەشتییە هەخامەنشییەکان بوو، لەسەر ڕووکاری کەشتییەکە لە دەوروبەری دەڕوانی، بینی کەشتییەك بەبێ بوونی ڕووناکی لە نێوەڕاستی مەیدانی جەنگی ئەوان بەرەو باشوور دەڕوات. هۆم تان وایزانی یەکێکە لە کەشتییەکانی خۆیان، هۆڕنی دەنگی بەکار هێنا، دواتر هاواری کرد تۆ کێی و بۆ کوێ دەڕۆی؟، بەڵام کەشتییە بێ ڕووناکیەکە وەڵامی نەدایەوە، هۆم تان بانگی کردەوە، وتی بۆچی وەڵام نادەیەوە، تۆ کێی و بۆ سەرگەردان بووی؟، چوونکە وەڵامی نەدایەوە، فەرمانی بە دوو کەشتیی جەنگی نێزیك لەو کەشتییە کرد، تا لێی نێزیك ببنەوە و ڕێگەی بگرن و بیناسن، بەڵام کەشتییەکە بە پەلە گەڕایەوە و بە خێرایی بەرەو باکور ڕۆیشت، دوو کەشتییە ئێرانییەکە بە فەرمانی هۆم تاون بە دووی کەوتن، بەڵام چوونکە زۆر خێرا بوو نەیانتوانی بیگەنێ. ئەو کەشتییەی لەو درەنگە شەوەدا هاتبۆوە نێو کەشتیگەلی ئێران، کەشتییەکی جەنگی ئێسپارت بوو، بە فەرماندەیی یەکێك لە فەرماندە لێهاتووەکانیان بە ناوی (هێلکۆس).

هێلکۆس بەڵێنی بە تراکاس دابوو لە نیوە شەودا بڕواتە نێو کەشتیگەلی هاوپەیواتان، کەشتییە هەخامەنشیی و ئەسینایی و تسالیەکان بژمێرێت، ئەو کەشتییانەی بە شەو بۆ وەرگرتنی زانیاریی دەهاتن، ژمارەی سەوڵلێدەرەکانیان دوو بەرانبەر زیاد دەکرد، هێلکۆسیش هەروای کردبوو، هاتبۆوە نێو شەڕگەی ئێرانییەکان، بە هۆی چرای سەر کەشتییەکان، دەیژماردن. کاتێك زانی بۆتە جێی گومانی ئێرانییەکان، چرای کەشتییەکەی کوژاندەوە.

ئەگەر هۆم تان ئەو کەشتییەی نەبینی بووایە، لەوانەبوو تەواوی مەیدانی جەنگی بەسەر کردبایەوە و چووبایە نێو کەشتییەکانی ئەسینا و تسالیش، چوونکە فەرماندە ئێرانییەکانی دیکە کە ئەویان دیبوو، گومانیان لیێ نەکرد، بەڵام هۆم تان گومانی کرد و هەوڵی گرتنی ئەو کەشتییەیدا، بەڵام چوونکە هێلکۆس دوو بەرانبەری رێژەی ئاسایی خۆی سەوڵلێدەری هەبوو، بە خێرایی دوورکەوتەوە و کەشتییە جەنگییەکان نەیانتوانی بیگرن، ئەویش نەیتوانی کەشتییەکانی هاوپەیواتان بژمێرێت.

ئەو شەوە لە دەریادا بۆ هەمووان سەخت بوو، سەوڵلێدەرەکان تاکو بەیانی نەیانتوانی بخەون، دەیانزانی رۆژێکی سەختتریان لە پێشە، رۆژی دواتر رۆژی جەنگ بوو. ئەفسەرەکانیش ئەو شەوە نەخەوتن، چوونکە دەبووایە وریا بن بۆ ئەوەی کەشتییەکان بەریەك نەکەون، ئەو شەوە تەنیا سەربازەکان خەوتن.

بەیانی لەگەڵ رۆژهەڵاتندا، هەندێ هەور لە ئاسمان دەرکەوت، بەڵام بە تەواوەتی دایان نەپۆشی هەندێ جار بەری خۆریان دەگرت، دواتر لادەچوون.

هەر کە دنیا هێندە ڕووناك بوو، کە بتوانن جیاوازیی لە نێوان دوو کەشتیی خۆیی و دوژمن بکرێت، هۆم تان فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشیی ئاگەداری کۆنونی فەرماندەی هێزی دەریایی هاوپەیواتانی کرد، کە هێرش دەکات و فەرمانی هۆم تان لە هەموو کەشتییەکان دووبارە کرایەوە، سەوڵەکان کەوتنەکار، کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیی بەرەو کەشتییەکانی ئێسپارت کەوتنە جووڵە.

لە هەر دوو جەنگی دەریایی سالامیس شێوەی جەنگە دەرياييەکانمان خستەڕوو و بۆ خۆپارێزی لە دووبارە کردنەوە، باسیان ناکەینەوە.

لە شەڕی کۆنیدۆس چەکێکی نوێ لە جەنگدا هاتەکایەوە، کە مارە ژەهراوییەکان بوون، ئێسپارتەکان لە وڵاتی خۆیان و وڵاتەکانی دیکەی یۆنان و ئاسیای بچووك تەنیا یەك جۆر لە ماریان بە ناوی (ئەژدیها) دەست دەکەوت، جۆرەکانی دیکە لەو شوێنانە نەبوو. بە وتەی چەند مێژوونووسێکی یۆنانی تا ئەوکات ماری ژەهراوی لە جەنگدا بەکار نەهاتبوو، ئەوە یەکەمجار بوو.

هەخامەنشییەکان لە جەنگی کۆنیدۆس مەنجەنیقیان بەکارهێنا. هەڵگرتنی مەنجەنیق لە جەنگەکانی رابردوو ئاسایی بوو، بەڵام کەشتییەکان نەیاندەتوانی بەردی پێویست بۆ مەنجەنیقەکان هەڵبگرن، بەڵام ئەمجارە بەشێك لە کەشتییە هەخامەنشییەکان لە جۆری تازە

بوون و قەبارەیان گەورەتر بوو، دەیانتوانی بەردی مەنجەنیق بگوازنەوە، بە تایبەتی بۆ هێزی دەریایی هەخامەنشیی چێ کرا بوون.

کاتێك کەشتییە هەخامەنشییەکان لە ئێسپارتەکان نێزیك بوونەوە، بەردباران بۆ سەر ئێسپارتەکان دەستی پێکرد، ئەوەش بۆ ئێسپارتەکان چاوەڕوان نەکراو بوو، هیچ ئامرازی بەرگریان لانەبوو، بەردباران ئازاری زۆری پێیان گەیاند، دواجار کاتی بەیەك گەیشتنی کەشتییەکان بەردباران وێستا تاکو سەربازانی هەخامەنشیی بەر بەرد نەکەون.

هەخامەنشییەکان چەندە پەلەیان بوو، کە بگەنە ئێسپارتەکان، ئێسپارتەکانیش دوو هێندە پەلەتریان بوو لە گەیشتن بەیەکدیی، لەسەر لەتی پێشەوەی تەواوی کەشتییەکان، شێوە قۆچەکێکی تیژی چێ کراو لە قەڵایی هەبوو، هەر یەکە لە کەشتییەکان کاتی نێزیك بوونەوە لە کەشتیی دوژمن هەوڵی دەدا قۆچەکە لە پەیکەرەی کەشتییەکەی ئەویدیی بدات.

دوو کەشتیی بێننە بەرچاوتان کە لەیەك نێزیك دەبنەوە، یەکێك لەوان ئێرانییە و بەسەر ئەوی دیکەیاندا بەرد دەبارێنێت، ئەوی دیکەیش بەدەم مانۆڕکردنەوە، خۆی بەلای ڕاست و چەپدا دەبات، بۆ ئەوەی خۆی لە بەردهاوێژەکان بپارێزێت، هاوکات بەرەو کەشتییەکەی دیکە دەڕوات. بەلاڕێدا بردنی کەشتیی لە پانتایی تیرهاوێژەکان کارێکی ئاسان نەبوو، چوونکە ئەوکات سووکان نەهاتبۆوە کایەوە، دوو سەوڵلێدەر لە بەشی پشتەوەی کەشتییەکە و هەریەکەیان لە لایەك دەبوون، ئەوان ئەرکی سووکانیان لە ئەستۆ بوو، بە فەرمانی فەرماندەی کەشتیی بۆ لای راست یاخۆ چەپ دەڕۆیشتن.

هاوکات لەگەڵ هەوڵی کەشتییە ئێسپارتەکان بۆ کوتانی قۆچەکەکەیان لە کەشتییەکانی دوژمن، کەشتییە هەخامەنشییەکانیش هەمان ئامانجیان هەبوو، بۆیە هەردوو کەشتیی بە تەواوی توانا هەوڵیان دەدا پەیکەرەی کەشتییەکانیان نەکەوێتە بەر قۆچەکی کەشتیی بەرانبەر، یاخۆ قۆچەکی خۆیان لە کەشتیی بەرانبەر بچەقێنن، هەندێکات هەردوو قۆچەك بەریەك دەکەوتن، بەشی پێشەوەی هەردوو کەشتیی تێك دەشکا، لەگەڵ بەرکەوتنی قۆچەکی کەشتییەك بە کەشتیی بەرانبەر، کەشتییەکە بێ جووڵە دەبوو، جەنگاوەران لە کەشتیی یەکەم بە خۆهەڵدان و بلەز دەچوونە سەر کەشتیی بەرانبەر، لەگەڵ بەرگریکاراندا جەنگ دەستی پێدەکرد، لەگەڵ رۆیشتنی جەنگاوەران بۆ کەشتیی بەرانبەر، هەندێکی دیکە لە سەربازانی نێو کەشتیی یەکەم هەوڵیان دەدا بە چەنگ و قووڵب دوو کەشتییەکە پێك ببستنەوەن بۆ ئەوەی

سەربازانی کەشتیی بەرانبەر نەتوانن بە تەور و شمشێر قوولّبەکان لیٚ بکەنەوە، قوولّبەکان لەباتی پەتك بە زنجیر دەبەسترانەوە، دواتر گووشاریان دەخستەسەر زنجیرەکان بۆ ئەوەی پەیکەری هەردوو کەشتیی پێکەوە بنووسێت، ئەگەر هێزی بازووی پیاوان بۆ راکێشانی کەشتییەکان کەم بووایە، ئەوا کۆتایی زنجیرەکانیان بە ئامێری تایبەت بە ڕاکێشانەوەی لەنگەر ڕادەکێشا، هێزی ئەو ئامێرانە هێندە زۆر بوون، ئەو شوێنەی پەیکەری کەشتیی دوژمنی تێك دەشکاند، قۆچەکەکەی تیٚ چەقیبوو، دوای ئەوە جەنگاوەران زۆر بە سانایی و بیٚ ئەوەی ترسیان هەبێت لەبەر بوونەوە بۆ نێو ئاو، دەچوونە سەر کەشتییەکەی دوژمن.

وێڕای ئەوەی کەشتییە جەنگییەکانی ئێران گەورەتر کرابوون، بەلاّم هێشتا گۆڕەپانی سەر کەشتییەکان سنووردراربوو، هاوکات کەشتیی ئێسپارتەکان بچووکتر بوون یاخۆ هەروەك جاران بوون، جەنگاوەر دەبووایە لەو گۆڕەپانە بچووکەدا سەربازی دوژمن بکوژێت، ئەگەر نا دەکوژرا!، هێشتا خولەکێك لە جەنگ تێپەڕ نەببوو، سەر کەشتی بە خوێن دادەپۆشرا، دوای دە خولەك هێندە لاشەی کوژراو و بریندار دەکەوت، ڕێگە بۆ ئەوانی دیکە تەنگ دەبۆوە، لەگەلّ بەردەوامبوونی جەنگ کار دەگەیشتە ئەوەی لە هەندیٚ شوێنی کەشتیی خوێن لە بەشی سەرەوە دەڕژایە سەر سەولّلێدەرەکان کە لە بەشی خوارەوە بوون، لە کاتی سەختدا فەرماندەی کەشتیی فەرمانی دەکرد، تا سەولّلێدەرەکان بێننە سەر کەشتیی بۆ ئەوەی بجەنگن، ئەوکات زنجیریان لە قاچیان دەکردەوە و چەکیان پێدەدان، دەیانبردنە گۆڕەپانی کەشتیی، ئەوانیش دەیانکوشت یاخۆ دەکوژران.

لە جەنگە دەریاییەکانی ئەودەمە نەبەزەیی و نە پارێزگاریکردن نەبوو، ئەگەر سەربازێك چەکی دانابایە تا خۆی ڕادەست بکات، دەکوژرا، تەنیا ئەگەر فەرماندەی کەشتیی داوای پارێزگاری کردبایە، کەشتییەکەی ڕادەست کردبایە، ئەوکات هێرشبەران دەستیان لە جەنگ و کوشتن هەلّدەگرت.

لەگەلّ بەیەك گەیشتنی کەشتیگەلی ئێسپارت و هەخامەنشیی، لە هەندیٚ شوێن ئێسپارتەکان چوونە نێو کەشتیی هەخامەنشییەکان، لە هەندیٚ شوێنی دیکەش کەشتیی ئێسپارتەکان کەوتەبەر هێرشی هەخامەنشییەکان، جەنگی دەریایی بە مەترسییە هەردەمییەکانی دەستی پێکرد. سەربازە ئێسپارتەکان چ لە کەشتییەکانی خۆیان و چ لەو کەشتییە هەخامەنشییانەی هێرشیان بۆ کردن، زۆر ئازایانە دەجەنگان، هێندە لەسەرخۆبوون،

کە لەوە دەچوو لە ڕاهێنانەکانی جەنگیدان، نەك لە جەنگی ڕاستیدا. پاڵپشتی لەسەرخۆییان ئەوەبوو، ئەوان لەکاتی جەنگدا دەنگیان نەدەهات، کاتێك لێدانیان بەردەکەت هاواریان نەدەکرد، لە کاتێکدا سەربازەکانی نەتەوەکانی دیکە هەندێ کات لە خۆشیان هاواریان دەکرد، دوای ئەوەی گورزیان بەردەکەوت دەنگی ناڵە و هاواریان دەهات.

لە کەشتییە هەخامەنشیی و ئێسپارتەکاندا، تەماشای هەر لایەکت بکردایە، تەنیا بریسکانەوەی شمشێر و تیر و رەنگە ئەرخەوانییەکەی خوێن دیاربوو، لە کەشتییەکاندا بە گشتیی مەرگ چاوەڕوانی بەرگریکار و هێرشبەران بوو. لەو کوشتارگە ترسناکانەدا، تەنیا یەك دەستە پارێزراو بوون، ئەوانیش سەوڵلێدەرەکان بوون، چوونکە لەوکاتەدا نەتەنیا سەوڵیان لێ نەدەدا، بگرە کەس هیچی بەسەریانەوە نەبوو یاخۆ هێرشی بۆ نەدەکردن، تەنانەت لەوکاتەدا دوای ماوەیەك لە بێبەشی دەیانتوانی خواردنێکی زۆر و باش بخۆن، چوونکە لە بەرە بەیانی ڕۆژی جەنگ دەبووایە بکەونەڕێ، دەرفەت بۆ خواردنی سەوڵلێدەرەکان نەدەبوو، دواتر کە جەنگ دەستی پێدەکرد، بە هۆی جەنگ کەشتییەکان دەوێستان، دەرفەت دەست دەکەوت تاکو خواردن بدەنە سەوڵلێدەرەکان، تاکە ڕۆژێك کە سەوڵلێدەرەکان خواردنی زۆر و باشیان پێ دەدرا، هەر ئەو ڕۆژە بوو.

لەو سەردەمەدا کەشتییەکان کەمتر نقووم دەبوون، زۆرتر دەکەوتنە بەردەستی هێزی سەرکەوتوو، نقوومبوونی کەشتییەکان ئەو کاتانە هاتەکایەوە، کە ئاگرهاوێژەکان لە کەشتییەکان دامەزراند، جەنگاوەران فێربوون بە هۆی مەنجەنیق، پەڕۆ کۆنە چەورکراوەکان بە ڕۆنی ڕەش، کە ئاگردەدرن بۆ کەشتییەکانی دوژمن هەڵدەن و ئاگر بخەنەوە، چوونکە پەمپی ئاویش نەهاتبووە کایەوە، ئامرازی بەگژداچوونەوەی ئاگریش نەبوو، ئاگرەکە پەرەی دەسەند و کەشتییەکە دەسووتا و لەنێو دەچوو، سەوڵلێدەرە بەدبەختەکانیش وێڕای هاوارە جەرگبڕەکانیان، دەسووتان و دەمردن.

بە سەرەنجدان لە جۆری ئەو جەنگە دەریاییانەی ئەوکات، دەبینین شانسی سەرکەوتن لەگەڵ ئەو لایەنە بوو، کە بتوانێت زۆرترین ڕێژەی کەشتیی بێنێتە نێو جەنگ، تاکو هەر کەشتییەك لەلایەن پتر لە کەشتییەکەوە هێرشی بکرێتەسەر، بەو شێوەیە لە چەند لایەکەوە هێرشی بۆ بکرێت تا لەنێو دەچێت، ئەو ڕۆژە لەشکرە دەریاییەکانی هەخامەنشیی و تسالی و ئەسینا ئەو کارەیان بەرانبەر ئێسپارت کرد.

هێزی دەریایی هاوپەیواتان بە دڵنیاییەوە بەهێزتر بوو، لە هێزی دەریایی ئێسپارت، بێ لەبەرچاوگرتنی ڕای مێژوونووسە یۆنانییەکان، کە ژمارەی کەشتییەکانیان بە پێنج سەد دیاری کردووە، دەڵێن ژمارەی کەشتییەکانی هاوپەیواتان زۆرتر بووە لە هی ئێسپارتەکان، بۆیە کەشتیی ئێسپارتەکان زۆرینەیان لە دوولاوە هێرشیان کراوەتەسەر، هاوپەیواتان دوای کوشتنی سەربازە ئێسپارتەکانی نێو کەشتییەك، دەچوون بۆ یارمەتیدانی دۆستەکانیان لە کەشتییەکی دیکەی ئێسپارتی، هێرشیان دەکرد، زووتر لەنێویان دەبردن، ئەگەر کەلێن نەکەوتبایە نێوان کەشتییەکان خێراتر دەبوون لەو کارەیان، بوونی کەلێنەکان بۆوە هۆی درێژەکێشانی جەنگ تاکو ئێوارە، ئەوکات سەرکەوتنی هەخامەنشیی و هاوپەیمانەکانی یەکلابۆوە، چوونکە تەواوی کەشتییە جەنگییەکانی ئێسپارت لەنێو چووبوون و کەوتبوونە بەردەستی هاوپەیمانەکان.

وێڕای ئەوەی ئێسپارتەکان لە بەرانبەر هێزی دەریایی هەخامەنشیی و هاوپەیمانەکانیان شکستیان خوارد، بەڵام لە جەنگ بەردەوامبوون، تا حەوت ساڵ جەنگی ئێسپارت و هەخامەنشییەکان درێژەی هەبوو، سەرەنجام لە شاری سارد پایتەختی لیدی لە ساڵی (٣٨٧ پ. ز) پەیماننامەی ئاشتی نێوان هەخامەنشیی و ئێسپارتەکان مۆر کرا، بەپێی ڕێککەوتننامەکە ئێسپارتەکان دەبووایە شارەکانی یۆنانی ئاسیای بچووك چۆڵ بکەن و هەموو دەوڵەتە شارەکانی یۆنان سەربەخۆ بن، ئێسپارت هیچی بەسەریانەوە نەبێت و دەستدرێژی نەکاتە سەریان.

چۆڵکردنی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك لەلایەن ئێسپارتەکان، بۆوە مایەی ئەوەی هەخامەنشییەکان جارێکی دیکە بکارن ئەو شارانەی لە دەستیان دابوو، بە دەستی بێننەوە و لە دەریاکانی ڕۆژهەڵاتی یۆنان و ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك هێزێکی دەریایی بەهێز دابمەزرێنن.

* * *

ئێستە باس لە بەشێك لە مێژووی سەردەمی دەسەڵاتداری ئەردەشێری دووەم دەکەین کە لەوانەیە بۆ خەڵکی ئەم سەردەمە جێی باوەڕ نەبێت، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو بابەتانەیان نووسیوە، کە دواتر ئاماژەیان بۆ دەکەین، کە جگە لە نووسینی مێژوونووسە دەرەکییەکان هیچ زانیاریی لە بەردەستدا نییە، لەبارەی مێژووی هەخامەنشییەکان.

جارێکی دیکە پێشهاتەکان ناوی پەریساتیس هاوسەری داریوشی دووەم، دایکی ئەردەشێری دووەم زەق دەکەنەوە، پەریساتیس دوای ئەوەی ئەردەشێری کوڕی بوو بە پاشا، دەسەڵات و کاریگەریی خۆی لە دەست نەدا، بە هەمان شێوەی سەردەمی هاوسەرەکەی مایەوە، ئەو کاریگەریی بەسەر ئەردەشێری کوڕیشیدا هەبوو، ئەو دووەمین جەنگی ئەسینا و هەخامەنشییەکانی هەڵگیرساند، هەر ئەویش وەك نێردراو رۆیشتە ئەسینا و دوو دەوڵەتە شاری بەهێزی یۆنان کە (تسالی و ئەسینا) بوون، کردە هاوپەیمانی خۆیان.

ئەردەشێری دووەم بووە خودان چەند کوڕێك، کوڕە گەورەکەی (داریوش)ی ناو لێنا، کوڕی سێیەمیشی (ئەخۆس)ی ناو لێنا. بە وتەی مێژوونووسەکان پەریساتیس دڵی بە داریوشی نەوەی خۆیدا چوو، داوای لێ کرد ببێتە هاوسەری.

داریوش وەك پیرێژنێك چاوی لە داپیرەی خۆی دەکرد، یاسا سرووشتییەکان رێگربوون لە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا، تا پەریساتیس پتر پێداگری بۆ ئەو بابەتە دەکرد، داریوش زۆرتر دژی دەوەستایەوە، ئەگەر خۆشەویستی یەك لایەنە بێت، چەندە لایەنی بەرانبەر ئازار دەدات، رۆژێك داریوش لە پێداگری دایەگەورەی خۆی بە تەنگ هات و لە سینگی کوتا و ئەوی بۆ لایەك هەڵدا، ئەوکات پەریساتیس ژنێکی بە ورە و خودان ئیرادە بوو، بڕیاریدا نەوەکەی خۆی لەنێو ببات.

دیسان ئەو بابەتە لەگەڵ ئەقڵدا کۆك نییە، کە دایەگەورە بیەوێت نەوەی خۆی لەنێو ببات، زانراوە کە نەوە لە لای باپیرە و داپیرە، زۆر لە کچ و کوڕەکانیان خۆشەویستترە، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییە کۆنەکان و لەنێویاندا دیۆدۆر بەو شێوەیە باسی دەکات، هەروەها ڕووداوەکانی دواتر نیشاندەری ئەوەن، کە داریوش کوڕە گەورەی ئەردەشێری دووەم دەکوژرێت.

بە وتەی مێژوونووسە کۆنەکانی یۆنان و رۆم، پەریساتیس ئەردەشێری کوڕی ناچار کرد، داریوش بکاتە فەرمانڕەوای وڵاتی (کاپادۆکی) لە ئاسیای بچووك، ئەردەشێری دووەم کە زۆر کاریگەریی دایکی لەسەر بوو، ئەو ئامۆژگاریەی پەسەند کرد و داریوشی کردە فەرمانڕەوای کاپادۆکی، کەسێك بە ناوی (تانزی) کە بە نهێنی ئامرازی دەستی پەریساتیس بوو، بۆوە بەردەست و بەڕێوەبەری کارەکانی داریوش، بە فەرمانی پەریساتیس ئەرکی تانزی ئەوە بوو، کە داریوش هان بدات بۆ یاخیبوون لە دژی دەسەڵاتیی باوکی و بەدەستهێنانی تەخت و تاجی

پاشایەتیی، ئەو کارەش تاوانێك بوو،لێخۆش بوونی نەبێت، زۆر جار لە رۆژهەلاَت ڕوویدا بوو، کوڕ لە پێناو بە دەستهێنانی تەخت و تاجدا بە دەستی باوکی دەکوژرا.

پەریساتیس گومانی نەبوو، ئەگەر داریوش لە دژی باوکی لە پێناو تەخت و تاجدا یاخی ببێت، بە فەرمانی ئەردەشێری دووەم دەکوژرێت. ئەرکی دیکەی تانزی ئەوە بوو، کە دەبووایە دوای ئەوەی داریوشی بۆ یاخیبوون ئامادە دەکرد، دەیزانی دەست بەکار دەبێت، ئاگەداری ئەردەشێری دووەم بکاتەوە کە کوڕەکەی دەیەوێت هێرشی بکاتەسەر و پاشایەتیی بە دەستەوە بگرێت، مەبەستی پەریساتیس ئەوە بوو ئەردەشێر بۆ رێگرتن لەو یاخیبوونە ئامادە بێت و نەشلەژێت. دوایین ئەرکی تانزی ئەوە بوو، کە دوای ئەوەی جەنگ لە نێوان داریوش و باوکی ڕوویدا، رێگەیەك بدۆزێتەوە کە داریوش خۆی رادەستی باوکی بکاتەوە.

لەگەلّ تێپەڕینی زستانی سالّی (٣٧٦ پ. ز) و هاتنی بەهاری سالّی (٣٧٥ پ. ز) داریوش بە لەشکرەکەیەوە وێڕای تانزی لە کاپادۆکی بەرەو ئێران بەڕێکەوت، لە ئێراندا تا گەیشتە شاری نەهاوەند ڕووبەڕووی هیچ بەرگرییەك نەبۆوە. تانزی وەك سەرکردەی لەشکرەکە بوو، دەبووایە فەرمانەکانی داریوش بە لەشکرەکەی ڕابگەیەنێت، لە نەهاوەند ئەو فەرمانەکانی بە شێوەیەك گەیاندە ئەفسەرەکانی لەشکر و داریوشیان دەستگیر کرد.

ئەردەشێر ئەوکات بە بۆنەی هاتنی بەهار و گەرمبوونی کەشوهەوا لە هەمەدان بوو، چوونکە ئەوێندەر بە کوێستان هەژمار دەکرا، کاتێك هەوالّی دەستگیرکردنی داریوشیان گەیاندە ئەردەشێر، فەرمانی کرد تا سەری ببڕن و بۆ هەمەدان رەوانەی بکەن، فەرمانی کوشتنی داریوش لەلایەن ئەردەشێری دووەم بە ئاگەداری پەریساتیس دەرکرا، ئەو دەیتوانی پێش بە کوشتنی ئەو گەنجە بگرێت و نەیکرد، سەری داریوشیان لە لەشی جیا کردەوە و بۆ باوکی ناردیانە هەمەدان، بەو شێوەیە داریوش بە هاندانی داپیرەکەی کوژرا.

بەپێی نووسینەکانی مێژوونووسە یۆنانییەکان، دوای ئەوە کوڕەکەی دیکەی ئەردەشێر، واتە کوڕی سێیەمی کە ناوی ئەخۆس بوو کەوتە بەردلّی پەریساتیس، ئەوجارەش داپیرە دلّی بە نەوەیەکی دیکەی خۆیدا چوو.

دوور نییە مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو خۆشەویستیەیان دروست کردبێت، هەرچەندە مێژوو دەڵێت ئەوکات هاوسەرگیری برا و خوشك، کوڕ و دایك، باوك و کچ ڕێگە پێدراو[٤] بووە، ئەو خاڵەمان بیر نەچێت، کە هاونیشتمانییە زەردەشتییەکان بە توندی دژی ئەو گێڕانەوە مێژووییانەن و دەڵێن مێژوونووسان بە ئەنقەست ئەو کارانەیان کردووە تا ئێرانییەکان لە بەرانبەر نەتەوەکانی دیکە بە سووك و پەست بناسێنن.

مێژوونووسە کۆنەکان دەڵێن ئەخۆس لە داریوشی برای ئاقڵتر بوو، دوای ئەوەی پەریساتیس خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕی، پەسەندی کرد، ئەوەش بووە مایەی ئەوەی دوای مردنی ئەردەشێر ببێتە پاشا و یارمەتی پەریساتیس ئەوی کردە پاشا، ئەگەرنا دەبووایە براگەورەکەی واتە داریوشی کوڕە گەورەی ئەردەشێر ببێتە پاشا.

* * *

دوای پەیمانی ئاشتی ساڵی (٣٨٧ پ. ز) لە نێوان هەخامەنشییەکان و یۆنانییەکان، پێوەندیی دۆستانە کەوتە نێوانیان و بازرگانی دەستی پێکرد، دوای ئەوە یۆنانییەکان پتر لە جاران هاتنەنێو لەشکری هەخامەنشیی. یۆنانییەکان دەچوونە نێو لەشکری وڵاتانی دیکەیش، بەڵام هاتن بۆ لەشکری هەخامەنشییان لا باشتر بوو، چوونکە مووچەی باشتریان دەست دەکەوت.

بۆچی لە سەردەمی ئەردەشێردا ژمارەی سەربازە یۆنانییەکان لە لەشکری هەخامەنشییدا زیادی کرد؟ پێویستە بزانین لە (٣٨٠ پ. ز) ئەردەشێری دووەم ئەرکی سەربازی لە ئێران نەهێشت. پێش ئەوەی یۆنانییەکان بە هۆی ئازایەتیان لە لەشکری ئێران بکرێنە سەرباز و دوای ئەویش، هەست بە پێویستبوونی ئەوان دەکرا لەو لەشکرە، دۆخی سەربازە بەکرێگیراوە

(٤) لە ئاینی زەردەشتدا کوڕ، کچ، خوشك، برا، دایك، باوك و هاوڕەگەزەکانیان لە یەك حەرام بوونە و بۆ یەك نەشیاون، بەڵام ئەوەندەی زانیاریمان هەبێت لەنێو هەخامەنشییەکان هەروەك فیرعەونەکانی میسر، گوێ بەو بابەتانە نەدراوە، زەبیحوڵڵا لەوەدا پاساوی نابەجێ بۆ پاشاکانی هەخامەنشیی دەهێنێتەوە و دەیەوێت ئەوە بکاتە نەریتی ئێرانییەکان. "وەرگێری کوردی"

یۆنانییەکانی ئەوکات بەرانبەر بە وڵاتانی دیکەی وەك ئێران، لە دۆخی سەربازە بەکرێگیراوەکانی سویسرا لە سەدەکانی (١٤، ١٥، ١٦ و ١٧) دەچوو بەرانبەر وڵاتانی دیکەی ئەورووپایی وەك فەرنسا. وڵاتی سویسرا وەك یۆنانی کۆن لە ڕووی پێداویستییەکانی ژیان سنووردار بوو، هێشتا ئەو پیشەسازییەی ئێستە لە سویسرا هەیە، نەهاتبووە کایەوە تاکو خەڵك تیایاندا کاربکەن و ژیانیان دابین بکەن، بۆیە پیاوانی سویسرا وەك پیاوانی یۆنانی کۆن دەچوونە سەربازی بۆ وڵاتانی دیکە، چوونکە لە فەرنسا پارەی پتریان پێ دەدرا، خزمەت لەو وڵاتەدا لایان باشتر بوو.

یۆنانییە کۆنەکانیش هەمان هۆکاریان بۆ بوون بە سەرباز لە وڵاتانی دیکەدا هەبوو، بە تایبەتی لە سەردەمی ئەردەشێری دووەمدا، هەڵوەشاندنەوەی ئەرکی سەربازی لەلایەن ئەردەشێری دووەم لە ڕووی رامیارییەوە هەڵەیەکی گەورە بوو، چوونکە ئەگەر ئەرکی سەربازی لە ئێران لە ساڵی (٣٨٠ پ. ز) هەڵنەوەشابایەوە، ئەسکەندەری مەکدۆنی پەنجا ساڵ، دواتر بە بیست و نۆ هەزار سەربازەوە نەیدەتوانی ئەو وڵاتە داگیر بکات.

داریوشی سێیەم دوایین پاشای هەخامەنشیی لە جەنگ لەگەڵ ئەسکەندەری مەکدۆنیدا نەیتوانی سوود لە سەربازە یەدەگەکانی وەربگرێت، بە لەشکرێك لە سەربازە بەکرێگیراوە یۆنانییەکان چۆوە جەنگی ئەسکەندەر، ئەوانیش نەیاندەویست جەنگی یۆنان بکەن، لە جەنگی ئیسۆس شوێنی خۆیان جێهێشت و داریوشی سێیەم شکستی خوارد.

دوای پەیماننامەی (٣٨٧ پ. ز) لە نێوان ئێران و یۆنان، ئاشتی درێژخایەن هاتەکایەوە، دەسەڵاتدارێکی پاوانخواز ئەو ئاشتییەی تێکدا، کە ئەویش (ئەواگۆراس)ی پاشای دەوڵەتشاری بچووکی (سالامیس) بوو لە یۆنان، سالامیس زۆرتر بە دوورگەیەك ناسرابوو، دوو جەنگی مەزنی دەریایی ئێران و یۆنان لە ئاوەکانی نێزیك ئەودا ڕوویاندا، بەڵام بەشێك لە کەنارەکانی یۆنانیش بە سالامیس ناسرابوو، ئەواگۆراس پاشای ئەو کەنارانە بوو.

ئەواگۆراس باڵای بەرز، سینگ و شانی پان، دەنگێکی گڕ و گەورە و نێرانەی هەبوو، ئەو تایبەتمەندییە جەستەییانە لەوکاتدا دەبوونە هۆکار بۆ باڵادەستی، تەنانەت ئێستە کە سەردەمی زانست و پسپۆرییە، هێشتا ئەو بەهایانە بایەخیان پێ دەدرێت، بە تایبەت پیاوی باڵابەرز، شان و سینگ پان لە هەموو شوێنێك ڕێزیان لێ دەگیرێت، چجای لەوی گاڤاندا کە ئەو خەسڵەتانەگرینگییەکی زۆریان هەبووە بۆ باڵادەستی.

ئەواگۆراس بە سوودوەرگرتن لە جەستەی توانی بووی چەند دەوڵەتە شارێکی یۆنانی لە کاتی بوونی پەیمانی ئاشتی یۆنان و ئێراندا داگیر بکات، یەکێك لە بەندەکانی ئەو رێککەوتننامەیە ئەوەبوو کە تەواوی دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان دەبێت سەربەخۆ بن. دانانی ئەو برگەیە لەو پەیمانەدا لەلایەن ئەردەشێری دووەم بۆ ئەوەبوو، کە ئەگەر هەموو ئەو وڵاتانە سەربەخۆ بن و نەبنە بەرفەرمانی پاشایەکی دیکە، ئەوا توانای جەنگیان لەگەڵ هەخامەنشییەکانیان نابێت، چوونکە هیچ یەکێك لەو دەوڵەتە شارانە، بە تەنیا توانای جەنگی هەخامەنشییەکانیان نییە.

پێش پەیماننامەی ئاشتیی ئێسپارتەکانیش بە هۆی داگیرکردنی چەند وڵاتێکی دیکەی یۆنانی و شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك، توانیان جەنگی هەخامەنشییەکان بکەن، ئەواگۆراس دوای داگیرکردنی چەند وڵاتێکی یۆنانی، بەهێزبوو، دوورگەی قوبرسی داگیرکرد، کە بەپێی پەیماننامەی ئاشتی دەبووایە بە سەربەخۆیی بمێنێتەوە. دوای داگیرکردنی قوبرس، هێرشی کردەسەر لازقییە لە کەنارەکانی سوریا، دواتر بووە هەرەشە لەسەر هەخامەنشییەکان، چوونکە لازقییە بەشێك بوو لە سنووری هەخامەنشیی.

ئەردەشێری دووەم ئاگەداری دەسەڵاتدارانی تسالی، ئێسپارت و ئەسینای کردەوە کە ئەواگۆراس پێشێلی رێکەوتننامەی ئاشتی دەکات، پێویستە دەسەڵاتدارانی یۆنان ئەو رێککەوتننامەیە جێبەجێ بکەن. لەو رێکەوتننامەیەدا هاتبوو، ئەگەر دەوڵەتەشارێك بەبێ هۆ جەنگی هەخامەنشییەکان بکات، لەسەر دەوڵەتەشارەکانی دیکەی یۆنانە، کە جەنگ لە دژی ئەو دەوڵەتەشارە رابگەیەنن و یارمەتی لە ئێران وەربگرن، بۆیە ئەرکی حکوومەتەکانی یۆنان بوو، لە دژی ئەواگۆراس بجەنگن، بەڵام ئەوان لە ئەواگۆراس دەترسان، بۆیە روونکردنەوەی ئەو پیاوەیان بۆ هێرشکردنە سەر لازقییە پەسەند کرد.

روونکردنەوەی ئەواگۆراس ئەوەبوو، کە ئەو بۆیە قوبرس و دواتریش لازقییە داگیرکردوو، چوونکە هەخامەنشییەکان هێزێکی گەورەیان لەوێندەر دامەزراندووە و ویستی داگیرکردنیان هەبووە.

ئەگەر ئەوکات پاشایەکی وەك (کوروش، داریوش یاخۆ خەشایار) پاشای هەخامەنشیی دەبوو، فەرمانی لەشکرکێشی دەردەکرد و لەشکری دەنارد بۆ لازقییە و ئەوێی لە ئەواگۆراس وەردەگرتەوە، ئەوکات قوبرسیشی داگیر دەکرد، بەڵام چوونکە ئەو پاشایانە نەبوون، ساڵانی

دوایی تەمەنی ئەردەشێر ساڵانی لاوازی هەخامەنشییەکان بوو، ئەردەشێری دووەم پێشنیازی کرد تا لێژنەیەك بۆ لێکۆڵینەوە بڕۆنە لازقییە و لێکۆڵینەوە لەبارەی بوونی لەشکری ئێران لەوێندەر بۆ هێرشکردنە سەر قوبرس بکەن.

لێژنەیەك لە هەخامەنشیی و یۆنانییەکان دیارکرا و بەرەو لازقییە رۆیشتن تا لێکۆڵینەوە بکەن، بەڵام ئەواگۆراس رێگەی پێنەدان بچنە نێو لازقییە. پێنج رۆژان ئەندامانی ئەو لێژنەیە لە گوندێك لە نێزیك لازقییە بە هیوای رێگەپێدانیان بۆ چوون بۆ نێو لازقییە لەلایەن ئەواگۆراس مانەوە، رۆژی پێنجەم ئەندامانی لێژنەکەیان گرت و دووریان خستنەوە، وتیان ئەگەر لە لازقییە نێزیك ببنەوە، دەکوژرێن.

ئەواگۆراس دوای لازقییە، شارەکانی دیکەی کەنارەکانی سوریای داگیرکرد، دواتر بەرەو شارەکانی نێو قووڵایی سوریا کەوتەڕێ و شارەکانی (حومس و حەلەبی) داگیرکرد. دیسان ئەردەشێر حکوومەتەکانی یۆنانی ئاگەدارکردەوە، کە پێویستە لەگەڵ ئەواگۆراس بجەنگن، ئەوان دیسان دەستیان بە کوشتنی کات و بیانوو هێنانەوە کرد، کە هەخامەنشییەکان پاڵنەری ئەو کارەی ئەواگۆراس بوونە.

پەریساتیسی دایکی ئەردەشێر، کە پێشتر فەرماندەیی جەنگەکانی لە ئەستۆ دەگرت، چیدی ئازایەتی و توانای جارانی نەمابوو، پتر بەدووی هەوا و هەوەسەکانی خۆیەوە بوو، ئەردەشێری دووەمیش نەخۆش بوو، لەدوا ساڵەکانی تەمەنی دووچاری نەخۆشی فەرامۆش و خەڵەفان ببوو، بۆیە توانای بڕیار وەرگرتنی نەمابوو.

ئەواگۆراس بێ کێشە و گرفت لە سوریا بەردەوام بوو لە داگیرکاری، دوای داگیرکردنی هەموو شارەکانی باکوری سوریا، دەستی کرد بە داگیرکردنی باشوور و شاری دیمەشقیشی داگیرکرد، بەڵام فەرمانڕەوای دیمەشق لە باڵی بەرز و شانە پانەکانی ئەو نەترسا، بۆ جەنگی ئەو ڕۆیشت، ژمارەیەك لە سەربازەکانی کوشت، ئەواگۆراسی ناچار بە پاشەکشە کرد.

لە یۆنان ئەو وڵاتانەی کەوتبوونە ژێر دەستی ئەواگۆراس، بە بۆنەی دوورکەوتنەوەی ئەو توانیان سەربەخۆیی خۆیان بە دەست بێننەوە، حکوومەتەکانی یۆنانیش کاتێك زانیان ئەواگۆراس لە قوبرس و سوریا نیشتەجێ بووە، ئاسوودەبوون، بەڵام ئاسوودە بوونیان بۆ ئەوە نەدەگەڕایەوە، کە پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ هەخامەنشییەکانیان جێبەجێ نەکرد،

ئەوان پێشتریش نەیاندەویست لەگەڵ ئەواگۆراس بجەنگن، بگرە ئەوان خۆیان ترسیان هەبوو، کە ئەو هێرش بکاتە سەر تسالی و ئەسینا و ئێسپارت و ...هتد، بەڵام ئەو بەرەو سوریا و قوبرس رۆیشت.

# ڕووخان

له دوایین ڕۆژەکانی تەمەنی ئەردەشێری دووەم، دۆخی ئێرانییەکان شلەژا و تێکچوو، ئەویش بە هۆی خەڵەفانی پاشا و هەوا و هەوەسەکانی دایکی واتە پەریساتیس، چیتر ئێران دەسەڵاتیی ناوەندی نەبوو، هەر فەرمانڕەوایەك لە سنووری خۆیدا هەمەکارە بوو. ئەگەر ئەوکاتە ئەواگۆڕاسی یۆنانی لە قوبرس و سوریا بووایە بە بۆنەی هەبوونی ئەو کەشە دەیتوانی تەواوی سنووری هەخامەنشیی داگیر بکات، بەڵام ئەو بە پێچەوانەی ویستی یۆنانییەکان حەزی بە گەڕانەوە بۆ نیشتمان هەبوو، ئەوەبوو بۆ یۆنان گەڕایەوە.

ئەردەشێری دووەم دوای نەخۆشییەکی درێژخایەن و چل و شەشساڵ پاشایەتیی لە هاوینی ساڵی (٣٥٨ پ. ز) مرد، دوای ئەو کوڕەکەی ئەخۆس هاتە سەر تەخت، ناوی لە خۆی نا (ئەردەشێری سێیەم).

بە وتەی مێژوونووسان ئەردەشێری دووەم لە حەرەمخانەکانی خۆی پتر لە سێ سەد ژنی مارەبڕاو و مارە نەبڕاوی هەبوو، کۆمەڵێك منداڵی لە ئەوان هەبوو، کە زۆرینەیان لە سەردەمی ژیانی خۆیدا مردن، لە ئەوانەی زیندوو مانەوە تەنیا ناوی چوار کوڕی لە مێژوودا دەبینرێت کە بریتین لە: (داریوش کە بە تاوانی نافەرمانی و پیلانگێڕی کوژرا، ئاریاسێپ، ئەخۆس و ئەرسام). ئاریاسێپ لە ژنێکی مارەبڕاوی ئەردەشێر بوو، دەیتوانی لە دوای ئەو ببێتە جێنشینی.

ئەخۆس دوای کوژرانی براکەی چەند هەنگاوێك لە پاشایەتیی نێزیك کەوتبۆوە، بڕیاریدا ئاریاسێپ لەنێو ببات، بۆیە لە ڕێگەی چەند کەسێکی نێو کۆشك و هەندێ لە ژنەکانی حەرەمخانەکانی باوکی، پروپاگەندەی ئەوەی بڵاوکردەوە، کە گوایە ئاریاسێپیش وەك داریوشی برای دەیەوێت لە دژی باوکی یاخی ببێت و بیکوژێت و ببێتە پاشا. بەو کارەی ئاریاسێپی خستە دۆخێکەوە، کە لە ترسی ئەو مردنە ناخۆشەی چاوەڕوانی بوو، خۆی ژەهر خوارد کرد و مرد.

مێژوونووسەکان نووسیویانە کە ئەردەشێری دووەم نهێنی خۆکوشتنی ئاریاسێپی زانی و لە داخان گریا، بەڵام بە هۆی پیری و بێ توانایی هیچی بۆ نەوترا، بە هۆی نائومێدی لە ئەخۆس،

تەواوی خۆشەویستی خۆی دایە ئەرسامی کوڕی کە لە ژنێکی مارە نەبڕاو (حەرامزادە) بوو، زۆر هۆگری بوو، بەڵام ئەویش بە فەرمانی ئەخۆس کوژرا.

هەروەها دەبێژن ئەو بە یارمەتی پەریساتیس گەیشتە پاشایەتیی، هەرچەندە گێڕانەوەیەکی دیکەش هەیە، کە دەڵێت ئەوەی لە هەمووان پتر یارمەتیدا تا پیلانەکانی بەرێوەببات، ئاتووسای خوشکی بوو، کە هاوسەر و کچی ئەردەشێری دووەمی بوو، لەوانەشە هەردوو گێڕانەوەکە ڕاست بن، چوونکە گومان نییە ئەخۆس بۆ سەرخستنی ئەو پیلانە مەرگاوییانە دەبووایە کەڵك لە یارمەتی ژنانی بەهێزی کۆشك وەربگرێت.

مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە ئەردەشێر دوای ئەوەی بوو بە پاشا، هەموو شازادە هەخامەنشییەکان، جگە لە منداڵەکانی خۆی کوشت و دەڵێن لە هاوینی ساڵی (٣٥٨ پ. ز) لە کاتێکدا کە هێشتا تەرمی ئەردەشێری دووەم نەگواسترا بۆوە بۆ شوێنی گۆڕەکەی، ئەخۆس فەرمانی کوشتنی هەموو شازادە هەخامەنشییەکانی دەرکرد. دوای ئەو کوشتارگەیە، ئەردەشێر هەموو ئەو کەسانەشی کوشت کە گومانی دەکرد ئاریشەی بۆ بنێنەوە یاخۆ گومانی لێیان هەبوو، چوونکە بچووکترین بەڵگەی مێژوویی مێژوونووسێکی ئێرانیمان لەبارەی ئەو ڕووداوانە لە بەردەست نییە، ناچارین ئەو ڕووداوە مێژووییانە باس بکەین، بەڵام دەڵێین ئەوجۆرە تاوانانە ئەوکات لە یۆنان ڕووی دەدا، کاتێك ئەسکەندەری مەکدۆنی لە جیاتی باوکی (فیلیپ یاخۆ فیلفۆس) بوو بە پاشا، هەموو شازادە ڕەسەنە مەکدۆنییەکانی کوشت.

ئەسکەندەری مەکدۆنی گەنجێکی ئاسایی نەبوو، بە بەراورد لەگەڵ ئەوان بە زانا دەژمێردرا، مامۆستایەکی وەك ئەرستۆی هەبوو. ئەرستۆ هەرچی زانیبووی فێری ئەوی کردبوو، هەر بۆیە رۆژێك بە ئەسکەندەری وت: (من هیچ دیکەم نییە بە تۆی بڵێمەوە، هەرچی زانیومە فێرم کردووی، ئێستە پێویستە خۆت زانستی خۆت پتر بکەی).

گەنجێکی ئاوا زانا و بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان دیموکراتخواز، کە دەیەویست دیموکراسییەت لە جیهاندا برەو پێ بدات، دوای هاتنەسەر تەختی پاشایەتیی، هەموو شازادە مەکدۆنییەکان، لەوانەش دوو برای بچووکی خۆی کوشت، بۆیە کاتێك مرد، لە مەکدۆنیا هیچ شازادەیەك نەبوو، ببێتە جێنشینی، سەردارەکانی بوونە جێنشینی، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان کردەوەی ئەو بە بچووك و بێ بایەخ دەزانن، لە بەرانبەردا کردەوەی ئەردەشێر گەورە دەکەن.

مەبەستی ئێمە بێ تاوان نیشاندانی ئەردەشێری سێیەم نییە، بگرە مەبەستمان ئەوەیە، کە ئەوکات لە یۆنانیش کە بە رواڵەت بێشکەی دیموکراسییەت بوو، ئەو تاوانانە هەبوون.

بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان دوای ئەوەی ئەردەشێری سێیەم بوو بە پاشا، پەریساتیسی داپیرەی چاوەڕوان بوو وەك جاران لەگەڵیدا بجوولێتەوە، بەڵام ئەردەشێری سێیەم چیدی ئەخۆسی جاران نەبوو، پاشایەکی سەربەخۆ بوو، خۆی بە ناچار نەدەبینی، تا پیڕەوی ویستەکانی داپیرەی بکات، بەڵام پەریساتیس کۆڵی نەدەدا و دەیوت: من تۆم کردە پاشا، ئەگەر یارمەتییەکانی من نەبووایە نەدەبووی بە پاشا، ئەوەی من لە تۆم دەوێت بچووکترین پاداشتە کە تۆ دەتوانی بە منی بدەیتەوە.

بە وتەی مێژوونووسانی یۆنانی ئەردەشێری سێیەم کاتێك زانی ناتوانێت ئەو ژنە لە خۆی دوورخاتەوە، فەرمانی کوشتنی دەرکرد، ئەوی تاوانبار کرد بە هەوڵدان بۆ ژەهرخوارد کردنی. لەوانەیە ئەو تۆمەتە بێ بنەما نەبووبێت، چوونکە دەزانین پەریساتیس لە رابردوودا ژەهری بەکار هێنابوو، هەردەم ئەو تۆمەتە دەتوانرا ئاراستەی پەریساتیس بکرێت. زانراوە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان سزای ئەو کەسانەی ئەو جۆر تاوانەیان کردبایە برێتی بوو لە داماڵینی پێست لە جەستەی بە زیندوویی.

بە وتەی مێژوونووسانی یۆنانی کاتێك پەریساتیس سزای مردنی بە سەردا سەپێنرا تەمەنی نەوەد ساڵ بوو، ئەو وتەیە بیرکردنەوەی پێویستە، چوونکە پیرێژنەکی نەوەد ساڵان هێندە تێك دەشکێت، کە ناتوانێت خۆشەویستی بۆ گەنجێك دەربڕێت، بەڵام بە گریمانێکی نێزیك بە دڵنیایی، ئەو پیرێژنە لە کاتی کوشتنیدا نێزیك هەشتا ساڵ بووە و داماڵینی پێست لە پیرێژنیك بەو تەمەنە تاوانێکی زۆر گەورەیە، بەڵام هەڵبەت ئەو کارە بۆ ئەردەشێری سێیەم کە لە سەردەمی دەسەڵاتداری خۆیدا زۆر تاوانی کوشتنی بە جێ گەیاندووە، جێگەی سەرسووڕمان نییە.

گێڕانەوەیەکی دیکە هەیە، کە دەوترێت ئەردەشێری سێیەم فەرمانی یەکەمی لەبارەی پەریساتیس بە داماڵینی پێستی بە زیندوویی لە جەستەی، کێشایەوە و فەرمانی کرد بە شێوەی ئاسایی بیکوژن.

لە مێژووی ئێراندا ژنە بە دەسەڵاتەکان زۆربوون، بەڵام ژنێکی بە هێزی وەك پەریساتیس نەبووە لە مێژووی کۆنی ئێران واتە ئەو مێژووەی بەشێك نییە لە ساتیرەکان، هەرچەندە زۆر

خەسڵەتی ناشیرین و خراپی هەبوو، بەڵام چەندین جار بە ئیرادەی بەهێز خزمەتی هەخامەنشییەکانی کرد.

سەردەمی ئەردەشێری سێیەم کە بە خوێنڕشتن دەستی پێکرد، سەردەمێکە لە پاشایەتیی هەخامەنشییەکان، دوایین ڕووناکی چرای پێش کوژرانی ئەو بوو. ئەردەشێری سێیەمیش دوایین ڕووناکایی هەخامەنشییەکان بوو لە سەردەمی پاشایەتیی خۆیدا گەورەیی و هێزی هەخامەنشیی گەڕاندەوە، بێ ئەوەی بتوانێت ڕێوڕەسمی باشی بەڕێوەبردنی وڵات لە سەردەمی کوروش و داریوش بگەڕێنێتەوە. ئەو پاشایەکی زۆر دیکتاتۆر و خوێنڕێژ و بێ بەزەیی بوو، بەڵام بە ئیرادە بوو، بەردەوام تێ دەکۆشا بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەوڵەتداری خۆی. شێوەی حوکمڕانی ئەو هێندە سەخت بوو، کە بۆ نموونە کاتێك شاری (سیدون)ی لە سوریا داگیرکرد، تەواوی بەرگریکارانی ئەو شارە خۆیان کوشت تا نەکەونە بەردەستی ئەردەشێری سێیەم، تەنانەت ئەواگۆراسیش بەو هەموو توانا جەستەییانەی هەیبوو، خۆی کوشت. ئەردەشێری سێیەم کاتێك فەرمانی کوشتنی یەکێکی دەردەکرد، گرینگی نەدەدا کە کەسێك یاخۆ کۆمەڵە کەسانێك دەکوژرێن.

کاتێك دەیویست لەشکرکێشی بکات، تەواوی ئەو پیاوانەی دەبرد، کە پێویستی پێ بوون، گرینگی نەدەدا بەوەی لە وەرزی کشتوکاڵدا نابێت جووتیاران ببردرێن بۆ جەنگ، هەروەسا کوڕە تاقانەیەکی دایك و بابێکی پیر لە ئەرکی سەربازی بەخشراو نەبوو، هەڵبەتە ئەرکی سەربازی لە سەردەمی ئەردەشێری دووەمدا وەلانرا، ئەردەشێری سێیەم پیاوانی بەپێی نەریتەکانی کۆنی سەربازی بۆ جەنگ دەبرد.

دوای ئەوەی ئەردەشێری سێیەم گەیشتە دەسەڵات، پارە بۆ کارە پێویستەکان نەبوو، ئەو فەرمانی کرد لەسەر چەرم دراو چێ بکەن و برەوی پێ بدەن، بۆ یەکەمجار لە مێژووی ئێران (شەهروا)[1] بڵاوبۆوە، لە مێژووی پێش ئەردەشێری سێیەم ئەوە نابینرێت. کاتێك شەهروا برەوی سەند، گورزی گەورە بەر بازرگانی کەوت، چوونکە کەس متمانەی پێ نەبوو،

(١) شەهروا بە واتای پارەی نووسراو دێت یاخۆ دەکرێت بگوترێت پارەی باوەڕپێکراو یان شێوەی چەکی ئێستە، بەڵام جیاوازی ئەوەبوو، کە بە مۆر لەسەر پێستی گا دەدرا. "وەرگێری کوردی"

نەیدەویست. لە لایەکی دیکە وەرگرتنی شەهروا بە زۆری بوو، ئەوەی وەری نەگرتبایە دەکوژرا، بۆیە هیچ شتێك دەست نەدەکەوت.

لە کۆشکی ئەردەشێر خواجەیەك بە ناوی (باگواس) هەبوو، کە ناوبانگی زانایی و بە ئەزموونی هەبوو، ئەو پیاوە نەتەنیا پلەی گەورەی وەرگرت، بگرە بوو بە پاشا.(٣)

باگواس بە ئەردەشێری وت: پێویستە شەهروا بە رێژەیەکی دیاری کراو چێ بکرێت نەك بێ کوتا بێت، ژمارەی نەزانرێت، هەروەها جارچییەکان پێویستە جار بدەن، کە شەهروا چەکی نەختینەی خەڵکە لای پاشا و بەپێی ئەو چەکە پاشا قەرزداری خەڵکە، بەڵێنی دانەوەی ئەو قەرزانە لەلایەن پاشا، تەنیا سێ مانگە، دوای ئەو ماوەیە هەر کەسێك شەهروا بداتەوە، زێڕ وەردەگرێت.

باگواس بە ئەردەشێری وت لە ئەمڕۆ تا سێ مانگی دیکە پێویستە زێڕ و خشڵی پێویست دابین بکەی تا لە کاتی هاتنی خەڵکدا پێیان بدرێتەوە، نابێت چاوەڕوان بی خەڵك دوای ئەو بەڵێنە متمانە بە شەهروا بکەن، بەڵام دوای سێ مانگ ئەگەر شەهروا لە خەڵك وەرگیرایەوە و زێڕ و خشڵیان پێ درایەوە، دوای ئەوە متمانە بەرانبەر بە شەهروا پەیدا دەکەن.

پێشبینی باگواس ڕاست بوو، خەڵك تا سێ مانگ متمانەیان بە شەهروا نەبوو، ئەویان وەرنەدەگرت، بۆیە ساتوسەودایی گەورە ڕاگیرا، سەودایی بچووك وەك ئەوکاتەی پارە و زێڕ و خشڵ نەبوو (کاڵا بە کاڵا)یان دەگۆڕییەوە، بۆ نموونە گەنم بە رۆن یاخۆ میوە دەگۆڕدرایەوە بە خوێ یاخۆ خورما و...هتد ، چوونکە ئەو کەسەی بە نموونە ماڵ یاخۆ باخی خۆی دەفرۆشت نەیدەتوانی گەنم یاخۆ رۆن وەربگرێت، بەڵام سێ مانگ تێپەڕ بوو، ئەوانەی شەهروایان هەبوو بە زێڕ و زیویان گۆڕییەوە، تێگەیشتن کە گۆڕینەوەی شەهروا بە زێڕ و زیو ڕاستە، بەڵێنەکە بێ بنەما نییە، بەمەش بەرانبەر بە شەهروا متمانەیان پەیدا کرد.

بەم شێوەیە یەکەم پاڵپشت لە پارەی نووسراو (وەك پارەی کاغەزی ئێستە) لە ئێران هاتەکایەوە، شەهروا لەسەر پارچەکانی چەرم بە هۆی مۆری ئاسنینی داخ کراو وەك نەخشێکی هەستاوە لەسەر چەرم چێ دەکرا و وەك نەخشێکی دەرکەوتە وابوو.

---

(٣) لە مێژووی ئێران دوو خواجە گەیشتوونەتە پلەی پاشایەتی، یەکیان باگواس لە سەردەمی هەخامەنشیی، ئەویدیی ئاغا محەمەد خانی قاجار لە سەدەی هەژدەیەم، دیاریشە کە مەبەستی ئێمە خواجەی ڕاستییە نەك ئەو گەورە پیاوانەی بە دەستەواژەی کۆن بە خواجە ناودەبرێن. "زەبیحوڵڵا"

دەوترێت یەکەم شەهروا لە چین چێ کراوە، بەڵام نازانین پشتیوانی هەبوو یاخۆ نا؟ یەکەم دراو لە ئێران لە سەردەمی ئەردەشێری سێیەم بە شێوەی پارچەی چەرم دروست بوو، بەڵام ناوی شەهروا نەبوو، دواتر لە دوای هاتنی ئیسلام ئەو ناوەی لێنرا، مێژوونووسە یۆنانییەکان ناوی ئەو پارەیەیان بە (شاهاکان) نوسیوە، پێ دەچێت ناوی ڕەسەن (شاهاگان) بووبێت، دوای سوان بووبێت بە (شایەگان) واتە شایستەی شایەکان.

برەوسەندنی شەهروا زۆر یارمەتیدەری ئەردەشێری سێیەم بوو لە ڕووی داراییەوە، چوونکە ئەو بۆ جەنگە گەورەکان پێویستی بە پارە هەبوو، شەهروا بووە پاڵپشت بۆ دابینکردنی تێچووە قورسەکانی ئەو جەنگانە. ماوەی بەردەوامبوونی شەهروا دەساڵ بوو، واتە لە (٣٥٨ تا ٣٤٨ پ. ز)، دوای ئەو ماوەیە ئەردەشێر شەهروای چاپکرد، چوونکە باری ئابووری وڵات بە هۆی دەسکەوتەکانی جەنگ باش بۆوە، ئەو باج و خەراجانەی لە وڵاتانی دیکە وەردەگیرا، پێویستی بە چاپی شەهروا نەما.

شەهروا سەرەتا تەنیا لە پایتەخت هەبوو، هەر تەنیا لە پایتەختیش وەریاندەگرت و بەس، کەس لە دەرەوەی پایتەخت نەیدەویست، بەڵام دوای ئەوەی متمانە دروست بوو، کە دەکرێت بە زێڕ و دراویتر بگۆڕدرێتەوە، لە هەموو ئێران پەسەند کرا، لە هەر شارێك دامەزراوەیەك بە ناوی بانك هەبوو، هەمووان دەیانتوانی بچنە ئەوێ و شەهروا بگۆڕنەوە بە زێڕ و دراویتر، بەڵام لەبەر واری دیاریکراودا دەیانتوانی شەهروا بگۆڕنەوە و بەروار لەسەر شەهرواکان دیاری کرابوو.

دوای دەساڵ و دوای ڕاوەستانی ئامادەکردنی شەهروا، خەڵك لە نەمانی شەهروا بەداخ بوون، چوونکە شەهروا بەرانبەر بە زێڕ و بە تایبەتی زیو زۆر سووك بوو، بە ئاسانی دەگواسترایەوە، دزەکان نەیاندەزانی کە پارەیان لایە. داریوشی سێیەم دوایین پاشای هەخامەنیی ویستی شەهروا چاپ بکات، بەڵام نەیتوانی لەبەر واری دیارکراودا زێڕ و زیوی ئەو شەهروایانە بداتەوە کە لای خەڵك بوون، هێندە بێ متمانەیی لە لای خەڵك لە ئێران چێ بوو، وایکرد جارێکی دیکە شەهروا چاپ نەکرایتەوە.

ئەردەشێری سێیەم دوای ئەوەی بوو بە پاشا، ویستی بچێت، سوریا لە ئەواگۆراسی یۆنانی وەربگرێتەوە، ئەو بیری بوو کە باوکی واتە ئەردەشێری دووەم لە یۆنانییەکانی ویست تاکو بڕگەکانی پەیماننامەی ئاشتی (٣٨٧ پ. ز) جێبەجێ بکەن و دژی ئەواگۆراس ببنە هاوپەیمانی

ئەو، ئەوانیش ئەو داوایەیان پەسەند نەکرد، بۆیە ئەردەشێری سێیەم بڕیاریدا بەهێزی خۆیەوە بڕواتە سوریا و لەگەڵ ئەواگۆراس بجەنگێت.

دوای ئەوەی ئەردەشێری دووەم ئەرکی سەربازی هەڵوەشاندوە، پیاوانی ئێرانی پەروەردەی جەنگیان نەما، ئەردەشێری سێیەم بۆ جەنگی ئەواگۆراس پێویستی بەو پیاوانە بوو، کە ڕاهێنانی جەنگیان کردبێت. پەروەردە و ڕاهێنانی سەربازی تازە پێویستی بەکات بوو، زاندراوە کە لە ڕابردوودا پەروەردەی سەربازی زۆرترین کاتی دەویست، چوونکە سوود وەرگرتن لە چەکی سارد پێویستی بە هێزی جەستەیی بوو سەرباز دەبووایە ماوەیەك لەژێر پەروەردە و سەرگەرمی مەشق و ڕاهێنان بێت تا هێزی پێویست پەیدا بکات.

ئەردەشێری سێیەم دەچوو بۆ جەنگی ئەواگۆراس و نەیدەتوانی چاوەڕوان بێت تا سەربازە نوێیەکان پەروەردە دەکرێن، بۆیە دوو کاری ئەنجامدا، یەکەمیان ئەوە بوو کە سەربازەکانی خۆی لە نێوان خێڵە شاخنشینەکان بە تایبەتی خێڵەکانی (کاسیت) هەڵبژارد، دووەمیان ئەوەبوو کە هەندێ لە پیاوانی بۆ سەربازی بانگهێشت کردەوە و خستنییە بەر ڕاهێنان، بۆ ئەوەی لە کاتی گەڕانەوەی لە جەنگی ئەواگۆراس، ئەوان ڕاهێنانیان تەواو بکەن و بتوانێ بیانهێنێتە نێو لەشکر.

خێڵەکانی کاسیت(٤) ئارییایی بوون، لە رۆژئاوای ئێران نیشتەجێ بوون، سنووری ژیانی ئەوان بە تەواوی نازانین، مێژوونووسان جیاوازییان هەیە لە دیارکردنی سنووری نیشتەجێ بوونیان، بەڵام گومان نییە ئەو خێڵانە لەو ناوچەکانی (پیش کوە و پوشت کوە) دەژیان و لووڕەکان نەوەی ئەوانن.

شاراوە نییە پیاوانی لووڕ کە لە ناوچە شاخاوییەکان دەژین، کەسانێکن بەهێز، دلێر و تەمەن درێژن، تا ئێستەش ژنان و پیاوانی سەد ساڵە لە لووڕستان زۆرن. کاسنییەکان لە لووڕەکانی ئێستە پتەوتر و بەهێزتر بوون، چوونکە هەندێ لەو نەریتانەیان نەبوو کە شارستانییەت هێنای، ئەوان چایان نەدەخوارد و جگەرەیان نەدەکێشا.

پیاو و ژنانی کاسنی لە رابردوو پتر لە سەد ساڵ دەژیان، کەمتر ڕووی دەدا پیاوێك بە نەخۆشی بمرێت، هەندێ لە پیاوان لە تەمەنی گەنجی لە جەنگدا دەکوژران، هەندێکیشیان لە

(٤) کاسیت هەمان کاسی یاخۆ کاسنییەکانن کە باپیرانی تیرەی لووڕن، ئاشکرایە کە لووڕەکان یەکێکن لە تیرە هەرە رەسەنەکانی کورد. "وەرگێڕی کوردی"

پیریدا، بە تەمەنەکانیش وەك گەنجەکان دەچوونە جەنگ و لە تەمەنی پیاوە کاسیتەکاندا سنووریێك نەبوو بۆ نەچوون بۆ سەربازی و پشوودان لەژێر خێوەت.

تاوڵی لوورەکان ماڵی ئەوان بوو، ئەوان شار و خانوویان نەبوو، لە تەواوی تەمەنیاندا لە نێوان هاوینەهەوار و زستانەهەواردا لە هامووشۆ بوون، لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان هۆکاری ئەو کۆچە بەردەوامە بوو.

لە کۆتایی پایز و ئەوکاتەی گژوگیا لە کوێستانەکان بە تەواوەتی وشك دەبوو، ئەوان لە کوێستان بەرەو پێدەشتە گەرمەکان دەهاتنەوە، مەڕ و ماڵاتەکانیان لەو پێدەشتانە دەلەوەڕاند، لە زستاندا بەرەو ناوچە گەرمەکان دەڕۆیشتن، ئەو شوێنانەی ئەوان لێیان دەمانەوە بە گشتیی ئاوی زۆریان هەبوو، لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا ئاو لە جۆگەلە و ڕووبارەکانی ئەو ناوچانە هەبوو، تا ئێستەش باری سرووشتی ئەوێ نەگۆڕاوە.

جەنگی ئەردەشێری سێیەم لەگەڵ ئەواگۆراس بە سەرکەوتوویی کۆتایی هات، تەواوی ئەو شارانەی سوریا کە کەوتبوونە بەردەستی ئەواگۆراس، لە دەستی دەرهێنرایەوە، بەڵام کەمێك دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیە، ئەردەشێری پاشای هەخامەنشیی بە دەست باگواسی خواجە کوژرا.

باگواس سەرەتا بووە گەنجینەداری ئەردەشێری سێیەم، دواتر بوو بە بەرپرس لە تەواوی کاروباری دارایی وڵات و سەرمایەیەکی باشی گردکردبۆوە.

ئەردەشێری سێیەم لە بیستەم ساڵی پاشایەتیدا کاتێك زانی باگواس بۆتە خاوەن سەرمایە و هێزی زۆر، ویستی بیکوژێت و دەست بەسەر سەرمایەکەیدا بگرێت، بەڵام باگواس پێش دەستی کرد، بە یارمەتی ئارسێس کوڕی ئەردەشێری سێیەم لە ساڵی (٣٣٨ پ. ز) ژەهر خواردی کرد و کوشتی، جگە لەو زانیارییانەی مێژوونووسە یۆنانییەکان لەبارەی چۆنییەتی کوشتنەکەی، هیچ زانیاریی دیکە لە بەردەستدا نییە، سەرچاوە ئێرانییەکان بچووکترین زانیارییان لەو بارەوە نییە.

پێدەچێت ئەردەشێری سێیەم منداڵی زۆری هەبووبن، دوای مردنی لەلایەن باگواسەوە لەنێو بردران، ئەوانەی مانەوە بریتی بوون لە: (ئارسێس کە دوای باوکی بە هۆی باگواس بوو بە پاشا، کوڕێکی دیکەی بەپێی گێڕانەوەکان هەڵات بۆ لای ئەسکەندەری مەکدۆنی، سێ کچی ئاتووسای خوشك و خێزانی ئەردەشێری سێیەم کە لەگەڵ دایکیان لەو کوشتارگەیە رزگار بوون).

ئارسێس بە هەمان ناو بە ڕواڵەت بۆ ماوەی سێ ساڵ پاشا بوو، بەکردەنی باگواس دەسەڵاتیی بەڕێوە دەبرد، بەڵام کاتێك باگواس هەستی کرد ئارسێس نیازی هەیە کە بیکوژێت، ئەو و منداڵەکانیشی کوشت.

دیسان زانیاریمان نییە لەبارەی ئەوەی ئاخۆ باگواس چۆن ئارسیس و منداڵەکانی کوشت؟، چوونکە لە سەرچاوە ئێرانییەکان هیچ لەو بارەوە نییە، لە سەرچاوە یۆنانییەکانیش درێژەی ئەو باسە نابینرێت، تەنیا هێندە دەزانین باگواس لە ساڵی (٣٣٥ پ. ز) ئارسێس و منداڵەکانی کوشت و نەوە و وەچەی پاشایانی هەخامەنشییەکان لەنێوچوون.

دوای ئەوە باگواسی خواجە ماوەی شەش مانگ بە سەربەخۆیی پاشا بوو، بەڵام لە هەموو لایەکەوە نارەزایی لە هەمبەر خواجە سەریهەڵدا، چوونکە ئەو لە شازادەکانی هەخامەنشیی نەبوو تا بتوانێت فەرمانڕەوایی بکات.

باگواس بۆ ئەوەی نەکەوێتە مەترسی بەرهەڵستکارانەوە، کۆدۆمانۆسی فەرمانڕەوای ئەرمەنستانی هێنا، کە لە خزمانی داریوشی دووەم و بەپێی هەندێ گێڕانەوە نەوەی ئەو بوو، واتە شازادە بوو، کردی بە پاشا، کۆدۆمانۆس ناوی (داریوشی سێیەمی) بۆ خۆی هەڵبژارد، بەپێی هەندێ گێڕانەوە کاتی بوونی بە پاشا تەمەنی چل و پێنج ساڵ بوو.

لەو پاشایە کە دوایین پاشای هەخامەنشیی بووە، دوو جۆرە بەسەرهات گەیشتووەتە ئێمە، یەکەمیان چیرۆکێکە، ئەگەر لە ڕووی ئەدەبییەوە بایەخی زۆری هەبێت، ئەوا لە ڕووی مێژووییەوە بایەخی نییە، مەگەر رۆژێك ئەو بابەتە ئەدەبییانە لە مێژووی ئێران جێگیر بکرێن.

بەپێی دەقی یەکەم داریوشی سێیەم یاخۆ (دارای سێیەم) پیاوێکی دەست و زمان کراوە و دلێر بوو، لە ڕووخساری هەڵکشانێك لە گەورەیی و پاکی دەڕوون دەردەکەوت. ئەو خودان تەواوی ئەو خەسڵەتانەیە، کە مرۆڤێکی تەواو پێویستە هەیبێت، هیچ کێماسیی نەبوو، بەڵام لەو مێژووانەی بەردەستن ئەو بە شێوەیەکی دیکە ناسێنراوە، بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین کە نووسەری ئەوانە مێژوونووسانی یۆنانین، واتە پێنووس بە دەست دوژمنەوە بووە.

لە سەرچاوە مێژوویيە یۆنانییەکانی کە ئێستە بەردەستن، داریوشی سێیەم پیاوێکی ترسنۆکە و خۆشگوزەران بووە، کاتێك چاوی بە لەشکرێك دەکەوت لە ترسان دەکەوتە لەرزین. ئەو بەشە لە نووسینی یۆنانییەکان بە دڵنیاییەوە لە ڕووی دوژمنایەتییەوە هەڵبەستراوە،

چوونکە کۆدۆمانۆس کە ناوی داریوشی سێیەمی بۆ خۆی دانابوو، لە سەردەمی ئەردەشێری سێیەم بەشداری لە جەنگدا کردبوو، ئازایەتی زۆری نواندبوو، ئەردەشێری سێیەم وەك پاداشت بۆ ئازایەتییەکانی شمشێری زێڕی پێ بەخشی و ئەوی کردە فەرمانڕەوای ئەرمەنستان، ئەردەشێری سێیەم ئەو کەسە نەبوو، کە بە بێ زانینی لێهاتوویی شمشیرێکی زێڕ بکاتە دیاری بۆ کەسێك، ئەگەر نەزانێت کێیە!.، بۆیە دەتوانرێت بگوترێت ئەگەر داریوشی سێیەم بە وتەی یۆنانییەکان کێماسیی زۆریشی هەبوو بن، بەڵام ترسنۆك نەبوو، بەڵام دوورنییە کە بە وتەی یۆنانییەکان خۆشگوزەران بووبێت، چوونکە ئەوکات حکوومەتی هەخامەنشییەکان گەندەڵ ببوو، چیدیی شازادە و سەردارەکان هەڵگری خەسڵەتی پاشاکانی سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی نەبوون، هەموویان ڕوویان کردبووە ڕابواردن و سەرگەرمی ئاسوودەیی جەستەیی بوون.

دوای بوونی بە پاشا یەکەم کاری داریوشی سێیەم کوشتنی خواجە باگواس و زەوتکردنی سەرمایە و ماڵەکەی بوو، لەبارەی کوشتنی ئەو وتی:"ئەو پیاوە ناپاکی بەرانبەر بە دوو پاشای پێش من کردووە، کە سەرمایەی خۆی بە هۆی ئەوانەوە دەست کەوتبوو، گومانم نەبوو، ئەگەر زیندوو بمێنێت، منیش دەکوژێت، بۆیە ئەوم کوشت، تاکو بەدەست پیلانگێڕی ئەو کە هەوڵی کوشتنم دەدات، لەمە زیاتر ناڕاحەت نەبم."

داریوشی سێیەم دوای ئەوەی لە مەترسی باگواس رزگاری بوو، بە وتەی یۆنانییەکان دەستی بە رابواردن و خۆشگوزەرانی کرد، لەگەڵ سێ هەزار ژن، کە لە کۆشکە جیاوازەکانیدا هەبوون، بەردەوام خەریکی رابواردن بوو.

ئەگەر ژمارەی سێ هەزار زێدەڕۆیی نەبێت، ناچارین بڵێین زۆرینەی ئەو ژنانە کەنیزەکی بەردەستی ژنانی پاشا بوون، چوونکە هیچ پیاوێك توانای رابواردنی نییە، لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرە لە ژنان، بە تایبەتی داریوشی سێیەم کاتی بە دەسەڵات گەیشتنی چل و پێنج ساڵی بوو. ماوەیەك بەسەر پاشایەتیی داریوشی سێیەمدا نەڕۆیشتبوو، دیسان بابەتی جەنگی یۆنان هاتەوە پێشێ، ئەمجارەیان جەنگەکە زۆر قورستر بوو لە جارەکانی دیکە.

بەر لەوەی داریوشی سێیەم ببێتە پاشا، فلیپ پاشای مەکدۆنییە هێرشی کردە سەر ئاسیای بچووك، بەڵام نەیتوانی پێشڕەوی بکات و گەڕایەوە بۆ مەکدۆنییە، لە مەکدۆنییە کوژرا و کوڕەکەی کە ناوی ئەسکەندەر بوو لە جیاتی ئەو بوو بە پاشا.

کاتێك ئەسکەندەر گەیشتە دەسەڵات، ناوی ئەسکەندەری سێیەم بوو، دواتر بە ئەسکەندەری گەورە ناسرا، پێش ئەو دوو ئەسکەندەری دیکە پاشای مەکدۆنیا بوون. ئەو لە ساڵی (٣٥٦ پ. ز) لە باوکێکی ئازا بە ناوی (فلیپی دووەم) و دایکێکی پتەوکار بە ناوی (ئۆلەمپیا) هاتە دنیاوە، دوای ئەوەی کەمێك گەورە بوو، پیاوێك بە ناوی (لیزی ماخۆس) کرا بە ڕاهێنەری، لیزی ماخۆس لە بنەڕەتدا ئێسپارتی بوو، داستانی تەرمۆپیلێ کە ئێسپارتەکان نووسیبویانەوە، بەردەوام دەیخوێندەوە، لەگەڵ هەموو خوێندنەوەیەکدا رقی بەرانبەر بە هەخامەنشییەکان نوێ دەبۆوە، دەزانین لە جەنگی تەرمۆپیلێ سەربازە هەخامەنشییەکان (لئونیداس) پاشای ئێسپارت و سەربازە پاسەوانە تایبەتییەکانی ئەویان کوشت.

لیزی ماخۆس چوونکە رقی لە ئێرانییەکان بوو، دوای ئەوەی بوو بە ڕاهێنەری ئەسکەندەر، تۆوی کوکینەی بەرانبەر بە ئەوان لە دڵی ئەو کوڕەدا چاند، بە گریمانی زۆر هێرشی ئەسکەندەر بۆ ئێران بۆ ئەو کینەیە دەگەڕێتەوە، کە لەلایەن مامۆستاکەی لە دڵیدا چێندرابوو.

فلیپی دووەم واتە باوکی ئەسکەندەر، جەنگاوەرێکی ئازا و دلێر بوو، بە پێویستی زانی کوڕەکەی بە شێوەیەك پەروەردە بکات، کە هونەرەکانی جەنگ وەك ئەسپسواری، تیرهاوێژی، شمشێر وەشاندن و هەڵدانی ڕم بزانێت. تاکو ئەسکەندەر گەورەتر دەبوو، جوانتر و بەهێزتر دەبوو، لە تەمەنی هەژدەساڵیدا، بوو بە پاڵەوانی هەڵدانی ڕم و دیسك، کە مەکدۆنییەکان هۆگری هەردووکیان بوون.

کاتێك ئەسکەندەر گەیشتە تەمەنی سێزدە ساڵی، باوکی ئەوی ناردە لای ئەرستۆ کە گەورەترین زانای یۆنان بوو، ئەرستۆ لە ئامادەیی ئەسکەندەر بۆ فێربوون، سەری سووڕما. ئەسکەندەر لە ماوەی سێزدە تا شازدە ساڵی تەمەنی تەواوی ئەو بابەتانە فێربوو، کە مامۆستاکەی دەیزانی لەبارەی (فیزیك، میتافیزیك، بیرکاری و ئەدەب)، ئەرستۆ پێی وت: (من هیچی دیکەم نییە فێری تۆی بکەم، ئەوە تۆی کە بە روانین، لە داهاتوودا دەکاریت هەندێ بابەتم فێر بکەی.)

ئەسکەندەر دوای ئەوەی دەستی بە پاوانخوازی کرد، هەموو ئەو بابەتە سەرەنجڕاکیشانەی دەیبینین بە تایبەتی لەبارەی ئێران بۆ ئەرستۆی مامۆستای دەنووسی و دەینارد، هەندێ لەو نامانە لە وێرانکاری و شەڕەکانی سەردەمەکان پارێزراون، ئەمڕۆ دەکرێت ئەوان بخوێنینەوە و بزانین ئەسکەندەر ئەو پیاوە بووە، کە بۆ قوتابی بوونی ئەرستۆ شیاو بێت.

لیزی ماخۆس بەردەوام ئەسکەندەری بەرانبەر بە ئێرانییەکان ڕق ئەستوورتر دەکرد و پێی دەوت: تۆ کوڕی ئاشیلی (پاڵەوانی ئەفسانەیی و ناسراوی یۆنان).

ئاریستۆپۆلۆسی مێژوونووس و نووسەری بەناوبانگی یۆنان، کە لەگەڵ ئەسکەندەر چوو بۆ ئێران، تاکو مردن لەوێندەر مایەوە، لە پەڕتووکە گەورەکەیدا کە لەنێوچووە، دواتر لەلایەن زانای جوگرافی مێژوویی (ئێسترابوون) هەندێکی نووسراوەتەوە، نووسیویەتی: (ئەسکەندەر مێشکی بەهێز بوو، هیچی بیر نەدەچوو، ڕووخساری مووی کەمی پێوە بوو، تا چەند ڕۆژ پێویستی بە ریش و سمێڵ تاشین نەبوو، چوونکە زۆر قۆز بوو، لە منداڵییەوە سەرنجڕاکێش و دەوروبەرەکەی هۆگری ببوو، ئەو قۆزی و جوانییەی هەیبوو تا دوایین ڕۆژەکانی تەمەنی مایەوە).

ئەو پیاوە قۆز و جوان و زانایە کە مێژوونووسەکان ئەویان لە ریزی خوداوەندیانی یۆنان ناساندووە، یەکێك بوو لە خوێنرێژ و بێ بەزەییترین جەنگاوەرەکانی جیهان، مێژوونووسە یۆنانییەکان هەوڵیانداوە دڵڕەقی و توونددوتیژی ئەو پیاوە بشارنەوە و بە بێ دەنگی بیهێڵنەوە، بۆ نموونە لە دوای جەنگی گرانیك، کە یەکەم جەنگی ئەو لە دژی هەخامەنشییەکان بوو، نووسیویانە: (ئەسکەندەر بیست هەزار سەربازی ئێرانی دیل کرد، هەر بیست هەزار سەربازەکەی کوشت).

مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە ئەسکەندەر بۆیە چووە ئێران و وڵاتانی دیکە تاکو دیموکراسییەت لە جیهاندا پەرە پێبدات و "شاری نموونەیی" چێ بکات، کە تیایدا هەموو تاکەکان بە ئاسوودەیی و خۆشنوودی بژین، بەڵام ئەسکەندەر هەنگاوی دەنایە هەر شارێکی ئێران، هەموو پیاوانی دەکوشت و منداڵ و ژنەکانیشی وەك کۆیلە دەفرۆشت، ئەوە لەلایەن خودی مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە نووسراوە، نەك لەلایەن ئێرانییەکانەوە.

ئەو تاوانانەی ئەسکەندەری مەکدۆنی کردی، چەندین سەدە، دواتر نە جەنگیزخان و نە تیموری لەنگ بۆیان نەکرا ئەنجامی بدەن، یۆنانییەکان ئێرانییەکانیان بە بەربەر ناودەبرد، لە کاتێکدا ئەفسەر و سەربازەکانی ئەسکەندەر دڕندەییان، لە دڕندەیی ئاژەڵانی میناك شێر و پڵنگ تێپەڕاند.

دوای کوژرانی فلیپی دووەم، ئەسکەندەر گەیشتە سەر تەختی پاشایەتی، لیزی ماخۆس بە ئەسکەندەری وت: ئێستە کاتی ئەوە هاتووە، کە بڕۆیتە ئێران و ڕەچەڵەکی ئێرانییان لەنێو ببەی.

ئەسکەندەر وتی: تا ئەو کاتەی بە تەواوەتی دەسەڵاتیی یۆنانم لە دەستدا نەبێت، ناتوانم بڕۆمە ئێران، چوونکە ئەگەر بەسەر هەموو یۆناندا باڵادەست نەبم، دوای ڕۆیشتنم بۆ ئێران، ئەوان لەگەڵ نەتەوەکانی یۆنان لە دژی من دەبنە هاوپەیمان و لەنێوم دەبەن.

ئەسکەندەر لە ڕۆژی شەست و یەکەمی دوای مردنی باوکی، لەشکرکێشیی کردە سەر تسالی، کە یەکێك بوو لە دەوڵەتە شارە گەورەکانی یۆنان، لەشکرەکەیانی تێك شکاند و ئەو وڵاتەی داگیرکرد، بێ وێستان ڕۆیشت تاکو (تەبس) داگیر بکات، کە جیا بوو لەو (تەبس)ـەی لە میسر هەبوو، دوای داگیرکردنی تەبس، ئەسکەندەر بەرەو ئەسینا ڕۆیشت و ئەو دەوڵەتە شارەش بێ جەنگ باڵادەستی ئەسکەندەری پەسەندکرد، دوای ئەوە تەواوی ئەو دەوڵەتە شارانەی لە باشووری یۆنان واتە پلۆپۆنز بوون، بەرفەرمان بوونیان بەرانبەر ئەسکەندەر دەربڕی، بەم شێوەیە ئەو سەردارە گەنجە توانی دەست بە سەر تەواوی یۆناندا بگرێت.

دوای ئەو سەرکەوتنە لیزی ماخۆس پێی وت: ئێستە کە تەواوی یۆنانت لە بەردەستە، بڕۆ بۆ ئێران و ئێرانییەکان لەنێو ببە و ڕەچەڵەکیان مەهێڵە.

ئەسکەندەر لەشکرێکی لە بیست و نۆ هەزار سەربازی پیادە و چوار هەزار سەربازی سوارە ئامادە کرد، بۆ ئەوەی بگاتە ئێران. هەموو سەربازەکانی یۆنانی بوون، ئەسکەندەر پێیانی وت: (ئێمە دەچینە وڵاتێك، کە دانیشتووانی ئەوێندەر دەوڵەمەندترین دانیشتووانی جیهانن، زێڕی ئێران لە دنیادا ناوبانگی هەیە، گەیشتینە هەر شارێك من ئێوە ئازاد دەکەم، لەوەی هەرچی دەتانەوێت بە تاڵانی ببەن، هەر ژن و پیاوێکی گەنج کە ویستتان بۆ کۆیلەیی بیهێنن و بیفرۆشن، من دڵنیاتان دەکەمەوە، کە هەریەکە لە ئێوە لەو گەشتەدا بە بیست تاڵان زێڕەوە دەگەڕێنەوە).

ئەسکەندەر بەو هیوایە سەربازەکانی خۆی بە جۆش هێنا، ئەودەمە بەرەو ئاسیای بچووك کەوتەڕێ تا خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنەی ئێستە لە وڵاتی تورکیایە، کە بە ناوی نیمچە دوورگەی (گالی پولی) دەناسرێ، ئەو نیمچە دوورگەیە لە سەردەمی ئەسکەندەردا بە (خرۆزۆس) ناودەبرا، گەروویەك دەکەوتە تەنیشت ئەو نیمچە دوورگەیە، کە ئێستە بە (گەرووی دەردەنیل) ناسراوە، ئەوکات بە (هێلسپۆنت) دەناسرا، ئەسکەندەر بە لاسایی خەشایار شا پردێکی بە بەلەمەکان لەسەر گەرووی دەردەنیل چێ کرد، بەڵام ئەو ڕۆژەی ویستی لەشکرەکەی لەسەر پردەکە بپەڕێنێتەوە، دەریا بە ڕادەیەك هەڵکشابوو، کە پردەکەی تێکشکاند.

یۆنانییەکان باوەڕیان بە شتی دوور لە راستی و ئەقڵ هەبوو، تەنانەت بۆ بابەتی زۆر ئاسایی دەچوونە لای غەیب بێژەکان، کە لێهاتووترینی غەیب بێژەکان ئەوانەی پەرستگەی دولفی بوون و پرسیاریان لێ دەکردن. دوای تێکشکانی پردەکە بە هۆی گێژەلووکەوە، سەردارێکی ئەسکەندەر بە ناوی (پارمەنیۆن) وتی: (ئەو گێژەلووکەیە لەلایەن خوداوەندیانەوە نارداوە تاکو ئێمە تێ بگەیەنن، کە نابێت بۆ جەنگی پاشای ئێران بچین).

ئەسکەندەر وتی: خوداوەندیان ئەو گێژەلووکەیان ناردووە تاکو تێمان بگەیەنن، کە پێویستە پەلە بکەین لە چوونمان بۆ جەنگی پاشای هەخامەنشیی، ئەگەرنا وەرزی گۆڕانی کەشوهەوا دێت و ئێمە لە جەنگ دەگەڕێنێتەوە، ئەوەبوو فەرمانی کرد لە دەوروبەر کەشتیی بێنن تاکو سەربازەکانی بە کەشتیی لە دەردەنیل بپەڕێنێتەوە، پیادە و سوارەکان بە کەشتیی گواسترانەوە بۆ رۆژهەڵاتی گەرووەکە.

هەر کە ئەسکەندەر لە دەردەنیل پەڕییەوە و گەیشتە ئاسیای بچووك، فەرمانڕەوای لیدی هەواڵی بۆ داریوشی سێیەم نارد و وتی: بەپێی ئەو زانیارییانەی من هەمە، ئەسکەندەر بەسەر هەموو یۆناندا باڵادەست بووە و ئێستە هاتووەتە ئاسیای بچووك، بێ دوودڵی بەرەو ئێران دێت، بەڵام ئەگەر بۆ من پارە و هێزی یارمەتیدەر بنێری، ئەو دەگەڕێنمەوە.

نەزاندراوە کە ئەو راپۆرتە گەیشتووەتە داریوشی سێیەم یاخۆ نا، چوونکە لە پەرتووکە یۆنانییەکاندا باسی ناردنی راپۆرت هەیە، بەڵام باسی گەیشتنی بە داریوشی سێیەم نییە. وێڕای ئەوەی گومانمان نییە، کە داریوشی سێیەم لە باڵادەستی ئەسکەندەر لە یۆنان و هاتنی بۆ ئەسیای بچووك ئاگەدار بووە، بە گریمانی زۆر هەستە دوژمنکارییەکانی ئەوی بەرانبەر بە ئێران زانیوە، چوونکە بە هۆی پێوەندیی بازرگانی لە نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان، لەو بارەیەوە زانیاریی بەردەوام هەبووە.

بەڵگەشمان بۆ ئەوە ناردنی لەشکر بووە لەلایەن داریوشی سێیەمەوە بۆ رێگرتن لە ئەسکەندەر، ئەگەر ئەو زانیاریی نەبووایە، لەشکری نەدەنارد. ئەو لەشکرەی داریوشی سێیەم بۆ رێگرتن لە ئەسکەندەر ناردی بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان پێکهاتبوو لە سەد هەزار کەس، کە ئەو ژمارەیە زێدەڕۆیی تێدایە، ئەو لەشکرە لە سی یاخۆ چل هەزار سەرباز پێکهاتبوو، کە لە روانگەی پێداویستییە جەنگییەکان بە لەشکرێکی ناکامڵ دادەنرێت،

چوونکە نە گالیسکەی جەنگی، نەبورجی گەڕۆك و نەمەنجەنیقیان پێ بوو، لە کاتێکدا لە سەردەمی هەخامەنشییەکان گالیسکەی جەنگی یەکێك بوو لە چەکە کاریگەر و بەهێزەکان.

لەو چل هەزار سەربازەی داریوش بۆ جەنگی ئەسکەندەری نارد، پازدە هەزاریان لە سەربازە بەکرێگیراوە یۆنانییەکان بوون، لە پەنا سەربازە ئێرانییەکانەوە دەڕۆیشتن. ئەو لەشکرە لە کەناری ڕووباری (گرانیك) کە ناوە دروستەکەی لە کۆندا (گرانیکۆس) بوو، گەیشتنە لەشکری داریوش. ئەو ڕووبارە سەرچاوەکەی لە شاخی (ئایدا) کە دەکەوێتە باشووری دەریای مەڕمەڕەوە، دوای مەودایەکی کورت دەڕژێتە نێو ئەو دەریایە، تا ئێستە ماوە، بۆ زانین لەسەر نەخشەی تورکیای ئێستە شارێك بە ناوی (بالیك سیر) بدۆزنەوە، ئەو ڕووبارە لە ڕۆژئاوای ئەو شارە لە باشوور بۆ باکور دەڕوات، لەو ڕووبارانەیە کە لە کۆتایی هاوینان ئاویان تێدا نامێنێت، ئەوکات چوونکە وەرزی بەهار بوو هێشتا ئاوی هەبوو.

ئەو ڕۆژەی ئەو دوو لەشکرە بەیەك گەیشتن، شەست ڕۆژ لە بەهاری ساڵی (٣٣٤ پ. ز) تێپەڕی بوو، بە پێچەوانەی نووسینی مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە داریوش خۆی لەگەڵ ئەو لەشکرە نەبوو، کە لە کەناری ڕووباری گرانیك گەیشتە لەشکری ئەسکەندەر، نووسینەکانی ئەو کەسانەی لەگەل ئەسکەندەر بوون وەك (ئاریستۆپۆلۆس، پارەمەنیۆن، نی کاتوور و کولی تۆس) ئەو بابەتە پشتڕاست دەکەنەوە. داریوشی سێیەم لە جەنگی دواتر کە جەنگی (ئیسۆس) بوو بەشداربوو، بەڵام لە گرانیك بەشدار نەبووە.

سەبارەت بە جەنگی گرانیك هیچ بەڵگەیەك یاخۆ سەرچاوەیەکی ئێرانیمان نییە، هەرچی دەیزانین لە سەرچاوە و مێژوونووس و نووسەرە یۆنانییەکانی هاوڕێی ئەسکەندەرەوەیە. ژمارەی هاوڕێکانی ئەسکەندەر کە ناویان لە مێژوودا ماوەتەوە، زۆرن، هەندێکیان مێژوونووس بوون یاخۆ بۆ هونەرکردن مێژوویان دەنووسییەوە.

لە سەرەتای مێژووی نووسراوی ئێرانمان پێکرد، کە کوروش و دواتر داریوش چەند ڕێسا و یاسای ڕێکیان بۆ لەشکرەکانیان دانا و چەند بنەمایەکیان بۆ دانانی ئۆردووگە بڕیار لێدا، لە ئۆردووگەکانیان شەقام و کۆڵانیان دانا، لە چوارڕیانەکان، جگە لە کاتەکانی پەلاماری لەناکاوی دوژمن، ڕووناکیان دادەنا، تاکو ئەو کەسەی لە ڕۆژ یاخۆ شەو دێتە نێو ئۆردووگە بتوانێت هەر کەسێکی دەیەوێت، بیبنێت.

ئەو ڕێسا و ڕێکارییەی لە ئۆردووگەکانی هەخامەنشیی هەبوو، لە کاتی بەیەك گەیشتنی ئەو دوو لەشکرە بە ڕادەیەك سست و خراپ بوو، کە بە وتەی (نی کاتۆر) کە لە هاوڕێکانی ئەسکەندەر بوو، ئەو شەوە سەربازە مەکدۆنییەکان دەچوونە سەربازگەی هەخامەنشیی و دانووستاندنیان لەگەڵ سەربازە یۆنانییەکان دەکرد.

سەربازە یۆنانییەکانی نێو لەشکری ئێران لەو سەربازانە بوون، کە دوای ئەردەشێری دەستدرێژ وەك بەکرێگیراو هاتبوونە نێو لەشکری ئێران، ئاشکرایە دانووستاندنی نهێنی سەربازە مەکدۆنییەکان لە ئۆردووگەی هەخامەنشیی لەگەڵ ئەواندا بۆ چ مەبەستێك بووە، بە دڵنیاییەوە سەربازانی ئەسکەندەر داوایان لە ئەوان کردووە تاکو پاڵ بدەنە لەشکری یۆنان و لە لەشکری هەخامەنشیی بکشێنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەقڵدا ناگونجێت کە لە شەوی پێش شەڕدا، لە ئۆردووگەیەك کە لە بەرانبەر دوژمن بێت، هێندە نارێکی و بێ ئاگایی هەبێت، کە سەربازانی دوژمن بتوانن بێنە نێو ئۆردووگەکە و لەگەڵ هاوڕەچەڵەکەکانی خۆیان بکەونە دانووستاندن و هانیان بدەن بۆ ناپاکی، بەڵام نووسینەکانی هاوڕێیانی ئەسکەندەر ئەوە باس دەکەن، ڕووداوەکانی ڕۆژی دواتریش ئەو وتەیە پشتڕاست دەکەنەوە.

ئەو شەوە لە کاتێکدا سەربازانی ئەسکەندەر بە ئازادی دەچوونە نێو سەربازگەی هەخامەنشیی هاوڕەچەڵەکەکانی خۆیان هاندەدا، ئەسکەندەر و چەند کەسێك لە سەردارەکانی وەك (سلۆکۆس، لۆمەنۆس و بەتلیمیۆس) پێکەوە بەشێك لە پەڕتووکی داستانی ئیلیادی هۆمەریان دەخوێندەوە، کە بریتی بوو لە داستانی جەنگی (ترۆی).

دوای ئەوەی کەمێك لە ئیلیاد خوێندرایەوە، سەردارەکان لە خێوەتی ئەسکەندەر دەرچوون و چوونە خێوەتەکانی خۆیان. لۆمەنۆس بەردەستی ئەسکەندەر، کە هەندێ نووسینی لەبارەی ئەو نووسیوەتەوە، خواردنی ئێوارەی سەرداری مەکدۆنی برد، خواردنی ئەو شەوەی بریتی بوو لە پارچەیەك نان و کەمێك پەنیر و قاپێکی بچووك لەو زیتوونانەی لەنێو خوێ و توێکڵی هەناردا گیرابوونەوە لەگەڵ یەك جام شەراب بوو، بەڵام ئەسکەندەر هەردەم بەو خواردنە ئاساییە ڕازی نەدەبوو، لە کاتی پشوودا خواردنی خۆش و زۆری دەخوارد، لە خواردنەوەی شەراب زێدەڕۆیی دەکرد و دەیوت هەر کەسێك لە کاتی پشوو دەست بە خواردن و خواردنەوە بگرێت، ناسوپاسگوزاری بەرانبەر بە خوداوەندییان کردووە.

دوای ئەوەی ئەسکەندەر نانی شەوی خوارد، سەری خستە سەر کۆڵە پشتەکەی تاکو لەو شەوە کورتانەی بەهاردا، کەمێك پشوو بدات، چوونکە ئەو لە جەنگدا وەك هەریەکە لە سەربازەکانی خۆی بەو شتانەی لە کۆڵەپشتەکەیدا هەیبوو کاتی بەسەر دەبرد.

پاشان ئەسکەندەر ڕاکشا تا بخەوێت، بە وتەی یەکێك لەو بەردەستانەی ناوی (هەفاس تیۆن)ـە، کە لەگەڵیدا بوو، نەتەنیا خوداوەندی جوانی لە شاخی ئۆلۆمپی ماڵی خوداوەندیانی یۆنان بۆ بینینی ئەسکەندەر هاتە خوارێ، بگرە تەواوی خوداوەندیان، تەنانەت زێئۆسی خوداوەندی خوداوەندیانی یۆنان کە لە زمانی ڕۆمی بە (ژووپی تێر) ناسرابوو هاتن بۆ تەماشاکردنی ئەسکەندەر.

هەموو ئەو بابەتانەی باسی ئەسکەندەریان کردووە، لەلایەن هاوڕێیەکانییەوە بووە، کە هێندەی باسی جوانی سەرداری یۆنانیان کردووە، هێندە باسیان لە ئازایەتیی ئەو نەکردووە، ئەو شەوە بەوتەی کاسەلێسەکانی ئەسکەندەر تەواوی خوداوەندیان بۆ بینینی ئەو هاتبوونە خوارەوە کۆتایی هات و سپێدەی بەیان هات.

لەشکری هەخامەنشیی لە لای ڕاست، لەشکری یۆنان لە لای چەپی ڕووبارەکە بوون، بە وتەی ئاریستۆپۆلۆس لەشکری یۆنانی بۆ هێرشکردنە سەر لەشکری هەخامەنشیی لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، ئاوی ڕووبارەکە هێندە نەبوو، کە ڕێگر بێت لە پەڕینەوەی لەشکرەکە.

نۆڵدکەی ئەڵمانی دەڵێت لەشکری ئێران بۆ هێرشکردن بۆ سەر ئەسکەندەر لە ڕووباری گرانیك پەڕییەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی شەست و یەکەمی بەهاری ساڵی (٣٣٤ پ. ز) بوو، لەشکری هەخامەنشیی دوای پەڕینەوە لە ڕووبارەکە دەستیان بە هێرش کرد.

وەك نەریتی هەمیشەییان لەشکری هەخامەنشیی دابەش بوون بەسەر دوو شەڕگە، ناوەڕاست (دڵی لەشکر)، یەدەگیش هەبوو، لای چەپی ئێرانییەکان، یۆنانییەکان بوون کە لە نێوان دە بۆ پازدە هەزار کەس دەبوون، لەگەڵ دەستپێکی شەڕدا لای ڕاست و دڵی لەشکری هەخامەنشیی هێرشیان کرد، هەموو سەربازە یۆنانییەکانی لای چەپی لەشکری هەخامەنشیی خۆیان دایە پاڵ لەشکری یۆنان.

ئەو ناپاکییە بە تەواوەتی ئێرانییەکانی شەپرزە کرد، ڕوونە کاتێك لای چەپی لەشکرێك لەپڕ چۆڵ دەبێت، باری ئەو لەشکرە چۆن دەبێت. بەشێك لە بیست و نۆ هەزار سەربازە پیادە و چوار هەزار سەربازە سوارەکە، بە دە تا پازدە هەزار سەربازە یۆنانییەکەی لای چەپی لەشکری

ئێران بەهێز بوون، بە دەوری دڵ و لای ڕاستی لەشکری ئێراندا سووڕانەوە و گەمارۆی هەخامەنشییەکانیاندا.

تەنانەت یەك دێڕ لەبارەی ئەو جەنگە لە سەرچاوە ئێرانییەکاندا نییە، بە وتەی سەرچاوە یۆنانییەکان ئەو لەشکرەی هەخامەنشیی کە هاتبۆوە جەنگی ئەسکەندەر، پاڵپشت بە سەربازە یۆنانییەکان هاتبوون، بە چۆڵبوونی لای چەپی لەشکرەکەیان و دوای ئەوەی ئەو سەربازە بەکرێگیراوانە چوونە پاڵ لەشکری ئەسکەندەر، ورەی خۆیان دۆڕاند و هەوڵی هەڵاتنیاندا.

نابێت چاوەڕوان بین سەرچاوە یۆنانییەکان ستایشی ئێرانییەکان بکەن، سەرچاوەی ئێرانیش هیچیان لەو بارەوە نەنووسیوە کە نیشاندەری دیل بوونی بیست هەزار سەربازی هەخامەنشی بێت، چوونکە یۆنانییەکان وتوویانە لەو جەنگەدا دوو هەزار سەربازی هەخامەنشیی کوژران و بیست هەزاریش دیل کراون، زیانی ئەسکەندەر لەو جەنگەدا تەنیا شەست سەربازی پیادە و چل سەربازی سوارە بوو.

خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەو نووسینەی زانایەکی ئەڵمانی وەك نوڵدکە دووچاری سەرسووڕمان دەبێت، کە چۆن لە کاتی نووسینی ئەو ژمارانە وردبینی و بیرکردنەوەی نەبووە، لە ڕاستگۆیی و سپاردەیی ئەو پیاوە لە نووسینەوەی مێژوو بە گومان نین، هەروەها لەو هۆگرییە تایبەتییەی ئەو بەرانبەر بە ئێران هەیبووە پشتڕاستین، ئەو پەڕتووکەی ئەو بە ناوی (بنەمای زماننامسی ئێران) نووسیویەتی، دواتر بە ناوی (داستانی نەتەوەیی ئێران) چاپکراوە، دیارترین کارە کە سەبارەت بە شانامەی فیردەوسی نووسراوە، بەڵام ئەو زانایە بیری نەکردووەتەوە، کاتێك دوو هەزار ئێرانی دەکوژرێن، بە دڵنیاییەوە بەپێی جەنگەکانی ئەوکات ژمارەی بریندارەکان زۆرتر دەبێت، ئەی چۆن نەیانتوانی پتر لە شەست پیادە و چل سوارەی ئەسکەندەر بکوژن، بە دڵنیاییەوە ژمارەی کوژراوەکانی ئەسکەندەر زۆرتر بوونە.

دوای ئەوەی ئەسکەندەر سەرکەوت، بڕیاریدا بۆ ستایشی ئەو سەرکەوتنە جەژنێکی شادی مەزن بگێڕێت و قوربانی بۆ خوداوەندیانی یۆنان بکات و جەژنێکی وەرزشی گەورە لە شێوەی ئۆلۆمپیاد سازدا، کە تیایدا هەموو سەربازە وەرزشکارەکان بەشداربوون، بە فەرمانی ئەو سەری بیست هەزار دیلەکەیان بڕی، دوو سەد لە سەربازەکانی ئەسکەندەر بۆ سەربڕینی دیلەکان راسپێردران، هەریەکە لە ئەوان سەد کەسی بەر کەوت، بیست هەزار سەری بڕاویان بە سەر بیست هەزار نێزەوە کرد و نێزەکانیان لە زەوی چەقاند.

له ئۆلۆمپیادە وەرزشییەکان ئالآی ڕەنگاوڕەنگی زۆر لە زەوی دەچەقێندران، لە ئۆلەمپیادی ئەسکەندەر بیست هەزار سەری بڕاوی سەربازی ئێرانی کرایە ئالآ و سەربازانی ئەسکەندەر لە بەرانبەر ئەو سەرەبڕاوانە پێشبڕکێیان کرد، ئەسکەندەر خۆی دیسك و ڕمی هەڵدا، کە پێش بوونی بە پاشا ئەو لە هەردوو بواردا پاڵەوانەوە بوو.

دوای ئەو جەنگە و بەپێی هەندێ گێڕانەوە لە دوای دووەمین جەنگی لەشکری هەخامەنشیی لەگەڵ ئەسکەندەر واتە جەنگی ئیسۆس وەك دواتر باسی دەکەین، داریوشی سێیەم نامەیەکی بۆ ئەسکەندەر نووسی و تیایدا وتی: (ئەگەر تۆ لەگەڵ مندا ئاشتی بکەی، من تەواوی ولآتانی ئاسیای بچووك دەدەم بە تۆ، بەو شێوەیە پاشایەتییەکەم لەگەڵ تۆدا دەکەم بە دوو بەش، وێڕای ئەوەش کچەکەم دەکەمە هاوسەری تۆ)، بەلآم ئەسکەندەر وەڵامی دایەوە کە ئەوەی تۆ دەتەوێت بە منی دەدەی هی خۆمە، تۆ هیچت نییە کە بە منی بدەیت.

دوای جەنگی گرانیك بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان داریوشی سێیەم لە تەواوی ولآتانی ژێردەستی ئێران کە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشییان پێکدەهێنا داوای سەربازی کرد، لە دوورترین شوێنەکانی ئەو ئیمپراتۆرییەتە واتە لە سێند و خوارەزم و بەڵخ تاکو ولآتە نێزیکەکان، سەربازی پیادە و سوارە هاتن، کۆی ئەوان شەش سەد هەزار سەربازی پیادە و سوارە بوو، کە لە شوێنە جیاکانی ئێران جێگیر بوون تاکو بۆ جەنگی ئەسکەندەر بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆن.

ئەو ژمارەیەش وەك ژمارەی کوژراوانی جەنگی گرانیك ڕاست نییە، مێژوونووسە یۆنانییەکان بۆ گەورەکردنی سەرکەوتنی ئەسکەندەر بەسەر داریوشی سێیەمدا لە جەنگی ئیسۆس ژمارەی شەش سەد هەزار سەربازیان خستۆتەڕوو، مەودای نێوان کاتی جەنگی گرانیك و ئیسۆس نیشان دەدات، کە داریوش کاتی بۆ کۆکردنەوەی لەشکرێکی ئاوا گەورە نەبووە، بەلآم ئەسکەندەر دوای جەنگی گرانیك و ئاهەنگی شادی سەرکەوتن، بە لەشکرەکەیەوە بەرەو ساردی پایتەختی لیدی ڕۆیشت، لە ڕێگەدا هەر ئێرانییەکی بینی، کوشتی و ژن و پیاوانی گەنجی ئێرانی بەخشییە سەربازەکانی تاکو وەك کۆیلە بیانفرۆشن.

ئەسکەندەر و لەشکرەکەی ترسێکی گەورەیان لای خەڵکەکە چێ کردبوو، کاتێك گەیشتە سێ فەرسەنگی (١٨ کم) شاری سارد، بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان فەرمانڕەوای شارەکە

چۆوە پێشوازی ئەسکەندەر و وتی: (شاری سارد خۆی بەدەستەوە دەدات، هەرچی لە زێڕ و پارە لە گەنجینەی شاردا هەیە دەبێتە هی ئەسکەندەر).

ئەسکەندەر پێش ئەوەی شاری سارد خۆی بەدەستەوە بدات، دەیویست وێرانی بکات و بیسوتێنێت، بەڵام بە هۆی خۆبەدەستەوە دانی فەرمانڕەوای شار لە سووتاندن و وێرانکردنی ئەو شارە چاوپۆشی کرد و ژن و کوڕانی گەنجی بە سەربازەکانی خۆی بەخشی تاکو وەك کۆیلە بیانفرۆشن، بەو هۆکارە نرخی کۆیلە لە وڵاتی کیلیکی کە یەك لە وڵاتانی ئاسیای بچووك بوو، گەیشتە تەنیا سەد درهەمی یۆنانی ،کە دەیکردە کرێی کرێکارێکی ئاسایی لە ماوەی دە رۆژ کارکردندا.

لە وەرزی زستاندا ئەسکەندەر تەواوی وڵاتانی ئاسیای بچووکی داگیرکرد، سەرما و بەفری زستان نەیان توانی رێگر بن لەو داگیرکارییە، چوونکە لە هیچ شوێنێك ڕووبەڕووی بەرگری سەخت نەبوو.

لە دواکۆتایی وڵاتی کلیکی لە ئاسیای بچووك شارێك بە ناوی ئیسۆس هەبوو، کە ئێستە پاشماوەی وێرانەکانی لە نێزیك ئەدەنە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیایە.

ئەو ناوچەیە زۆر جاران دەبوو بە مەیدانی جەنگ، بەڵام هیچ یەکێك لەو جەنگانەی ڕوویاندا وەك ئەو جەنگەی داریوشی سێیەم و ئەسکەندەر ناوبانگیان دەرنەکرد، بۆیە لە کاتی ناوهێنانی ئەو شوێنە، ئەوانەی ئاگەدارن، تەنیا سێیەمین جەنگی داریوشی یاخۆ دارای سێیەم دوایین پاشای هەخامەنشییان دێتەوە بیر.

هۆکاری ڕوودانی ئەو هەموو جەنگانە لە ناوچەی ئیسۆس ئەوەبوو، کە هەر هێرشبەرێك ویستبای لە ئاسیای بچووك بەرەو رۆژهەڵات بڕوات، دەبووایە لەو ناوچەیە تێپەڕ بێت، ئەگەر لەوێوە نەڕۆیشتبایە، ناچار دەبوو زۆر بەرەو باکور بڕوات تاکو بتوانێت لە رێگەیەك بڕوات و خۆی بگەیەنێتە رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك، چوونکە شاخەکانی تۆرۆس لە رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك رێگەی رۆیشتنی هێرشبەرانیان لە رۆژئاوا بۆ رۆژهەڵات یاخۆ بە پێچەوانەوە گرتبوو، ئەوان نەیاندەتوانی لەو زنجیرە شاخانە تێپەڕ بن، تەنیا لەو رێگە تایبەتانە نەبووایە، کە لە باشووری کلیکی بوون، تاکە رێگەش ئەو رێگەیە بوو، کە لە باشوور بەرەو رۆژهەڵات دەڕۆیشت و رێگەی ئیسۆس بوو، لە لایەکی ئەو رێگەیە و لە باکورییەوە شاخ هەبوو، لە لاکەی

دیکەی لە باشوور دەریا هەبوو، پانتایی ئەو ڕێگەیە وەك مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە بە پێوەری ئەمڕۆ دوو کیلۆمەتر و نیو بووە.

بە وتەی یۆنانییەکان لە سێیەم ڕۆژی وەرزی هاوینی ساڵی (٣٢٣ پ. ز) شەش سەد هەزار سەربازی داریوشی سێیەم چاوەڕوانی ڕێگرتن لە لەشکری ئەسکەندەر بوون، لەو ڕێگەیە، ئەو گێڕانەوەیە لەگەڵ ئەقڵ و بەرژەوەندیی جەنگدا کۆك نییە، چوونکە ئەگەر داریوش شەش سەد هەزار سەربازی هەبایە بۆ بە درێژایی هاوین لەو ڕێگەیە چاوەڕوانی ئەسکەندەر دەبوو، بۆچی خۆی لەو ڕێگەیە نەپڕییەوە بەرەو ڕووی لەشکری ئەسکەندەر نەڕۆیشت تا لەنێوی ببات؟.

فەرماندەیەك کە شەش سەد هەزار سەربازی هەبێت، دەبێت شێت بێت، کە تەواوی وەرزی هاوین لە ڕێگەیەکدا چاوەڕوانی پەڕینەوەی دوژمن بێت و تێچووی قورس و پشت شکێنی شەش سەد هەزار سەرباز بە ئەستۆ بگرێت و خۆی بەرەو دوژمن نەڕوات، لە کاتێکدا دوژمنەکەی پتر لە بیست و نۆ هەزار سەربازی پیادە و چوار هەزار سەربازی سوارەی نەبوو.

خوالێخۆش بوو (کازم خانی سیاح) کە ماوەیەك مامۆستای زانکۆ بوو، بە هۆی ئەو گێڕانەوە دوور لە ئەقڵەوە، تەنانەت گومانی لە ڕوودانی جەنگی ئیسۆس هەبوو و دەیوت: لەوانەیە ڕوودانی ئەو جەنگە لە ساختەکارییەکانی یۆنانییەکان بێت، بەڵام ئەگەر گومان لە بوونی ئەو جەنگەش بکەن، گومان لە شکستی داریوشی سێیەم ناکرێت، چوونکە ئەو شکستە لە بەڵگە ڕۆژهەڵاتی و فارسییەکانی وەك شانامەدا هەیە، زانراوە کە فیردەوسی بۆ نووسینی شانامە سوودی لە سەرچاوە یۆنانییەکان وەرنەگرتووە، سەرچاوەکانی تەنیا پەڕتووکە ڕۆژهەڵاتییەکان بوون.

پرۆفیسۆر بارت مامۆستای مێژوو لە زانکۆی گلاسکۆ باوەڕی وایە هۆکاری دواکەوتنی جەنگ لەلایەن داریوشی سێیەم بۆ مانگی دووەمی پایز، دواکەوتنی ئامادەکردنی لەشکر بوو، ماوەیەکی پێچوو تا داریوش توانی بۆ جەنگی ئەسکەندەر لەشکر ڕێك بخات و بیباتە ئاسیای بچووك، بۆیە وەرزی هاوین ڕۆیشت و پایز هات، بەڵام لە دووی نۆڤامبەری ساڵی(٣٣٣ پ. ز) جەنگ لە نێوان ئەسکەندەر و داریوشی سێیەم لە ناوچەی ئیسۆس ڕوویدا، هەوا هێندە سارد نەبوو، کە سەربازەکان هەراسان و ناڕەحەت بکات و ڕێگر بێت بۆ جەنگ، بۆیە شکستی داریوشی سێیەم بە دەست ئەسکەندەر هۆکاری دیکەی لە پشتەوە بوو، جگە لە سەرماوسۆڵە.

هەرچەندە لە شانامەدا شکستی داریوش بە دەست ئەسکەندەر هەیە، بەڵام ڕەوشی جەنگ و ناوەکان بوونیان نییە، بۆ تێگەیشتن لە جەنگی ئیسۆس، دیسان جگە لە پەنابردنە بەر سەرچاوە یۆنانییەکان، هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نییە.

بەپێی نووسینی ئەوان لەشکری داریوشی سێیەم پێکهاتەیەك بوو لە نەتەوە و ڕەچەڵەکە جیاکان بە جلوبەرگی درێژ و کورت و ڕەنگە جیاکان و بە شێوازی جیای سەر و ریش تاشین لە ئاسیای ناوەند و هیندی و خوارەزم، سەربازانی خوارەزم سمێڵی گەورە و شۆڕیان هەبوو، کە هی هەندێکیان دەگەیشتە سەر سینگیان، سەربازانی توران پرچی درێژیان هەبوو، دەگەیشتە سەر پشتیان، سەربازانی ڕەشپێست نیزەی درێژیان هەبوو، پێڵاویان نەدەکردە پێیان، سەربازە سکاکان هێندە باڵابەرز بوون، کە ئەوانی دیکە لەکاتی دوان لەگەڵیاندا دەبووایە سەریان هێندە بڵند بکەن کە وەك ئەوەی چاو لە بەشی سەرەوەی دارێك بکەن.

بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو لەشکرە شەش سەد هەزار کەسییە کە لە هەموو ئەو نەتەوانە پێکهاتبوون، کە لە سنووری ئیمپراتۆری هەخامەنشیی دەژیان، بەهای جەنگیان نەبوو، پانی ڕێگەی ئیسۆس لە شاخەوە لە باکور تا دەگەیشتە دەریا لە باشوور، تەنیا (٢٥٠٠) مەتر بوو، مێژوونووسە یۆنانییەکان درێژیەکەیان بە سی ئەستاد نووسیوە، کە بە پێوەری ئێستە دەکاتە شەش کیلۆمەتر، داریوشی سێیەم دوای ئەوەی تەواوی وەرزی هاوینی لە چاوەڕوانی ئەسکەندەر مایەوە، لە ڕۆژی دووی نۆڤامبەری ساڵی (٣٣٣ پ. ز) ئەو هەموو لەشکرەی لەو ناوچە سنووردارە جێگیر کرد، کۆکردنەوەی شەش سەد هەزار سەربازی پیادە و سوارە لە ناوچەیەك بە پانی (٢٥٠٠ م) و درێژی (٦٠٠٠) مەتر، ئەستەمە، سەربازان لەو ناوچەیە وەك ماسی ساردین لە قووتودا دەکەونە سەر یەك و توانای جووڵەیان نابێت، لە جەنگدا سەربازەکان پێویستە لە ڕیزەکانیاندا لەگەڵ دوژمن بجەنگن و توانای جووڵەیان هەبێت.

خوالێخۆشبوو کازم سیاح کە ئەفسەرە و پێی وایە کۆکردنەوەی شەش سەد هەزار سەرباز لە ناوچەیەکی ئاوا بەرتەسك بە ئەستەم دەزانێت و دەڵێت: ئەگەر داریوشی سێیەم شەش سەد هەزار سەربازی لە ناوچەیەکی ئاوا بەرتەسك کۆدەکردەوە، ئەستەم بوو ئەسکەندەر بتوانێت لە ئیسۆس بپەڕێتەوە، چوونکە ڕیزی ئەستووری سەربازەکان وەك بەربەستێکی گەورە پێش ئەوی دەگرت.

ئەوەی یۆنانییەکان نووسیویانە دوای باسی دەکەین، کە لەگەڵ ئەقڵدا ناگونجێت و مرۆڤ ناتوانێت پەسەندی بکات، کە شەش سەد هەزار سەرباز ئەوانیش وەك سەربازانی خەڵکی نۆبە کە بنی پێیان وەك شاخ سەخت بوو،کە درکی بیابان و بەردی نووك تیژی تێ نەدەچەقی، سەربازە باڵابەرزەکانی سکاکە هێشتا وێنەی باڵای ئەوان لە رۆژهەڵاتی ئێران هەیە، نەتوانن لە بەرانبەر سی و سێ هەزار سەربازی ئەسکەندەر کە تەنیا چوار هەزاریان سوارە بوون، بەرگری بکەن، بەڵام ناتوانین ئەوە رەت بکەینەوە کە لەشکری داریوشی سێیەم بەهای جەنگی لەشکرەکانی پێشووی هەخامەنشیی نەبووە، کە جەنگە درێژەکان و براکوژییەکان ئەو بابەتانەی لەنێوبرد، کە مەرجی بەهێزی وڵات بوون. ئەگەر لەشکری داریوش بەهای جەنگی لەشکرەکانی پێشووی هەبووایە، لە سێ جەنگ لە بەرانبەر ئەسکەندەر شکستی نەدەخوارد، بە دڵنیاییەوە لە دووەمین و سێیەمین جەنگ دا داریوش بۆ خۆی بەشدار بووە.

ئاریستۆپۆڵۆس یەکێك لەو یۆنانییانە بوو، کە لەگەڵ ئەسکەندەر رۆیشتە ئێران و ئێسترابوونی جوگرافی زان، هەندێ لە بەشەکانی پەرتووکەکەی گێڕاوەتەوە، وتوویەتی هەندێ لە سەربازانی هەخامەنشیی هەڵنەدەهاتن تاکو مردن بەرگریان دەکرد، بەڵام زۆرینەی سەربازەکان هەڵدەهاتن و رێگە بۆ تێپەڕبوونی ئەسکەندەر کرایەوە، باری جەنگ بەپێی گێڕانەوەی ئاریستۆپۆڵوس کە خۆی لە مەیدانی جەنگ بووە، بەم شێوەیە بووە: (بەرەبەیان ئەوکاتەی سەربازەکان لە خەو ڕابوون بۆ جەنگ ئامادەبوون، بینیان کە ئاسمان هەورە و نەختێك ساردە. ئەسکەندەر لە کاتێکدا کە بەرگی یەکگرتووی هۆپ لیتەکانی لەبەر بوو، سواری ئەسپە ناسراوەکەی خۆی بوو. ئەو شمشێرەکەی لە کالان دانابوو، تۆبزێکی بە دەستەوە بوو، هەندێ کات بەو تۆبزە هێمای بۆ بەشەکانی لەشکرەکەی دەکرد و فەرمانی دەردەکرد.

من (واتە ئاریستۆپۆڵۆس) لە بینینی لەشکری لە ئەندازە بەدەری هەخامەنشیی کە جلوبەرگی رەنگاوڕەنگیان لەبەر بوو، ترسم لێ نیشت و بیرم کردەوە کە ناتوانین بەسەر ئەو سەربازانەدا سەرکەوتوو ببین، بەڵام ئەسکەندەر بە ئەفسەرەکانی وت لە زۆری لەشکرەکە مەترسن، هەر کە ئێوە هێرشتان دەست پێکرد، ئەوان وەك پۆلە چۆلەکەکان هەڵدەفڕن، ئەو کات بە هێرشی لای ڕاستی ئێمە کە هەموویان هۆپ لیت بوون دەستی پێکرد، سەربازەکانی ئێمە بە درێژایی کەنارەکانی ئاو دەجووڵان، هەرکە هێرشی ئێمە دەستی پێکرد، من بە خۆشحاڵیەوە بینیم کە سەربازانی دوژمن پاشەکشە دەکەن و هەوڵ دەدەن خۆیان لە شمشێری

سەربازانی هۆپ لیتی ئێمە بپارێزن، بەڵام هەندێك لە ئەوان بەرگریان دەكرد و شمشێری سەربازەكانمان ئەوانیان دەخستە سەر زەوی.

كاتێك سەربازانی لای ڕاستی ئێمە تۆزێك جووڵان، سەربازانی لای چەپی ئێمە كەوتنە جووڵە و هێرشیان بردەسەر هەخامەنشییەكان، ئەوكات دڵی لەشكرەكەمان كە سوارە و پیادە بوون، كەوتنە جووڵە و سوارەكان لە پێشەوە و پیادەكان لە دوویانەوە دەڕۆیشتن، من بینیم كە لە هەموو لایەك هەخامەنشییەكان لە كشانەوەدان و خۆیان لە سەربازانی پیادە و سوارەمان بە دوور دەگرن، من لەگەڵ خۆمدا وتم سەربازانی هەخامەنشیی دەیانەوێت فێڵمان لێ بكەن و مەبەستییانە سەربازەكانمان بخەنە دوای خۆیان و دوای پەڕینەوەیان لە ئیسۆس لە ناوچەیەكی بە پانتایی لەگەڵماندا بجەنگن، تا سەربازەكانمان پتر دەڕۆیشتن بۆ پێشەوە، منیش پتر دەڕۆیشتم بۆ پێشەوە، تاكو ئەوەی كە تەواوی ڕێگەكەی ئیسۆسم بڕی، ناوچەیەكی پانوبەرین بەرچاوم كەوت، بینیم دیسان ئێرانییەكان سەرگەرمی پاشەكشەن. لای چەپی ئێمە تەریب بە شاخەكە دەجووڵان، دوای ئەوەی گەیشتنە ناوچەی بەرین، توانیان هەندێك لە سەربازە هەخامەنشییەكان گەمارۆ بدەن، من بینیم كە دوو گالیسكە لە گەمارۆكە رزگار بوون و بلەز بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتن، دواتر زانیم داریوشی سێیەم لە یەك لە گالیسكەكاندا بوو).

ئەریستۆپۆڵۆس بەردەوام دەبێت و دەبێژێت: (تەنانەت دوای ئەوەی زانیمان كە یەكێك لەو دوو گالیسكەكە داریوشی تێدابووە، نەماندەتوانی باوەڕ بكەین ئێرانییەكان بەكردەنی مەیدانی جەنگیان بەجێ هێشتووە، بگرە بە خۆمم دەوت بە رواڵەت ئەوان هەڵدێن بۆ ئەوەی بكەونە پشت ئێمە و لەپڕ هێرش دەكەنە سەرمان و لەنێومان دەبەن، چوونكە ئەقڵم ئەوەی پەسەند نەدەكرد، كە شەش سەد هەزار سەرباز بە هۆی هێرشبردنی لای راستی ئێمە، هەڵاتنیان لە مانەوە پێ باشتر بووبێت، دوای ئەوەی جەنگ بە سەركەوتنی ئێمە كۆتایی هات، ئێمە سەرەنجماندا هۆكاری ئەوەی هەخامەنشییەكان نەیانتوانی بەرگری بكەن، ئەوە بووە كە ئەو شوێنەی لەشكری داریوشی لێ بوو هێندە پانتایی كەم بوو، كە ریزی سەربازە هەخامەنشییەكان نەیاندەتوانی تیایدا بجوولێن).

نووسینی هەریەكە لە هاوڕێكانی ئەسكەندەر دەخوێنینەوە هەموویان هۆكاری شكستی داریوشی سێیەم لە جەنگی ئیسۆس تەنگی جێگەكە بووە و پانتایی نێوان شاخ و دەریا هێندە نەبووە، كە ئەوان بە باشی سوود لە گۆڕەپانەكە وەربگرن و ریزەكانی لەشكرەكە بە توندی رێگر بوونە لە یەكدی، بەڵام

لای راستی لەشکری یۆنان کە هەموویان سەربازانی هۆپ لیت بوون و چەکی قورسیان لابوو، توانیان بە ناوەڕاستی ئەو هەموو سەربازە هەخامەنشییەدا کە توانای جووڵەیان نەبوو، بە ئاراستەی دەریا ڕێگە بۆ خۆیان بکەنەوە و لەشکری هەخامەنشیی پاشەکشە پێ بکەن.

پتر لە (٢٣٠٠) ساڵ بەسەر جەنگی ئیسۆسدا دەڕوات، لەوانەیە ڕادەربڕین لەمەڕ ئەو جەنگە لە دەرەوەی گێڕانەوەی مێژوونووسانی ڕابردوو ئەستەمە، بەڵام هەموو ڕووداوێکی جەنگ یاخۆ ناجەنگ خودان بنەمایەکە کە بەپێی ئەوان دەتوانرێت بزانین ئەوەی وتراوە ڕاستە یاخۆ نا، ئەگەر ئەسکەندەر توانی تەنیا بە بەکارخستنی لای راستی لەشکرەکەی، لەشکرێکی شەش سەد هەزار کەسی تێك بشکێنێت، ئەی بۆچی بەدووی ئەو لەشکرە هەڵاتووە نەکەوت و ڕاستەوخۆ بەرەو ئێران نەڕۆیشت، تا پاشایەتیی داریوش لەنێو ببات، بۆچی بە کەنارەکانی مەدیتەرانە بەرەو میسر رۆیشت و خۆی گەیاندە ئەو وڵاتە؟.

ئەو سەردارەی بە وتەی خۆی توانیویەتی لەشکرێکی شەش سەد هەزار کەسی شکست بدات، بە بیست و نۆ هەزار سەربازی پیادە و چوار هەزار سەربازی سوارە، کە هەموویانی نەخستبێتە نێو جەنگەوە، ئیدی لە چی ترساوە؟، ئەو دەیتوانی دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیە بە رێپێوانێکی ڕاستەوخۆ و خێرا خۆی بگەیەنێتە نێو ئێران، ناچار نەدەبوو لە جیاتی رۆیشتن بەرەو شوێنی مەبەست، ڕێگەی باشوور بگرێتەبەر و خۆی بگەیەنێتە میسر. بە ناچاری دەبێت بگوترێت ئەسکەندەر وێڕای ئەوەی لە یەکەمین جەنگ واتە جەنگی گرانیك لەشکری هەخامەنشیی شکاند، بەڵام لە دووەمین جەنگدا لەشکری هەخامەنشیی ترسا[٥].

پرۆفیسۆر بارت دەڵێت: لە جەنگی ئیسۆس ئەسکەندەر هێندەی لێ کوژرا، کە نەیوێرا بەرەو ئێران بڕوات. ئەو وتەیە لە ڕووی ئەقڵەوە مایەی پەسەند بوونە، بە تایبەت کە لە دواین جەنگ کە ئەسکەندەر لە دژی داریوشی سێیەم بەرپای کرد، ژمارەی سەربازە یۆنانییەکانی زۆر کەم بوون.

ئاریستۆپۆلۆس نووسیویەتی لە جەنگی ئیسۆس ژن و کوڕ و دایکی داریوشی سێیەم بە دیل گیران و بردرانە لای ئەسکەندەر.

---

(٥) زۆری بەکارهێنانی وشە ساردەکان بەرانبەر یۆنانییەکان لە هەستی زەبیحوڵڵا هاتووە، دیارە وەك چۆن یۆنانییەکان بە کینە لە دڵ بەرانبەر بە ئێران ناودەبات، خۆشی لە جیاتی پێشینان کینەی ئەوانی هەڵگرتووە و تۆڵەی ڕووداوە مێژووییەکان لە نووسینەوەی مێژوو دەکاتەوە. "وەرگێڕی کوردی"

بارت مامۆستای مێژووی یۆنان لە زانکۆی گلاسکۆ ئەو وتەیە بە راست نازانێت و دەڵێت پاشاکانی هەخامەنشیی ژن و منداڵ و دایکیان نەدەهێنا بۆ جەنگ، ئەوان لە ناوچەکانی دووره ئێران دیل کران، نەك لە جەنگی ئیسۆس، ئەوەش دوای دوایین جەنگی داریوشی سێیەم و ئەسکەندەر بوو نەك لە جەنگی ئیسۆس(٦).

ئەسکەندەر کە بەرانبەر بە ئێرانییەکان زۆر کینەی هەبوو، دوای جەنگی ئیسۆس ڕکوکینەی پتر بوو، چوونکە نەیوێرا راستەوخۆ بەرەو ئێران بڕوات، دەستی کرد بە داگیرکردنی شاره کەنارییەکانی دەریای فنیقییە، کە بەشێك بوون لە ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی. دانیشتووانی شاری (سەیدۆن) بەرانبەر ئێران ئەمەکدار بوون و سەرسەختانە بەرگریان کرد، ئەسکەندەریش ناچار بوو ئەو شاره گەمارۆ بدات.

سەیدۆن لە کەناری دەریا بوو، ئەسکەندەر لە رێگەی وشکانی و دەریاوە ئەو شارەی گەمارۆدا، دوای حەوت مانگ توانی سەربازەکانی بباتە نێو شارەکە. ئەو پیاوە خوێنڕێژە هەموو پیاوانی ئەو شارەی لە هەردوولای شەقامەکان هەڵواسی، ئەوانی ناچار کرد زەوی هەڵکەنن و دارەکانی هەڵواسین بە دەست خۆیان داکوتن، هەر بەو ئەستوونە دارانەوە، کە خۆیان دایان کوتابوو، هەڵیدەواسین.

بە هەمان شێوە کە لە سەردەمی ئێستە بۆ ڕووناکی لە دوولای شەقامەکان گلۆپی ڕووناکی دەبینرێت، لە شاری سەیدۆنیش مرۆڤە هەڵواسراوەکان دەبینران. هەموو ژن و منداڵانی ئەو شارەی وەك کۆیلە فرۆشت، ئەو رۆژەی ئەسکەندەر ئەو بەندەرەی بەجێ هێشت، تەنانەت یەك مرۆڤی لێ نەمابوو، تەرمە هەڵواسراوەکان هێندە مانەوە تا بۆگەن بوون و ڕزین.

---

(٦) لەوانەیە ئەو رایە بە لای خۆیانەوە ڕاست بێت، کە ئەسکەندەر لە ترسان بەرەو ناوەندی ئێران نەڕۆیشتووە، بەڵام لە لایەکی دیکە هیچ سەرکردەیەکی دانا ئامادە نییە لەشکرێکی بچووك و ماندوو، هەرچەندە بە تواناش بێت بباتە نا دڵی دوژمن، پێش ئەوەی لە پەلوپۆی نەخات و سەرچاوەکانی یارمەتیدانی پەك نەخات، دیارە ئەسکەندەر لە روانگەی پەك خستنی هەخامەنشییەکان لە کەنارەکانی مەدیتەرانە و میسر بەرەو ئەو شوێنانە رۆیشتووە، زانیویەتی ئەو شوێنانە هەم سەرچاوەی مرۆیی، هەمیش سەرچاوەی دارایی باشن بۆ ئەو کەسەی بە دەستییەوە بن، بۆیە خستوویەتییە بەردەستی خۆی تاکو لە لایەك هەخامەنشییەکان لاواز و لە لایەکی دیکە خۆی بەهێز بکات. "وەرگێڕی کوردی"

پارمەنیۆن یەکێکە لە هاوڕێکانی ئەسکەندەر دەڵێت:"کاتێك کوشتاری شاری سەیدۆن لەلایەن ئەسکەندەر گەیشتە داریوشی سێیەم، نامەیەکی بۆ نووسی و وتی تۆ لە یۆنانی بێشکەی فەیلەسووفانەوە هاتووی، بۆچی ئەو تاوانانەت ئەنجام داوە؟"

ئەسکەندەر بە ئەو کەسەی وت کە نامەکەی هێنابوو: "بڕۆ بە داریوش بڵێ، کە ئەو نامەیەت بە شێوەیەك نووسیوە، کە هاوشانی منی، ئەگەر دەتەوێت نامەکەت وەڵام بدەمەوە، دەبێت بە شێوەیەك بینووسی کە کۆیلەیەك بۆ خاوەنەکەی دەینووسێت".

تاوان و کارەساتەکانی ئەسکەندەر ئەنجامی دان، هێندە بڵاوبوون کاتێك ئەسکەندەر گەیشتە میسر، ئەوان لە ترسان هیچ بەرگریان نەکرد و خۆیان بە دەستەوەدا.

# لە گۆگمەل تا بابل

ئەو رۆژەی ئەسکەندەر گەیشتە میسر ئەو شارەی ئێستە بە ئەسکەندەرییە ناسراوە، لەو وڵاتەدا بە ناوی (راکۆتیس) ناسرا بوو. ئاریستۆپۆلۆس کە وەك سێبەر لە دووی ئەسکەندەر دەڕۆیشت باسی ئەو شارە دەکات، پێش ئەوەی ببێتە ئەسکەندەرییە، بە شێوەیەك کە ئەو دەڵێت ئەسکەندەرییە شارێك بوو لە کەناری دەریای مەدیتەرانە لە تەنیشت کەنارەکان، لە رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا درێژ ببۆوە، لەو شارەدا چەند شوێنێکی ناسراو هەبووە، کە یەکێکیان گەڕەکی جوولەکانە لە باکوری رۆژهەڵاتی شار، دانیشتووانی ئەو گەڕەکە نەوەی ئەو جوولەکانە بوون، کە بە هاندانی کوروش هاتبوونە میسر و لەوێندەر نیشتەجێ بوون، بەپێی هەندێ لە گێڕانەوەکان، ئەوانە پاشماوەی ئەو جوولەکانە بوون کە نەیانەویست لەگەڵ موسا لە میسر بڕۆن.

دووەم بەشی ناسراوی ئەسکەندەرییە ناوچەی کات بەسەربردنی ئەو شارە بوو، کە تیایدا لە سەردەمانی کۆنەوە هەندێ ماڵ هەبوون کە لەنێویاندا ژنە جوانەکان پێشوازییان لە خوازیارەکانیان دەکرد، هەندێك کەس کار و پیشەیان دۆزینەوەی ژنی جوان بوو بۆ خانەدان و دەوڵەمەندەکان، لە تەواوی دنیاوە بۆ رابواردن دەچوونە ئەو گەڕەکەی شاری ئەسکەندەرییە، ئەو گەڕەکە تا ئەو رۆژەی فیرعەونەکان لە میسر بوون، سەرچاوەی باش بوو بۆ داهاتی ئەوان، بەو پێیەی لە نێوەندی شار بوو، لە دەرەوەی ئەو گەڕەکەش دانیشتووانی رەسەنی شارەکە نیشتەجێ بوون، لەو گەڕەکە گەورەیەی دانیشتووانە رەسەنەکان بۆ لای رۆژئاواش، گۆڕستانی عاشقان هەبوو، کە گۆڕی عاشقە هەژارەکان بوو.

هەندێ لە دەوڵەمەندانیش، کە دەهاتنە ئەو شارە بۆ رابواردن، دوای ئەوەی هەموو داهاتیان لەو گەڕەکە خەرج دەکرد و مایە پووچ دەبوون، ئەگەر لە نیشتمانی خۆیان پارەیان نەبووایە، ڕووی ئەوەیان نەبوو جارێکی دیکە بۆ وڵاتەکانیان بگەڕێنەوە، ئاکینجبوونیش لەو شارە بە هۆی نەبوونی پارەوە بۆ ئەوان نەدەشیا، بۆیە خۆیان دەکوشت و لاشەکانیان بەبێ ڕێوڕەسمی ئاسایی و نەریتی ئەوان واتە بێ مۆمیایی کردن، لە گۆڕستانی عاشقان دەنێژران.

ئەسکەندەرییە پێش هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئەو شارە بە لاسایی شاری رۆم دروست کرابوو، ئەو شارە تەلاری بەرزی لێ بوو. ئەو تەلارە بەرزانەیان بۆ جوانی چێ نەکردبوو، پێویستیی ببوو هۆی دروست کردنیان، چوونکە دانیشتووانی شارەکە رۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی دانیشتووانی زیاد دەبوو، شوێنی شارەکە لە نێوان دەریای مەدیتەرانە لە باکور و دەریاچەی مارەیۆنیس لە باشوور بەشی نیشتەجێ بوونی دانیشتووانی ئەو شارەی نەدەکرد، بۆیە خاوەن سەرمایەکان، وەك شاری رۆم تەلاری بەرز و چەند نهۆمیان تێدا دروست کردبوو، تاکو بە کرێیان بدەن، کۆڵانەکانی ئەسکەندەرییە تەنگ و باریك بوون.

لە نێوان هاوڕێکانی ئەسکەندەردا ئەندازیارێك بە ناوی (دی نۆکرات) هەبوو، کە زۆر هۆگری ئەسکەندەر بوو، کاتێك بیستی ئەسکەندەر مردووە، خۆی کوشت. ئەوانەی ئەندازیارن یاخۆ دەیانەوێت ببنە ئەندازیار دەبێت ناوی دی نۆکرات بزانن، نەزانینی ئەو ناوە لەلایەن ئەندازیارێکەوە وەك ئەوە وایە کە قەشەیەك ناوی حەزرەتی عیسا نەزانێت و نەیناسێت.

دی نۆکرات سێ کاری گەورەی بە ئەنجام گەیاند، یەکەمیان تەلاری پەرستگەی دیانا لە یۆنان بوو، تا ئێستە وێرانەکانی ماون، دووەمیان بیناکردنی شاری ئەسکەندەرییە بوو، بەڵام بەو نەخشەسازییەی دی نۆکرات کردبووی نەماوە وەك خۆی نەمایەوە، سێیەمیان دروستکردنی پەیکەرێك بۆ ئەسکەندەر لە شاری ئەفەسۆس بە بەرزی هەزار مەتر.

ئەو دەیەویست تەواوی شاخەکە داتاشێت تا پەیکەری ئەسکەندەر لە شاخەکەدا چێ بکات، بۆ ئەوەی هەردەم ئەو پەیکەرە بمێنێتەوە، بەڵام ئەو کارە نەگەیشتە ئاکام، کاتێك دی نۆکرات دەستی بەوکارە کرد، هەواڵی مردنی ئەسکەندەری پێ گەیشت و لە داخان و لەبەر بێ ئۆمێدی لە دامێنی شاخەکە بە چەقۆ قوڕگی خۆی هەڵبڕی و خۆی کوشت.

شاری ئەسکەندەرییە بە فەرمانی ئەسکەندەر و لەسەر نەخشەی دی نۆکرات بیناکرا، ئەو ئەندازیارە لەو شارە شەقامەکانی بە پانی نیو ئەستاد، واتە سەد مەتر دروست کرد، تەنانەت لە سەردەمی ئێستەشدا کە لە شارە گەورەکان شەقامی پان دروست دەکرێت، ئەو پانییەی ئەو شەقامانە جێگەی سەرسووڕمانن.

یەکێك لەو دامەزراوە گەورانەی دی نۆکرات لەو شارە بینای کرد پەڕتووکخانە بوو، کە هێندە گەورە بوو کە ناوی پەڕتووکخانە بۆوە ناوی هەمیشەیی، پێویست نەبوو بوترێت (پەرتووکخانەی ئەسکەندەرییە) لە هەر شوێنێکی جیهان کاتێك خوێندەوارێك دەیوت

پەڕتووکخانە، خوێندەواران دەیانزانی مەبەست لە پەڕتووکخانەی ئەسکەندەرییە، بەڵام ئەوێ تەنیا پەرتووڕکخانە نەبوو، زانکۆیەکی گەورە بوو، کە تیایدا تەنیا پەڕتووك نەدەخوێندرا، بگرە وانەی لێ دەوترایەوە و پەڕتووکی لێ دەنووسرا و چێشتخانە و ئارایشگە و گەرماوی تێدا بوو.

لە سەردەمی پاشایەتیی (بەتاڵسە) کە جێنشینەکانی ئەسکەندەر بوون لە میسر، شەقامە پانەکان لە پێناو چاوچنۆکی و بۆ بەردەستخستنی زەوی تەنگ کرانەوە، بەڵام گرینگی و بایەخی پەڕتووکخانەکەیان پتر کرد، ئەو پەڕتووکخانەیە لە جیهانی کۆن بوو بە ناوەندی زانست، لە ڕۆژهەڵات بە قوتابخانەی ئەسکەندەرییە ناسرا، ماوەی هەزار ساڵ بە ناوەندی زانست مایەوە، هەندێ زانا لەوێندەر پەروەردەبوون، کە ئێستەش ناوبانگیان هەیە، ئەو پەڕتووکخانەیە بە هۆی ئاگرکەوتنەوە سووتا و لەنێوچوو.

ئەسکەندەرییە یەکەم شار بوو، کە لەلایەن ئەسکەندەرەوە بویناد نرا، دواتر ئەو بە لاساییکردنەوەی کورووش دەگەیشتە هەر شوێنێك، شارێکی بە ناوی خۆی دروست دەکرد، لە هەندێ شوێن ناوی شارەکانی دەگۆڕی و ناوی خۆی لەسەر دادەنا، بۆیە هەموو ئەو شارانەی بە ناوی ئەسکەندەرییە لە میسر تا کەنارەکانی ڕووباری سێند هەبوون، هەموویان لەلایەن ئەو چێ نەکراون.

ئەسکەندەر و سەربازەکانی نەریتێکی نەخوزراویان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بۆ ڕۆژهەڵات، کە مێژوونووسە ئەورووپاییەکان پەردە پۆشیان کردووە، تا ئەسکەندەر لە مێژوودا وەك یەکێك لە خوداوەندیان دەرکەوێت، ڕاستیش ئەوەیە کە مێژوونووسە ئەورووپاییەکانیان بەو هۆیەوە لە خوداوەندیانی ئەفسانەکان چواند، کە ئێرانی داگیرکرد، چوونکە تا سەردەمی داریوشی سێیەم هیچ پاشا و سەرکردەیەکی ئەورووپی، جگە لە ئەسکەندەر نەیتوانی خۆی بگەیەنێتە ناوەندی ئێران، دواتریش کەس لە ئەوان لەو کارە سەرکەوتوو نەبوون.

مێژوونووسە یۆنانییەکان گرێ کوێرەیان بەرانبەر بە ئێران هەبوو، بۆیە ئەسکەندەریان لە دژی ئێران هێندە گەورە کردووە، کە تەنانەت کەسی دیکە لە مێژووی ئەورووپا لە داگیرکاری وڵاتان نەگەیشتنە ئەسکەندەر، تەنانەت ناپلیۆنیش لە مێژووی ئەورووپا نەگەیشتە ئەو. هۆکارەکەشی برێتی بوو لەوەی هەموو مێژوونووسە ئەورووپاییەکان لەبارەی شکۆی ئەسکەندەر هاوڕابوون، بەڵام سەبارەت بە شکۆی ناپلیۆن تەنانەت هەموو مێژوونووسە فەرەنسییەکانیش هاوڕا نەبوون.

مێژوونووسە ئەورووپاییەکان بۆ ئەوەی ئەسکەندەر مەزن بکەن، ژیانی تایبەتی ئەو و سەربازەکانی ئەویان داپۆشی، لە کاتێکدا کە ژیانی تایبەتی ئەسکەندەر و سەربازەکانی ژیانێکی بۆگەن و ناشیرین بوو، هەموو مێژوونووسە بێ لایەن و راستی بێژەکان دەڵێن پێش هاتنی ئەسکەندەر و هاوڕێکانی بۆ رۆژهەڵات هاورەگەزبازی لە نێوان نێر و نێر واتە نێربازی نەبوو، ئەو جۆرە هۆگرییە ئەوان هێنایان، بەڵام خەڵکی رۆژهەڵات، بە تایبەتی ئێرانییەکان هێندە پاکژبوون کە هەرگیز ئەو بابەتە لە لایان نەبوو بە نەریت.

ئەسکەندەر لە ماوەی مانەوەی لە میسر هەوڵی بەهێزترکردنی لەشکرەکەیدا بۆ هێرشکردنە سەر ئێران، ئەو دەیزانی ئەو ڕەشپێستانەی لە باشووری میسر دەژین، پیاوانی زۆر ئازایان هەیە، بۆیە سەردارێکی خۆی بە ناوی (بەتڵەمیۆس) بۆ کۆکردنەوەی سەرباز نارده باشووری میسر و پێی وت: پیاوانێك بۆ سەربازی بەکرێ بگرە، کە تەمەنیان پتر نەبێت لە بیست ساڵ.

بەپێی هەندێ وتە بەتڵەمیۆس پەنجا هەزار ڕەشپێستی بۆ سەربازی بە کرێ گرت و لە رێگەی ڕووباری نیل بۆ باکوری میسری ناردن، ئەسکەندەر هەندێ لە ئەفسەرەکانی ڕاسپارد بۆ ئەوەی ڕاهێنانە سەربازییەکان بەو سەربازە ڕەشپێستانە بکەن. ئەوان هێندە بەهۆش و زیرەك بوون، کە لە ماوەیەکی کەمدا توانیان هێندەی بۆ تێگەیشتن لە ڕاهێنەرەکانیان پێویستیان بوو، زمانی یۆنانی فێر بن.

هەروەها بەتڵەمیۆس هەندێ ژنی رەشپێستی لەگەڵ خۆیدا هێنا، تا پێشکێش بە ئەسکەندەریان بکات، زانراوە کە ئەو ژنانە لە نەتەوەیەك لە رەشپێستەکان بوون، کە لە باشووری سودان دەژیان، ئێستەش لەوێ ماون، هەموو پیاو و ژنانی ئەوان باڵابەرزن، ئەوانەی جوانناسن دەزانن لە جیهاندا، تەنانەت جوانترین سپی پێستەکان لە جوانیدا ناگەنە ئەو ژنانە.

ئەسکەندەر هەموو ژنەکانی بەسەر ئەفسەرەکانیدا دابەش کرد، بە وتەی مێژوونووسەکان کە ئەویان گەیاندبوو بە پلەی خوداوەندییەتی، لەگەڵ هیچیان جووت نەبوو، بۆ ئەوەی لە جووتبوون لەگەڵ یەکێك لەو ژنانە، منداڵێکی رەشپێست یاخۆ دووڕەگ نەکەوێتەوە.

دوای گەڕانەوەی لە باشووری میسر، بەتڵەمیۆس بە ئەسکەندەری وت: بە بەرژەوەندیی دەزانم کە لە رێگەی دەریا هێرش بکەینە سەر ئێران، چوونکە ئەگەر بمانەوێت لە رێگەی وشکانییەوە هێرش بکەین، دەبێت رێگەیەکی زۆر ببڕین، دواتر بەشێك لە رێگەکەمان بەو

ناوچانەدا دەڕوات، کە هەندێ نەتەوەی دیکەی لێیە، کە پیاوانی ئازا و دلێریان هەیە[١]، ئەوان لەگەڵماندا دەجەنگن و لاوازمان دەکەن تاکو پتر بڕۆین لاوازتر دەبین، کاتێك دەگەینە لەشکری داریوشی سێیەم هێندە لاواز دەبین کە توانای جەنگمان نابێت و شکست دەخۆین، بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی دەریاوە بڕۆین و لە باشووری ئێران لە کەنداوی فارس لەشکرەکەمان پیادە بکەین، دوو سوودی بۆ ئێمە دەبێت:

یەکەمیان بریتییە لەوەی لەشکری ئێمە کە بە ڕێگەی دەریاوە دەڕوات و دەگاتە ئەوێ، ماندوو نابن و ئامادەییان دەبێت، سوودی دووەمیش ئەوەیە دوای پیادەبوونی لەشکرەکەمان لە کەنارەکانی کەنداوی فارس لە نێوەندی ئێران دەبین و دەتوانین بە زوویی خۆمان بگەیەنینە پێرسپۆلیس و تەواوی سەرمایە و گەنجینەکانی پێرسپۆلیس بۆ ئێوە دەبێت.

ئەسکەندەر لە وەڵامدا وتی: من لە ڕێگەی وشکانی دەڕۆم، چوونکە هەخامەنشییەکان لە کەنداو و دەریای عومان لەشکری دەریایی بەهێزیان هەیە، ئەگەر من بە دەریادا بڕۆم، بە دڵنیاییەوە هەندێ لە کەشتییەکانم نقووم دەبن، تەنانەت ئەگەر سەرکەوتووش ببم.

لە لایەکی دیکە ئەگەر سەربازەکانم لە ڕێگەی دەریاوە ببەم، ئەوان بە هۆی مانەوەیان لەنێو کەشتیی بۆ ماوەی زۆر، ئامادەییان لەدەست دەدەن و خاو دەبنەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی وشکانییەوە بڕۆم بە هۆی بەردەوام بوونیان لە ڕێگە بڕین، چوست و چالاکی خۆیان دەپارێزن، بەڵام لەبارەی ناوچە خێڵەکییەکانی ئێران، من دەمەوێت دوای گەیشتنم بە ئێران لە هیچ یەك لەو ناوچە خێڵەکییانە تێپەڕ نەبم.

ئەسکەندەر پێش ئەوەی بگاتە ناوچە خێڵەکییەکان، لەگەڵ لەشکری داریوشی سێیەم ڕووبەڕوو بۆوە، دوای ئەوەی داریوشی شکستدا، ئەسکەندەر خۆی لە تێپەڕبوون بە ناوچە خێڵەکییەکان پاراست. وردبینی ئەسکەندەر بە سوودی خۆی بوو، ئەگەر پێشنیازی بەتڵەمیۆسی پەسەند کردبووایە و لە ڕێگەی دەریاوە ڕۆیشتبا، نەیدەتوانی لەشکرەکەی بگەیەنێتە کەنارەکانی ئێران، چوونکە هەخامەنشییەکان لە کەنداوی فارس و دەریای عومان

(١) زەبیحوڵڵا نەتەوەکانی بە خێڵ ناوبردووە، بۆ خۆپاراستن لە دووبارەبوونەوەی ئەو هەڵەیە راستمان کردەوە، بێگومان ئەوان نەتەوەبوون لەو ناوچانە دەژیان کە بە خێڵەکی ناو براون. "وەرگێڕیکوردی"

لەشکری دەریایی بەهێزیان هەبوو، کەشتییە جەنگییەکانیان ڕێگەیان بە کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی یۆنان نەدەدا، بگەنە کەنارەکان.

ئەسکەندەر تەنانەت دوای شکست دانی داریوشی سێیەم لە دوایین جەنگدا، لە لەشکری دەریایی هەخامەنشیی لە کەنداو دەترسا، یەکەم کاری گەورەی ئەنجامیدا بەر لەوەی بچێتە پێرسپۆلیس ئەوەبوو کە جڵەوی لەشکری دەریایی هەخامەنشیی گرتەدەست، ئەو ئەرکە گرینگتر بوو لە داگیرکردنی پێرسپۆلیس.

ئەو وای بیردەکردەوە کە دوای هەڵاتنی داریوشی سێیەم، گرتنی پێرسپۆلیس بۆی کارێکی هێندە قورس نییە، بەڵام بوونی ئەو لەشکرە دەریاییە لە کەنداو و عومان بۆ ئەو دەبۆوە مایەی گرفت و ئاریشە نانەوە لە کارەکانی داهاتوویدا.

هەندێ بابەت هەیە کە ئێرانییەکان پێویستە بیزانن، بەڵام مامۆستا و لێکۆڵەرە بەڕێزەکانی ئێران تا ئێستە خۆیان ماندوو نەکردووە تاکو لێکۆڵینەوەیان لە بارەوە بکەن. هەر وەك هیچ کات مامۆستا یاخۆ لێکۆلەرێکی ئێرانی نەچووە تاکو کەتیبەکانی بێستوون بخوێنێتەوە، بە هەمان شێوە تا ئەمڕۆ هیچ یەکێك لە ئەوان نەچووە هەتا لەبارەی دوایین گۆڕەپانی جەنگی نێوان داریوش و ئەسکەندەر لێکۆڵینەوە بکات.

لەوانەیە پرسیار بکرێت کە ئەگەر لێکۆڵینەوە لە یەکەمین و دوومین جەنگ نەکرێت چ سوودێکی دەبێت تا لێکۆڵینەوە لە گۆڕەپانی سێیەمین جەنگ بکرێت؟.

لە وەڵامدا دەڵێین گۆڕەپانی جەنگەکانی یەکەم و دووەم لە دەرەوەی ئێران بوون، گۆڕەپانی سێیەم لەنێو ئێران بووە، ئەگەر سنوورەکانی رۆژئاوای ئێران لە سەردەمی نادرشا گۆڕانیان بەسەر نەهاتبایە، ئێستەش دوایین گۆڕەپانی جەنگی دارای سێیەم و ئەسکەندەر ئێران دەبوو. هەرچی ئێمە دەیزانین لەبارەی ئەو گۆڕەپانە لەلایەن لێکۆڵەر و مێژوونووسەکانی دەرەوەیە.

ئەسکەندەر دوای دەرچوونی لە میسر بەرەو سوریا رۆیشت، لە باکوری سوریا لە ڕووباری فورات پەڕییەوە و چۆوە نێو بەشی باکوری میزۆپۆتامیا، دوای پەڕینەوە لە رشووباری دیجلە گەیشتە بەشی رۆژهەڵاتی ئەو ڕووبارە بەردەوام بوو تا گەیشتە دەشتی (گۆگمەل) لە نێزیك شاری (ئەربەل) یاخۆ (ئەربیل).

بۆ زانینی شوێنی ئەربیل پێویستە نەخشەی ئێران بخەنە بەرچاو و ڕووباری بەناوبانگی زاب کە لە شاخەکانی رۆژئاوای کوردستان سەرچاوە وەردەگرێت، بدۆزنەوە، لەگەڵ زێیەکە بڕۆن تا

ئەو شوێنەی ئەو زێیە دەرژێتە نێو دیجلە، ئەربیل کەوتوتە باشووری شوێنی بەیەك گەیشتنی ئەو دوو زێیە، هەمان شاری ئەربیلە کە ناوەندی پارێزگای ئەربیلی وڵاتی عێراقە.

لێتۆژە دەرەکیەکان شوێنی جەنگی داریوش و ئەسکەندەریان دیارکردووە، لە رۆژئاوای شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو زێی زاب و دیجلە لە نێزیك شاری ئەربیل (هەولێر) لە باشووری زێی زاب بووە، کەوتووەتە پێدەشتێك بە ناوی (گۆگمەل)[٢] یاخۆ (گۆگامەل). لە ناوچە بە پیت و سەوزەکانی ئەوسای ئێران بووە، ئەسکەندەر لە دووەمین مانگی بەهار گەیشتە ئەوێندەر، بۆیە تەواوی دەشت بە گژوگیا سەوز ببوو.

پارەمەنیۆن کە لەگەڵ ئەسکەندەر بووە، نووسیویەتی: "ئەگەر داریوشی سێیەم تەنیا پێنج سەد سەربازی لە کەناری ڕووباری دیجلە دانابووایە، ئێمە هەرگیز نەماندەتوانی خۆمان بگەیەنینە ناوچەی ئەربیل." ئەو وتەیەی پارە مەنیۆن لەلایەن تەواوی مێژوونووسانەوە پشتڕاست کراوەتەوە، دەڵێین ئەگەر داریوش بەشێکی کەم لەو لەشکرە گەورەیەی خۆی ناردبا بۆ ئەو شوێنە، ئەسکەندەر نەیدەتوانی بە ئاسانی لە دیجلە بپەڕێتەوە و زیانی گەورەی بەردەکەوت یاخۆ لەوانە بوو ناچار بە گەڕانەوەش ببێت یان بە هێزێکی کەمتر بچێتە مەیدانی جەنگ.

بەپێی نووسینی پارەمەنیۆن داریوشی سێیەم یەك ملیۆن سەربازی پیادە و سوارە و چوار هەزار گالیسکەی جەنگی لەوێندەر جێگیر کردبوو. مێژوونووسە یۆنانی و رۆمییەکان ژمارەی سەربازەکانی هەخامەنشییان لە دووسەد هەزار تا ملیۆنێك سەرباز دیاری کردووە، کە لەوانەیە ژمارەی یەکەم یاخۆ شتێك پتر لەوە ڕاست بێت، بەڵام ملیۆنێك کەس زێدەڕۆیی تێدایە، بێگومان پارەمەنیۆن گەورەترین سەرداری مەکدۆنییە، مێژوونووسە یۆنانییەکان مەبەستیان لە باسکردنی ئەو ژمارەیە، گەورە پیشاندانی سەرکەوتنی ئەسکەندەر بوو.

---

(٢) ئەو ناوە لە بنەڕەتدا گۆملە، دەشتێکە لە نێزیك گۆمی گۆمل کە دەکەوێتە سنووری شاری بەردەڕەشی ئێستە لە نێزیك هەولێر، زێی گۆمل لە نێوان سنووری هەردوو شاری شێخان و بەردەڕەشە، دەشتەکەش کەوتووەتە سەرووی ئەو زێیە، لە هەڵکەندنەکانی ئەم دواییە لە کوردستانی باشوور هەندێ سککەی زێری یۆنانی و رم و کەرەستەی دیکە دۆزرایەوە، کە سەلمێنەری شەڕی نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان بووە لەو شوێنە. "وەرگێڕی کوردی"

نۆڵدکە نووسەری جەنگی ئەربیل لە فەرهەنگ نامەی بەریتانیکا بیٚ هیچ دوودڵییەك ئەو ژمارە یەك ملیۆنییەی نووسیوە، ژمارەی چوار هەزار گالیسکەی جەنگی نەنووسیوە، لە کاتێکدا بە وتەی تەواوی مێژوونووسە ئەورووپاییەکان هەرگیز پێش جەنگی خاچهەڵگرەکان لە جیهاندا ڕووی نەدابوو، کە لەشکرێکی پێنج سەد هەزار کەسی بکەوێتەڕیٚ.

لە یەکەمین جەنگی خاچهەڵگراندا دوای ئەوەی فەتوا بۆ جەنگی ئاینی لەلایەن پاپا و چەند ئۆسقۆفێکی کریستیان لە دژی ئیسلام دەرچوو، لەشکرێك لە ئەورووپا بۆ جەنگی موسوڵواتان کەوتەڕیٚ کە مێژوونووسەکان ژمارەی سەربازەکانی ئەو لەشکرەیان بە پێنج سەد تا شەش سەد هەزار سەرباز دیاری کردووە، بەڵام ئەوان سەرباز نەبوون، وەك دەوترێت ڕەشە لەشکر بوون بۆ زیادبوونی ژمارە بوو، تا لە ئەورووپا تێپەڕ بوون و گەیشتنە ڕۆژهەڵات ئەو ژمارەیە کەم بۆوە بۆ سەد و پەنجا هەزار سەرباز، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان مەترسییان بۆ کریستیانەکانی ڕۆژهەڵات زۆرتر بوو لە موسوڵمانەکان، چوونکە وەك کوللە دەگەیشتنە هەر شوێنێك هەموو شتیان دەخوارد و ناوچەکەیان دووچاری قاتوقڕی و برسێتی دەکرد، هیچیان بۆ کەس نەدەهێشتەوە تاکو خەڵك بیخۆن.

پەسەندکردنی ژمارەی ملیۆنێك سەرباز لای کەسێك زانیاریی نەبێت لەو بارەوە ئاساییە، بەڵام لە زانایەکی وەك نۆڵدکە پەسەندکردنی ئەو ژمارەیە زۆر بە دوور دەزانرێت.(٣)

پارەمەنیۆن دەڵێت: "جەنگ لە پەنجایەمین ڕۆژی بەهاردا ڕوویدا، کاتێك گەیشتینە ناوچەی هەولێر، خێوەتەکانی لەشکرە گەورەکەی داریوشی سێیەممان لە دوورەوە دیت، هێندە خێوەتی لێبوو کە توانای ژماردنمان نەبوو، هەموو دەشتەکەی پڕ کردبوو، ئەگەر دووری مەودای نێوانمان ڕێگر نەبووایە، هەرئەو ڕۆژە هێرشمان دەکردە سەر لەشکری داریوش و

---

(٣) لە بەلاڕێدابردنی بابەتەکە داوای لێبوردن دەکەین، بەڵام فەرهەنگنامەی بریتانیکا لە سەدەی رابردوودا تەنها لە بەریتانیا پتر لە پەنجا جار چاپ کراوە، جگە لەوەی لە ئەمەریکا، ئۆستralیا، زێندلاندی تازە و ئەفریقای باشوور چاپ کراوە، بۆیە ئەو بابەتە بۆ هەموو دنیا لە رووی ئاگەداربوون لە مێژووی ئێران بە بەڵگە دادەنرێت، هەر ئینگلیزێك لە هەر شوێنێکی جیهان بۆ وەرگرتنی زانیاریی پەنای بۆ دەبات. بە داخەوە دەتوانین بڵێین ئەو ئێراننناسە گەورەیە لە نووسینەکەیدا نەیتوانیوە بێلایەن بێت، ئێرانییەکان بە نەتەوەی وەحشی و بەربەر ناو دەبات و هەستەکانی بەسەر مێژوودا زاڵ کردووە." زەبیحوڵڵا"

لەنێومان دەبردن، چوونکە هیچ ئارایشی جەنگیان نەبوو، بەڵام بە هۆی دووری مەوداکە زانیمان ئەو رۆژە ناتوانین لەپڕ هێرش بکەینە سەر لەشکری داریوش."

بەپێی ئەو وتەیە دەزانرێت کە لەشکری ئەسکەندەر لەچل ونۆیەمین رۆژی بەهاردا گەیشتووەتە پێدەشتی گۆگمەل، چوونکە پارەمەنیۆن دەڵێت جەنگ لە پەنجایەمین رۆژی بەهاردا ڕوویدا.

کۆمەڵێك بابەتی دیکە کە لەلایەن ئەو نووسراوە ئەوە دەسەلمێنێت کە لەو رۆژە لەشکری ئەسکەندەر گەیشتوونەتە ئەو پێدەشتە، چوونکە دەڵێت: "دوای ئەوەی شەو داهات، ئاگرێکی زۆر لە لەشکری هەخامەنشیی کرایەوە، ئێمەش ئاگرمان کردەوە و ژمارەیەك سەربازمان تا بەیانی نەنووستن تا ئەگەر هەخامەنشییەکان پەلاماریاندایین، لەپڕ نەبێت و بتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین، بەڵام داریوشی سێیەم وێڕای هەبوونی ئەو لەشکرە مەزنە، نەیوێرا هێرشمان بکاتەسەر".

رۆژی دواتر پێش رۆژهەڵات هەردوو لەشکر لە دەشتی گۆگمەل بۆ جەنگ ئامادە بوون، گۆڕەپانی جەنگ لە رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا بوو، لەشکری هەخامەنشیی لە رۆژهەڵات لە نێزیك شاری ئەربیل (هەولێر) و لەشکری ئەسکەندەر لە رۆژئاوا نێزیك شوێنی بەیەك گەیشتنی هەردوو زێی زاب و دیجلە بوو. زەوی ئەو ناوچەیە تەخت بوو، بۆ بەگەڕخستنی گالیسکە جەنگییەکانی هەخامەنشیی باش بوو.

رۆژی پێشتر بە فەرمانی ئەسکەندەر سەربازەکانی لەشکرەکەی ژمارەیەکی زۆر داریان لە کەناری زاب بڕی، کە لە باکوری ئۆردووگەکەیان بوو، هەندێ سێ پێچکەیان دروستکرد، کە بۆ گواستنەوە دەشیان تاکو کاتی هێرشی گالیسکەکانی هەخامەنشیی لە پێش سەربازەکانیان دابنێن، بۆ ئەوەی ئەسپەکان بەرببنەوە و گالیسکەکان بشکێن. لە دوو جەنگەکانی پێشووتر یۆنانییەکان سوودیان لەو ئامرازە وەرنەگرت.

لە جەنگی ئیسۆس واتە دووەمین جەنگ، هەرچەندە باس لە هەڵاتنی داریوش بە گالیسکە دەکات، بەڵام هیچ باس لە هێرشی گالیسکەکانی هەخامەنشیی نەکراوە و بەپێی زانراوەکان لەو جەنگەدا ئەوان گالیسکەیان نەبووە، بەڵام لە سێیەمین جەنگ وێڕای بوونی چوار هەزار گالیسکە لە لەشکرەکەی داریوشدا، نەیانتوانی سوودیان لێ ببینن، چوونکە کاتێك لێخوڕی

گالیسکەکان چاویان بە سێ پێچکەکان و سەربازە هۆپ لیتەکان کەوت، نەیانوێرا هێرش بکەن.

ئەو گێڕانەوە بێ بنەمایە، چوونکە چوار هەزار گالیسکە لە هەندێ سێ پێچکەی دارین ناترسن، هێرش نەکردنی سەربازانی داریوش لە ترسی سێ پێچکەی دارین و سەربازانی هۆپ لیت درۆیەکە مێژوونووسە یۆنانییەکان هەڵیان بەستووە، بەڵام هەڵاتنی سەربازانی داریوش (کە بە زوویی باسی دەکەین) درۆ نییە و لەلایەن ئەو مێژوونووسانەوە باس کراوە، بەڵام سەربازانی هەخامەنشیی لە ترسی سەربازانی ئەسکەندەر هەڵنەهاتن، بگرە بە هۆی هەڵاتنی داریوشی پاشا و فەرماندەی گشتیی لەشکرەکەیان هەڵات، بۆیە ئەوانیش هەڵاتن. لە جەنگدا ئەگەر ئەفسەرێك هەڵبێت ورەی سەربازەکان کەم دەبێتەوە، چجای هەڵاتنی فەرماندەی گشتیی لەشکرەکە.

لە جەنگی ئیسۆس چۆنییەتی هەڵاتنی داریوشی سێیەم بۆ ئێمە ڕوون نییە، بەڵام لە جەنگی گۆگمەل ئەگەر نووسراوەکانی مێژوونووسە یۆنانییەکانیش نەبووایە، دەتوانین بزانین کە هەڵاتنی داریوش بووە هۆی هەڵاتنی سەربازەکانی و جەنگ بە سوودی ئەسکەندەر کۆتایی هات، چوونکە بەپێی لێکدانەوەکان هیچ هۆکارێکی دیکە بۆ شکستی هەخامەنشییەکان لە جەنگی گۆگمەل ناتوانێت بدۆزێتەوە.

مێژوونووسە یۆنانییەکان دیسان ژمارەی لەشکری ئەسکەندەریان بە بیست و نۆ هەزار پیادە و چوارهەزار سوارە دیارکردووە، لە کاتێکدا کە ئەسکەندەر بە وتەی پرۆفیسۆر بارنی بەریتانی بە لەشکرێکی گەورەی سەد هەزار کەسی لەو جەنگەدا لەگەڵ داریوشی سێیەم جەنگاوە. دەتوانرێت گومان ببرێت کە لە لەشکری هەخامەنشییدا دەرز پەیدا بوو، سەربازانی ئەسکەندەر گەیشتنە شوێنێك کە ترسی دیل بوونی داریوشی سێیەمی لێدەکرا، ئەویش لە ترسی دیل نەبوونی بە گالیسکە هەڵات، گێڕانەوەیەکی دیکە هەیە دەبێژێت دوای ئەوەی ئەسکەندەر بە تیر لێخوڕی گالیسکەکەی ئەوی کوشت، هەڵات و ئەو سەربازانەی وایانزانی داریوش کوژراوە دەستیان بە هەڵاتن کرد، بەم شێوەیە ریزەکانیان تێك شکا. بە هۆی تێکپرژان و هەڵاتنی سەربازانی داریوش لە لایەك و هێرشی سەربازانی ئەسکەندەر کە راوەدووی هەڵاتوانیان دەنا، کەشێك لە تۆز و خۆڵی چڕ ناوچەکەی داگرت. لەوکاتەدا داریوش

هێندە بە خێرایی لە مەیدانی جەنگ هەڵات، ئەوانەی لە دەورەی بوون، نەیانزانی بۆ چ لایەك هەڵاتووە.

ئێستە پسپۆران دەتوانن سنووری گۆڕەپانی جەنگی گۆگمەل تەنانەت بە پێوەری مەتر دیار بکەن، بەڵام لەبارەی ئەو جەنگە، جگە لە نووسینەکانی مێژوونووسە یۆنانییەکان هیچ دیکەمان لە بەردەست نییە. گومانمان نییە کە هەخامەنشییەکان لەو جەنگەدا پێش هەڵاتن، بەرگری باشیان کردووە، چوونکە پارەمەنیۆن سەرداری مەکدۆنی نووسیویەتی یازدە هەزار کەس لە سەربازانی ئەسکەندەر کوژران و دووسەد هەزار کوژراویشی بۆ هەخامەنشییەکان دیارکردووە کە زێدەڕۆیی پێوە دیارە، چوونکە یازدە هەزار سەربازی ئەسکەندەر کوژراون کە لە نێوانیاندا سەربازانی نەتەوەی دیکەی تێدابوو، دەردەکەوێت کە ئێرانییەکان لە سەرەتادا بە باشی دەجەنگان، بەڵام دوای هەڵاتنی ئەسکەندەر ورەیان بەردا.

داریوش دوای هەڵاتن بەرەو شاری هەولێر ڕۆیشت، نیوەشەو گەیشتە نێو شارەکە. ئەو لەوێندەر، دوای بینینی هەندێ لە فەرماندە و ئەندامانی لەشکرەکەی لە بەرانبەریاندا وتی گەورەیی و دەسەڵات و سەرمایە و ژنە زۆرەکانی حەرەمسەراکان و خواجەکانی حەرەم بۆ ئەو تەنیا بارگرانی بوون، بۆیە هەموویان بۆ ئەسکەندەر بەجێ دەهێڵێت، چوونکە بۆی دەرکەوتووە لە کاتە سەختەکاندا ئەوانە نەك تەنیا مایەی بەختەوەری نین، بگرە جگە لە بەدبەختی و نەهامەتی و کلۆڵی چی دیکەیان بەدواوە نییە، وەك بینرا هەبوونی ئەو شتانە، بوونە هۆکاری شکست، بۆ ئەسکەندەریش بوونە مایەی سەرکەوتن.

داریوش دوای ئەو وتەیە بۆ دڵدانەوەی فەرماندەکانی گوتی دەیەوێت بڕواتە ناوچە دوورەکانی ئێران، بۆ جەنگی ئەسکەندەریش لەشکرێك چێ بکات، چوونکە بۆی دەرکەوتووە سەرکەوتن بۆ ئەو کەسەیە کە سەربازی زۆرتری هەیە، بەم شێوەیە داریوش لە هەولێر کەوتەڕێ، بەرەو ماد ڕۆیشت، هەولێر دوای ماوەیەکی کورت کەوتە دەست ئەسکەندەر.

بە هۆی هەڵاتنی داریوش تەواوی پێداویستی و کەرەستە جەنگییەکان و ئەو گەنجینەیەی لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، بۆ ئەسکەندەر بەجێما، بەپێی نووسینی ئێسترابوون کە ئاریستۆپۆلۆس گێڕاوێتیەوە کە لەگەڵ ئەسکەندەر بووە، دە هەزار تالان زێڕ و زیو و بەردە گرانبەهاکان و کەرەستە و پێداویستییە جەنگییەکان بوون. ئەگەر بەهای یەك تالان بە

چوارسەد لیرەی بەریتانی دیاری بکەین، بە بەهای چوار ملیۆن لیرەی بەریتانی زێڕ و زیو و شتی گرانبەها کەوتە دەست یۆنانییەکان.

دوای ئەو جەنگە ئەسکەندەر بە پێچەوانەی پێشنیازی سلۆکۆسی سەرداری لەشکرەکەی، مۆڵەتی نەدایە لەشکرەکەی پشوو بدەن و وتی: "مۆڵەتدان بە سەرباز و ئەفسەرەکان دوای ئەو سەرکەوتنە، ئەوان هان دەدات بۆ خواردنەوە و رابواردن، لە ئەنجام تەکووز و رێکی لەشکر خاوەبێتەوە و توانی جەستەییان لەدەست دەدەن، هێشتا نازانین تاکو سەرکەوتنی یەکجاری چەند جەنگی دیکەمان لەگەڵ داریوش لە پێشە".

پێویستە ئەو بابەتە فەرامۆش نەکەین کە هەرسێ مێژوونووس (پارەمەنیۆن، ئاریستۆپۆڵۆس و سلۆکۆس) کە خۆیان بەشداری جەنگەکان بوون، کە بە وتەی ئەوان لەوانەیە لە هەرسێ جەنگ و بە تایبەتی لە جەنگی ئیسۆس و گۆگمەل بەشداربوونی داریوش بۆ خۆی یەکێك بووبێت لە هۆکارە سەرەکییەکانی شکستی هەخامەنشییەکان، ئەو سێ کەسە دەڵێن ئەسکەندەر لە هەولێر دە هەزار تالآن زێڕ و زیو، لە شووش سی هەزار تالآن زێڕ و زیو، واتە دوازدە ملیۆن لیرە و دوای گرتنی پێرسپۆلیسیش حەفتا و پێنج هەزار تالآن زێڕ و زیو، واتە سی ملیۆن لیرەی بەردەست کەوت، ئاخر داریوش ئەو هەموو زێڕ و زیو و دراوەی هەبوو بێت، ئەگەر بەشێکی لێ خەرج بکردایە بۆ چەك و جبەخانە و تفاقی جەنگ، ئەو دەمە لەشکرێکی زۆر بەهێزی دەبوو، کە هەرگیز ئەسکەندەر توانای داگیرکردنی ئێرانی نەدەبوو.

دوای شاری ئەربیل، ئەسکەندەر سەربازەکانی بەرەو باشوور برد. ئەگەر نەخشەی ئەو رێگەیە بخەینە بەرچاومان کە ئەسکەندەر پێیدا رۆیشتووە بۆ شووش کە لە خوزستان بوو، دەبینین ئەو رێگەیە پێچاوپێچە وەك رۆیشتنی مار، مەبەستی ئەسکەندەر لەو رۆیشتنە ئەوە بووە کە نەکەوێتە نێو ناوچە خێڵەکییەکان و لەگەڵیاندا نەجەنگێت. ئەو کە بۆ جەنگی داریوشی سێیەم لە دیجلە پەڕیبۆوە، بەرەو رۆژهەڵات رۆیشت بوو، دیسان لە دیجلە پەڕییەوە ڕووە و رێگەی رۆژئاوا، دواتر باشووری گرتەبەر تا گەیشتە بابل، کە دەیزانی هێزی بەرگری لێ نییە. بابل بێ بەرگری خۆی بەدەستەوەدا، ئەسکەندەر لە کوشتاری خەڵك خۆی پاراست، بەڵام سەرمایەی نێو گەنجینەی شارەکەی داگیرکرد، مێژوونووسە یۆنانییەکان باسی سەرمایەی ئەوێندەریان نەکردووە کە چەند بووە.

ئەسکەندەر لە بابل ناچار بوو مۆڵەت بداتە ئەفسەر و سەربازانی خۆی، چوونکە ئەوان دەیانزانی لە بابل بەپێی نەریت و رێسا ناوچەییەکان لە پەرستگەکاندا ئەو کچە گەنجانەی

هاوسەرگیریان نەکردووە، خۆیان دەخەنە بەردەستی پیاوان و ئەوکارە بە ناشیاو و خراپ نازانن، بەڵام وێڕای ئەوەی ڕێسا و نەریتەکان ڕێگەیان دەدان، دیسان هەندێك پارە و زێڕیان لەو پیاوانە وەردەگرت کە خۆیان دەخستەبەر دەستیان و بەشێك لەو دراوانە بۆ پەرستگە و لە ڕاستیدا بۆ باخەڵی کاهینەکانی پەرستگە بوو، بەشەکەی دیکەی بۆ خۆیان دەمایەوە و پاشکەوتیان دەکرد تاکو بۆ کاتی هاوسەرگیری خەرجی بکەن.

ماوەی مانەوەی ئەسکەندەر لە بابل پتر بوو، لە ماوەی مانەوەی لە شارەکانی دیکە، بۆ کێشکردنی کاهینەکانیش، سەردانی پەرستگەی مەردۆکی کرد و ئەو پەرستگەیە پێشتر لەلایەن کوروشی گەورە ڕاگیرا بوو. ئەسکەندەر بە هەمان شێوە کە جوانی شار و شوێنە جوانەکانی سەرەنجی ڕاکێشا بوو، بە هەمان شێوەش نەریتی نەشیاوی بابلییەکان کە سەربازەکانیان دووچاری گەندەڵی دەکرد، دووچاری سەرسوورِمانی کرد بوو. ئەو سەرسوورِمانەی ئەو لە نامەیەکدا دەردەکەوێت کە بۆ ئەرستۆی مامۆستای خۆی ناردووە، ناوەرۆکەکەی هەیە و دەتوانرێت بزانرێت، ئەو دەڵێت: "ئەو شارە هێندە گالیسکەی لێیە کە لە چوارڕیانەکان، ڕێداریان داناوە و کەڕنایان داوەتە دەستیان، بە دەنگی ئەو کەڕنایانە گالیسکەکان ڕێنوێنی دەکرێن، ڕوو لە هەرلایەك دەکەن کەڕنای بۆ لێ دەدەن و گالیسکەکانی ئەو لایە دەڕۆن".

لە هەمان نامەدا قوتابی بۆ مامۆستاکەی نووسیوە: " شەهوانییەتی سەرباز و ئەفسەرەکانم دووچاری شۆك و سەرسوورِمانیان کردم، لە چوونیان بۆ پەرستگەکان، ئەز هیچ پاڵنەرێك نابینم لەوەدا، بۆ ئەوەی بەرەو ئەو پەرستگەیانە بڕۆم و لەگەڵ ئەو کچە جوانانەدا جووت ببم".

ئەسکەندەر دوای دانانی (مازیۆس) بە فەرمانڕەوای بابل و دانانی هێزێکی کەم بۆ پارێزگاری لە شارەکە، بابلی بەجێ هێشت، مازیۆس لە سەردارەکانی داریوش بوو، خۆی ڕادەست کردبوو. ئەسکەندەر بۆ گەیشتن بە شووش، ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژئاوای ئێرانی بڕدا یاخۆ بڕی و بە دەورەیاندا سووڕایەوە.

مێژوونووسەکان دەڵێن ئەسکەندەر لەبەرئەوەی ڕێگەی دیکەی لەو ناوچە شاخاوییە نەبوو کە دەکەوتە نێوان بابل و شووش، ئەو ناوچەیەی بڕدا، ئەو وتەیە ناڕاستە، چوونکە لە نێوان میزۆپۆتامیا و ئەو ناوچەیە کە ئێستە لۆڕستانە، چەندان ڕێگەی دیکە هەبوون، کە بە شاخەکاندا دەڕۆیشتن، هەرچەندە پانوبەرین نەبوون، بەڵام بۆ پەڕینەوە دەشیان، هەندێك لەو

ڕێگەیانە تا ئێستەش ماون، دەبێت بووترێت ئەگەر ڕۆیشتن بەو ڕێگەیانەدا بۆ گەشتیاران شیاو بوو بێت، ئاخۆ بۆچی بۆ ڕۆیشتنی لەشکرەکان نەدەشیا، ئەگەرچی هەموو ئەو ڕێگەیانە شاخاوی بوون، هەندێکیان بە هۆی ڕۆیشتنی بەردەوامی خەڵك لە ماوەی هەزاران ساڵدا وەك پلیکانی لێ هاتبوو.

ئەو بابەتە بۆ هەندێ مێژوونووسی کۆنی ئێران جێگەی سەرسووڕمان بوو، کە بۆچی ئەسکەندەر دوای داگیرکردنی بابل ڕاستەوخۆ بەرەو ڕۆژهەڵات نەڕۆیشت یاخۆ بەرەو شووش نەچوو، ئێستە دەزانین کە ترسی خێڵە (کاسنییەکان) کە باپیرانی لووڕەکانی ئێستەن، گرفتی ڕێگە شاخاوییەکان، هۆکار بوون بۆ ئەوەی ئەسکەندەر لە باشوورەوە بێتە نێو خۆزستان.

ئەو خۆزستانەی ئەسکەندەر گەیشتە نێوی بەهەشت بوو، ئاریستۆپۆلۆس کە لەگەڵ ئەسکەندەر چوو بۆ خۆزستان، ناوی ئەو زیلانە دەبات کە ئێستە نەماون، بەڵام ئەو گەشتیارانەی بە فڕۆکە بە ئاسمانی ئەو ناوچەیەدا دەڕۆن، ڕێڕەوی ئەو زیلانە کە وشك بوونە دەبینن.

هەندێك وایان بیرکردووەتەوە وشکبوونی خۆزستان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەنداوانەی لەلایەن پاشاکانەوە لەسەر ڕووبارەکانی ئەو دەڤەرانە چێکران، بەڵام ئەو زیلانە تەنیا بەشێك لە خۆزستانیان پاراو دەکرد، سەوزی و ئاوەدانی خۆزستان بۆ کۆمەڵێك ڕووباری دیکە دەگەڕایەوە کە هەبوون.

لە خۆزستان جەنگەڵ هەبوو کە ئێستە نەماوە، بە وتەی هاوڕێیانی ئەسکەندەر ئەو جەنگەڵانە بە ژمارەی پەلکی دارەکان ئاسکیان تێدابوو، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە دەرفەت بە کەس نەدەدرا کە لەوێندەر ڕاو بکات، بەڵام سەربازانی ئەسکەندەر کاتێك گەیشتنە ئەو لێڕەوارانە هێندەیان لەو ئاژەڵە جوانە کوشت، تەنانەت ڕەچەڵەکی لەنێوچوو، دانەیەکیشی لێ نەمایەوە.

لە ڕووداوی هاتنی ئەسکەندەر بۆ خۆزستان بابەتێك بووەتە جێگەی سەرسووڕمانی مێژوونووسان، ئەویش ئەوەیە کە ئەسکەندەر دوای هاتنی بۆ خۆزستان، ڕاستەوخۆ نەڕۆیشتە شووش، ماوەی حەوت ڕۆژ سەربازەکانی بەژێر سێبەری دارەختەکانی دارستاندا برد، هەرچەندە کەشوهەوا گەرم بوو، بەڵام لەبەر سێبەری دارەکان سەربازەکان هەستیان بە گەرما نەکرد.

مێژوونووسان دەڵێن شووش لە رابردوودا پتر لە ئێستە لە کەنداوی فارس نێزیك بووە، نیشتەنییەکانی ئەو زیلانەی دەڕژانە نێو کەنداو، لەو شوێنانە کەنارەکانیان بەرەو پێش برد، بۆیە ئەسکەندەر دەبووایە لە ماوەی سێ رۆژدا بگاتە شووش، بەڵام ئەسکەندەر دوای گەیشتنی بە خۆزستان، ماوەی پازدە رۆژان بە رێگەوە بوو، ئینجا گەیشتە شووش، ئەو دواکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە رابردوودا زەلکاوێك لە باشووری شووش هەبووە، لەو رێگەیەوە نەیاندەتوانی بچنە نێو شووش، ئەوانەش کە لە شووش دەهاتنەدەر بە رێگەکانی باکور، رۆژئاوا و رۆژهەڵاتدا دەڕۆیشتن، هەروەها ئەوانەی دەهاتنە ئەو شارە بە یەکێك لەو رێگەیانەدا دەڕۆیشتن. ئەسکەندەر دوای هاتنی بۆ خۆزستان ناچار بوو، لە جەنگەڵی گەورەی خۆزستان تێپەڕ ببێت تاکو خۆی بگەیەنێتە شووش.

شووش ئەوکات یەکێك بوو لە پایتەختەکانی ئێران، پاشاکانی سەرەتای زنجیرەی هەخامەنشیی ژمارەیەك تەلاری مەزنیان تێدا چێ کردبوو، لە ڕووی جەنگیشەوە بە قەڵایەکی پتەو هەژمار دەکرا، هیرۆدۆت لە سەردەم پێش ئەسکەندەر، لە ساڵی (٤٢٥ پ. ز) ئەو شارەی بینیووە، چوونکە لە کاتی چوونی هیرۆدۆت تا هێرشی ئەسکەندەر بۆ شووش ئەو شارە نەکەوتبۆوە بەر هێرش، دەتوانین بڵێین کاتێك ئەسکەندەر گەیشتە ئەو شارە، ئەوێندەر هەمان دۆخی سەردەمی هیرۆدۆتی هەبوو، کە ئەو نێزیکەی سەدەیەك و چەند ساڵێك بەر لە هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئێران، ئەو شارەی بینی بوو، بە تێروتەسەلی باسی کردبوو، کە شووش دیوارێکی هەبووە، پشتێنە خۆڵینەکەی بیست و سێ مەتر ئەستوور بوو، دیوارەکەشی هێندە پان بووە، کە دوو گالیسکە توانیویانە بە تەنیشت یەکدییەوە بەسەریدا برۆن، ئەو پشتێنە خۆڵینە لە هەڵکەندنی ئەو خەندەقە بەرهەم هاتبوو، کە بە دەورەی شارەکەدا هەڵکەندرابوو لە هەندێ شوێنی ئەو خەندەقە چەندان پرد هەبوون، بۆ ئەوانەی هاتوچۆی ئەو شارەیان دەکرد، بکارن بەسەریاندا بپەڕنەوە، هەر پردێك دەگەیشتە دەروازەیەك، کاتێك دەروازەکان دادەخران، ئەستەم بوو کەس بتوانێت بەبێ مۆڵەتی پاسەوانانی دەروازەکان بچێتە نێو شار یاخۆ لێی بێتە دەرێ.

خەندەقەکە بە شێوەیەك هەڵکەنرابوو، کە هەر کاتێك بیانەوێت لە رێگەی ڕووبارەوە دەیانتوانی پڕی بکەن لە ئاو، تەنانەت ئەگەر ئەو خەندەقە پڕ ئاویش نەکرابووایە، هێندە پان و قووڵ بوو، کە رێگر دەبوو لە پەڕینەوەی لەشکرێکی گەورە بۆ نێو شار. کاتێك ئەسکەندەر گەیشتە شووش سەرۆکی سەربازگەی شار و فەرمانڕەواکەی کە ناوی (ئاداپاك) بوو، بڕیاریدا کە بەرگری بکات.

ئاداپاك دەیزانی ئەسکەندەر خودان لەشکرێکی بەهێزە و ناتوانێت لە بیباندا لەگەڵی بجەنگێت، بەڵام دەیتوانی لە شووش بەرگری بکات. چوونکە پردەکان بۆ گەیاندنی خۆراك و پێداویستیی بۆ شار دەبووایە سوودیان لێ ببینرێت، ئاداپاك فەرمانی کرد تەواوی پردەکان وێران بکەن، جگە لە دوو پرد لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا، ئەگەر ئەو دوو پردەشی وێران کردبایە، ئەوا خەڵك نەیاندەتوانی خۆراك و پێداویستیی بۆ خۆیان دابین بکەن. وێرانکردنی پردەکان لەو سەردەمەدا، کارێك نەبوو کە لە ماوەیەکی کورتدا بە ئەنجام بگات، چوونکە ئەو کارە دەبووایە بە قولێنگ پردەکان برووخێنن.

بۆیە کاتی گەیشتنی ئەسکەندەر بە شاری شووش، هێشتا دوو پردەکەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بۆ سوود هاتوچۆکردن دەشیان، ئەسکەندەر بۆ گرتنی شووش زۆر سوودی لێ وەرگرتن. ئەسکەندەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ شووش ئەو شارەی گەمارۆدا، زانیاریمان لەبارەی ناوی ئەو ئەندازیارەوە نییە، کە مەنجەنیقی بۆ ئەسکەندەر چێ کرد، بەڵام زانراوە کە سەربازانی ئەسکەندەر مەنجەنیقی گەورەیان لە تەنیشت خەندەقەکانەوە دامەزراند و بەردبارانی شاریان کرد.

ئەو بەردە گەورانەی لەلایەن مەنجەنیقچییەکان دەهاوێژران، هیچ کاریگەرییان لە دیواری شار نەبوو، وەك ئەوە بوو کە بەردۆچکە بە دیوارەکەدا بدەن. مەودای رۆیشتنی بەردەکانیش هێندە نەبوو، کە بتوانرێت بەرد بە ماڵاندا بدرێت و خانووەکان وێران بکات، یاخۆ ببێتە مایەی ئەوەی خەڵکی شار بکەونە چەرمەسەری و نارازی بن، چوونکە بەردباران هیچ سوودی نەبوو، ئەسکەندەر سەربازەکانی راسپارد دەروازەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و دیوارەکەی تەنیشتی کە لەبەر دەستیان بوو، بۆ گەیشتن بە نێو شار وێران بکەن، چوونکە ئاداپاك لە پشت دەروازەکان دیواری ئەستووری چێ کردبوو، شکاندنی دەروازەکان رێگەی هاتنی ئەسکەندەری بۆ نێو شار نەدەکردەوە.

سەربازە بەرگریکارەکانی شووش لەسەر دیوارەکەوە، کە سەربازەکانی یۆنانی سەرگەرمی وێرانکردنی بوون، بەردیان بەسەر ئەواندا دەباراند، ژمارێکیان کوشتن. ئەسکەندەر فەرمانی بە کەوانداەرەکانی خۆی کرد، تاکو بە تیر لەبەر گریکاران بدەن و رێگەیان نەدەن بەردبارانیان بکەن و رێگر بن لە وێرانکردنی دیوار و دەروازەکە. تیرهاویشتنی بەردەوام و تەکووزی سەربازە یۆنانییەکان دەهەمبەر بەرگریکارانی بەردەم دیوارەکە، نەیتوانی بەردباران رابگرن، بەڵام بە تەواوەتی بنبڕی نەکرد، هەندێك جار بەرگریکاران دەرفەتیان بە دەست دەهێنا تا بەرد بەسەر هێرش بەراندا ببارێنن.

ئاداپاك پیاوێکی ترسنۆك نەبوو، بەڵام ئەو لەشکرەی شووشی گەمارۆ دابوو، لەشکرێکی بەهێز بوو. پرۆفیسۆر بارت ژمارەی لەشکری ئەسکەندەر لە جەنگی شووش بە ئەندازەی ژمارەکەی لە جەنگی گۆگمەل بە دەرکردنی ژمارەی کوژراوەکانی دەزانێت، واتە ئەسکەندەر لە جەنگی شووش نەوەد هەزار سەربازی هەبوو. بەرگریکاران بە فەرماندەیی ئاداپاك تەنیا پێنج هەزار کەس بوون، بۆچی داریوش شارێکی وەك شووش بە بێ سەربازگەیەکی گەورە بەجێ دەهێڵێت؟، وەڵامەکەی بۆ ئەو هۆکارە دەگەڕایەوە، کە داریوشی سێیەم بە گریمانی خۆی وای دەزانی ئەسکەندەر دوای ئەربیل بەرەو رۆژهەڵات دەڕوات، واتە خۆی دەگەیەنێتە ئەکباتان کە یەکێك بوو لە پایتەختەکانی ئێران، ئەکباتان ئەوکات خاوەن سەربازگەیەکی بەهێز بوو، بەڵام شووش لەشکری بەرگریکاری بەهێزی نەبوو، چوونکە لە ئێران کەس پێشبینی نەدەکرد، کە ئەسکەندەر دوای جەنگی گۆگمەل بەرەو باشوور بڕوات و لە باشووری خۆزستانەوە بەرەو شووش بێتەوە و هێرش بکاتە سەر ئەو شارە. ماوەی چەند رۆژ ئەرکی سەربازانی ئەسکەندەر ڕووخاندنی دیواری شار بوو، ئەرکی بەرگریکارەکانیش بەردباران کردنیان، بەڵام دیوار و پشتێنە خۆڵینەکە هێندە ئەستوور بوو، کە سەربازانی ئەسکەندەر لە توانایان نەبوو وێرانی بکەن، بە تایبەتی کە شەوان بەردباران پتر دەبوو، چوونکە کەوانداراەکانی ئەسکەندەر بە باشی سەر دیوارەکەیان نەدەبینی و نەیاندەتوانی بەرگریکارەکان لە سەرەوە بکەنە ئامانجی تیرەکانیان. ئەسکەندەر ناچار بوو بۆ داگیرکردنی شووش لە دیوارەکەوە سەربکەوێت، ئەو رێگەیە هەڵبژێرێت کە لە کۆندا لە گرتنی قەڵاکان مەترسیدارترین رێگە بوون.

سەربازەکانی ئەسکەندەر بە رێنوێنیی ئەندازیار و دارتاشەکانی نێو لەشکر دەستیان کرد بە چێکردنی پلیکانەی پان و بەرز لە دارەکانی دەوروبەری شارەکە، وێڕای پلیکانەکان، دەستیان کرد بە چێکردنی هەندێ پردی دارین لە تیر و داری پرد بۆ ئەوەی وەك پرد لەسەر خەندەقیان دابنێن، ئەو کارەش یارمەتیدەریان دەبوو بۆ گەیاندنی پلیکانەکان بۆ ژێر دیوارەکان. گواستنەوەی پلیکانەکان بە نێو خەندەقی پڕ لە ئاو ئەستەم بوو، لە لایەکی دیکە پلیکانەکانیش نەدەکرا لەنێو ئاوی خەندەقەکانەوە بە دیوارەکەوە هەڵپەسێرن، ئەو پردانە زۆر کاریگەر دەبوون بۆ رێگەی پەڕینەوە، هەروەها بۆ گەیاندنی پلیکانەکان بۆ بن دیوارەکان.

دارتاشە یۆنانییەکان لە بەشی خوارەوەی هەر پلیکانەیەك پایەی زیادەیان دروست کرد، کاتێك پلیکانەکان بە دیوار هەڵدەپەسێردران، پایە زیادەکان بە پردەکەوە دەبەسترانەوە تا

پلیکانەکە توونید ببێت و نەکەوێت یاخۆ پاسەوانەکان نەتوانن بەریان بدەنەوە. دوای ئەوەی پلیکانەکان لەسەر هەردوو پردی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و پردە دارینەکانەوە بە دیوارەکە هەڵپەسێردران، سەربازە یۆنانییەکان دەستیان کرد بە سەرکەوتن بۆ سەر دیوارەکە.

ئەو شێوە لە قەڵاگرتن بۆیە مەترسیدار بوو، چوونکە ئەوکاتەی هێرشبەران دەستیان بە سەرکەوتن لە پلیکانەکانەوە دەکرد، بەرگریکاران نەتەنیا بەرد، بگرە ئاوی کوڵاویان بەسەردا دەکردن و هەوڵیان دەدا تاکو پلیکانەکە بەردەنەوە، ئەگەر لەو کارە سەرکەوتوو بووبان، بێگومان ئەوانەی لەسەر پلیکانەکان دەبوون بەگشتیی یاخۆ دەمردن یان بە سەختی بریندار دەبوون. دوای ئەوەش کە هێرشبەران بە زیانێکی زۆر لە دیوارەکە سەردەکەوتن، دەکەوتنە بەر هێرشی بەرگریکاران و دەکوژران، تەنیا ئەگەر ژمارەی پلیکانەکان زۆر بووانە و بەرگریکاران فریای کوشتنیان نەکەوتبانە.

ئەسکەندەر زانیاریی لەو بابەتە هەبوو، دەیزانی ئەگەر بەتەنیا پلیکانەکان بخەنە سەر دیواری بەرانبەر دەروازەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و سەربازەکانی سەربکەون، هەر سەربازێك کە سەر دیوارەکە بکەوێت، دەکوژرێت، چوونکە ئەو سەربازانەی لە پلیکانە سەردەکەوتن، نەیاندەتوانی بە کۆمەڵ سەرکەون، یەك یەك سەردەکەوتن، لەو دۆخەشدا ئەوانەی سەردەکەوتن بە تەنیابوون و دەکوژران، بەڵام بە هۆی زۆری ژمارەی پردە دارینەکان و پلیکانەکانەوە، سەربازەکانی ئەسکەندەر لە هەموو لایەکەوە بە بەردەوام لە دیوارەکە سەردەکەوتن و توانیان لە هەندێ شوێنی سەردیوار بۆ خۆیان پێگە دروست بکەن و لەو پێگەیانەوە ژمارەیەکی زۆر سەرباز توانیان بە هۆی پلیکانەکانەوە بچنە نێو شار.

دوای ئەوە هێرشی سەربازەکانی ئەسکەندەر لەسەر دیواری شار بۆ سەر بەرگریکاران زۆرتر بوو، چوونکە ژمارەیان زۆر بوو، لە چەند خاڵێکی سەر دیوارەکە پێگەیان هەبوو، توانیان سەربازە بەرگریکارەکان بکوژن و بەرەو نێو شارەکە بڕۆن. ماوەی دوو ڕۆژ سەربازەکانی ئەسکەندەر لەگەڵ سەربازانی ئاداپاك و ئەو پیاوانەی خەڵکی شووش کە بۆ بەرگری چەکیان هەڵگرتبوو، جەنگان، لەو ماوەیەدا دەروازەکانی شاریان کردەوە، سەربازەکانی دیکەی ئەسکەندەر زۆر بە ئاسایی چوونە نێو شار. کاتێك جەنگی شووش کۆتایی هات، لە پێنج هەزار سەربازی بەرگریکاری ئەو شارە، تەنانەت یەك کەسیش بە زیندوویی نەمایەوە و ئاداپاکیش کوژرا.

مێژوونووسە یۆنانییەکان ژمارەی کوژراوەکانی ئەسکەندەریان لە شووش بە دوو هەزار و پێنج سەد کەس دیاری کردووە، کە جێگەی گومانە، چوونکە سەربازە بەرگریکارەکان تا دوایین کەس بەرگریان کرد، هەندێ لە پیاوانی شاریش یارمەتییان دان، بێگومان ژمارەی کوژراوەکانی لەشکری ئەسکەندەر زۆرتر بووە لەو ژمارەیەی مێژوونووسە یۆنانییەکان باسی دەکەن.

لە کاتی بەردەوامبوونی جەنگدا سەربازانی ئەسکەندەر تەواوی پیاوانەیان دەکوشت، واتە ئەوان جیاوازییان نەدەکرد لە نێوان بەرگریکارانی شار و پیاوانی لاشەڕ، بۆیە لەکاتی بەکۆتا هاتنی جەنگدا زۆرینەی پیاوانی شارەکە کوژران.

ئەوان هەموو گەنجە جوانەکان و هەموو ژنەکانیان بە دیل گرتن، دوای تالانکردن، شارەکەیان سووتاند و منداڵە بێ دایك و بابەکانیش لە هەموو لایەکەوە هەڵدەهاتن تا خۆیان رزگار بکەن، چوونکە ئاگر لە هەموو لایەك هەبوو، زۆرینەی منداڵان لە ئاگردا سووتان و مردن، ئەوانەش کە زیندوو مانەوە، کەس نازانێت چارەنووسیان چی بەسەر هات.

لەو پەڕتووکەی لەلایەن (هارۆڵد لەمبی) ئەمەریکی لەبارەی ئەسکەندەر نووسیویەتی، باس لەو بابەتەی سەرەوە ناکات، باسێك نییە لەبارەی کوشتاری دانیشتووانی شووش، بۆیە ناوی هارۆڵد لەمبمان هێنا، چوونکە دوای نووسینی ئەو پەڕتووکە لەبارەی ئەسکەندەر سەردانی ئێرانی کرد، لە ئێران یەکێك لە وەرگێڕە بە تەمەنە ڕاگەیاندکارەکان(٤) ئەوی ڕووبەڕووی رەخنەکردەوە کە بۆچی لە پەڕتووکەکەیدا ئەسکەندەری گەیاندووەتە پایەی خوداوەندێتی و ئێرانییەکانی تا پلەی دڕندەیی داکشاندووە.

لە پەڕتووکەکەی هارۆڵد لەمبدا ئەسکەندەر خاوەن ڕووخسارێکی فریشتەئاسایە و دڵی پڕ بووە لە بەزەیی و خۆشەویستی، تەنیا لە پێناو بڵاوکردنەوەی برایەتی و دیموکراسییەت لە ئێران و هیندستان و ئەفغانستان پێشڕەوی کردووە، ئەو دەیویست بڵێت پێویستە بۆ هەردەم جەنگ وەلا بنێن و نەتەوەکانی دنیا وەك ئەوەی لە بەهەشت بن، دوور بکەونەوە لە ئازاردانی یەکدیی. بە باوەڕی ئەو، ئەسکەندەر هەر لەوکاتەوە کە گەیشتە نێو ئێران مەبەستی بوو کە

---

(٤) ئەو وەرگێڕ و نووسەرە بە تەمەنە ڕاگەیاندکارەی نووسەر باسی دەکات، هەمان نووسەر و وەرگێڕی ئەم پەڕتووکەیە واتە مامۆستا زەبیحوڵڵا مەنسوری بوو، کە هەمیشە بەو شێوە لە سادەیی و نەرمڕۆییەوە خۆی دەخاتەڕوو.

خۆشەویستی بۆ ئێرانییەکان دەربڕێت، لە نێوان ئەوان و یۆنان دۆستایەتیی هەمیشەیی چێ بکات.

مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە ئەسکەندەر دوای ئەوەی شووشی داگیرکرد، یەکەم شاری ئەسکەندەرییەی خۆی لە هەمان ناوچە واتە خۆزستان دروست کرد، بەڵام شوێنی شارەکەیان دیار نەکردووە، تا ئێستەش زانیاریمان لەبارەی شوێنی چێکردنی ئەو شارە لە خۆزستان نییە، بەڵام شوێنی ئەسکەندەرییەکانی دیکە کە لە ئێران دروست کران یاخۆ ئەو شارانەی ئەسکەندەر ناوەکانی گۆڕین، تا ڕادەیەك زانیاریمان هەیە.

# تەختی جەمشید لەنێو ئاگردا

ئەسکەندەر دوای ئەوەی هەموو دانیشتووانی شووشی تالآن کرد، شارەکەی سووتاند، لە خۆزستان نەگیرسایەوە، بەرەو پێرسپۆلیس کەوتەڕێ.

کاتێك بە بۆنەی دروستکردنی پێرسپۆلیس باسی داریوشی یەکەمان کرد، وتمان کە لەو دەڤەرە شارێکی دروست کرد، ئەو شارە لە تەنیشت پێرسپۆلیس لە (مەرڤ دەشت) بوو، یۆنانییەکان ئەو شارەشیان بە پێرسپۆلیس ناو دەبرد[1].

پارەمەنیۆن وتوویەتی کە پێرسپۆلیس سێ سەد هەزار کەس دانیشتووانی بووە، دەردەکەوێت لە شارە گەورەکانی ئێران بووە لە جیهانی ئەو سەردەمەدا، کەم شار جگە لە بابل و شارەکانی ولاتی چین ئەو ژمارەیە لە دانیشتووانیان هەبێت.

لە دەوروبەری شار تا چاو بڕی دەکرد، کێڵگە و باخ هەبوو، جوانی خەڵکی ئەو شارە بەناوبانگ بوو، دەتوانین بڵێین جوانەکانی نێو نەتەوەی فارس هەموویان لە نەوەکانی دانیشتووانی کۆنی پێرسپۆلیسن و جوانیان لەوانەوە بۆ ماوەتەوە.

---

(١) هۆکاری بێگانەبوونی وشەی پێرس پۆلیس دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو وشەیە لە هیچ یەکێك لە کەتیبەکانی هەخامەنشییدا نەهاتووە، کە بەردەستکەوتوون و تا ئێستە ماون. یەکێك لەو لەوحە بەردینانەی لەژێر پایەکانی کۆشکی پێرس پۆلیس دۆزراوەتەوە، ئێستە لە مۆزەخانەی ئێرانی باستانە و بە خەتێکی زۆر جوانی بزماری نووسراوە، کە شیاوی ئەوەیە مرۆڤ بۆ بینینی بچێتە ئەو مۆزەخانەیە، ئەو لەوحە لە لایەن داریوش لەژێر یەکەم بەردی بناخەی ئەو کۆشکە دانراوە، ناوی پێرس پۆلیسی بە وشەی (گاە) نووسیوە، لەوانەیە هەمان وشەی (کاخ) بێت کە ئێستە لە جیاتی کۆشك بەکاردێت، لەو دوو کەتیبەیە پتر، نووسەر و وەرگێڕی ئەو نووسینە مێژووییانە لە هیچ شوێنێکی دیکە نووسینێکی نەبینیووە، کە باس لە پێرس پۆلیس بکات، ئاساییە کە لە شوێنی دیکە ناوی هات بێت و هێشتا زانیاریمان لەسەری نەبێت. "زەبیحوڵلا"

بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان، ئەسکەندەر بۆ کات بەسەر بردن بەرەو پێرسپۆلیس ڕۆیشت، لە کاتێکدا کە وەك زانراوە ئەو بۆ کوشتار و تالآن و وێرانکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس چوو بۆ ئەوێ.

لە هەندێ لە پەڕتووکە یۆنانییەکاندا هاتووە، کە ئەسکەندەر کاتێك گەیشتە نێو پێرسپۆلیس، جوانی کچانی ئەو شارەی بینی، بڕیاریدا بۆ خۆی و هەشتا لە ئەفسەرانی لەو کچانە هەڵبژێرێت، هاوسەرگیری بە کۆمەڵ بۆ هەشتاو یەك کەس بە ئەنجام بگەیێنێت، بەڵام هەندێ بابەتی دیکە لە پەڕتووکی مێژوونووسانی دیکە هاتووە، ئەو هاوسەرگیرییە بە کۆمەڵە کە بە ناو بۆ پێوەندیکردنی هەردوو وڵاتی ئێرانی و یۆنانی بووە، بە درۆ دەخەنەوە، چوونکە دوای کوشتار و تالآن و سووتاندن، هیچ کچێکی جوان دەست نەدەکەوت تا ببێتە هاوسەری ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی، هەموو ژنەکان لەلایەن سەربازەکانی ئەسکەندەر دیل کران و بردران، تەنیا منداڵان لە پێرسپۆلیس مابوونەوە.

داریوشی سێیەم کە لە ئەکباتان واتە هەمەدان چاوەڕوانی هاتنی ئەسکەندەر بوو، دوای ئەوەی بیستی ئەو بەرەو شووش ڕۆیشتووە، هەوڵی بەرگری لە پێرسپۆلیسی نەدا، تەنانەت توانای بەرگریشی نەبوو، بۆیە هەوڵی نەدا گەنجینەی ئەو شارە بۆ شوێنێکی دیکە بگوازێتەوە.

هەڵسوکەوتی ئەو پیاوە دوای گەیشتنی ئەسکەندەر بۆ ئێران بە ڕادەیەك دوور لە ئەقڵ و بەرپرسیارێتی بووە، کە بە ناچاری دەبێت بڵێین وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان لەبارەی ترسنووکی ناوبراو ڕاست بووە، چوونکە ئەو پیاوە دەیتوانی خۆی بگەیەنێتە پێرسپۆلیس و گەنجینەی ئەو شارەی بۆ ئەوێ بردبایە یاخۆ بۆ شوێنێکی دیکە، لێ ئەو کارەی نەکرد.

بە وتەی پارەمەنیۆن شاری پێرسپۆلیس بە شێوەیەك دروست کرا بوو، کە دانیشتووانی هەموو گەڕەکەکان دەیانتوانی کۆشکی پێرسپۆلیس ببینن.

پارەمەنیۆن جگە لە سەرسووڕمانی لە جوانی ئافرەتانی ئەو شارە، دوو بابەتی دیکە بۆتە هۆی سەرسووڕمانی ئەو لەو شارەدا، یەکیان ئەوەبوو هەموو کرێکارانی نانخانەکان ژن بوون، فرۆشگە و دووکانەکانی دیکەش ئەو دووکانانە بوون، کە کچە جوانەکان تیایاندا گوڵیان دەفرۆشت. پارەمەنیۆن لە هیچ شوێنێکی ئاسیا و ئەورووپا نەیبینی بوو، کە گوڵ بفرۆشن، بۆ یەکەمجار ئەو کارەی لە پێرسپۆلیس بینی.

سەبارەت بە وردەکارییەکانی شارەکە هەر هێندە دەبێژین، کە ئەو شارە خودان ئاوێکی یەکجار زۆر، زێرابیشی هەبوو، ئەگەر نها کۆڵینکارینی بۆ ئەنجام بدرێت، ڕەنگە کەناڵەکانی زێرابی دەرکەوێتەوە، سەبارەت بە شاری پێرسپۆڵیس چەندان بەڵگەنامەی مێژوویی هەیە، برێتییە لە نووسینی (کولی تارخۆس) مێژوونووسی یۆنانی کە ئەو شارەی لە (٣١٦ پ. ز) بینیوە، واتە حەڤدە ساڵ دوای وێرانبوونی کۆشکی پێرسپۆڵیس، ئەوەش بەو مەرجەی ئەسکەندەر لە ساڵی (٣٣٣ پ. ز) ئەوێی داگیرکرد بێت. وێڕای ئەوەی حەڤدە ساڵ پێش چوونی کولی تارخۆس بۆ ئەو شارە، ئەسکەندەر هەموو پیاوانی پێرسپۆڵیسی کوشت و بەتەواوەتیش دنیشتووانەکەی تالآن کرد، هێشتا پێرسپۆڵیس لە دیدی ئەودا شارێکی جوان و ئاوەدان بوو، هەر وەك دەزانین کە لە ساڵی (٣١٦ پ. ز) یۆنانییەکان فەرمانڕەوای ئێران بوون.

کولی تارخۆس بەم شێوەیە باسی کۆشکی پێرسپۆڵیس دەکات: "هێشتا کاریگەریی سووتاندن لە کۆشکی پێرسپۆڵیس بەرچاو دەکەوێت، وێڕای ئەوەی وێران بووە، بەڵام هێشتا ستوونەکانی بە پێوە ماون، کاتێك گەشتیاران نێزیك دەکەونەوە، لە دوورەوە سەرەنجیان رادەکێشێت، ، بۆیە دەکەونە ژێر کاریگەریی و شکۆی ئەو وێرانەیە و پرسیار لە خۆیان دەکەن، بۆچی ئەو کۆشکە وێرانە هێندە بە شکۆیە، ئەی ئەگەر وێران نەکرابووایە چ شکۆیەکی دەبوو؟"

کولی تارخۆس درێژترین باسی لەبارەی کەوتنی پێرسپۆڵیس بۆ نەوەکانی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، هەرچەندە ئاریستۆپۆلۆس و پارەمەنیۆنیش ئەو کارەیان کردووە، بەڵام ئەوان لەگەڵ ئەسکەندەر بوون، هەندێ لە ڕووداوەکانیان بە ئەنقەست بە شێوەیەکی دیکە نووسیوەتەوە و ڕاستییەکانیان شێواندووە تا بە سوودی ئەسکەندەر بێت، بەڵام کولی تارخۆس خۆی پێرسپۆڵیس و شوێنەکانی دیکەی ئێرانی بینیووە، لەگەڵ هەندێك لەو کەسانە گفتوگۆی کردووە، کە لە جەنگی پێرسپۆڵیس بەشداربوون، هەرچی لە ئەوانی بیستووە نووسیویەتی، ئەو یەکەمین مێژوونووسە کە پشتی بە وتەکانی بیست کەس بەستووە کە لە پێرسپۆڵیس بوون و سووتانی ئەو کۆشکەیان بینیوە و گەواهیدەرن لەسەر ڕووداوەکە، نووسیویەتی ئەسکەندەر بە ئەنقەست ئەو کۆشکەی سووتاند تا ئەو دەرکەوتە بە شکۆیەی مێژوو و شارستانییەت و جوانی و هونەری ئێران لەنێو ببات، لە کاتێکدا پارەمەنیۆن نووسیویەتی ئاگرکەوتنەوەی کۆشکی پێرسپۆڵیس بە هەڵە ڕوویدا.

وێڕای ئەوە ئاریستۆپۆلۆسیش کە مێژوونووسە و لەگەڵ ئەسکەندەردا بووە، دەڵێت: ئەسکەندەر فەرمانی کرد مەشخەڵێك بێنن، دایە دەست ژنێکی جوان بە ناوی (تایس) تاکو بەرزی بکاتەوە و پردەکانی کۆشك بەو مەشخەڵە ئاگر بدات، کە ئەوە دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە ئاگر کەوتنەوەکە بە ئەنقەست بۆوە.

پێرسپۆلێس دیواری نەبوو ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە پاشاکانی هەخامەنشیی پێیان وانەبووە، ئەو شارە کە لە نێوەڕاستی ئێراندایە، هەرگیز رۆژێك لە ڕۆژان هێرشی بکرێتەسەر.

لەوانەیە بگوترێت شاری پێرسپۆلێس هاوینەهەوار بووە، بۆیە دیوار بۆ نەکراوە، بە هەر بیانوویەك بێت ئەو شارە دیواری نەبووە، هەموو مێژوونووسان چ ئەوانەی لەگەڵ ئەسکەندەر بوون، چ ئەوانەی وەك کولی تارخۆس ڕووداوەکانیان لە زمانی گەواهیدەران گێڕاوەتەوە، بە گشتیی لەو بارەوە هاوڕان کە ئەو شارە دیواری نەبووە، بەڵام ئەو شارە سەربازگەی هەبووە، ئەفسەرێکی ئێرانی بە ناوی (ئاریا بەرزین) فەرماندەی سەربازگەی شاری پێرسپۆلێس بووە، یۆنانییەکان ئەو ناوەیان بە (ئاریۆ بەرزەن) نووسیوەتەوە، سەربازگەی شار جیابوو لە سەربازگەی کۆشك، هەندێك سەربازی خەڵکی گدرۆزیا پاسەوانی کۆشك بوون، فەرماندەکەیان ئەفسەرێك بوو بە ناوی (تری داتس)، کە ئەو ناوە یەکێك بوو لە ناوە بڵاوەکان لە ئێراندا.

سەربازانی گدرۆزیا کە ئێستە بە بلوچستان ناسراوە، ئەوکات (باشووری ئەفغانستان و پاتانستان) بەشێك بوون لەو هەرێمە، هەموویان باڵابەرز و چوارشانە، چاوشین و پرچ زێڕین، لە نموونە دیارەکانی رەچەڵەکی ئاریایی بوون، ئێستەش نەوەکانی ئەوان دەتوانین لە پاتانستان لە باشووری ئەفغانستان بدۆزینەوە، هەر بۆیە پاسەوانانی کۆشکیان لە سەردەمی دوایین پاشاکانی هەخامەنشیی لەنێو خەڵکی گدرۆزیا دیاری دەکردن تا شکۆیان هەبێت، پێویستە بگوترێت کە هەموو سەربازانی لەشکری هەخامەنشیی وەکو یەك نەبوون، لە هەموویان دیارتر سەربازانی پاتانستان بوون. ئەوان بە باڵای بەرز و چاوی شین، ریشی درێژ و پان، کاتێك زرێیان دەکردە بەر و کاسکێتیان دەکردە سەر، نێزەیان دەگرتە دەست و لە دەرگەکانی کۆشکەوە بە شکۆی پێرسپۆلێسەوە پاسەوانیان دەکرد، هەرکەسێك دەیبینین لە مەزنایەتی و بەرچاویی ئەوان دووچاری حەپەسان دەبوو، شکۆی کۆشکەکەش ئەو سەرسووڕمانییەی پتر دەکرد، بێگومان ئەوان بۆ پتر بەدەرخستنی شکۆی کۆشکەکە کرابوونە پاسەوان، لە کاتی ئاساییدا ژمارەی ئەوان دوو سەد

کەس بوو، ئەو ڕۆژەی ئەسکەندەر هاتە پێرسپۆڵیس ژمارەی پاسەوانەکانی پێرسپۆڵیس دوو سەد کەس بوو.

هەندێ لە مێژوونووسان وایان زانیوە کە پاسەوانەکانی کۆشکی پێرسپۆڵیس لە سەربازانی گاردی جاویدبوون، بەڵام لە سەردەمی داریوشی سێیەم ئەو گاردە نەمابوو، ئەگەر مابووایە داریوش لە هەردوو جەنگی ئیسۆس و ئەربیل بەو شێوەیەی کە باسکرا هەڵ نەدەهات.

ئاریابەرزەن فەرماندەی سەربازگەی شاری پێرسپۆڵیس هیچ کاری بە کاروباری پاسەوانی کۆشکەوە نەبوو، پاسەوانانی کۆشك بە پاسەوانی سەربەخۆ دەزانران، ئەو فەرماندەی هەزار سەربازی پیادەی بێ ئەسپ و گالیسکەبوو، لەگەڵ نێزیك کەوتنەوەی ئەسکەندەر لە پێرسپۆڵیس، بە هەزار سەربازەکەیەوە بۆ جەنگ لەگەڵ ئەو کەوتەڕێ، لە کاتێکدا ئەسکەندەر نێزیکەی سەدهەزار سەربازی هەبوو، ئاریابەرزەن دەیویست جەنگی لەگەڵدا بکات.

کۆلی تارخۆس دەڵێت:"یەکێك لە کەسایەتییەکانی ئەو شارە بە ناوی (مانو چرە) لەوانەیە منوچەهر بێت، کاتێك بینی ئاریا بەرزەن بە هەزار سەرباز بۆ جەنگی لەشکرێکی سەد هەزار کەسی دەڕوات، بانگەشەی خەڵکی شاری کرد تا چەك بگرنەدەست و بۆ یارمەتی سەربازانی ئاریابەرزەن بچنە جەنگ، کۆمەڵێك لە پیاوانی گەنجی شارەکە خۆیان چەکدار کرد و لەگەڵ مانوچرە و سەربازەکانی ئاریابەرزەن کەوتنەڕێ".

ئاریستۆپۆلۆس نووسیویەتی: کە پیاوانی شاری پێرسپۆڵیس چەکیان گرتە دەست و هاتن بۆ جەنگی ئێمە (واتە لەشکری ئەسکەندەر)، گوایە هەر ئەو بابەتە هۆکاری کوشتاری تەواوی پیاوانی ئەو شارە بوو لەلایەن ئەسکەندەر، چوونکە ئەو شارەی بە شارێکی بێ بەرگریکار نەناسی.

هاوڕێکانی ئەسکەندەر لە نووسینەکانیاندا باس لە جەنگێکی دیکە دەکەن کە لە نێوان ئاریابەرزەن و لەشکری ئەسکەندەر لە نێزیك دەروازەی قەزووین ڕوویداوە.

بەپێی ئەو گێڕانەوەیە دوای جەنگی گۆگمەل لە تەنیشت زێی زاب لەشکری ئەسکەندەر بووە دوو بەش، بەشێك لەگەڵ ئەسکەندەر بەرەو باشوور هاتن تا بچنە شووش، بەشێکی دیکە بەرەو ڕۆژهەلات ڕۆیشتن، لە نێزیك دەروازەی قەزووین، بە وتەی هاوڕێیانی ئەسکەندەر لە دەروازەی کاسپیان، گەیشتنە ئاریابەرزەن.

سەبارەت بە دەروازەی قەزووین زۆر باسکراوە تا بزانن لە کوێیە، ئەوەی دەزانرێت ئەو دەروازەیە مەبەست لە دەروازەی ناوچەی شاخاوی ئێران بووە، هەرکەسێك ویستبێتی لە

پشتێنەی ئێران کە عارەبەکان بە (عێراقی عەجەم) ناویان بردووە، بێتە نێو ناوچەی شاخاوی باکور، بەوێدا ڕۆیشتووە.

خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئیبراهیم پوور داوود) ئەو دەروازەیەی کە لە پشتێنەی ئێران بۆ ناوچە شاخاوییەکان کراوەتەوە بە (ئیوان کی) ئێستە دیاری کردووە، کە نێزیك تارانە و خەڵك بە (ئیوان کیف) ناوی دەبەن، ئەو وتەیە جێگەی سەرەنجە، چوونکە لە (ئیوان کی) ئێستە هیچ دەرگەیەك بەرەو ناوچە شاخاوییەکانی مازەندەران نییە. ئایا باشتر نییە ڕێڕەوی یەکێك لەو زیلانەی لە باکور بەرەو باشوور دەڕوات و ڕێگەی بۆ ناوچەی شاخاوی مازەندەران کردووەتەوە، وەك (جاج ڕوود) یاخۆ (کەرەج) بە دەروازەی قەزووین بناسین؟.

لێرە مێژووی جەنگی ئەسکەندەر لەگەڵ ئاریابەرزەن وێڵ دەبێت، نازاندرێت ئاریابەرزەن کە لە دەروازەی قەزووین بووە، چۆن گەیشتەوە پێرسپۆلیس و بووە فەرماندەی سەربازگەی ئەوێ؟، ناتوانین بلێین ئەو ئاریابەرزەنەی لە قەزووین بوو جیابوو لەو ئاریابەرزەنەی لە پێرسپۆلیس بوو، چوونکە ئەو ناوە لەو ناوانە نەبوو کە زۆر دووبارە ببێتەوە، ناوی ئاریا لە پێش ناوی خانەدانە پلە یەکەکانی وڵات دەهات و لە ناوە دووبارەکان نەبوو.

کاتێك تری داتس فەرماندەی کۆشکی پێرسپۆلیس کە نێزیکەی دە برین لە جەستەی بوو، خستە سەر تەخت و بردیانە لای ئەسکەندەر تا کلیلی گەنجینەکەی لێ وەربگرێت، ئەسکەندەر پێی وت: کلیلی گەنجینەکەم پێ بدە.

تری داتس وەڵامی دایەوە: من ئەو کلیلە تەنیا دەدەمە پاشای خۆم یاخۆ نێردراوی ئەو کە فەرمانی پاشای لە دەستدا هەبێت.

ئەسکەندەر وتی: پاشای تۆ منم.

تری داتس وتی: پاشای من داریوشی سێیەمە.

ئەسکەندەر وتی: داریوشی سێیەم کوژراوە. (لەکاتێکدا کە هێشتا زیندوو بوو).

تری داتس وتی: گریمان کوژرا بێت، من کلیلەکان تەنیا دەدەمە میراتگری ئەو، کە میراتگری پاشایەتیی بێت.

ئەسکەندەر وتی: ئایا دەزانی بە تاوانی ئەو نافەرمانییە، چ سزایەکت دەدەم؟.

تری داتس وتی: چ دەکەی؟.

ئەسکەندەر وتی: بکوژەکان بانگ دەکەم تا وەك چۆن پێستی مەڕ لە دوای کوشتنی ئەو ئاژەڵە لە گۆشتەکەی دادەماڵن، تۆش ئاوا لێ بکەن.

تری داتس وتی: سوپاسی یەزدان دەکەم کە لە نیروانا (بەهەشت) رۆحم لە پێش رۆحی پاشاکەم شەرمەزار ناکات، دەتوانم بە سەرفرازی بەو بڵێم کە ناپاکیم بەرانبەر نەکردووە.

پارەمەنیۆن دەڵێت کاتێك ئەسکەندەر ئەو وەڵامەی لە تری داتس بیست، وتی: خۆزگە منیش خزمەتکارێکی وەك تۆم هەبووایە. چاوپۆشی لە ئەشکەنجەی ئەو کرد و فەرمانیدا تاکو بە کوتان و لێدانەکان بەهۆی قەدی دارێکەوە دەرگەکە بشکێنن، ئەو دارەش برێتی بوو لە قەدی دارێك کە زۆرتر قەدی داری تەورێزی بەکاردەهات، بیست کەسێك پێکەوە هەڵیان دەگرت و بە توندی سەری دارەکەیان بە دەرگەکەوە دەکوتا، دوای چەند لێدانێك دەرگەکە لە بن و بۆتەکەوە هەڵدەتەکا یاخۆ دەردەچوو و دەکەوت. نۆڵدکە دەڵێت بۆ شکاندنی دەرگەی گەنجینە سوودیان لە تیری دیکە بینی، چوونکە بە وتەی ئەو لە کۆندا لە پێرسپۆلیس ئەو دارەی لێ نەبوو، کە ئێستە بە داری تەورێزی ناسراوە.

سەبارەت بە هەڵسوکەوتی ئەسکەندەر بەرانبەر بە تری داتس دواتر دەدوێین، چەند گێڕانەوەیەك لەو بارەوە هەیە، ئەوەی ئێستە باسی دەکەین دەستپاکی و شەرەفمەندی ئاریا بەرزەن فەرماندەی سەربازگەی پێرسپۆلیس و تری داتس فەرماندەی کۆشك و سەربازەکانیانە کە مایەی ستایشە.

ئەوان دەیان زانی کە داریوشی سێیەم هەڵاتووە و زانیارییان هەبوو کە ئەسکەندەر لە پێرس پۆلچیس نێزیك دەبێتەوە، دەیان توانی بۆ بەدەست هێنانی زێڕ و زیو، دەست بەسەر گەنجینەی کۆشکی پێرسپۆلیسدا بگرن. ئەگەر ئەو کارەیان کردبایە، ساڵانێکی زۆر دەیانتوانی بە ئاسوودەیی بەردەوام بن لە ژیان و هێندە زێڕ و زیو لە گەنجینەکەدا هەبوو، کە ئەگەر پێنج سەد هەزار سککەی زێڕ لەو گەنجینەیە دزرا بووایە، کاریگەریی لە سەرمایەی گەنجینەی ئەو کۆشکە نەدەکرد.

بە بیستنی ئەوەی ئەسکەندەر چی لە گەنجینەی ئەو کۆشکە بردووە، مرۆڤ دووچاری سەرسووڕمان دەبێت. تەنانەت لەم سەردەمە کە گوێی هەموان زۆر ناوی ملیۆن و بلیۆن دەبیستن، دیسان بە بیستنی ئەوەی لەو کۆشکە هەبووە، دەبێتە مایەی سەرسووڕمان. هێندە زێڕ لە گەنجینەی پێرسپۆلیس هەبوو کە دوای ئەوەی ئەسکەندەر ئەوی کردەوە، بە یەکجار دووهەزار ئەسپ و ئێستر کە باری سککەی زێڕیان لێ نرا بوو، ناردەوە بۆ یۆنان.

ئەگەر بەپێی نەریتی کۆن باری هەر ئەسپێك بە نەوەد کیلۆگرام دیار بکەین، ئەسکەندەر سەد و هەشتا تەن زێڕی بە هۆی ئەسپ و ئێستر ناردەوە یۆنان، بەڵام یۆنانییەکان خاوەنی ئەو ئەمانەتداری و پاکییەی ئێرانییەکان نەبوون، هەرکە زێڕەکەیان برد و دەستیان بەسەرداگرت یاخۆ تالآنیان کرد، هەریەکەیان چوونە یەکێك لە ولآتانی یۆنان بۆ ئەوەی تا مردن لەوێ بە ئاسوودەیی ژیان ببەنەسەر.

وێڕای ئەو دووهەزار ئەسپ و ئێسترە، پێنج هەزار باری وشتر کە سککەی زیو و شتی دیکەی زیوینیان بار کردبوو لە کۆشکی پێرسپۆلیس بردرا، سەرمایەیەکی ئاوا گەورە و بێ ژمار لە دەست تری داتس و دوو سەد سەربازی ئەو و ئاریابەرزەن و سەربازەکانی بوو، تەنانەت ئەوان چاویان نەبڕییە یەك سکەی زیوین.

وەك مێژوونووسە یۆنانییەکان باسی دەکەن ئاریابەرزەن لەگەڵ سەربازەکانی و هەندێ لە خەڵکی شارەکە، دەتوانرێت ناوی پارتیزانیان لێ بندرێت، لە خەرەندێك کە زێی (پۆلوار) پیایدا دەڕۆیشت، رێیان بە لەشکری ئەسکەندەر گرت. ئەو خەرەندەی ڕووبارەی پۆلواری پیادا دەهات تا ئێستەش ماوە و خەرەندێکی قووڵ و پان بوو، جیاوازیی لەگەڵ خەرەندە قووڵ و تەنگە شاخاوییەکان هەبوو، دوو لەشکر لەو خەرەندەدا دەیانتوانی پێکەوە بجەنگن.

ئاریابەرزەن تەنیا توانی سوود لە هەزار سەربازەکەی خۆی ببینێت کە چەکی قورس و گالیسکەیان نەبوو، پارتیزانە شارییەکانی بە هێزی جەنگ هەژمار نەدەکران، لە سەردەمی دوایین پاشاکانی هەخامەنشیی ئەرکی سەربازی نەما بوو، بۆیە پیاوان نەدەکەوتنە بەر مەشق و راهێنانە سەربازییەکان تا لە کاتی پێویست ئامادەییان هەبێت، سەربازەکانی ئەسکەندەر هەموویان ڕاهێندراو بوون و چەندان جەنگیان بینی بوو. ئاشکرایە ئاکامی جەنگی هەزار سەربازی پیادە لەگەڵ سەدهەزار سەرباز کە لە جەنگدا سەرکەوتوو بوونە و ورەیان بەرزە، ئاخۆ دەبێت چۆن بێت؟

پارتیزانە شارییەکان لێکدابڕان، هەندێکیان گەڕانەوە بۆ پێرسپۆلیس و لە کوشتارگەی ئەوێ بە دەست سەربازەکانی ئەسکەندەر کوژران، بەڵام سەربازەکانی ئاریابەرزەن بەپێی توانای خۆیان و تا ئەو کاتەی ئاریابەرزەن کوژرا، بەرگریان کرد. دوای کوژرانی ئەویش پاشماوەی سەربازەکانی کە توانای جەنگی لەشکری ئەسکەندەریان نەمابوو، خۆیان بەدەستەوەدا. دواتر

هیچ هێزێك نەما، جگە لە دووسەد سەربازی پاسەوانی کۆشکی پێرسپۆڵیس بە فەرماندەیی تری داتس نەبێت.

ئەسکەندەر هاتە نێو شار و فەرمانی کوشتنی تەواوی پیاوانی دەرکرد، ئەو پیاوانەی نەیانتوانی خۆیان حەشار بدەن، کوژران و هەرچی بۆ تاڵانکردن دەشیا، کەوتەدەست سەربازەکانی ئەسکەندەر، بەڵام کۆشکی پێرسپۆڵیس بەرگری کرد و سەربازەکانی ئەسکەندەر نەیانتوانی بچنە نێو کۆشك.

ئێستە کاتێك ڕووداوێك دەقەومێت، کە ئێمە خۆمان لەوێندەر ئامادە نەبین، لە کاتێکدا لەم سەردەمەدا دەژین و لە هۆکارە دەرووونییەکانی خەڵك دەزانین کە ئەو بابەتانە چۆن ڕوودەدەن، بەڵام بە چەندین جۆر باسی ڕووداوەکەمان پێ دەگات، تەنیا ئەوکاتەی ڕووداوەکە بە چاوانی خۆمان دەبینین، دەتوانین دڵنیا بین لە چۆنێتی ڕووداوەکە، بۆیە نابێت دووچاری سەرسووڕمان ببین کە لەبارەی گرتنی کۆشکی پێرسپۆڵیس لە دووهەزار و پێنج سەد ساڵ بەر لە نها، کە چەندان گێڕانەوە ببیستین.

لەوکاتەدا کە پارەمەنیۆن دەڵێت تری داتسیان لەسەر تەختە بۆ لای ئەسکەندەر هێنا تا کلیلی گەنجینەی بداتێ و نەیدایە، مێژوونووسێکی دیکە بە ناوی کولی تۆماخۆس (کە جیایە لە کولی تارخۆس) دەڵێت: "تری داتسی فەرماندەی کۆشکی پێرسپۆڵیس بە بێ جەنگ خۆی ڕادەستی ئەسکەندەر کرد".

کولی تۆماخۆس لە بنەڕەتدا خەڵکی کارتاژ بوو، دوای وێرانکردنی کارتاژ لەلایەن ڕۆمەکانەوە ڕۆیشتە یۆنان و بووە یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی ئەوێ، ئەو لە ئەکادیمیای ئەفلاتوون خوێندی، دواتر دەستی بە وانە گوتنەوە کرد، لە ساڵی (١٢٩ پ. ز) بووە سەرۆکی ئەکادیمیا و یەکەم کەس بوو کە جۆرە دەمژمێرێکی میکانیکی چێ کرد، لە ساڵی (١٢٩ پ. ز) بە دواوە ناوی ئەکادیمیای یۆنان گۆڕا بە ئەکادیمیای نوێ. کولی تۆماخۆس فەیلەسووف، مێژوونووس و پیشەوەر بوو، خودان چوارسەد پەڕتووکە، هیچ پەڕتووکێکی نەماوە، هەموو ئەوەی لەبارەی پەرتووکەکانی ئەوەوە دەیزانین بابەتی کورت و پەرت و بڵاون کە لە پەڕتووکی خەڵکانی دیکەوە هاتوون.

ئاخۆ دەبێت کامە لەو دوو گێڕانەوەیەی پارمەنیۆن و کولی تۆماخۆس پەسەند بکەین و کامیان لەم دووانە ڕاستی دەڵێن، چوونکە پایەی زانستی کولی تۆماخۆس گەورەیە، مرۆڤ وا

دەزانێت پێویستە گێڕانەوەی ئەو پەسەند بکات، بەڵام ئەو پیاوە تەنیا وتەی خەڵکی دیکە دەگێڕێتەوە و هیچی بە چاوی خۆی نەبینووە. پارەمەنیۆن خۆی لە جەنگی پێرسپۆلیس بەشدار بووە، سرووشتییە کە گێڕانەوەی ئەو کەسە پشتڕاستترە کە بە چاوی خۆی ڕووداوەکەی بینیووە.

وەك باسکرا کۆشکی پێرسپۆلیس دیواری نەبوو، واتە وەك قەڵاکان خاوەنی بورج، بەڵام بە هۆی ئەوەی کۆشکەکە لە بەرد دروست کرابوو، کاتێك دەرگەکان دادەخران کەس توانای نەبوو بچێتە نێو کۆشکەکە. وێڕای ئەوەی لەنێو کۆشکەکە پتر لە دووسەد پاسەوان نەبوو، بە هۆی پتەوی کۆشکەکەوە، هەر لەبەرئەوەش سەربازانی ئەسکەندەر نەیاندەتوانی دەروازەکانی کۆشکەکە بشکێنن، دووسەد سەرباز پێشیان بە سەدهەزار سەرباز گرت، بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە بەریان بە سەد و بیست هەزار سەربازی ئەسکەندەر گرتووە.

ئەگەر ژمارەی سەربازەکانی ئەسکەندەر بە سەدهەزار کەس ژمارە بکەین، ئەوا هەریەکە لە دووسەد سەربازەکەی کۆشك لەگەڵ پێنج سەد سەربازی ئەسکەندەر جەنگاوە کە ئەو ڕێژەیە لە جەنگەکانی جیهاندا بێ وێنەیە(٢).

دەوترێت هۆکاری هەبوونی توانای جەنگ بەرانبەر بە سەد هەزار سەربازی ئەسکەندەر لەلایەن ئەو دوو سەد سەربازەوە، دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی زرێی باشیان لەبەر بوو و کاسکێتی باشیان لەسەر و لاقبەندیان هەبوو.

ئاشکرایە ئامرازەکانی بەرگری ناتوانن سەربازان لە بەرانبەر گورزی شمشێر و تیر و نێزە بپارێزن، ئەگەر ئازایەتیی نەبێت هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت سەرباز ناچار بە بەرگری بکات.

ئەو ڕۆژەی ئەسکەندەر هێرشی کردە سەر کۆشکی پێرسپۆلیس، ڕۆژێکی گەرم بوو، هەتاو بە سەر کۆشکدا دەدرەوشایەوە، لەژێر تیشکەکانی ئەو هەتاوەی هەموو شوێنێکی ڕووناك کردبۆوە، جەنگی سەربازە باڵابەرز و چوارشانەکان بە ریشە پان و درێژەکانیان لەگەڵ سەربازە

---

(٢) زەبیحوڵڵا تەنیا بۆ بە ئازا دەرخستنی ئەو دوو سەد سەربازە ئەو پێوانەیە دەکات، لە کۆشکێکی بەردین کە کەس نەیەوێت دەرگەکان بشکێنێت، ئیتر شوێنێك نامێنێتەوە تا جەنگی لێ بکرێت، تەنانەت ئەگەر جەنگیش هەبێت لە پشت دەرگەکان دەبێت و لە پشت هەر دەرگەیەك تەنیا چەند کەسێك کە ناگاتە دەکەس دەتوانن شمشێر بوەشێنن، بەو پێوەرە لە پشت دە دەرگەوە لە هەرلایەك لە سەد سەرباز پتر لە جەنگدا نابن و ئەو پێوانەیە تەنها چیرۆك و ئەفسانەیە. "وەرگێڕی کوردی"

یۆنانییەکانی ئەسکەندەر، دیمەنێکی سەیری چێ کرد بوو، بەدەر لە رژانی خوێن، لە دیمەنە بێ وێنەکانی جیهان بووە.

سەربازەکانی کۆشك دەیانزانی سەربازەکانی ئەسکەندەر تەنیا لە دەرگەکان دەتوانن بێنە نێو کۆشك، بۆیە تەنیا لە بەرانبەر دەرگەکان وێستابوون، هەرکە یەکیان دەکوژرا، سەربازێکی دیکە جێگەی دەگرتەوە و بەردەوام دەبوو لە جەنگ، خوێن دەرگاکانی کۆشکەکە و دیوارەکانی هەردوو دەرگەکانی سوور کرد بوو. جەنگی یەك لەگەڵ پێنج سەد تا نیوەڕۆ بەردەوام بوو.

ئاریستۆپۆلۆس دەڵێت: "پێش ئەوەی جەنگ کۆتایی پێ بێت، لە لایەکی کۆشکەوە دووکەڵێکی چڕ و ئەستوور بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە"، لەوانەیە بەهۆی بەرگری ئازایانەی سەربازە بەرگریکارەکانەوە ئەسکەندەر هەوڵیدا بێت ئاگر لە کۆشکەکە بەربدات تا ناچار بن خۆیان بە دەستەوە بدەن.

کاتێك رۆژ گەیشتە نیوەڕۆ لە یەکێك لە دەروازەکانی کۆشك کە دوای تێپەڕبوون پیایدا دەگەیشتنە پلیکانی پانوپۆڕ تا ئێستەش ماوە، دوایین پاسەوان کوژرا، سەربازەکانی ئەسکەندەر توانیان لەو دەروازەیە تێپەڕ بن و بەرەو پلیکانەکان بڕۆن، لەوێندەر ئەو ژمارە سەربازانەی کە توانای بەرگریان مابوو، رێگەیان لێ گرتن، بەڵام پلیکانەکان پانتر بوون و سەربازەکانی ئەسکەندەر توانیان بە ژمارەیەکی زۆرتر هێرش بکەن، بە هۆی زۆری ژمارەیان توانیان تەواوی بەرگریکاران بکوژن، کەمێك دوای پاش نیوەڕۆ جەنگ لە تەواوی دەرگەکان بەکۆتاهات.

لە کۆشکی پێرسپۆلیس، جگە لە ژمارەیەك کەسانی بەتەمەن کە بایەخی جەنگیان نەبوو، هەموو پاسەوانانی کۆشك کوژران یاخۆ وەك تری داتس فەرماندەی کۆشك بە شێوەیەك بریندار بوون کە توانای جەنگیان نەما.

کۆشکی پێرسپۆلیس وێڕای لایەنی هونەری تەلارسازی، لایەنی ئاینیشی هەبوو، خزمەتکارەکانی لە کەسانی بە تەمەن هەڵدەبژێردران. وێڕای ئەوەی ئەو ساڵمەندانە توانای جەنگیان نەبوو، بەڵام بە فەرمانی ئەسکەندەر کوژران، چوونکە پاسەوانەکانی کۆشك خاوەن ریشی درێژی پان بوون، ئەسکەندەر بۆ جوانکاری فەرمانی کرد سەریان ببڕدرێت و هەر یەکەیان بە سەر نێزەوە لە مەودای وەکو یەك لە دەورەی کۆشك دابنرێن.

له گێڕانەوەیەکی دیکە دەوترێت سەری تری داتس وەك سەری پاسەوانانی کۆشك له جەستەی کرایەوە، له لایەکی دیکە دەوترێت بەهۆی ئامادەنەبوونی بۆ پێدانی کلیلەکانی گەنجینه به ئەسکەندەر به زیندوویی پێستی له جەستەی داماڵدرا، دوا گێڕانەوەش دەڵێت به هۆی ئەمەکداربوونی بۆ پاشای هەخامەنشیی، کەوته بەر لێخۆشبوونی ئەسکەندەر.

دوای ئەوەی هەموو ئەو کەسانه کوژران که له کۆشك بوون، تالآنی کۆشکەکە لەلایەن خودی ئەسکەندەرەوە دەستی پێکرد.

وەك لەو بەشەدا باسمان کرد که تایبەت بوو به کاری تەلارسازی ئەو کۆشکە لەلایەن داریوشی یەکەم، لەو کۆشکەدا جگە له زێڕ و گەوهەر و فەرشی گرانبەها، کۆمەڵێك پەیکەری جوان هەبوو که لەلایەن پەیکەرتاشە یۆنانییەکانەوە دروست کرا بوون، ئەسکەندەر هەریەکە لەو پەیکەرانەی که دەتوانرا بگوازرێتەوە، ناردەوە یۆنان، ئەوانەش به هەموو ئامێرێك گواستنەوەیان سەخت و دژوار بوو، به بەردی مەنجەنیق تێك شکێندران تا شوێنەواری هونەری یۆنان لەو کۆشکە نەمێنێت.

ئەو کردەوانه و بڕینی دارەکانی باخی پێرسپۆلیس، کارێك نەبوو، که وەك کەوتنەوەی ئاگر له کۆشکەکە به هەڵە و ڕووداو دابنرێت و بڵێن ئەسکەندەر به ئەنقەست ئەو کۆشکەی وێران نەکردووە.

له دەوروبەری کۆشکەکە باخێك هەبوو که ئەگەر له بەیانی کەوتبایەڕێ تا دوای نیوەڕۆ پێویست بوو ڕێ بکەیت تا چوار دەورەی بگەڕێیت، به فەرمانی ئەسکەندەر تەواوی دارەکانی ئەو باخە له داری میوە و داری بێ بەر هەموویان بڕدران، کەس نەیوێرا پێی بڵێت دەست له بڕینەوەی دارەکانی میوە هەڵبگرێت، بەڵآم هەمووان دەیانزانی ئەو بۆیە دارەکانی میوە دەبڕێت تا له داهاتوو ئێرانییەکان نەتوانن له میوەکانیان بخۆن.

ئەسکەندەر به پێچەوانەی ئەوەی باس دەکرێت له ڕۆژی سێیەمی داگیرکردنیدا کۆشکی پێرسپۆلیسی سووتاند. ئاریستۆپۆلۆس دەڵێت ماوەی چل ڕۆژی خایاند تاکو ئەوەی دەیانەویست و پێویست بوو له کۆشکەکە دەری بهێنن و بەتایبەتی زێڕ و زیو و خشڵەکانی نێو کۆشك.

کۆلی تۆماخۆس دەڵێت لەو کۆشکە خشڵی ڕووت نەبووە، ئەوەی هەبووە هەمووی لەسەر دەرگە، دیوار و ئاگرخانه هەڵواسرابوون، کۆشکی پێرسپۆلیس ئاگرخانەیەکی هەبووە که

بەردەوام ئاگری لێبووە. ئەو گێڕانەوەیەی کولی تۆماخۆس تەواوکاری گێڕانەوەیەکە کە لە یەکێك لە بەشەکانی پێشوو سەبارەت بە ڕاپەرینی ئاگرخانەکان لە دوای ئەردەشێری دەستدرێژ باسکرا، چوونکە هەندێ لە مێژوونووسان باوەڕیان وابوو کە ئاگرخانە لە سەردەمی ساسانییەکان هاتە کایەوە و پێش ئەو کاتە لە ئێران نەبووە.

ئەگەر لێکۆڵەرانی ئێمە ئێستە بچنە ئاگرخانەی چیچەست لە تەنیشت دەریاچەی ورمێ و ئاگرخانەی شاخی تەختی سلێمان و ئەو ئاگرخانەی هێشتا هەندێ لە بیناکەی لە فارس ماوە و هەندێ لە خۆڵی بینای ئاگرخانەکە یاخۆ ئەوەی لەژێر زەوی ماوەتەوە بە هۆی (کاربۆنی ١٤) بخەنە بەر ئەزموون، دەردەکەوێت کە ئەو ئاگرخانانە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان هەبوونە یاخۆ نا، چوونکە کاربۆنی ١٤ تەمەنی بیناکان و شتومەك بە لانی کەم تا چواردە هەزار ساڵ دیاردەکات. هەڵبەت لە ڕابردوودا تەنیا تا چواردە هەزار ساڵ دیاردەکرا و ئێستە باشتر دەتوانن لە کاربۆنی ١٤ بۆ ئەو مەبەستە سوود وەربگرن.

بە گشتیی ئەو باسانەی تا ئەمڕۆ توانیومانە سوودیان لێ وەربگرین و خستوومانەتە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز، نیشاندەری ئەوەن کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان ئاگرخانە لە ئێران هەبووە و لایەنی پاکی هەبووە، ئەگەر لە سەرەتاشدا بۆ هەڵگرتنی ئاگر و پێکردنی مەشخەڵ بەکار هاتبێت.

لە پێرسپۆلێس خشڵی گرانبەهای بەردەست نەبووە، ئەوەی هەبووە لەسەر دەرگە، دیوار و ئاگرخانە هەڵواسرا بوو، ئەسکەندەر دەستی گرت بەسەر تەواوی ئەو خشڵە گرانبەهایانەی سەر دەرگە و دیوار و ئاگرخانەکان ڕەوانەی یۆنانی کردن. ئەو زێڕ و زیو و خشڵانەی لە پێرسپۆلێس بوون بە پێنج هەزار وشتر و دوو هەزار ئەسپ و ئێستر لەوێندەر گواسترانەوە بۆ دەرەوە.

فەرشە گرانبەهاکانی کۆشکیش بە پێنج سەد گالیسکەبارکران، هەندێکیان گوایە بۆ یۆنان بردران، گالیسکەکان دەیانتوانی لە پێرسپۆلێس بچنە کەنارەکانی دەریای مەڕمەڕە لە ڕۆژئاوای تورکیای ئێستە تا فەرشە قورس و گرانبەهاکان لە کەشتییەکان بار بکرێن و بنێردرێن بۆ یۆنان، ڕێگەی بە ناوبانگی پاشایەتیی کە ئێستە بە شاریٚ ناسراوە، پێرسپۆلێسی بە ساردی پایتەختی لیدی دەبەستەوە، لەوێشەوە دەچۆوە کەناری دەریای مەڕمەڕە.

دوای چل ڕۆژ و بردنی هەموو ئەو شتانەی دەتواندرا بگوازرێنەوە، ئەسکەندەر بڕیاری وێرانکردنی کۆشکی پێرسپۆلیسیدا کە هێمای شکۆ و گەورەیی پیشەسازی و هونەری ئێران و پێشانگەیەکی پیشەسازی و هونەری بوو.

ئەو ڕۆژەی بە فەرمانی ئەسکەندەر ئەو کۆشکە وێران دەکرا، میواندارییەکی گەورە ساز درا، کوڕ و کچێکی گەنجی ئێرانی وەك قوربانی بۆ زێئۆس خوداوەندی گەورەی یۆنانییەکان سەربڕان، وەك ئەوەی ئەو هەموو خوێنەی ئەسکەندەر ڕشتنی بەس نەبوو بێت.

پرسیارێك بە مێشکماندا دێت کە مادام ئەسکەندەر دەیویست ئەو کۆشکە وێران بکات بۆ بە قولینگ ئەو کارەی نەکرد و ڕووی لە ئاگر کرد بۆ بە ئەنجام گەیاندنی؟، وەڵامیش ئەوەیە ئەو کۆشکە هێندە بە پتەوی چێ کرابوو کە ئەسکەندەر دەیزانی بە کولینگ ناتوانێت ئەوکارە بکات.

بەڵگەی پتەو و قایمی ئەو کۆشکەش ئەوەیە کە ئێستە لەبەر چاوانە، دووهەزار و پێنج سەد ساڵ لە هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئەو کۆشکە تێپەڕیوە، لەو ماوەیەدا دوژمنان و دۆستە نەزانەکان بەپێی توانا کۆششیان کردووە بۆ لەنێوبردنی، کەچی هێشتا هێندە لەو کۆشکە ماوەتەوە کە گەورەیی و شکۆی ئەو کۆشکە بە دیار بخات.

بۆ لەنێوبردنی کۆشك، هێندەی توانایان هەبوو، کۆشکەکەیان پڕ کرد لەو کەرەستانەی بە چاکی دەسووتێن. لەوکاتەدا کە سەربازەکانی ئەسکەندەر کۆشکەکەیان پڕ دەکرد لە دار و لۆکە و پەڕۆ کۆنی چەورکراو بە ڕۆن، ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی دانیشتبوون و میوانداریيان دەکرد و خواردنیان دەخوارد. دوور نییە ئەسکەندەر یەکێك لەو ژنانەی لەوێندەر بوون مەشخەڵێکی ئاگری دابیچتە دەستییەوە، بۆ ئەوەی سووتاندنەکە دەست پێبکات، ئەو بەشەی لەگەڵ ئەو کەسانە ڕێك بخات کە بەچاوی خۆیان ڕووداوەکەیان بینیوە.

ئێوارەخوانە میوانداریيەکە لەلایەن ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی سەر لە ئێوارە دەستی پێکرد، بۆیە دەتوانین گێڕانەوەکانی مێژوونووسان لەبارەی ئاگرکەوتنەوە لە نیوەشەودا بە دروست بزانین، لەوانەشە تەنیا درێژەکێشانی کاتی میوانداریيەکە ئاگرکەوتنەوەکەی نەخست بێتە کاتی نیوەشەو، بگرە ئەسکەندەر بە ئەنقەست ویستبێتی سووتانی کۆشکەکە لە کاتی شەودا ببینێت، چوونکە زانیویەتی ئاگرەکە بە زوویی پەرەدەستێنێت، ئەوانەی نێزیك بن دەیانسووتێنێت، هەرکە ئاگرەکە کەوتەوە ئەسکەندەر و تەواوی ئەوانەی لە خوانەکە بوون بە خێرایی لە کۆشکەکە دوور کەوتنەوە و چوونە دامێنی شاخێکی نێزیك تا بە باشی سووتانی

کۆشکەکە ببینن، لەوانەیە ئەو شاخەی ئەسکەندەر و هاوڕێکانی چوونە دامێنی، شاخێك بێت بە ناوی (ڕەحمەت) کە لەوێوە وێرانەکانی ئەو کۆشکە بە چاکی دەبینرێت.

ئەو شەوە تا بەرەبەیان ئەسکەندەر و هاوڕێکانی سەرگەرمی تەماشاکردنی سووتانی کۆشکی پێرسپۆلێس بوون، دوای ئەوەی دنیا ڕووناك بوو، بۆ نووستن ڕۆیشتن، ئاگر هێندە بەردەوام بوو تا هەموو ئەو شتانەی لەنێوبرد کە سووتانیان سانا بوو، لەو ڕۆژە بە دواوە ئەسکەندەر لای ئێرانییەکان بە (گەجەستەك)، بە واتای (نەفرەت لێکراو) ناسرا.

کاتێك ئەسکەندەر کوشتاری خەڵکی شووشی کرد، ئێرانییەکان ئەو ناوەیان بەسەردا نەبڕی، بگرە ئەو دەمەی خەڵکی پێرسپۆلێسیشی کوشت، ئەو ناوەی بۆ دانەنرا، بەڵام کاتێك ئەو کۆشکەی وێران کرد ئەو ناوەیان بەسەردا بڕی، ئێستەش کاتێك زەردەشتییەك ناوی ئەسکەندەر دێنێت بە (گەجەستەك) ناوی دەبات، دوای وێرانبوونی کۆشکی پێرسپۆلێس هەموو ئێرانییەکان وتیان کە ئەو کەسەی کۆشکەکەی وێران کرد، لە تەمەنی لاویدا دەمرێت، هەروا بوو، ئەسکەندەر هیچ وەچەی نەخستەوە و جوانەمەرگیش بوو. ئێرانییە کۆنەکان مەزنترین بەدبەختیان لەوەدا دەبینی کە مرۆڤ وەچە نەخاتەوە، باوەڕیان وابوو ئەو پیاوەی وەچە نەخاتەوە، کەسێکی مردووە.

ئەسکەندەر دوای ئەوەی پێرسپۆلێس وێران بوو، هەستی بە پەشیمانی دەکرد، هەوڵیدا تا تۆڵەی وێرانکردنی شووش و پێرسپۆلێس بکاتەوە، کە دوو پایتەختی گەورەی ئێران بوون، بۆیە هەوڵی دا چەند شارێك لەو وڵاتە دروست بکات، بۆ ئەو مەبەستە (دی نۆکرات) ئەندازیاری تایبەتی خۆی بانگ کرد و ڕایسپارد تا بەو پارەیەی لە شووش و پێرسپۆلێس بە تاڵان برابوو، دەشار و بەپێی هەندێ وتە بیست شار چێ بکات.

بە وتەی مێژوونووسان ئەسکەندەر لە هەریەکە لە ناوچەکانی فارس، کرمان و بلوچستان دوو شار و لە باکتریا سێ شاری دروست کرد، لە شوێنەك انی دیکەیشهەندێ شاری دامەزراند. ئێستە ئێمە زانیاریمان لەبارەی شوێنی هیچ یەکێك لەو شارانە نییە، تەنیا قەندەهار نەبێت کە بە وتەی یۆنانییەکان لە شارەکانی ئەسکەندەرە و هێشتا ماوەتەوە، بەڵام قەندەهاری ئێستە ئەو قەندەهارە نییە کە ئەو بینای کرد، چوونکە دی نۆکرات ئەو نەخشەیەی بۆ شارەکانی ئەسکەندەری دانابوو، لە نەخشەی کوروشی گەورەوە وەرگرتبوو، لە قەندەهاری ئێستە شوێنەواری ئەو نەخشەیە بەرچاو ناکەوێت، بەڵام هێشتا لە ئەسکەندەرییەی میسر پاشماوەی نەخشەی دی نۆکرات بەرچاوە.

سەیر ئەوەیە لە مێژووی سلوکییەکان کە جێنشینەکانی ئەسکەندەر بوون لە ئێران، ناوی ئەو شارانە نابینین کە ئەسکەندەر دروستی دەکردن و لە جیاتیان ناوی شارە سلوکییەکان لە مێژوودا دێت، ئێستەش زانیاریمان لەبارەی هەندێکیان هەیە کە یەکێکیان لە کەناری ڕووباری دیجلەیە، یەکێکی دیکە لە کەناری کارۆن و یەکێکی دیکەش لە تەنیشت ڕووباری تەجەن بوو، زانیاریمان لەبارەی شارەکانی دیکەی سلوکی نییە. ئایا ئەو شارانەی لە مێژووی رابردوو بە سلوکی ناو دەبرێن، هەمان شارەکانی ئەسکەندەرن، کە سلوکییەکان دواتر ناوی خۆیان خستە سەریان، تەنانەت پێشەنگبوونی ئەسکەندەریشیان لەبیر کردووە؟، یاخۆ شاری نوێبوون و لەلایەن خۆیانەوە چێ کران؟، یان ناوی ئەو شارانەیان گۆڕی کە هەبوون و کردوویانەتە ناوی خۆیانەوە.

ئەسکەندەر لەو رۆژەوە کە هاتە ئێران لە هەوڵی لەنێوبردنی وەچەی ئێران و گۆڕینی بۆ وەچەی یۆنان بوو، دوو ڕێگری لە بەردەمدا هەبوون، یەکێکیان زمانی ئێرانیان و ئەوەی دیکەیان ئاینەکەیان بوو. لەوانەیە پرسیار بکرێت کە بۆچی ئەسکەندەر ویستوویەتی ئێرانی بکاتە یۆنانی.

وەك دەوترێت ئەوە ئامۆژگاری ئەرستۆی مامۆستای بووە بۆ ئەسکەندەر، کە لە جیهاندا پێویستە یەك زمان و یەك ئاین و یەك یاسا هەبێت، کە ئەویش یۆنانییە. ئەوەی ئەرستۆ بە قوتابییەکەی خۆی وت سەرچاوەکەی لە پەڕتووکی (شارە نموونەیەکەی) ئەفلاتوونی مامۆستای وەرگرتبوو. ئەفلاتوون دەیەویست جیهانێك چێ بکات، لەنێویدا ستەم و جیاوازیی چینایەتی نەبێت، بەڵام کۆیلە بۆ خزمەتکاری خاوەنەکەی هەبێت. ئەرستۆ کە لە دوای مامۆستاکەی بناخەی فەلسەفەی (پیاسەکەران)دانا سوودی لە بیرۆکەی مامۆستاکەی وەرگرت.

ئەسکەندەر دوای وێرانکردنی پێرسپۆڵیس، فەرمانی کرد تا لە خۆزستان و فارس ئاگرخانەکان بکوژێننەوە و هەمووان بە زمانی یۆنانی بئاخڤن، چوونکە خەڵك نەیاندەتوانی بە زمانی یۆنانی قسان بکەن، ماوەی سێ ساڵان بۆ فێربوونی ئەو زمانە دیاری کرا، دەبووایە لەو ماوەیەدا هەمووان بکارن هێندەی پێویستیان دەبێت زمانی یۆنانی فێر بن. دوای ئەوە هەر دەڤەرێك کە دەکەوتە ژێردەست ئەسکەندەر ئەو فەرمانە بێ بەزەییانە جێبەجێ دەکرا، بەڵام لەو بەشانەی ئێران کە کەوتنە ژێردەستی ئەسکەندەر، خەڵك بەردەوام بوون لەسەر قسەکردن بە زمانی فارسی هەخامەنشیی، چوونکە خەڵکی یۆنانی زان کەم بوون و هێندە نەبوون تا خەڵك لێیانەوە زمانی یۆنانی فێر ببێت، بۆیە ئەسکەندەر هەندێ لە سەربازەکانی لەو شوێنانە

بەجێ هێشت تا ببنە مامۆستای خەڵك و بەپێی پێویست زمانی یۆنانیان فێر بکەن. بۆیە نابێت بە لامانەوە سەیر بێت کە دوای بیست ساڵ کاتێك (سی پۆدۆنس) گەڕیدە و نەشتەرگەری یۆنانی سەفەری بۆ ئێران کرد، دەیبیست کە هەمووان بە زمانی یۆنانی دەدوێن، دیسان مایەی سەرسووڕمان نییە، کە ڕێنووسی فارسی هەخامەنشیی لەنێوچوو، خەڵك بە ڕێنووسی یۆنانیان دەنووسی.

کوروشی گەورە دەچووە هەر وڵاتێك بە جلوبەرگی ئەوان دەچۆوە پەرستگەکانیان و ڕێزی لە خوداوەندکانی ئەوان دەگرت، تا تێیان بگەیەنێت کە ئاین ئازادە. وێڕای ئەوەی زمانی کوروش فارسی بوو، بەڵام تەواوی کەتیبەکانی بە هەر سێ زمانی (فارسی، عیلامی و بابلی) دەنووسییەوە تا نیشانی بدات سەرەڕای ئاین، زمانی نەتەوەکانی دیکەی بەلاوە گرینگە، بەڵام ئەسکەندەر دوای سەرکەوتن بەسەر ئێران و لەنێوبردنی هێزی دەریاییەکەی، یەکەم کاری وەلاوەنانی زمانی فارسی بوو، بەڵام نەیتوانی ئاین و یاساکانیان وەلا بنێت.

خەڵك چوونکە ناچار بوون بە یۆنانی بدوێن، خۆپارێزیان دەکرد و لە شوێنە گشتییەکان بە یۆنانی دەدوان، بەڵام کاتێك خۆمانە بوونایە بە زمانی فارسی دەدوان. هەروەها لەبارەی ئاینەکەیان خۆپارێزبوون، بۆ ئەوەی ئەسکەندەر و دواتریش جێنشینەکانی بیانوویان بۆ ئازاردانی ئەوان دەست نەکەوێت، بە رواڵەت خۆیان بە شوێنکەوتووانی ئاینی یۆنان نیشان دەدا و وایان دەردەخست کە خوداوەندیانی یۆنان دەپەرستن، بەڵام لە دەڕووندا هەموویان مەزدا پەرەستبوون.

لە باسی ڕووداوەکانی داریوشی یەکەمدا وتمان کە ئەو ئاڤێستای لە زمانی باختەری وەرگێڕایە سەر زمانی فارسی هەخامەنشیی تا هەڵێنجانی ڕێسا ئاینییەکان بە تەنیا لە دەست مووغەکان نەبێت. لەو ئاڤێستایە وەرگێڕدراوە یەکێکیان لە پەڕتووکخانەی کۆشکی پێرسپۆلیس و ئەوی دیکەیان لە پەڕتووکخانەی ئاگرخانەی چیچەست بوو، بەڵام پەڕتووکەکانی پەڕتووخانەی چیچەستیش لەلایەن یۆنانییەکانەوە سووتان و ئاڤێستاکەی ئەوێش سووتا. دوای ئەوە ئێرانییەکان چی دیکە پەڕتووکی ئاینیان نەبوو، تەنیا سوودیان لە بیری ئەو کەسانە وەردەگرت کە ئاڤێستایان خوێند بووە یاخۆ هەندێ لە بەشەکانیان لە بیرمابوو.

ئەوانەی هەندێ بەشی ئاڤێستایان لەبیر مابوو، نەیاندەتوانی ئەو بەشانە بنووسنەوە تا لانی کەم ئەو بەشانە بۆ نەوەکانی داهاتوویان بمێنێتەوە، چوونکە ئەگەر نووسینێك لە ئاڤێستا کەوتبایە

بەردەستی یۆنانییەکان، خاوەنەکەیان دەکوشت جا ئەگەر خاوەنی بووایە یاخۆ یەکێکی دیکە بووایە.

ئایا ئەوکاتەی حکوومەتی یۆنانییەکان لە ئێران لەنێوچوو، ئەشکانییەکان دەسەلاتیان گرتە دەست، لەو ماوەیەدا کە چوارسەد ساڵی خایاند، ئێرانییەکان خودان پەڕتووکی ئاینی بوون؟، لەو بارەوە ناتوانین ڕای خۆمان دەربڕین، چوونکە بەڵگەی مێژووییمان لەبەردەستدا نییە، بەلام دەتوانین بڵێین ئێرانییەکان خاوەنی ئاینی مەزداپەرەستی بوون، لەوانەیە ئەو بەشانەی ئاڤێستا کە لە بیری خەڵکدا مابۆوە، لە سەردەمی ئەشکانییەکان نووسرابێتەوە و کەوتبێتە بەردەستی خەڵکی.

وێڕای ئەوە ناتوانین بڵێین لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا ئاڤێستا لە بەردەستی خەڵك بوو، ئەگەر هەبووایە ئەردەشێری یەکەم ناچار نەدەبوو بۆ کۆکردنەوەی ئاڤێستا سەختی ببینێت و داوا لە (تەنسێر) زانای ناسراو بکات تا ئەو کارەی بۆ بکات. تەنسێر بۆ کۆکردنەوەی ئاڤێستا لە سەردەمی ئەردەشێری دامەزرێنەری زنجیرەی پاشایەتیی ساسانییەکان و ماوەی پاشایەتیی شاپووری یەکەم زۆر سەختی بۆ ئەو کارە چەشت و هەموو ئەو کەسانەی کۆکردەوە کە بەشە جیاکانی ئاڤێستایان بیر مابوو، چوونکە وای بیر دەکردەوە کە ئەگەر لە هەر کەسێك تەنیا بەشێکی کەم لە ئاڤێستا ببیستێت، سەرکەوتووە.

لەو دەمەی سووتاندنی ئاڤێستای پێرسپۆلیس و ئاڤێستای چیچەست لەلایەن ئەسکەندەرەوە ئەنجام درا، نێزیکەی شەش سەدە تێپەڕ ببوو، هەموو ئەوانەی ئاڤێستای سەرەکییان ئەزبەر بوو مردبوون. هەر ئەو تێپەڕبوونەی شووش دوای شەش سەدە نیشاندەری ئەوەیە کە ئەشکانییەکان هەندێ لە بەشەکانی ئاڤێستایان نووسیوەتەوە، ئەگەرنا تەنسێر چۆن دوای شەش سەدە دەیتوانی لە زمانی خەڵك بەشەکانی ئاڤێستا ببیستێت.

لە لایەکی دیکە لە بەڵگەنامە مێژووییەکاندا هاتووە کە تەنسێر و هاوکارەکانی هەندێ بەشی ئاڤێستایان لەبەر گرتەوە. کەواتە دەردەکەوێت کە هەندێ بەش لە ئاڤێستا هەبووە، بۆ ئەوەی ئەوان بکارن لەبەریان بگرنەوە. هەندێکیش لە بیری پێشەوا ئاینییەکان وەرگیرا، لە ڕۆژهەلات ئەزبەر کردنی پەڕتووکە ئاینییەکان برەوی هەبوو.

لە تۆژینەوەکانی (ماکس مۆلەر)ی لێتۆژی ڕۆژهەلاتناسی ئەڵمانی  لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم لەبارەی پەڕتووکی (ریگ وەدا) مەزنترین پەڕتووکی ( ریگ وەدا) ئاینی

کۆنی هیندییەکان بە ئەنجامی گەیاند، دەرکەوت هەزاران ساڵ پێش داهێنانی رێنووس، ناوەرۆکەکەی لە سینگ بۆ سینگ گواستراوەتەوە، (بەرهەمەن) واتە پێشەوا ئاینییەکانی ئەو ئاینە لەو ماوە درێژەدا پەڕتووکی ریگ وەدایان لەبەر کردووە بێ ئەوەی بینووسنەوە.

دەبێت سەرەنج بدەین کە پەڕتووکی ریگ وەدا و سێ پەڕتووکی دیکەی ئاینی هیندییەکان کە بایەخیان لەو پەڕتووکە کەمترە بە زمانی سانسکریت بووە کە زمانی کۆنی هیندییەکانە و لە ماوەی هەزاران ساڵ کەس هەوڵی لەنێوبردنی ئەو زمانە و دانانی زمانێکی دیکەی لە جیاتی نەدا. لە کاتێکدا ئەسکەندەر و جێنشینەکانی زمانی فارسی هەخامەنشییان کە زمانی نووسینی ئاڤێستا[٣] بوو، لەنێوبرد و زمانی فارسی لە نیوەی دووەمی پاشایەتیی یۆنانییەکان واتە سلوکییەکان، بە تەواوی بە فەرمی نەمابوو.

وێڕای ئەوەش ئەو بابەتە بە تەواوەتی رەت ناکەینەوە کاتێك تەنسێر و هاوکارەکانی ئەو ئەرکەکەیان ئەنجامدا، لەوانەیە کەسانێك هەبووبن کە ئاڤێستایان لەبیر مابێت، وەك وتمان ئەو بابەتانە لەنێو نەتەوە رۆژهەڵاتییەکان هەبووە، لە لایەکی دیکە بەشێك لە ئاڤێستا سەرچاوەی لە (وەدا) وەرگرتووە، دیسان شاراوە نییە کە رەگی زمانی فارسی هەخامەنشیی گەڕاوەتەوە بۆ زمانی سانسکریتی هیندی کە تا ئەم دواییانە بە زمانە مردووەکانی جیهان دەناسرا.

لە سەدەی نۆزدەیەم بە دواوە بەرەبەرە لە هیندستان دەتوانرێت بگوترێت کە سانسکریت زیندوو کرایەوە، ئێستە لەنێو زمانناسە هیندییەکان زمانی سانسکریت قسەی پێ دەکرێت.

ئەو ئاڤێستایەی تەنسێر بە پشتیوانی دوو پاشای ساسانی (ئەردەشێر و شاپوور) کۆی کردەوە، بۆ زمانی فارسی ساسانی (پەهلەوی ساسانی) وەرگێڕدرا و بە (زەند) دەناسرا. زەند لە دەست بارودۆخەکان نەپارێزرا و هێرشەکانی دوای ئەو سەردەمە هەندێ بەشیان لەنێوبرد، بەڵام ئەوەی مایەوە لە روانگەی مێژوویی و زمانناسی و پەیبردن بە باوەڕە ئاینییە کۆنەکانی ئێرانییەکان زۆر بە بایەخ بوو، هەر ئەو زەندەیە کە لەلایەن (دارمێس تەتر) بە ناوی ئاڤێستا

---

(٣) پیشتر لەو پەڕتووکەدا لە لایەن زەبیحوڵڵاوە باس کرا، کە ئاڤێستا بە زمانی باختەری بوو، ئێمەش بەڵگەمان خستەروو کە بە زمانی کوردی بووە، نەك باختەری، تەنانەت خۆشی چەند جارێك دەڵێت کە وەرگێڕاوی ئەو پەڕتووکە بە زمانی فارسی هەخامەنشیی بووە. "وەرگێڕی کوردی"

بۆ زمانی فەرەنسی وەرگێڕدرا، هەر ئەوەشە کە خوالێخۆشبوو (ئیبراهیم پوور داوود) مامۆستای زانکۆ لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێشوو بە ناوی ئاڤێستا کردییەوە بە فارسی.

بە کورتی گریمانێکی خەیاڵی واتە گریمانێك، تەنانەت لە بیست و سێ سەدە پێش نها بە کردەنی بوونی ئەستەم بوو، بووە هۆکاری ئەوەی ئەسکەندەر بچێتە هەر شوێنێك، دەخوازێت ئەوێ بە یۆنانی بکات، لەوانەیە بەو هۆیەوە کە ئێرانییەکانی لە تەواوی نەتەوەکانی دیکەی بە سەرسەختتر زانیبێت بۆ بوون بە یۆنانی، بۆیە زمان و ئاین و یاساکانی ئەوانی یاساخ کرد، بەڵام ئەسکەندەر تەنیا توانی زمانی ئێرانییەکان[٤] بخات و زمانی یۆنانی بکاتە جێگرەوەی ئەو زمانە، پاش ئێران ئەو وڵاتەی لە هەمووان پتر دووچاری گۆڕینی زمان بۆوە میسر بوو، لەوێندەر زمانی میسرییەکان وەلانرا و یۆنانی جێگەی گرتەوە. ناوچەیەکی دیکە بە هۆی تووندڕۆییەکانی ئەسکەندەر و جێنشینەکانی دووچاری گۆڕانکاریی زمان هاتن ئاسیای بچووك بوو، لەوێندەریش زمانی یۆنانی جێگەی زمانەکانی ئەو دەڤەرانەی گرتەوە.

لە ئێران دەسەڵاتیی زمانی یۆنانی بە ناوی زمانی خودان پێنووسەکان تا ماوەیەك دوای لەنێوچوونی حکوومەتی یۆنانییەکان لە ئێران بەردەوام بوو، تەنانەت لەنێوەڕاستەکانی دەسەڵاتیی ئەشکانییەکانیش لە کەتیبەکاندا بە دوو زمان دەنووسران، یەکێکیان یۆنانی و ئەوی دیکەیان پەهلەوی ئەشکانی بوو، واتە زمانی فارسی ئەشکانی، بەڵام ڕەنگە لە هەندێ دەڤەرەیلی ئێران کە دوور بوون لە نێوەندەکانی کولتوور و شارستانییەت، زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی هەبووبێت و خەڵك بەو زمانە دوابن.

---

(٤) بە داخەوە تا ئێستەش ئەو کێشە خراپ و ناکامە هەیە، کە فارسە بەڕێزەکان زمانی خۆیان بە زمانی ئێرانی ناودەبەن، ئەوانی دیکەش بە زاراوەی ناوچەیی دەناسێنن، لە کاتێکدا زمانی کوردی و بلوچی و ...هتد لە ئێران هەیە و هەبووە، تەنانەت کوروش کە فارسەکان زۆر شانازی پێوە دەکەن لە وتارە مێژووییەکەی دان بەوەدا دەنێت کە لە مادەکان زۆر شت فێربووە،یەکێکیان ڕێنووسەکەیان بووە، کە سی و شەش پیت بووە و فێربوونی ئاسانتر بووە لە ڕێنووسی فارسی ئەوکات، بەڵام هەمان کار کە یۆنان بەسەر زمانی فارسیان هێنا، پێشتر بە شێوەیەکی دیکە بەسەر مادەکان هاتوو، ئەو پێکهاتە ڕەسەنە هەوڵی سڕینەوەی درا و تا ئێستەش ئەو هەوڵە بەردەوامە. "وەرگێر بۆ کوردی"

دوای هێرشی عارەبانیش بۆ سەر ئێران زمانی پەهلەوی ساسانی لە هەندێ دەڤەرەیلی ئێران هەر مابووە، بەڵگە مێژووییەکان دەریان دەخست کە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا هێشتا لە هەندێ شوێنی ئێران خەڵك بە زمانی پەهلەوی ساسانی دەئاخڤین، لە سەدەی چوارەمی کۆچیش زمانی خەڵکی ڕەی کە تارانی ئێستە یەکێك لە گوندەکانی بوو برێتی بوو لە زمانی پەهلەوی ساسانی.

# له ئەكباتان تا باختەر

ئەسكەندەر دوای ئەوەی پێرسپۆلیسی پایتەختی گەورەی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشییەكانی كردە گۆڕەپان و پێباز و تالآنی لەشكركەی، هێندە لەو شارە نەمایەوە و رێگەی ئەكباتانی گرتەبەر.

پێویستە ئەوە بڵێین كە سەرداره سەركەوتووە مەكدۆنییەكە ئەو لەشكركێشییەی كرد، لەوانەیە هەستی بەو مەترسییە كردبێت، لەلایەن داریوشی سێیەم بۆ سەر ئەكباتان، لەوانەشە بۆ چاوچنۆكی ئەو سەرمایە خەیاڵییەی ئێران كە لە ئەكباتان و لەبەردەستی داریوشی سێیەم بوو، بەرەو پاسارگاد نەچووبێت، دوای گەڕانەوەی لە داگیركردنی هیندستان و رۆیشتنی بەرەو بابل واتە میزۆپۆتامیا بوو، لەسەر رێگەی خۆیدا رۆیشتە پاسارگاد بۆ سەر گۆڕی كوروش.

ئەسكەندەر كاتێك لە پاسارگاد بۆی دەركەوت، لە نەبوونی ئەودا گۆڕی كوروش تالآن كراوە، یۆنانییەكانی زۆر سەرزەنشت كرد.

بە وتەی مێژوونووسەكان، ئەسكەندەر ویستی نێو گۆڕەكە ببینێت، بەڵام كاتێك دەرگەی گۆڕەكەیان كردەوە و بینی كەلوپەلە بە نرخ و دەگمەنەكان دزراوە، تەنانەت تابوتەكەیان شكاندووە و ویستوویانە تەرمەكەی بدزن و بۆ لایەكی دیكەی ببەن، زۆر خەمبار بوو، فەرمانی بە ئاریستۆپۆلۆس كرد بۆ ئەوەی پاشماوەی تەرمەكەی كۆ بكاتەوە و بیخاتەوە نێو تابوتەكەی، گۆڕەكەی رێك بخاتەوە، بە شێوەیەك كە شایستەی ئەو بێت و مۆری ئەسكەندەری لێ بدات، ئەویش وەهای كرد، (مێژوونووسان نووسیویانە كە ئەسكەندەر دامەزرێنەری زنجیرەی پاشایەتیی هەخامەنشیی ستایش كرد).

سەرئەنجام ئەسكەندەر لە بەهاری ساڵی (٣٢٠ پ. ز) بەرەو ئەكباتان رۆیشت.

داریوشی سێیەم لە هەوڵی ئامادەكردنی لەشكر بوو، ماوەیەك لە ئەكباتان بوو، لەو ماوەیەدا لەگەڵ بەسۆس فەرمانڕەوای باختەر و ژمارەیەك لە گەورانی كۆشك بە لەشكرێكی كەم كە توانیبووی ئامادەی بكات، لە ئەكباتان بەرەو باختەر كەوتبۆوە رێگە.

ئەسکەندەر ئەو شارانەی دەکەوتنە سەر ڕێگەی داگیری دەکردن، کاتێك گەیشتە ئەکباتان داریوشی سێیەم لەوێندەر ڕۆیشت بوو، ئەسکەندەر ئەوەی لە گەنجینە تالآنکراوەکانی ئێران لە لای مابوو، بۆ یۆنانی نەناردەوە، خستییە بەردەستی پارەمەنیۆن، شەش هەزار سەربازی پیادەی مەکدۆنی بۆ پاسەوانی بەجێهێشت و کەوتە دووی داریوشی سێیەم.

داریوش هێشتا لە بیری ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەسکەندەردا بوو، دەیەویست هێزەکانی لە باختەر کۆبکاتەوە، لە نێزیك شاری دامغانی ئێستە، لەلایەن بەسۆس و چەند کەسێکی دیکە لە هاوڕێکانی دەستگیر کرا، ئەوان هێندەیان لێدا تا بە سەختی بریندار بوو.

ئەسکەندەر ڕاوەدووی داریوشی دەنا لە سەرزەوییە پانوبەرینەکانی بەردەستی هەخامەنشییدا دەڕۆیشت، لەسەر ڕێگەی خۆی کۆمەڵە شارێکی زۆری بە جەنگ و کوشتار یاخۆ بە بێ جەنگ خستە ژێر رکێفی خۆی، سەرئەنجام کاتێك گەیشتە داریوش بە هۆی سەختی برینەکانییەوە مرد بوو.

ئەسکەندەر بە بینینی دوایین پاشای هەخامەنشیی لەو دۆخە دڵتەزێنەدا خەمبار بوو، فەرمانی کرد تەرمی ئەو پاشا هەڵاتووە، چارەنووس ڕەشە بە ڕێزەوە ببەنە پارس و لەوێندەر بینێژن. بەسۆس کە لەگەڵ هاوڕێکانی بە خێرایی بەرەو باختەر ناوەندی حکوومەتەکەی دەڕۆیشت، دوای کوشتنی داریوشی سێیەم خۆی بە داریوشی چوارەم پاشای ئێران ناساند.

باختەر بە واتای باکور، سەرزەوییەك بوو، خۆراسانی باکوری ڕۆژهەڵات و ئەفغانستانی باکور و بەشێك لە تورکستانی گرتبۆوە خۆ، بە بڕوای هەندێکان بۆ نموونە (دارمێس تەتەر) زەردەشت لە باختەر هاتووەتە دنیاوە و منداڵی لە شاری (تەبەس) لە نێزیك سنووری ئەفغانستان بردووەتە سەر واتە نە ئەو تەبەسەی بە گوڵزار ناسراوە، ئێستە لە خوراسان سێ شار بە ناوی تەبەس هەیە، یەکێکیان لە سنووری ئەفغانستانە، ئەوی دیکەیان لە تەنیشت کەویرە بە گوڵشەن ناسراوە، دوایینیان لە باکوری سەبزەوارە.

بەسۆس لە باختەر هێزی زۆری کۆکردەوە، لە هەندێ بەشی ئیمپراتۆریەتیی هەخامەنشیی کە تا سەرووی سەیحوون دەڕۆیشت، بەردەوام بوو لە بانگەشەکەی، بەڵام ئەسکەندەر هەنگاو بە هەنگاو لە دووی بوو، سەرئەنجام لە ڕێگەی کەسانی دەوروبەرییەوە لە ساڵی (٣٢٨ پ. ز) خستییە نێو تەڵەوە.

مێژوونووسان نووسیویانە ئەسکەندەر سۆسی بە تاوانی کوشتنی داریوشی سێیەم سزادا، کە ئەوە بە دوور نازانین، چوونکە سەرداره سەرکەوتووە مەکدۆنییەکە تا ئەو کات لە زۆر

پیلانگێڕی بە سەلامەتی دەرچوو بوو، لەوانەیە لە ڕووخساری بکوژی داریوشدا، هەمان بکوژی خۆی دەبینی، بۆیە دوای سزای توونـد ئەوی دایە دەست جەلاد، بەڵام باشتروایە بگوترێت ئەسکەندەر لە بە سۆس دەترسا،کە بانگەشەی بۆ تەخت و تاجی خۆی دەکرد، بۆ تەمبێکردنی ئەو بە واتای کۆتایی هێنان بەو کەسە بوو، کە لە سووچێکی ئیمپراتۆرییەتەکەی بۆ ئەو دەبۆوە مایەی کێشە نانەوە، بەڵام دوای کوشتنی بەسۆسیش جەنگ لە شوێنە جیاکانی باختەر بەردەوام بوو، ئەسکەندەر بۆ ڕێکخستنەوەی باختەر و دەڤەرە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێران (پارت) ماوەی دوو ساڵ لە جەنگ و خوێن ڕشتندا بوو.

هارۆڵد لەمبی ئەمەریکی کە گەشتی بۆ ئێرانیش کردووە، باسی بەسەرهاتێك دەکات بە کورتی برێتییە لەوەی ئەسکەندەر ناوبانگی (ڕەخان یاخۆ روکسانە) کچی پاشای باختەری لە فارس پێگەیشت، بێ ئەوەی بیبینێت کەوتە ئەڤینی ئەوەوە و ناردی بۆ داخوازی ئەو، پەیامی بۆ نارد کە "تۆ جوانترین کچی جیهانی، ئەگەر داخوازی من پەسەند بکەی و ببی بە هاوسەرم، کۆشکێکت بۆ چێ دەکەم، شووشەی پەنجەرەکانی لە زێڕ بن، بێ ئەوەی سەرما و گەرما بێتە نێو کۆشکەکەتەوە، ڕووناکی هەتاو و هەردەم بەردەوام بێتە نێو کۆشکەکەت."شووشەی زێڕ لە جیاتی شووشەی ئاسایی بەکاردەهات و ڕووناکی هەتاو و هەردەم پیایدا دەڕۆیشت.

ئەسکەندە بە هۆی داخوازیکارەوە پەیامی بۆ روکسانە نارد، ئەگەر ببێتە هاوسەری، هەزار تالان زێڕ، واتە شیربابییەکەی دەکاتە چوارسەد هەزار لیرەی زێڕ، بەڵام ڕەخان بە گریمانی زۆر بە فەرمانی باوکی داخوازییەکەی ئەوی پەسەند نەکرد، ئەسکەندەر لەشکرکێشیی کرد بۆ باختەر.

ئەو بەسەرهاتە لەلایەن هارۆڵد لەمب نووسراوە، مێژوونووسانی دیکەش بە شێوەی دیکە باسی دەکەن، بۆ نموونە ئاریان دەڵێت خەڵکی سەغدیان لە دژی فەرمانڕەوایی ئەسکەندەر یاخیبوون، چوونکە کوشتارگەی مەزنیان لە سەربازەکانی ئەسکەندەر بینی بوو، بۆ نموونە (ئارزات) یەکێك لە گەورەکانی سەغدیان، ژن و کچەکانی پەنایان بردە بەر شاخێك لەو ناوچەیە تا لە سەربازانی مەکدۆنی پارێزراو بن.

ئەسکەندەر بە لەشکرەکەیەوە لەو شاخە نێزیك کەوتەوە، بۆی دەرکەوت سەرکەوتن لەو شاخە کە وەك دیوار بەرەو ئاسمان قیت ببووە، کارێکی ئەستەمە. پەیامی بۆ خەڵکی سەغدییان نارد تا خۆیان بە دەستەوە بدەن و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان، بەڵام سەغدییەکان خۆراك و ئاوی پێویستیان لە بەردەست

بوو، پێشنیازی ئەسکەندەریان ڕەت کردەوە، وتیان لە شوێنی خۆیان نابزوون، مەکدۆنییەکان باڵندە نین تا بفڕن و بێنە سەر شاخ. ئەسکەندەر کە ڕقی هەستابوو، ژمارەیەك لە پیاوەکانی کە لە سەرکەوتنی شاخ زۆر شارەزا بوون هاندا تا لە شاخەکە سەرکەون.

پیاوەکانی ئەو بە شەو بەو پێداویستییانەی دەیانەویست دەستیان بەسەرکەوتن لە شاخەکە کرد، کاتی سەرکەوتن هەندێکیان بەربوونەوە نێو خەرەندەکان بوون، ئەوانی دیکە دوای ڕۆیشتن بە ڕێگە سەختەکاندا، خۆیان گەیاندە سەرشاخەکە و بە هەڵکردنی ئاڵا ئەو سەرکەوتنەیان گەیاندە ئەسکەندەر.

بۆیە دواتر ئەسکەندەر چەند کەسێکی نارده لای سەغدییەکان و وتی دەبینن کە مەکدۆنییەکان دەتوانن بفڕن، بۆیە لە شاخ وەرنە خوارەوە، ئەو دەمەش سەغدییەکان ناچار بوون خۆیان بەدەستەوە بن.

پاش کەمێك ئەسکەندەر (ڕەخان یاخۆ ڕوکسانە)ی لەگەڵ دایك و خوشکەکانی لەنێو دیلەکاندا بینی و بە زۆر هاوسەرگیری لەگەڵدا سازکرد، بەڵام هاوسەرگیری ئەسکەندەر لەگەڵ ڕوکسانە و لە دایکبوونی منداڵێك لەو بە ناوی (ئەسکەندەری دووەم) پتر لە ئەفسانە دەچێت.

مێژوونوسە یۆنانییەکان هەندێکجار تەنانەت سڵیان نەکردووەتەوە لە تێئاخنینی ئەفسانە بۆ نێو مێژوو، لەوانەیە ئەفسانەی هاوسەرگیری ئەسکەندەر لەگەڵ ڕوکسانەیان هەڵبەستبێت تاکو بڵێن ئەو پیاوێکی ئاسایی بووە و هەستی مرۆڤێکی ئاسایی هەبووە، لە کاتێکدا دەڵێین ئەگەر ئەو لە هاوسەرگیری لەگەڵ ڕوکسانە کوڕێکی بە ناوی (ئەسکەندەری دووەم) هەبوو، بۆچی دوای خۆی نەبوو بە جێنشینی؟.

بە لە جیاتی دانانی مێژوو دەتوانین بڵێین ئەسکەندەر لە ساڵی (**٣٢٣** پ. ز) کاتێك بە نەخۆشی (هەوکردنی سییەکان) مرد، کوڕەکەی هەشت یاخۆ نۆ ساڵان بووە یاخۆ لانی کەم حەوت ساڵان بووە، دایکی ئەسکەندەر کە ناوی ئۆلەمپیا بوو هێشتا زیندوو بوو.

ئەوکات ئەگەر پاشایەك مردبایە، تەنانەت ئەگەر کوڕێکی شیرەخۆرەشی هەبووایە، لە جیاتی باوکی دەیانکرد بە پاشا، چجای ئەوەی کوڕێکی حەوت ساڵانی هەبووایە.

باڵادەستی ئەسکەندەر بەسەر سەربازەکانیدا هێندە زۆر بوو، ئەگەر ئەسکەندەر کوڕێکی هەبووایە، هیچ یەکێك لە سەردارەکانی نەیان دەتوانی بانگەشەی جێنشینی بکەن.

هەر ئەو مێژوونووسانەی نووسیویانە ئەسکەندەر لە ڕەخانی هاوسەری کوڕێکی بە ناوی ئەسکەندەری دووەم هەبوو، نووسیویانە کە ئەسکەندەر لەسەر جێگە و لە کاتی مردندا، وڵاتەکانی خۆی بە سەر سەردارەکانیدا دابەش کرد ئێرانی بە سلۆکۆس، میسری بە بەتڵەمیۆس و شامی (سوریا) بە ئانتیکۆس سپارد، بەڵام هیچ باسی کوڕەکەی ئەویان نەکردووە. چۆن دەتوانرێت پەسەندی بکەین کە ئەسکەندەر وڵاتەکانی لە نێوان سەردارەکانی دابەش بکات، بەڵام کوڕەکەی بێ میرات و بەش بهێڵێتەوە، لە کاتێکدا دەیزانی ناوی خۆی بەهۆی کوڕەکەیەوە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

لە وەسیەتنامەی ئەسکەندەر بچووکترین ئاماژە بە کوڕەکەی نەکراوە، لە کاتێکدا بە وتەی مێژوونووسان ئەسکەندەر لەکاتی مردنیدا سی و سێ ساڵ تەمەنی بوو، ڕەخانی هاوسەری و ئەسکەندەری دووەمی کوڕی لەسەر سەرینی بوون.

مێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێن بۆیە کۆڕەکەی نەبوو بە پاشا، چوونکە مێردی خوشکەکەی ئەسکەندەر، ئەسکەندەری دووەمی کوشت، بەڵام مێردی خوشکەکەی ئەسکەندەر کە ناوی (کاساندرۆس) بوو لە کاتی مردنی ئەسکەندەر لە لای ئەو نەبوو تا کوڕەکەی بکوژێت. گریمان لەوێش بووبێت، چۆن دەیتوانی لەنێو ئەو هەموو سەردارە بە ئەمەکانەی ئەسکەندەردا، کوڕەکەی ئەسکەندەر بکوژێت و بۆ خۆشی زیندوو بمێنیتەوە؟.

گومانمان لەوەدا نییە ئەسکەندەر خوشکێکی لە خۆی بچووکتری بە ناوی (تسالۆنیك) یاخۆ (تسالۆنیس) هەبووە، ئەویش وەك ئەسکەندەر زۆر جوان بوو، یەکێك لە سەردارەکانی مەکدۆنی بە ناوی (کاساندرۆس) بوو بە هاوسەری، واتە بووە مێردی خوشکەکەی ئەسکەندەر. کاساندرۆس دوای مردنی ئەسکەندەر لە مەکدۆنیا بانگەشەی بە پاشابوونی بۆ خۆی کرد و پشت ئەستوور بەوەی زاوای ئۆلەمپیاد و مێردی خوشکی ئەسکەندەرە بووە پاشا.

بۆیە ئەگەر ئەسکەندەر کوڕی هەبوایە، پاشایەتیی مەکدۆنیا دوای ئەسکەندەر دەگەیشتە کوڕەکەی نەك مێردی خوشکەکەی، بە تایبەتی زنجیرەی پاشایەتیی مەکدۆنیا کە ئەسکەندەر لەو بنەماڵەیە بوو، لە زنجیرە پاشایەتییە کۆنەکان بوون، لەو بنەماڵەیە بەردەوام کوڕ لە دوای باوکی بۆتە پاشا و ئەستەم بوو پیاوێك کە مێردی خوشکی پاشا بێت لە دوای مردنی ئەو ببێتە پاشا، پاشایەتیی کاساندرۆس لە مەکدۆنیا بەڵگە بوو بۆ ئەوەی ئەسکەندەر کوڕی نەبوو.

هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن ڕەخان دوای مردنی ئەسکەندەر لەگەڵ کوڕەکەی چوون بۆ مەکدۆنیا، لەوێندەر بە دەستی کاساندرۆس کوژرا، بەڵام ڕەخان خەڵکی سەغد بوو، لەوێندەر هەمووان دەیانناسی، ژنێك کە هاوسەرەکەی بمرێت دەچێتەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونی کە هەمووان دەیناسن و لەوێ دەمێنێتەوە و ناڕوات بۆ وڵاتێك کە بێگانە و غەوارە و نامۆ بێت، یاخود لەوێ کوڕەکەشی بکوژن تا میراتگری پاشایەتیی ئەسکەندەرە لەنێو بچێت.

بۆیە بوونی ئەسکەندەری دووەم بەو شێوەی کە هەندێ لە مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە، تەنیا ئەفسانەیە و ئەسکەندەر کوڕی نەبوو.

* * *

زانراوە ئەسکەندەر دوای هاوسەرگیری یاخۆ بە وتەیەکی دیکە سەرنەگرتنی هاوسەرگیری لەگەڵ ڕەخان، بەرەو هیندستان ڕۆیشت و بەشی ڕۆژئاوای هیندستانی داگیرکرد، کە ئێستە بە وڵاتی پاکستان ناسراوە.

هیچ یەکێك لەوانەی بۆ داگیرکردنی هیندستان چوون، نەیانتوانیووە، تەواوی ئەو وڵاتە داگیربکەن، لەو هێرشبەرە بەناوبانگانەی مێژووش (ئەسکەندەر، مەحموود غەزنەوی، تەیمووری لەنگ و نادر شا)، کە تەنیا بەشی ڕۆژئاوای هیندستانیان داگیرکرد، تەنانەت هەندێکیان نەیانتوانی هەموو پاکستانی داگیر بکەن، هیندستان هێندە بەربڵاو و گەورە بوو، ژمارەیەکی زۆر دەسەڵاتدار تیایدا حوکمڕان بوون، هیچ کەس لە داگیرکارانی جیهان نەیدەتوانی هەمووی داگیر بکات.

لەبارەی جەنگەکانی ئەسکەندەر لە هیندستاندا، ئێمە باس لە هیچ شتێك ناکەین، کە پێوەندییان بە ئێرانەوە نەبێت، تەنیا دەڵێین دۆخ و نەریتەکانی هیندستان، بە تایبەت ژنی گەنج لە دوای مردنی هاوسەرەکەی لەگەڵ تەرمی هاوسەرەکەیدا دەسوتێنرا.

بابەتێکی دیکە کە زۆر بۆ ئەوان جێگەی سەرسووڕمان بوو، بوونی چوار وەرزی ساڵ بوو، لە دارێکدا گوڵ و چرۆ لە بەهار، میوەی کاڵ لە هاوین، پێگەیشتنی میوە لە پایز، زەردبوونی پەلك لە زستان دەبینرا، چوونکە لایان وا باو و بڵاو بوو، کە لە بەهەشت لە تەواوی وەرزەکان

گوڵ و میوە هەیە، یۆنانییەکان وایان بیر دەکردەوە ئەو بەهەشتەی بیستوویانە ئەوا هیندستانە.

دوای ئەوەی ئەسکەندەر گەیشتە کۆتایی ڕووباری سێند لە نێزیك شاری (کەراچی) ئێستە، بڕیاریدا لە هیندستان بگەڕێتەوە.

ئەسکەندەر دوای گەیشتنی بە ئێران یەکەم کار کە ئەنجامیدا لەنێوبردنی لەشکری دەریایی هەخامەنشیی بوو لە کەنداوی فارس و دەریای عومان، بەڵام بەشێك لە کەشتییەکان بە فەرماندەیی ئەفسەرێك بە ناوی (گام پۆت) لە جەنگی یۆنانییەکان رزگاریان ببوو.

ئەسکەندەر دوای سەرکەوتنی بەسەر ئێراندا هێزی دەریایی یۆنانی بە کەناڵی داریوشدا لە میسرەوە هێنا بۆ ئێران، ڤێجا هەر ئەو لەشکرەی بردە هیندستان. دواتر لە هیندستانەوە هەواڵیان پێی ڕاگەیاند کە (گام پۆت) ئەفسەری دەریایی هەخامەنشیی بەو کەشتییانەوە کە ماون بڕیاریداوە رێگەی گەڕانەوەی لێ بگرێت، لەشکری کۆکردوتەوە و دەیەوێت لە کاتی گەڕانەوەیدا لەسەر رێگەی ئەو دایان بەزێنێت.

ئەسکەندەر لە ترسی ئەوەی دیسان لەگەڵ هیندییەکان نەکەوێتە جەنگ، رێگەی گەڕانەوەی خۆی بە پشتێنە کەنارەییەکانی زەریای هیند و دەریای عومان دیاری کرد. ئەو لە کۆتایی ڕووباری سێند، واتە لە نێزیکی شاری کراچییەوە بۆی دەرچوو، تەنیا لە درێژایی پشتێنەی کەنارەکانی زەریای هیند و دەریای عومان رێگەی بڕی. بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر هێرشی گام پۆت و ئەو لەسەر رێگەکەی لەشکرێك دانەبەزێنێت، دەریاسالاری یۆنانی (نەئارك) لە تەریب بە کەنارەکان بە کەشتیگەلی یۆنانییەوە بەرێکەوت تا ئەگەر کەشتییەکانی گام پۆت ویستیان لەشکر پیادە بکەن، رێیان لێ بگرن.

بەم شێوەیە (نەئارك) بوو بە پاڵپشتی لەشکری پیادەی ئەسکەندەر و تەریب بە کەنارەکانی زەریای هیند و دەریای عومان و کەنداوی فارس ئەوانی پاراست تا گەیشتە خورمشەهر.

یەکێك لە بابەتە سەیرەکانی مێژوونووسە یۆنانی و ئەوروپاییەکان ئەوەیە ئەو گەشتەی ئەویان بە گەشتێکی ئاسایی دەریایی داناوە، لە کاتێکدا گەشتێکی جەنگی و سەربازی بوو. لە لایەکی دیکەوە ئەو گەشتەی ئەویان بە بێ وێنە ناساندووە، لە کاتێکدا بێ وێنە نەبووە، کەشتییە ئێرانی و هیندییەکان سەدان و هەزاران جار ئەو رێگەیان بڕیوە.

باسی ئەو بابەتە بە زیان دەزانین کە تا ئەو ڕۆژەی قیبلەنوما دروست نەکرا بوو یاخۆ بوونی ئەستێرەی جوودی نەزانرا بوو، کەشتییە ئێرانی و هیندییەکان لە ترسی ونبوون هەردەم بە درێژایی کەنارەکاندا دەریاوانیان دەکرد.

هەموو بازرگانی ئێران لەگەڵ هیندستان، چین و وڵاتانی دیکەی ئەو ناوچەیە لەو ڕێگەیەوە ئەنجام دەدران، کە نەئارك پیایدا خۆی گەیاندە کۆتایی کەنداوی فارس، بەڵام مێژوونووسە یۆنانی و ئەورووپاییەکان، تەنانەت ئەمڕۆش گەشتەکەی نەئارك بە فەرمانی ئەسکەندەر لە کەراچی تاکو خورمشەهر بە ڕووداوێکی بێ وێنە لە جیهانی کۆندا ناو دەبەن.

لەو گەشتەدا یەکێك لەو بابەتە سەیرانە کە لە وشکانی بەرچاوی نەئارك و یاوەرانی کەوتبوو برێتی بوو لە دەستەیەك لە خەڵك کە ناوی (ئەکتیۆڤاژ)، واتە ماسیخۆریان بۆ دانان، بە سەرسووڕمانەوە سەرەنجیان دەدا ئەوان، تەنانەت ماسی وەك خۆراك دەدەنە مانگاکانیان. لە کاتێکدا ئێستەش لە هەمان دەڤەر کە بەشێکە لە کەنارەکانی بلوچستان، بە هۆی نەبوونی گژوگیا ماسی دەدرێتە مانگاکان، بۆیە گۆشتی مانگاکانیان تامی ماسی دەدات.

گەشتنامە نەئارك بۆ کەسێکی یۆنانی نوێ بوو، بەڵام بۆ ئێرانییەك لەو کاتدا نوێ نەبوو. لەوانەیە پرسیار بکرێت ئەگەر ئێرانییەکان ئەو ڕێگەیەیان دەناسی بۆ گەشتنامەیەکیان لە بارەیەوە نەنووسی؟، دیارە ئەسکەندەر هەموو نەخشە جوگرافی و دەریاوانی و پەڕتووکەکانی ئێرانیانی لەنێوبردن. هێزی دەریایی هەخامەنشیی کە لەلایەن ئەسکەندەر لەنێو بردرا، خودان نەخشە جوگرافی و دەریاوانی بوو، کە وەك هێزە دەریاییەکەی لەنێو بردران.

تەنیا کەسێك کە توانای بوژاندنەوەی هێزی دەریایی ئێرانی هەبوو و دەیتوانی نەخشە جوگرافی و دەریاوانی زیندوو بکاتەوە گام پۆت ئەفسەری پایەبەرزی هێزی دەریایی هەخامەنشیی بوو، ئەویش بەر لەوەی بکارێت ئەو کارە بکات بە نەخۆشی تاعوون مرد.

هەڵبەتە لە کۆندا پەڕتووکەکانیان بە شێوەی تیماج لەسەر پێستەی ئاژەڵەکان دەنووسییەوە، هەموو کەس نەیدەتوانی پەڕتووکانی هەبێت. تەنیا پاشاکان و ئاگرخانەکان هێندە داهاتیان هەبوو کە پەڕتووکەکان لەسەر پێستەی ئاژەڵ بە هۆی خۆشنووسانەوە بنووسنەوە و بیان پارێزن، لە پەڕتووکە مەزنەکان پتر لە یەك دانە نەبوو، کاتێك ئەو دانەیە لەنێودەچوو، پەڕتووکەکە نەدەما.

یۆنانییەکان خۆیان وتوویانە کە خەشایار شا کاتی چوونی بۆ یۆنان بەپێی نەخشەی جوگرافی جەنگی دەکرد و ڕێگەی دەبڕی.

پەڕتووکخانەی پاریس کە لە ڕووی هەبوونی پەڕتووکەوە یەکێکە لە دەوڵەمەندترین پەڕتووکخانی جیهان، نەخشەیەکی لەبارەی کەنداوی فارس، دەریای عومان و زەریای هیند تێدایە، کە هی یۆنانییەکانە و لەسەر پێستی گا و لە دووسەدە پێش زاین کێشراوە، بە ڕواڵەت یۆنانییەکان ئەو نەخشەیان دوای ئەسکەندەر کێشاوە، ئێمە دەکارین بە لێکدانەوە بڵێین کە ئەوە لەبەرگیراوەی نەخشەیەکی ئێرانییە کە لە هێرشی ئەسکەندەر بۆ ئێران کەوتووەتە دەست یۆنانییەکان.

لە سەدەی حەڤدەی زاینی بە دواوە مێژوو و ئەدەبی هیندییەکان سەرەنجی زانا ئەورووپاییەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و هەوڵیاندا پەڕتووکە کۆنەکانی هیندستان، کە بە زمانی سانسکریتە واتە زمانی کۆنی تەواوی نەتەوە ئارياييەکان نووسرابوون بۆ زمانەکانی دیکە وەربگێڕن.

لە کاتی وەرگێڕانی ئەو پەڕتووکانەدا زانایانی وەك (ئانکە تیل دۆپرۆنی) فەرەنسی و (ماکس مۆلەری) ئەڵمانی، هەندێ بەڵگەنامەیان بەرچاو کەوت، کە نیشانەی هەبوونی پێوەندیی بەردەوام بوو لە نێوان هیندستان و ئێراندا، تەنانەت لە هەزار ساڵ پێش زایندا لە ڕێگەی دەریا، لە ئەدەبی سانسکریتدا ئەو ڕێگە دەریاییە بە (گاماپارسا) ناسراوە، کە واتای (ڕێگەی پارس) یاخۆ (بەرەو پارس) دەدات، بەڵام ئەمە لە ئەدەبیاتی سانسکریت بە واتای (ڕێگەی بەختەوەری) هاتووە، کاتێك نزایان بۆ یەکێك کردووە، وتوویانە کە نزادەکەن تا گاما پارسای بێتە بەر ڕێگەی و لە داهاتوودا بەختەوەر بێت، دەردەکەوێت لەلای نەتەوەکانی کۆن پارس نیشانەی بەختەوەری بووە.

لە ئەدەبی کۆنی هیندییەکان هەموو ئەو کەسانەی گاماپارسایان دەهێنایە زمان و دەیانناسی، دەیانزانی کە ئەویان لە ڕێگەی دەریاوە دەست دەکەوێت و دەبێت سواری کەشتیی بن و ئەو ڕێگەیە ببڕن.

ڕێککەوتنی ئەسکەندەر و نەئارك وابوو، کە ئەسکەندەر لە کەنارەکانەوە بڕوات و نەئارکیش تەریب بە کەنارەکان ڕێ بکات، لەشکری ئەسکەندەر و هێزی نەئارك بەردەوام یەکدیی ببینن، بەڵام لە بەشێك لە کەنارەکانی بلوچستان، نەتەوەیەك دەژیان کە بە بێ ترس هێرشیان کردە سەر لەشکری ئەسکەندەر، ئەویش بە ڕادەیەك بە دەست ئەوانەوە کەوتە

تەنگەناوە کە ناچار بوو، کەنارەکان جێ بهێڵێت و بچێتە هەندێ دەڤەرەیلی قووڵیی خاکی بلوچەکانەوە.

بە وتەی مەنەمۆن ئەو پیاوانەی هێرشیان کردە سەر لەشکری ئەسکەندەر، ڕووخساریان ڕەش[1] بوو، ئەو ڕەشییەش بە هۆی تاوەسووتەوە بوو، نەك وەك ڕەش پێستانی ئەفریقیا خۆیان ڕەش بن. ئەو دەڵێت: "ئەو پیاوە ڕەشانە نێزەی درێژیان پێ بوو، نێزەکانیان دەگرتە دەست و وەك گای نێر بێ ترس بۆ پارێزگاری خۆیان، هێرشیان دەکرد و لێدانەکانیان هێندە توند بوو، کە نێزەکانیان لە لایەکی لاشەی سەربازەکانمان ڕۆدەچوو، لە لایەکەی دی دەردەچوو، لە کاتێکدا کە ئەوان هێرشیان دەکرد، ژنەکانیان کە وەك خۆیان ئەسمەر بوون بە بەردەقانی بەردیان بۆ سەر سەربازەکانمان هەڵدەدا."

ئەوان لە لێدانی نێزە و تیر و شمشێرەکانمان نەدەترسان، وەك ئەوەی گورزی تیر و شمشێر ئەوان ئازار نەدات، لەو ڕۆژەوە کە لە یۆنان کەوتینەڕێ تا هاتینە نێو ئاسیا، نەتەوەیەکی ئاوا ئازا و نەترس و خوێن خۆرمان نەبینی.

مەنەمۆن چوونکە یۆنانی بوو پیاوان و ژنانی بلوچ بە خوێن خۆر ناودەبات، بەڵام کوشتارەکانی ئەسکەندەر لە پێرسپۆلیس و شارەکانی دیکەی ئێران بە ڕووداوی ئاسایی دەناسێت. ئێستەش خەڵکانێك لەو شوێنە دەژین کە هەمان گەرمی ئەوکاتیان هەیە و ڕووخساریان هەمان ڕەنگی ئەسمەری هەیە، بەڵام ژمارەیان هێندەی ژمارەی ئەوان نییە، کە بە نێزەکانیان سەربازانی ئەسکەندەریان کونبەدەر دەکرد. چوونکە دۆخی سرووشتی ئەوێ بەرانبەر بە رابردوو گۆڕاوە، ئەوکات کەنارەکانی بلوچستان سەوز بوو، بارانی زۆری لێ دەباری، لە کاتێکدا ئێستە لەوێندەر باران زۆر ناباریێت.

بۆ مرۆڤ جێگەی سەرسووڕمانە کە ناوچەیەك بکەوێتە کەناری دەریایەکی ئازادی وەك عومان کە ڕێگەی بۆ زەریا گەورەکانی جیهان هەبێت، بارانی تێدا کەم بێت، بەڵام هۆکارەکەی ئەوەیە کە لە پێنج سەدەی یەکەمی زایندا کەشوهەوای ڕۆژهەڵاتی ناڤین گۆڕانی بەسەرداهات، ئەو هەورە باراناوییانەی لە کەنداوی فارس و دەریای عومان هەڵدەستان، لە دوای ڕۆیشتنیان بەسەر بەرزاییەکانی جۆ، دەڕۆیشتن و خاکی هیندستانیان لە جیاتی بلوچستان ئاودەدا.

---

(١) مەبەستی ئەو لە ڕەش هەمان ئەو رووخسارانەیە کە لای ئێمە بە ئەسمەر ناسراوە. "وەرگێڕی کوردی"

لە کاتی هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئێران، ئەو کەنارانە سەوز و تژی گژوگیا بوون، ژمارەیەکی زۆرتر دانیشتووانی هەبوو، تەنانەت ئەوکات کە سەرەتای سەدەی سێیەمی پێش زاین بوو، گۆڕانی کەشوهەوا سەرەتاکانی ئاشکرا ببوو، باران لە بلوچستان کەم ببۆوە، ئەگەرنا ناچار نەدەبوون لە جیاتی گژوگیا ماسی بکەنە خۆراك بۆ گاکانیان، بەڵام بە دڵنیاییەوە دۆخی سرووشتی کەنارەکانی بلوچستان لە روانگەی پیت و بەرەکەتی باشتر بوو لە سەردەمانی دواتری، ئەگەرنا دانیشتووان زۆر نەدەبوون و توانای جەنگ لەگەڵ لەشکری ئەسکەندەریان نەدەبوو.

ئەسکەندەر بە هۆی ئەو هێرشانەوە ناچاربوو، دەڤەرە کەنارییەکان جێ بهێڵێت و بە نێو قووڵایی بلوچستان بەرەو فارس بڕوات، چوونکە هاوین بوو، ئەسکەندەر و سەربازەکانی بە هۆی گەرماوە ئازاریان دەچەشت، جگە لەوەش بەرەو بیابانێکی وشك و برینگ و بێ ئاو دەڕۆیشتن. یاوەرانی ئەسکەندەر دیاریان نەکردووە، کە ئەو دەشتە بێ ئاوە کوێ بووە، بەڵام بە پێچەوانەی لێکدانەوەی هەندێ لە مێژوونووسان (کەویری لووت) نەبووە، چوونکە ئەگەر بەو کەویرەدا رۆیشتبان، نەتەنیا هەموو سەربازانی، تەنانەت ئەسکەندەریش زیندوو نەدەما. ئەو پێدەشتە بێ ئاوە ناوچەیەك بووە لە بلوچستان یاخۆ سنووری بلوچستانە لەگەڵ کرمان، مەودای نێوانیان لەگەڵ کەویری لووت زۆرە. یاوەرانی ئەسکەندەر بەسەرهاتەکانی لەشکرەکەیان نووسیوەتەوە، بەڵام جوگرافیای ئەو ناوچەیەیان دەست نیشان نەکردووە، کە لەشکری ئەسکەندەر تیایدا ونبوو. ئەوەی پشتڕاست کراوەتەوە ئەو دەڤەرە لە بلوچستان بووە، بەڵام پەڕتووکە مێژووییەکان نەیان نووسیوە لەشکری ئەسکەندەر لە کوێی بلوچستان ونبوو.

یاوەرەکانی ئەسکەندەر نووسیویانە لەو شوێنەی لەشکرەکەمان ونبوو، ئێمە لە رۆژهەڵات بە مەودای زۆر دوور شاخمان بینی، لە باکوریش هەر لە مەودای دوور شاخ هەبوو، بەڵام شاخەکان هێندە دوور بوون کە دەمانزانی بەرلەوەی بیانگەینێ لە برسان و لە تینوویەتی دەمرین.

دەشتێکی ئاوا گەورە و بەرین و بێ ئاو کە لە رۆژهەڵات و باکورەوە شاخەکان ببینرێن، بە گریمانی زۆر دەشتێکە لە نێوان (چاڵی گا و گلۆگان) و نێزیك رۆژئاوای (خاشی) ئێستەیە. شاخەکانی باکور و رۆژهەڵاتی ئەو دەشتە زۆر بەرز نین، بەڵام لەو دەشتەدا تەنانەت گردێك کە بەرزییەکەی سەد مەتریش بێت لە مەودای دووریش نابینرێت.

یاوەرانی ئەسکەندەر نووسیویانە بە ئێمەیان وت کاتێك بگەنە ئەو ناوچەیە دەگەنە ئاو، ئێمەش دوای ئەوەی مەشکە و ئەو شتانەی لامان بوون پڕمان دەکردن لە ئاو، دەبووایە بەرەو

ڕۆژئاوا بڕۆین، بەڵام کاتێك گەیشتینە ئەو شوێنەی کە دەبووایە ئاوی لێ هەڵبگرین، دەرکەوت چاڵەکە وشکە و ئاوی تێدا نییە. ئەو چاڵە وشکە هەمان چاڵی گایە و دانیشتووانی ئەو ناوچەیە چاڵی گەورەی پڕ ئاو بە چاڵی گا ناو دەبەن، لە هەندێ شوێنی ئێران بە (گاوچاه) واتە (چاڵی گا) ناودەبرێت، بێگومان چاڵێك کە لەشکرێك بتوانێت ئاوی بۆ خواردنەوە لێ هەڵبگیرێت، هەمان چاڵی گایە و چاڵە ئاساییەکان ناتوانن لەشکرێك تێر ئاو بکەن.

کاتێك لەشکری ئەسکەندەر دەگەنە چاڵەکە دەبینن هیچ ئاوی تێدا نییە، لە کاتێکدا ئەو چاڵە ئاوە بەردەوام ئاوی تێدابووە، لەوانەیە بە هۆی بێ بارانییەوە وشکی کردبێت، چوونکە وشکەساڵی ئاستی ئاو دادەبەزێنێت و ئەو کانیانە وشك دەبن، ئەوە تەنیا گریمانێکە و ناتوانین هۆکاری ڕاستینەی وشکبوونی ئاوەکە بزانین. کاتێك لەشکری ئەسکەندەر گەیشتە ئەو دەشتە کە لە باکوری هێڵی پانی بیست و هەشتە، کات ئێوارە بوو، سەربازەکانی ئەسکەندەر بۆ گەیشتنیان بە ئاو، تەواوی ئەو ڕۆژە لەژێر هەتاوی گەرمدا ڕێگەیان بڕی.

لە وەرزی هاوین لە بیابانە گەرمەکانی ئێران کەس ڕێگەی نەدەبڕی، نەریت وابوو، کە دوای ڕۆژئاوا بوون یاخۆ دوو دەمژمێر زووتر ئەوانەی گەشتیان دەکرد، دەکەوتنەڕێ، چەند دەمژمێرێك ڕێگەیان دەبڕی، دواتر پشوویان دەدا، ماوەیەك دەخەوتن، ئینجا بە لەوەی ڕۆژ هەڵبێت دەکەوتنەڕێ، هەرکە هەتاو بە تەواوەتی هەڵدەکشا، پشوویان دەدا، چوونکە ڕۆیشتن لە کاتی ڕۆژدا لەژێر هەتاوی گەرم، نەتەنیا مەترسیدار بوو، بگرە ڕێبواران دەرگیری نەخۆشی هەتاوبردنیش دەبوون، چوونکە لە بیابان چارەسەر دەست نەدەکەوت، لەوانەبوو بمرن، بەڵام سەربازەکانی ئەسکەندەر ئەو ڕۆژە بۆ ئەوەی بگەنە ئاو، خۆپارێزیان نەکرد لە ڕۆژدا و لە کاتی ئەو هەتاوە تاقەت پڕوکێن و سوتێنەرەدا، ڕێگەیان بڕی، کاتێك گەیشتنە چاڵە ئاوی وشك، ورەی خۆیان لە دەستدا.

ڕێبوارانی ئێستە کاتێك بە بیابانەکانی ئێراندا دەڕۆن، ناتوانن لەوە تێ بگەن، کە ڕێبوارانی کۆن دوای ئەوەی دەگەیشتنە چاڵە ئاوێك و ئاویان نەدەدۆزییەوە، ورەیان چۆن دەبوو، چوونکە ڕێبوارانی ئێستە بە ئۆتۆمۆبیل ڕێگە دەبڕن، لە دەمژمێرێکدا ئەگەر بە ئاسایی بڕۆن، پتر لە شەست کیلۆمەتر دەبڕن، واتە ئەو ڕێگەیەی بە دوو ڕۆژ بە پێ دەبڕدرا. ڕێبواری ئێستە ئەگەر بگاتە چاڵێك کە وشك بێت دەڕوات و پاش دەمژمێرێکی دیکە بێ ماندوو بوون و هەتاو لێدان دەگاتە چاڵێکی دیکە، بەڵام ڕێبوارانی کۆن دوای ئەوەی دەگەیشتنە چاڵێك کە

وشك بووایە، نە توانای گەیشتن بۆ چاڵێکی دیکەیان دەبوو، نە دەیانتوانی بگەڕێنەوە شوێنی پێشوویان.

سەربازەکانی ئەسکەندەر دوای ئەوەی گەیشتنە چاڵی گا و ئاویان تێدا نەبینی، زانیان کە ناگەنە ئاو تەنیا لە گلۆگان و لە نێوان گلۆگان و چاڵی گادا نەبێت. کاتێك رۆژئاوابوو، هەندێ لە سەربازانی ئەسکەندەر دووچاری هەتاوبردن بوون، لەو گەرمایەی هاوین کەوتنە لەرزین، دواتر تایان هاتێ، ڕشانەوە و بێ توانایش سەرباری ئەو نەخۆشییانە. ئەسپەکانیشیان سەریان لەنێو توورەکەی کادا بوو بێ ئەوەی بیخۆن، چوونکە لەبەر تینوویەتی توانای خواردنیان نەبوو، ئەسپ توانای بەرگری کەمترە لە مرۆڤ و زووتر لەنێو دەچێت.

ئەگەر دەستەیەك لە خەڵکی ناوچەکە گەیشتبانە ئەو چاڵە کە وشك بووە، ورەی خۆیان لە دەست نەدەدا، چوونکە لە بیابان هەندێ گژوگیا هەیە، کە ئەگەر رەگیان بمژرێت، تینوویەتی دەشکێنن، بۆ نموونە رەگی ڕووەکی ناسراو بە (ئەنقوزە) تینویەتی دەشکێنێت، بەڵام سەربازانی ئەسکەندەر ئەو ڕووەکانەیان نەدەناسی و زانیارییان لەبارەی سوودی ئەوان لە نەهێشتنی تینویەتی نەبوو.

ئەو شەوە سەربازەکانی ئەسکەندەر لە تەنیشت (چاڵی گا) تا رۆژ هەڵاتن مانەوە، ئەو بەشە لە سەربازەکانیان کە نەخۆش بوون لەوێندەر بەجێیان هێشتن و پێیان وتن کە ئێمە ئاوتان بۆ دەنێرین، ئەوانی دیکەیش کە هەندێکیان پیادە و هەندێك سوارە بوون، کەوتنە رێکردن.

ئەسپەکانیان توانایان نەبوو خاوەنەکانیان هەڵبگرن و رێگە ببڕن، بۆیە ئەوان دابەزین و رێشمەکانیان گرتن و لە دوا خۆیاندا رایان دەکێشان.

لە رێگەدا ژمارەیەکی دیکە لە سەربازەکانی ئەسکەندەر دووچاری هەتاوبردن بوون، کاتێك رۆژ بەرەو گەرمتر رۆیشت، هەندێکیان لە تووندی تاکانیان و لەبەر تینویەتی کەوتنە وڕێنەکردن.

باری ئەسکەندەر باش بوو، چوونکە شەرابی پێ بوو، کەمێك شەراب تینویەتی نەدەهێشت، ئەسکەندەر لەو شەرابەی لای بوو، بەشی سەردارەکانی دەدا، تا ئەوانیش تینوو نەبن، بەڵام شەراب ئەوەند زۆر نەبوو، کە ئەسکەندەر بتوانێت بەشی سەربازەکانی لێ بدات، بۆیە ئەوان تینوو مابوون.

کاتێك هەتاو گەیشتە ناوەندی ئاسمان و سێبەرەکان تەواو کورت بوونەوە، لەشکری تینوو و گەرما بردووی ئەسکەندەر وێستان و خێوەتەکانیان هەڵدا بۆ ئەوەی بچنە بەر سێبەرەوە.

ئەوان بۆ ماوەیەکی باش وێستان تا گەرمی هەتاو کەم بۆوە، ئەوکات خێوەتەکانیان گردکردەوە و بەرەو گلۆگان کەوتنەڕێ، کاتی ڕۆیشتن هەندێ لە ئەسپەکان نەیانتوانی بکەونەڕێ، ئەسکەندەر فەرمانی کرد ئەسپە بێ تواناکان بەر بدەن، بەڵام ئەو سوارانەی ئەسپەکانیان بێ توانا ببوون نەیاندەتوانی دەستبەرداری زینی ئەسپەکانیان بن، بۆیە زینەکانیان لە کۆڵیان دەکرد و دەکەتنەڕێ.

ئەوەی ڕۆژ ئاوابوون، ئەستێرەی زووهرە دەرکەوت، دەزانین کە ئەو هەسارەیە لەکاتی هاتنەدەری هەندێ کات هێندە لە زەوی نێزیك دەبێتەوە، بەتایبەت ئەو دەمانەی تازە دەردەکەوێت، سەر زەوی بە شێوەیەك ڕووناك دەکاتەوە کە وەك ڕووناکی مانگی لێ دێت.

ئەوکاتیش چوونکە زووهرە زۆر لە زەوی نێزیك ببۆوە، لە سەرەتای شەودا بیابانی زۆر ڕووناك کردەوە، بەڵام دواتر کە ئاوابوو، بیابان بە تەواوەتی تاریك داهات.

لەو سەردەمەوە کە لەشکر پێکهات، هەردەم لە کاتی جووڵەکردن بە تایبەتی لە شەودا کەسانێك هەبوون کە گۆرانیان دەوت، ئەفسەرەکانیش ڕێگەیان لێ نەدەگرتن تاکو ورەیان بەرزتر و یارمەتیدەر بێت بۆ هەست نەکردن بە ماندوویەتی و بێ دەنگی بشکێنێت، بەڵام ئەو شەوە تینوویەتی بڕست و توانای لە هەمووان بڕیبوو، کەس نەیدەتوانی گۆرانی بڵێت. دوای ئەوەی ماوەیەك ڕێگەیان بڕی، سەربازەکان هێندە بێ توانابوون کە نەیاندەتوانی ڕێگە ببڕن، ئەسکەندەر بە ناچاری فەرمانی وەستانی دا، سەربازەکانیش بێ خۆپارێزی و هەڵدانی خێوەت، لەسەر زەوی درێژبوون تا پشوو بدەن.

ئەگەر ئەو شەوە دەستەیەك لە بلوچەکان هێرشیان بکردایە سەر یۆنانییەکان، دەیانتوانی تا دوایین سەرباز بکوژن، چوونکە ئەوان ئۆردووگەیان دانەنا بوو و پاسەوانیان نەبوو، ئەو لاوازیەی لە ئاکامی تینوویەتی هاتبۆوە کایەوە، ڕێگر بوو لەوەی سەربازەکان بتوانن ئۆردووگە چێ بکەن، سەردارەکانیشیان بۆ ئەوکارە ناچاریان نەکردن. چوونکە خۆیان بە شەرمەزاریان دەزانی کە بۆچی بە شەرابی ئەسکەندەر تینوویەتی خۆیان دەشکێنن، بەڵام ناتوانن لەو شەرابە بەوان بدەن.

لەگەڵ بەرەبەیاندا فێنکایەتیی سەربازەکانی لەخەو ڕاپەڕاند، بەو پێیەی لە گەرمترین ڕۆژەکانی هاویندا هەوای بەرەبەیان فێنکە.

وێڕای ئەوەی یۆنانییەکان خواردنیان لابوو، بەڵام کەسیان نەیانەویست پاڕوویەك نان بخۆن، چوونکە تینوویەتی ئەوانی وا لێکردبوو کە هیچیان بۆ نەخورێت، دوای ئەوەی دنیا بە تەواوەتی ڕووناك بۆوە، یۆنانییەکان تێگەیشتن کە ونبوونە. چوونکە وەك دیاریان کردبوو،

دەبووایە گلۆگان لە دوورەوە دیار بێ، ئەوان بتوانن شاری گلۆگان لە دوورەوە ببینن. ئێستە گلۆگان تەنیا گوندێکە، سەردەمی هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئێران ئەوێ شار بوو.

سەربازەکان لە ڕۆژئاوا چاویان بۆ گلۆگان گێڕا و نەبوو، ڕوویان لە باکور کرد تا ئەو شاخە ببینن کە لە باکور بوو، ئەویشیان نەبینی، لە جیاتی ئەو شاخێکیان لە باکوری ڕۆژهەڵات بینی، بێ ئەوەی بزانن ئەوە هەمان شاخە کە لە باکور بووە یاخۆ شاخێکی دیکەیە، چوونکە شاخ لە هەر چوارلاوە وەك یەك نییە، ئەو شاخەی لە پێشەوە بە شێوەیەك دەردەکەوێت، لەوانەیە لە پشتەوە بە شێوەیەکی دیکە بێت. ئەسکەندەر بە هۆی خواردنەوەی شەرابی شەو لە خەودا مابۆوە، کاتێك لە خەو هەستا، هەواڵیان پێدا کە گلۆگان دیارنییە.

پێویستە بگوترێت لە نووسینەکانی یاوەرانی ئەسکەندەر هیچ باس لە گلۆگان و چاڵی گا ناکرێت، ئەوان ناوی شاریان نەهێناوە، تەنیا وتوویانە چاڵی ئاو و ئەوە ئێمەین کە ئەو بابەتە بەو شێوەیە ڕوون دەکەینەوە.

ئەسکەندەر فەرمانی کرد چەند کەسێك لە ئەوانەی هێشتا ئەسپەکانیان توانایان ماوە بۆ دۆزینەوە بەرەو ڕۆژ ئاوا بڕۆن و بزانن ئایا شار لەو نێزیکانەدا دیارە یان نا؟.

مەبەستی ئەسکەندەر ئەوەبوو کە لەشکرەکەی بە ڕۆیشتنی بێ سوود لەژێر گەرمای هەتاودا ماندووتر نەبن و چاوەڕوانی گەیشتنی هەواڵی ئەو کەسانە بکات کە بۆ گەڕان چوو بوون.

سوارەکان دوای چەند دەمژمێرێك گەڕانەوە لە کاتێکدا کە ئەسپەکانیان بە سەختی ڕێگەیان دەبڕی، هەواڵەکانیان تەنیا بێ ئۆمێدی بوو، وتیان شوێنەواری ئەو شارە دیار نییە، هیچ ئاوەدانییەکی دیکەیش دیار نییە. ئەوکات ئەسکەندەر تێگەیشت کە ونبووە، تێگەیشت کە مەترسی لەنێوچوون چاوەڕوانی لەشکرەکەیەتی.

ئەو و چەند کەسێك لە سەردارەکانی و خزمەتکارەکانی بە هۆی هەبوونی شەراب دەیانتوانی بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتبوون، ئەوکات بەرەو فارس بڕۆن، بەڵام ئەسکەندەر نەیویست لەشکرەکەی بگەڕێنێتەوە، چوونکە هەموویان لە تینوویەتیی دەمردن.

ئەسکەندەر پێش ئەوەی بەرەو ڕۆژهەڵات بێت ئاگەداری دۆخی بیابانەکانی ئەوێ نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی گەشتی بۆ ڕۆژهەڵات کرد و بیابانەکانی ئێرانی بینی و ڕۆیشتە هیندستان و بیابانەکانی ئەوێشی بینی، ئەزموونی وەرگرت.

ئەو دەیزانی بیابان لە هاویندا ئەو ڕێبوارانە بێ توانا و ماندوو دەکات کە ئاو و خواردنیان پێیە، چجای ئەوانەی ئاویان پێ نییە، بە ڕۆژ و شەو دەبێت تینوو بمێنن. ئەسکەندەر دەیزانی گەشتیار یاخۆ سەربازانی تینوو لە کاتێکدا ئۆمێدی گەیشتن بە ئاویان هەبێت خۆیان ڕادەگرن و بەرگەی سەختی برسییەتی و تینوویەتی دەگرن بە ئۆمێدی ئەوەی ئاویان لێ نێزیکە، بەڵام ئەگەر بزانێت کە سەرچاوەی ئاوی لێ نییە، خۆڕاگری و بەرگەگرتنی نامێنێت و توانای ڕۆیشتنی نامێنێت و دەکەوێتە سەر زەوی و خۆی بۆ مردن ئامادە دەکات.

ئەو ڕۆژە سەربازە تینووەکانی ئەسکەندەر دوای گەڕانەوەی سوارەکان و نەبوونی هیچ شارێك لە نێزیکیان، خۆڕاگری خۆیان لە دەستدا، ئەسکەندەر تێگەیشت کە سەربازەکانی چیدی توانای ڕۆیشتنیان نەماوە و پێویستە ئاویان بۆ دابین بکات، بۆیە فەرمانی کرد تا بیر بۆ ئاو هەڵکەنن.

ئاریستۆپۆڵۆس کە لە یاوەرانی ئەسکەندەر بوو دەڵێت بە فەرمانی پاشای مەکدۆنی دەستکرا بە هەڵکەندنی بیر، ئەسکەندەر وەیزانی ئەوێ نێزیك دەریای ئیجەیە و بە هەڵکەندنی دوو گەز دەتوانن بگەنە ئاو، بە دووری دەزانین ئەسکەندەر کە قوتابی ئەرستۆ بووە، هێندە بێ زانیاریی بووبێت، کە نەزانێت لە بیابان لەوانەیە بە هەڵکەندنی دووسەد گەز لە زەویش نەگاتە ئاو. بە گریمانی زۆر ئەو زانیوییەتی لە بیاباندا پێویستە ماوەیەکی زۆر زەوی هەڵکەنن، ئەمڕۆ دەزانین کە لە هەندێ لە بیابانەکان بە دووسەد تا سێ سەد مەتریش ناگاتە ئاو.

ئایا ناکرێت بگوترێت ئەسکەندەر بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سەربازەکانی، ئەوانی هاندا بێت تا بیر هەڵکەنن، لەوکاتەدا کە ئەوان سەرگەرمی هەڵکەندنی بیرن، دەستەیەك لە سەربازان بۆ لایەکی دیکە بنێرێت تا بتوانن ئاو بدۆزنەوە.

ئەو ڕۆژە سەربازەکانی ئەسکەندەر بە تینوویەتی کەوتنە هەڵکەندنی بیر، تا ئەو کاتەی هەتاو گەیشتە نیوەڕۆ بەردەوامبوون، دواتر پشوویاندا تا ئەوکاتەی ڕۆژ بە تەواوەتی ئاوا بوو، سەرلەنوێ دەستبەکار بوونەوە، بەڵام چوونکە دەیانزانی لەو بیابانە وشکە بە ئاسانی ناگەنە ئاو، بەبێ ئارەزووی خۆیان کاریان دەکرد، ئەگەر فەرمانی سەرکردەکەیان نەبووایە ئەو کاریان نەدەکرد، چوونکە دەیانزانی لەو بیابانە پێویستە چەند شەو و ڕۆژ کار بکەن تا بگەنە ئاو، پێش گەیشتن بە ئاو هەموویان لە تینوویەتی دەمرن.

لە شەوی سێیەم لە ڕێکردنیان لە چاڵی گا، هەموو ئەسپەکان بێ توانا کەوتبوون، هەندێکیان سەریان شۆڕ کردبۆوە، خاوەنەکانیان دەیانزانی ئەو شەوە ئەسپەکانیان دەمرن و بەیانی لاشەی هەندێك لەو ئەسپانە لە زەوی دەبن، ئەوانی دیکەیش کە زیندوو دەمێنن، توانای ڕۆیشتنیان نابێت، هەموویان تا نیوەڕۆ یاخۆ تا ئێوارەی ڕۆژی دواتر دەمرن. تەنیا ئەوانەی سوارکارن دەزانن مردنی ئەسپێك لە تینوویەتی یاخۆ برسییەتی چەندە ناخۆشە، بۆیە ئەو شەوە هەموو سوارکارەکانی لەشکری ئەسکەندەر پرسەبار بوون بۆ لەنێوچوونی ئەسپەکانیان.

کاتێك شەو هات ئۆردووگەی ئەسکەندەر تاریك بوو، ئاگری تێدا نەدەبینرا، دەنگی وتووێژ و پێکەنینی سەربازەکان نەدەهات، کە لە دەوروبەری ئاگر یاخۆ نێزیك ئەو بۆ گەرمکردنەوەی خواردن دانیشتبن، چوونکە لە نەبوونی ئاودا ناتوانرێت خواردن ئامادە بکرێت و تینوویەتی تەواو وای لە سەربازەکان کردبوو، کە کەس بیر لە ئامادەکردنی خواردن نەکاتەوە، بۆ نموونە خواردن بە ئاگر ببرژێنن.

ئەو ڕۆژە لەبەر تینوویەتی لە لەشکری ئەسکەندەردا خواردن ئامادە نەکرا، هەرچەندە بەشە خواردنی ئەو شەوە لە خواردنی گۆشتی سوێرکراو درا بوو بە سەربازەکان، بەڵام کەس تەنانەت یەك پاڕووشی نەخوارد، چوونکە دەیانزانی بە هۆی سوێری گۆشتەکە دووچاری تینوویەتی توندتر دەبن، ئەو شەوە لە لەشکری ئەسکەندەر کەس نەیتوانی بخەوێت، تەنیا ئەسکەندەر و سەربازەکانی کە بە خواردنەوەی شەراب تینوویەتیان دەشکاند، توانیان بنوون.

هەرکە سەربازێك بۆ چەند خولەکێك چاوی دەچۆوە خەوەوە، خەوی بە کانی و ئاو و...هتد دەبینی، هەرچەندی دەیخوارد تێر ئاو نەدەبوو تا لەپڕ لە خەو ڕادەبوو و تێدەگەیشت ئەوەی بینیوویەتیی لە جیهانی خەیاڵ بووە، تینوویەتیی لە هەموو شوێنێك ماندووکەرە، تەنانەت لە زستانیشدا ئازار بەخشە، بەڵام تینوویەتیی لە هاوین و لە بیابان بێ ئۆمێدی دەستکەوتنی ئاو، ئازارێکە کە تەنیا ئەوەی دووچاری دەبێت سەختییەکەی دەزانێت.

کاتێك هەوای بیابان کەمێك فێنك بۆوە، هەندێك لە سەربازەکان چەند دەمژمێرێك خەوتن، بەڵام زۆرینەیان بە هۆی ئازاری تینویەتیی، بێداربوون تا سپێدە هات و دوای ئەوە ڕۆژهەڵاتی درێژخایەنی ڕۆژی هاوین دەستی پێکرد.

کاتێك ڕووناکی دەرکەوت، وەك پێشینیان دەڵێن بەنی سپی لە بەنی ڕەش جیابۆوە، سەربازەکانی ئەسکەندەر بینیان کە دەستەیەك لە کەڵەکێوییەکان لە لایەکی بیابانەکە رادەکەن، پێویستە بگوترێت کە یۆنانییەکان لە کاتی رێکردنیان لە رێگەی بلوچستان بەرەو فارس، رێپیێشاندەری ناوچەییان نەبوو، وەك باسمان کرد بلوچەکان ئەوانیان لە کەنارەکان بەرەو قووڵایی بلوچستان بەرِێ کرد و دنیا هێندە گەرم بوو کە کەسیان ئامادە نەبوون رێپیێشاندەریان بن، ئەگەر ئەو لەشکرە رێپیێشاندەری ناوچەییان هەبووایە هێندە ون نەدەبوون.

کاتێك سەربازەکان کەڵە کێوییەکانیان بینی، یەکیان کە لە ئەوانی دیکە بە ئەزموونتر بوو هاواری کرد کە ئەوانە یاخۆ بۆ سەر ئاو دەڕۆن یان لە لای ئاو دێنەوە. ئەو دەیزانی کە کەڵەکێوییەکانی ئێران تەنیا لە بەرە بەیاندا ئاو دەخۆن، ئەوکاتە نەبێت بۆ ئاوخواردن ناچن.

ئێستەش کە دوو هەزار و سێ سەد ساڵ بە سەر سەردەمی ئەسکەندەردا دەڕوات، کەڵە کێوییەکان تەنیا لە بەرە بەیاندا ئاو دەخۆن، گریمانێك نییە کە تا بەیانی دواتر ئەوان تینوو ببنەوە، ئەگەر تینووش ببنەوە، خۆیان رادەگرن تا ئەوەی لە بەرە بەیاندا بچنەوە بۆ ئاو خواردنەوە.

ئەو نەریتە دەروونییەی کەڵە کێوییەکان دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لە ئێران لە کۆندا شێر هەبووە، لەو بیابانانەی کە ئەوانی لێبوون، شێر بە شێوەیەکی ئاسایی تەنیا شەوان ڕاو دەکات، دوای تێپەڕبوونی دووبەش لە سێ بەشی شەو، چی دی راویان نەدەکرد، بەڵام ئەگەر برسی بووانە لە رۆژیشدا راویان دەکرد. کەڵەکێوییەکان ئەو خۆوەی شێرەکانیان دەزانی، بۆیە تەنیا کاتی بەرەبەیان بۆ ئاو خواردنەوە دەڕۆیشتن، ئەگەر لە شەودا بۆ شوێنی ئاو خواردنەوە رۆیشتبان، لەوانە بوو بکەونەبەر هێرشی شێرە برسییەکان.

وەك باسمانکرد ئەگەر بلوچێك لە نێوان سەربازەکانی ئەسکەندەر بووایە، بە بینینی ئەوان دەیزانی کە ئەوان بۆ ئاو خواردنەوە دەچن یاخۆ ئاویان خواردووەتەوە و دەگەڕێنەوە، چوونکە کەڵە کێوییەکان کاتی رۆیشتن بۆ ئاوخواردنەوە بە خێرایی و یەرغە دەڕۆن و لە شێر دەترسن، دەیانەوێت لە هێرشی شێرەکان پارێزراو بن، ئەگەر ئەوان لە بۆسەدا بن، بەڵام دوای گەڕانەوە بە ئارامی و یەك لاق دەڕۆیشتن، چوونکە دنیا ڕووناك دەبۆوە و دەیانتوانی شێرەکان ببینن.

سەربازەکانی ئەسکەندەر لەو ڕاستییانە بێ ئاگابوون، نەیاندەزانی کەڵە کێوییەکان لە ئاوخواردن دێنەوە یاخۆ بۆ ئاو خواردن دەچن، بەڵام گومانیان نەبوو ئەوان یاخۆ لە رۆیشتنن بۆ

ئاو خواردنەوە یان لە گەڕانەوەن لەسەر ئاو، ئەگەر لە هەردوو ئاراستەدا بەدوویان بکەون، ئەوا دەتوانن ئاو بدۆزنەوە.

ئەسکەندەریان لەو ڕووداوە ئاگەدار کردەوە، دوو دەستە لە سەربازەکان لە هەردوو ئاراستەدا کەوتنە شوێن دۆزینەوەی ئاو. ئەوان خۆیان گەیاندە سەر ڕێگەی ڕۆیشتنی کەڵە کێوییەکان و جێی سمەکانی ئەوانیان دۆزییەوە، کە نیشانی دەدا ئەوان بۆ کوێ دەڕۆیشتن و لە کوێ دەهاتنەوە. پێویست ناکات باسی ڕەوشی سەربازانی ئەسکەندەر لە ڕۆژهەڵات تا گەرمبوونی هەوا و ڕادەی تینوویەتیی ئەوان بکەین.

دەستەیەك لە سەربازەکان کە بەرەو ڕۆژهەڵات دەچوون، گەیشتنە ناوچەیەك کە هەوراز دەبۆوە، ئەوان بەرەو بەرزی دەچوون، دوای ماوەیەك لە ڕۆیشتن، چوونکە لە بەرزاییەکان بوون، شنەبایەکی فێنك گەرمای ڕۆژی کەمکردەوە، لەپڕ لە دوورەوە ئاو دەرکەوت. لە سەرەتا وایان زانی ئەویش سەراویلکەیە، دواتر بینیان کۆمەڵە باڵندەیەك لەوێن، بۆیە دڵنیابوون کە سەراویلکە نییە، بەڵام هێندە ماندووبوون، تەنانەت توانای دەربڕینی خۆشیان نەبوو، نەیاندەتوانی هەنگاوەکانیان خێراتر بکەن تا زووتر بگەنە ئاو و تێرئاو بن.

لە ڕاستیدا ئەوێ جۆگەلەیەك بوو کە لە ئاکامی ئاوی کانیاوێك چێ ببوو، لە بیابانەکانی ئێران لە تەواوی ئەو شوێنانەی بەرزایین، لەوانەیە ئەو کانیانە هەبن، سەربازەکان لەگەڵ گەیشتنیان بە جۆگەلەکە، کەوتنە سەردەم و دەمیان نایە سەر ئاو و خواردیانەوە.

ئەگەر ڕێپێشاندەرێکی ناوچەیی لەگەڵیان بووایە ئامۆژگاری دەکردن تا بە دەست ئاو بخۆنەوە، کەمێك بخۆنەوە، دوای کەمێکی دیکە هەندێك ئاوی دی بخۆنەوە تا بەرەبەرە تێر ئاو بن، بەڵام چوونکە ڕێپێشاندەریان نەبوو، کەوتنە سەر دەم، بێ ئەوەی بیر بکەنەوە کە لەوانەیە بمرن، کەوتنە ئاو خواردنەوە تا نەیانتوانی هەستنەوە، بە هەمان شێوە مانەوە.

دوای دەمژمێرێك هەندێك لە ئەوان توانیان هەستنەوە، هەندێکیشیان توانای جووڵەیان نەبوو، کاتێك ئەوانی دی بۆ لایان چوون، بینیان کە مردوون، بەڵام ئەوانەی بە خۆهاتبوونەوە، وەك ئەوە وابوو کە تازە زیندوو بووبنەوە، وزە و هێزیان بەبەر هاتەوە.

لاشەی مردووەکانیان جێ هێشت و مەشکەکانیان پڕ ئاو کردوو و کەوتنەڕێ، چوونکە گرینگترین کار و ئەرکی ئەوان لەو کاتەدا گەیاندنی هەواڵی دۆزینەوەی ئاو بوو بە ئەسکەندەر، ئەوان زۆر بە خێرایی ڕێگەیان دەبڕی و پێش ئێوارە مەشکە پڕ لە ئاوەکانیان

گەیاندە لەشکر، وێڕای ئەوەی هەندێ لە سەربازەکان لەبەر تینوویەتیی لە دۆخی بێ ئاگاییدا بوون، بە بیستنی هەواڵی هەبوونی ئاو چاوەکانیان کردەوە.

ئەسکەندەر فەرمانی کرد ئەو ئاوەی کە هێندراوە بە باشی دابەش بکەن، سەرەتا ئاو بدەن بەو کەسانەی بێ ئاگان، ئەگەر ئەوان توانای دەم کردنەوەیان نەبوو، دەمیان بکەنەوە و ئاوەکە بکەنە نێو دەمی ئەوان.

بۆ دابەشکردنی ئاو پیاڵەی بچووکیان هەڵبژارد، هەریەکە لە سەربازە تینووەکان یەك پیاڵە ئاویان پێدرا، هەر ئەو ڕێژە کەمەی ئاو، توانی بێ ئاگاکان بە هۆش بێنێتەوە و هێزی بەخشییە چووکی ئەوانی دیکە تا بکارن ڕێ ببڕن.

لەبارەی ئەو دەستە سەربازەی بەرەو ڕۆژئاوا بۆ دۆزینەوەی ئاو چووبوون نە لەو ڕۆژە و نە لە ڕۆژانی دواتر هەواڵێك نەهاتەوە، کەس نەیزانی ئەوان لە چ لایەکی ئەو بیابانە مردن، لەوانەیە لم و خیز لاشەکانی داپۆشی بن، چوونکە لە نێزیکی هەمان ناوچە، واتە ئەو هێڵەی لە چاڵی گاوە بەرەو گلۆگان دەڕۆیشت، لە ئاراستەی باکوری ڕۆژئاوا ناوچەیەکی خیزەڵێن هەبوو، کە خیزەکەی وەك لمی کەناری دەریا نەرم بوو، دوای ئەوەی با دەشنایەوە، لە زەوی بەرزی دەکردەوە و بۆ شوێنی دیکەی دەگواستەوە.

ئەو شەوە ئەسکەندەر بە سەردارەکانی خۆی ڕاگەیاند کە سەرەڕای ئەوەی ئەوان بەرەو پارس دەڕۆن، ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژهەڵات لە ڕێڕەوی خۆیان دووریان دەکاتەوە، بەڵام چارەیان نییە لەوە پتر کە بەرەو ئەو جۆگە ئاوە بڕۆن، چوونکە لەوکاتەدا گرینگترین ئەرك بۆ ئێمە دابینکردنی ڕێژەی پێویست لە ئاو بوو، دوای ئەوەی ئاوی پێویستمان هەڵگرت بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆین.

لەگەڵ دەرکەوتنی بەرەبەیان فەرمانی جووڵەی لەشکر لەلایەن ئەسکەندەر درا، ئەوکات تەنانەت یەك ئەسپ لە لەشکری ئەسکەندەر توانای جووڵەی نەبوو، بۆیە ئەسکەندەر ناچار بوو بەشێك لە پێداویستییە جەنگییەکانیان لەوێ بەجێ بهێڵێت تا دواتر ئەگەر ئامێری گواستنەوەیان دەست کەوت، بێن و ئەو کەرەستانە ببەن.

سەربازەکان بە ئومێدەوە ڕێگەیان دەبڕی، پێش نیوەڕۆ توانیان خۆیان بگەیەننە سەرچاوەی ئاو. لەشکری ئەسکەندەر ماوەی سێ ڕۆژان لەو شوێنە مانەوە تا بە تەواوەتی هێزی لەدەستچووی خۆیان وەرگرتەوە، لەو سێ ڕۆژەدا ئاژەڵە کێوییەکانی بیابان، لەنێویشیان کەڵە

کێوییەکان نەیاندەوێرا لە ئاوەکە نێزیك ببنەوە، بەڵام ئاژەڵە بیابانییەکان لە بیاباندا تەنیا یەك سەرچاوەی ئاویان لەبەر چاو نەدەگرت، سەرچاوەی دیکەیان دیار دەکرد تا ئەگەر سەرچاوەیەك وشك بوو، بتوانن لە ئەوانی دیکە ئاو بخۆنەوە.

پاش سێ ڕۆژان لەشکری ئەسکەندەر، دوای ئەوەی تەواوی کەلوپەلەکانی تایبەت بە گواستنەوەی ئاویان پڕ ئاو کرد و لاشەی مردووەکانیان ناشت، کەوتنەڕێ، بە وردی دەستیان بە ئاوەوە دەگرت تا لە دوورەوە شاری گلۆگان دەرکەوت، لەوکاتەدا ئەسکەندەر تێگەیشت کە لەشکرەکەی ڕزگاریان بووە، تا ئەوکات ترسی هەبوو کە لەشکرەکەی دووچاری بێ ئاوی ببێتەوە.

دوای ئەوەی گەیشتنە شاری گلۆگان، ئەسکەندەر فەرمانیدا تا ئەسپ دەستەبەر بکەن و بچنە ئەو شوێنەی کە پێداویستییە جەنگییەکانیان لێ بەجێ هێشتووە، ئەوان بار بکەن و بیانهێننەوە، ئەسکەندەر کە لە ڕووداوی بێ ئاوی ئەزموونی وەرگرتبوو، فەرمانی کرد تا چەند کەسێك لە خەڵکی ناوچەکە بە کرێ بگرن و لەگەڵ خۆیان وەك ڕێپێشاندەر بیانبەن.

کاتێك ئەو دەستە سەربازە گەیشتنە شوێن خێوەتگەی ئەسکەندەر، تەواوی ئەو ئەسپانەی لە ئەوێ مابوون، لە تینوویەتیی مردبوون، گەرمای تووندی هەتاو بە زوویی لاشەکانی ڕزاندبوون و بۆگەنی هەموو شوێنێکی داگیرکردبوو، بۆیە زۆر بە خێرایی کەلوپەلەکانیان بار کرد و گەڕانەوە، چوونکە دەیانزانی ئەگەر بمێننەوە، هەموویان نەخۆش دەکەون.

کاتێك سوپای ئەسکەندەر لە گلۆگان کەوتنەڕێ، چەند ڕێپێشاندەرێکیان لەگەڵدا بوو، بۆیە لەمەودوا هیچ ڕووداوێك شیاوی باسکردن بێت ڕووی نەدا.

درێژەی باسی ونبوونی لەشکری ئەسکەندەر لە یادگارییەکانی یاوەرانی ئەسکەندەر و مێژوونووسە یۆنانییەکان و ئەو باسەی پرۆفیسۆر بارنی بەریتانی لەو بارەوە نووسیویەتی، وەرگێراوە، بە هەمان شێوەش بەسەرهاتی جەنگی تەرمۆپیلمان لە پرۆفیسۆر بارن وەرگرت بوو.

# دوای مردنی ئەسکەندەر

ئەسکەندەر لە ساڵی (٣٢٤ پ. ز) دوای رزگاربوونی لە بیابان، گەیشتە فارس و بەرەو شووش رۆیشت، ئەوکات لە شووش لە رێگەی ئەو جەژنە گەورانەی بەجێی گەیاندن هەوڵی دڵنەوایی ئێرانییەکانیدا. بە وتەی مێژوونووسان ئەو نەخشەی ئەو بۆ ئاشتی یەکجارەکیی مەکدۆنی و ئێرانییەکانی دانا، بە پێکهێنانی کۆمەڵە پێوەندییەکی تازە ئەوانی لە یەکدی نێزیك دەکردەوە. بۆیە لە جەژنێکدا ئەسکەندەر و هەشتا کەس لە سەردار و ئەفسەرەکانی جلوبەرگی ئێرانیان کردەبەر و هاوسەرگیریان لەگەڵ کچانی ئێران کرد. ئەسکەندەر و دۆستە نێزیکەکەی (هەفەستیۆن) کچی داریوشی سێیەم کران بە هاوسەری یەکدی، سەردار و ئەفسەرەکانی دیکەیش لەگەڵ کچانی هەخامەنشیی یاخۆ کچانی گەورە بنەماڵەکانی ئێرانی بوونە هاوسەر.

هەر بە وتەی ئەو مێژوونووسانەی باسی هاوسەرگیری بە کۆمەڵیان کردووە، لە هەمان ساڵ واتە (٣٢٤ پ. ز) هەریەکە لە سەربازەکانی خۆی کە ماوەی دە ساڵ بوو لە ئەرکی سەربازیدا بوون، مۆڵەتدا و لە ئێراندا بۆ هەریەکەیان پارچە زەوییەکی دابین کرد تا لەوێ نیشتەجێ بن و کشتوکاڵ بکەن، هەموو ئەو زەوییانەی بە ئەوانی بەخشی ئەو زەوییانە بوون کە لە ئێرانییەکانی سەندبوو.

هەندێ لە مێژوونووسانی وەك (کونت دۆ گۆبینۆ) فەرەنسی نووسیویانە ئەو یۆنانییانەی زەویان پێدرا لە ئێران نیشتەجێ بوون و هاوسەرگیریان لەگەڵ کچانی ئێران کرد، ئەو کارە برەوی سەند، بۆیە ئێرانییەکان لەمەودوا بوونە خاوەنی چاوی شین و ئەوانەی چاویان شینە لە ئێران لە نەوەی یۆنانییەکانن. ئەو گریمانە ڕاست نییە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە ئێستە لە کۆمەڵگەی یۆنانی ژمارەی ئەوانەی چاو و موویان رەشە زۆرینەن.

لە دەستەبەندییەکانی نەتەوە هیند و ئەوروپاییەکان کە تیرەکانی ئەوان خاوەن چاوی شین و گەش یاخۆ مووی زێڕینن، ئەو رەگەزانە لە پەڕتووکە کلاسیکەکانی رەگەزناسی هەیە:

١) رەچەڵەکی جێرمەنی کە ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت (باواری، ئالەیانی، فرانکۆنی، ساکسۆنی، گوتی، نەروێژی و سویدی).

٢) رەچەڵەکی سێڵت و تیرەکانی.

٣) رەچەڵەکی ئیتالێك و بەشەکانی وەك (لاتینی، رۆمانی، ساردینی و دالماس و...هتد.)

٤) رەچەڵەکی هێلێنی کە ئەو بەشانەی وەك (یۆنانی، ئاتیکی، دۆرکی، کۆرێنتی و قوبرسی و...هتد) دەگرێتەخۆ.

٥) رەچەڵەکی سلاڤی و ئێسلۆنی لەگەڵ بەشەکانی (ئێسلوونی، سربی، کرواتی، بولغاری و لەهستانی و...هتد.)

٦) رەچەڵەکی هیند و ئێرانی کە ئێرانیانی ئەمڕۆ لەو رەچەڵەکەن و رەنگی ڕووخساری ئەوان ڕوونتر لە رەنگی ڕووخساری هەندێ لە رەچەڵەکەکانی دیکەی هیند و ئەورووپاییە. ئەو ئێرانیانەش کە لەو رەچەڵەکن لە بەشی جیا پێکهاتوون، زۆرینەی رەچەڵەکناسەکان ئەوەیان پشتڕاست کردووەتەوە کە ژمارەی ئەوانەی چاویان شین و پرچیان زەردە زۆرن، هەرچەندە ژمارەیان ناگاتە ژمارەی ئەڵمانەکان بەڵام بە رێژە زۆرن. بۆیە بێ دوودڵی هەموو ئەو ئێرانیانەی چاو شین یاخۆ پرچ زەردن لە رەچەڵەکی ئێرانین نەك یۆنانی. بیرۆکەی کونت دۆ گۆبینۆ و نووسەرانی دی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی زانیارییەکانان لەبارەی رەچەڵەکناسی و زانیارییەکانیان وەك ئێستە نەبووە.

ناتوانین ئەوە رەت بکەینەوە کە لە نێوان ئەو یۆنانییانەی ژنی ئێرانیان هێنا، سەربازی چاوشین و پرچ زەردی تێدا نەبووە، بەڵام زۆرینەیان چاو رەش بوون، پروپاگەندەی ئەوەی ئێرانییە چاوشین یاخۆ پرچ زەردەکان لە نەوەی یۆنانییەکانن، لە ئەفسانە پتر نییە.

لەم بەشەدا دەگەینە ئەفسانەیەك سەبارەت بە ئەسکەندەر کە لە رۆژهەڵات زۆر ناوبانگی هەیە و بریتییە لە بڕیاری ئەو بۆ رۆیشتن بەرەو باکور و داگیرکردنی، بە وتەی مێژوونووسەکان دەچوو تا ئاوی ژیان بدۆزێتەوە و بیخواتەوە تا بۆ هەردەم زیندوو بمێنێت، بەڵگەمان بۆ ئەفسانەبوونی ئەو باسە ئەوەیە کە ریزبەندی ئەو ڕووداوانە لەگەڵ کرۆنۆلۆژیای ژیانی ئەو رێك نییە.

ئەسکەندەر لە ساڵی (٣٢٤ پ. ز) خۆی و سەردارەکانی لە ئێران هاوسەرگیریان کرد، لە ساڵی دواتر واتە (٣٢٣ پ. ز) مرد، چۆن لەو ماوە کورتە کە یەکساڵ بوو، توانای هەبوو بۆ دۆزینەوەی ئاوی ژیان بەرەو باکور بڕوات و هێندە بڕوات تا بگاتە سەرزەوی تاریکی؟.

ئاشکرایە سەرزەوی تاریکی واتە جەمسەری باکور، ئەسکەندەر بۆ گەیشتن بەو شوێنە دەبووایە لە لینینگرادیش تێپەڕ ببێت، بەرەو باکور بڕوات، لینینگراد لە سەرزەوی تاریکی نییە، لە زستاندا کورتترین رۆژ ماوەکەی نیو کاتژمێرە، تاریکی بە تەواوەتی باڵی ناکێشێت بەسەر ئەو ناوچەیە.

ئەسکەندەر بۆ گەیشتنی بە ناوچەی تاریکی پێویست بوو لانی کەم تا هێڵی پانی (٦٢) پلە بڕوات، چوونکە لە ئەوێ بە دواوە ئیتر لە وەرزی زستاندا رۆژ نابێتەوە بەردەوام تاریکی و شەوە، واتە ئەسکەندەر لانی کەم دەبووایە تا ناوەڕاستی وڵاتی فێنلەند بڕوات کە لەو ماوە کورتەدا ئەو کارە ئەستەمە، چوونکە ئەگەر ئەو بۆ سەرزەوی تاریکی رۆیشتبێت، دەبێ لە زستانی ساڵی (٣٢٤ — ٣٢٣ پ. ز) گەشتەکەی دەست پێکرد بێت، ئەو نەیدەتوانی لەو ماوەیەدا سەفەرەکەی کۆتایی پێ بهێنێت و بگەڕێتەوە، سەرەڕای ئەوەی پەڕاندنەوەی لەشکرێك لە وەرزی زستاندا لە بیابانەکانی ڕووسیا کارێکی ئەستەم بوو.

ئەو کەسانەی گەشت بۆ سەرزەوی تاریکیان هێناوەتە ناو ژیانی ئەسکەندەر، تەنیا مەبەستیان دروست کردنی ئەفسانە بووە و ویستوویانە ژیانی ئەسکەندەر سەرسووڕهێنەرتر لە ئەوەی هەیە بخەنە بەرچاو، لەو ئەفسانەیە نووسەری ئەفسانە، چوونکە مەبەستی نووسینەوەی مێژوو نەبووە، جڵەوی ئەسپی خەیاڵی بەرداوە و هەرچی بە خەیاڵیدا هاتووە نووسیویەتی و لانی کەم هەوڵی نەداوە بابەتگەلێك بنووسێت کە کۆك بن لەگەڵ ئەقڵدا.

پێدەچێت یەکەم کەس کە ئەفسانەی گەشتی ئەسکەندەری بۆ تاریکی نووسیوەتەوە، ڕووداوەکانی ناو (حەوت خووانی) شانامەی وەرگرتووە، ویستوویەتی لەسەر شێوازی ئەوان هەندێ خووان بۆ ئەسکەندەر دیاری بکات.

لە حەوت خووانی شانامە ئەو ڕێگریانەی دێنە سەر ڕێگەی ڕۆستەم بە سەرەنجدان لە ئەفسانەکانی ئەوکات زۆر سەیر نین، بەڵام لە حەوت خوداوەندنەکانی ئەسکەندەر هێندە سەیرن، تەنانەت ئەو کەسانەی بڕوایان بە دێو و ئەژدیهای باڵدار و...هتد هەیە، دووچاری سەرسووڕمان دەبن و ناتوانن ئەو ڕووداوانە پەسەند بکەن. درێژەی باسی ئەو گەشتەی

ئەسکەندەر تەنیا لە هەندێ لە پەڕتووکە ڕۆژهەڵاتییەکاندا هەیە و لە هیچ مێژوویەکی ڕۆژئاواییدا نەنووسراوە.

ڕووداوێکی دیکە کە لە ساڵی (٣٢٤ پ. ز) ڕوویدا بریتی بوو لە داواکاری دی نۆکراتی ئەندازیاری ئەو سەبارەت بە دروستکردنی پەیکەرێك بۆ ئەسکەندەر لە یەکێك لە شاخەکانی ئێران، بە واتایەکی دی شاخێك داتاشێت و بیکاتە پەیکەری ئەسکەندەر.

ئەسکەندەر وتی: بۆچی دەتەوێت شاخێك بۆ پەیکەری من داتاشی؟.

دی نۆکرات وتی: بۆ ئەوەی هیچ کات زیانی پێ نەگات و تا دنیا هەیە ئەو پەیکەرە هەبێت.

ئەسکەندەر وتی: کەواتە ئەو کارە لە ئێران ئەنجام مەدە، چوونکە دوای مردنم ئێرانییەکان پەیکەرەکەم تێك دەشکێنن.

دی نۆکرات وتی: لە کوێ پەیکەرت لەنێو شاخدا بۆ دروست بکەم.

ئەسکەندەر وتی: ئەو کارە لە یۆنان ئەنجام بدە، چوونکە لە ئەوێ لە دوای مردنم کەس هەوڵی شکاندنی پەیکەرەکەم نادات.

دی نۆکرات فەرمانی ئەسکەندەری پەسەند کرد و وتی: دوای ئەوەی گەیشتمە یۆنان، دەگەڕێم و شاخێك دەدۆزمەوە، کە پێکهاتەکەی لەو بەردە بێت کە بۆ داتاشین دەشێت تا بە تێپەڕبوونی کات زەربە لە پەیکەرەکە نەدات.

دی نووکرات دوای گەیشتنی بە یۆنان شاخی (ئەفەس)ی لا باشتر بوو لە شاخەکانی دیکە، چوونکە لەو بەردە بوو کە دەیویست، شاخی ئەفەس نابێت بە هەڵە بە شاری ئەفەس کە شارێکی یۆنانی نشینی ئاسیای بچووك بوو.

ئەوکارەی دی نۆکرات هەوڵی دەدا ئەنجامی بدات، تەنانەت لە جیهانی ئێستە کە ئامێرە پێشکەوتووەکان و ماشێن زۆربوونە، هەر کارێکی گەورە بوو، چوونکە ئەو دەیەویست شاخێك بۆ ئەو مەبەستە داتاشێت. ئەو پێشبینی دەکرد کە ئەگەر ژمارەیەك بەردتاش بەردەوام سەرگەرمی کار بن، دوای بیست ساڵ ئەو پەیکەرە لە شاخەکە دروست دەکرێت و ژمارەی ئەو بەردتاشانەی لەلایەن دی نوکرات بۆ ئەو مەبەستە بە کرێ گیران بریتی بوو لە پێنج هەزار کەس.

دی نۆکرات پێش ئەوەی کارەکەی دەست پێ بکات لە دەرەوە نەخشەی پەیکەرەکەی دانا، دواتر ئەو نەخشەیەی بە پێوەری گەورەتر بۆ شاخەکە گواستەوە، بە شێوەیەك لەگەڵ پێوەری شاخەکەی ڕێکخست، کە بەردتاشەکان لە خوارەوەی شاخەکە دەیانتوانی دەست بە کار بکەن،

سەرەتا دوو قاچی پەیکەری ئەسکەندەر داتاشن، تا بەرزتریش بوونەوە داربەستی زیاتر دروست بکەن بۆ ئەوەی کاریان لەسەر بکەن.

کاتێك هەواڵی مردنی ئەسکەندەر لە شاخەکە گەیشتە دی نوکرات، بەردتاشەکان بەشێك لە دوو قاچی پەیکەری ئەسکەندەریان تاشی بوو، هەواڵی مردنی ئەسکەندەر هێندە لەسەر دی نۆکرات کاریگەر بوو کە بەو چەقۆیەی لای بوو، قورگی خۆی هەڵبڕی و کۆتایی بە ژیانی هات.

کساندرۆس کە وەك باسمان کرد، هاوسەری خوشکی ئەسکەندەر بوو، دواتر لە جیاتی ئەو بوو بە پاشا، بەپێی هەندێ گێڕانەوە کوڕەکەی ئەسکەندەر و روکسانەی خێزانی ئەسکەندەری کوشت، بە هۆی ئەو چاوچنۆکییەی بەرانبەر داریوش هەیبوو، ئەو بەشە لە پەیکەری ئەسکەندەری لەنێوبرد کە لە شاخی ئەفەس داتاشرا بوو، ئێستە لەو کارەی لە دامێنی ئەو شاخە دی نۆکرات بە ئەنجامی گەیاند هیچ شوێنەوارێك نەماوە.

بویەرەکانی مردنی ئەسکەندەر کە لە تەمەنی سی و نۆ ساڵێدا بوو. هەموو یاوەرانی ئەسکەندەر و مێژوونووسەکان هاوڕان لەو بابەتە کە مردنی ئەو بە هۆی نەخۆشییەوە بووە، هەندێك لە مێژوونووسان نووسیویانە کە ئەو دوای مەلەکردن لە ڕووباردا نەخۆش کەوت، سەبارەت بەو ڕووبارەی ئەو مەلەی تێدا کرد سێ گێڕانەوە هەیە:

یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو ڕووبارەی ئەسکەندەر مەلەی تێدا کرد، هەمان زێی فورات بوو، دوای ئەو مەلەکردنە ئەسکەندەر لە بابل مرد.

دووەم ئەوە بوو کە ئەسکەندەر لە ڕووباری دیجلە مەلەی کرد، هەر لە کەناری ئەو ڕووبارە و لە شوێنێك کە مێژوونووسەکان ناویان نەهێناوە، کۆتایی بە ژیانی هات.

سێیەم لە ڕووباری کەرخە مەلەی کرد، دوای نەخۆش کەوتن، ئەسکەندەر لە شاری شووش کۆتایی بە ژیانی هات.

ئەو کەسانەی دوای هەزاران ساڵ لە ڕووی نیشانەکانەوە دەتوانن نەخۆشی بناسنەوە، نووسیویانە کە ئەسکەندەر بە نەخۆشی مەلاریا کۆتایی بە ژیانی هاتووە، بەڵام (ئۆگۆست بایی) مێژوونووسی فەرەنسی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم ژیاوە و ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسە بووە، لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە کۆك نییە و پێی وایە مەلاریا نەخۆشییەك نییە کە بە چەند رۆژێك مرۆڤ لەنێو ببات، مەلاریا کوشندەیە، چوونکە هەندێك لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ وەك جەرگ لەکاردەخات، بەڵام نەك تەنیا لە ماوەی بیست رۆژدا، هەندێك لەو کەسانەی

دووچاری مەلاریا دەبوون تا چل یاخۆ پەنجا ساڵ دوای تووش بوونیان زیندوو دەمانەوە، بەڵام لە نووسینی هیچ یەك لە یاوەرانی ئەسکەندەر ئاماژە بەو نەخۆشییە نە لە پێش ساڵی (٣٢٣ پ. ز)، نە دواتریش نەکراوە. جگە لەوە توانا جەستەییەکانی ئەسکەندەر لە گەشت و جەنگەکاندا نیشانی دەدات کە ئەو جەستەیەکی ساخڵەمی هەبووە، نەخۆشێکی تووشبوو بە مەلاریا کە لە رۆژێك یاخۆ دوو رۆژ یان سێ رۆژ جارێك دووچاری تایەك دێت کە پاتر لە کاتژمێرێك دەخایەنێت، ئەو توانا و هێزە جەستەییانەی نابێت، بە دڵنیاییەوە ئەسکەندەر بە نەخۆشی مەلاریا نەمردووە.

بە وتەی ئۆگۆست بایی و بە سەرەنجدان لە نووسینەکانی یاوەرەکانی ئەسکەندەر، نەخۆشی ئەسکەندەر کە لە ماوەیەکی کەمدا ئەوی کوشتن دەبێت برێتی بێت لە نەخۆشی (هەوکردنی سییەکان)، بەڵام بە وتەی مێژوونووسەکانی دیکە ئەسکەندەر دوای ئەو گەشتە درێژەی بۆ رۆژهەڵات، ماندوو ببوو، کاتی گەڕانەوەش ناچار بوو ئەو کەسانە سەرکوت بکات کە لە نەبوونی ئەودا یاخی ببوون، ئەم هۆکارانە ئەویان لە دۆخێکی دەروونی و ڕووحی خراپدا دانابوو، لەوکاتەشدا مردنی تاکە دۆست و خۆشەویستەکەی، هەفستیۆسیش زەربەیەکی ترسناکی دیکە بوو کە بەری بکەوێت. ئەسکەندەر لە نەبوونی ئەودا پرسەدار بوو، سەرئەنجام هەوڵیدا بە خواردنەوە و رابواردن، لەدەستدانی ئەو فەرامۆش بکات، بۆیە کەوتە مەی خواردنەوە بە رێژەی زۆر، شەوێك لە یەکێك لە میوانداریییەکان بە رادەیەکی خواردەوە کە دووچاری تایەکی خراپ بوو و نەخۆش کەوت، لە ماوەی دە تا بیست رۆژ مرد. لە کاتێکدا کە سی و سێ ساڵ پتر لە تەمەنی تێپەڕ نەببوو، دوازدە ساڵ و چەند مانگێکیش پاشا بوو، لە بابل و لە کۆشکی (نەبۆکد نەسر) لە (٣٢٣/٥/١٣) کۆچی دوایی کرد.

زانیاریمان لەبارەی شوێنی ناشتنی ئەسکەندەر نییە، گوایە یۆنانییەکان کە خۆیان نەریتی هەڵکەندنەوەی گۆڕ و دەرهێنانەوەی تەرم و سووتاندن و...هتد هەبوو، وایان دەزانی ئێرانییەکان بە هۆی ئەو کینەیەی بەرانبەر ئەسکەندەر هەیانبوو، لەوانەیە گۆڕەکەی هەڵکەنن و لاشەکەی دەربێنن و بیسوتێنن، بەڵام ئێرانییەکان ئەو نەریتە ناپەسەندەیان نەبوو، ئەو نەریتە لە نێوان دوو نەتەوەی یۆنان و مەغۆلەکان برەوی هەبوو.

بە داخەوە دوای ئەوەی مەغۆلەکان لە ناوچە جیاکانی ئێران بە دەسەڵات گەیشتن، بەرەویان بەو نەریتە ناشیرینەدا، هەر دەسەڵاتدارانێك کە دژی یەکدیی بوونایە، لە کاتی سەرکەوتندا لاشەی دوژمنەکەی لە گۆڕ دەردەهێنایەوە و دەیسووتاند. بە داخەوە بە هۆی ئەو

نەریتە ناشیرنە، ئەو دەستەواژە ناشیرنانە "(پدرش را در اورد) یاخۆ (پدرش را سوزانید) "هاتنە نێو زمانی فارسی و مایەوە، ئەو دەستەواژانە بەو واتایە دێن (بابی لەگۆڕ دەرهێنایەوە یاخۆ بابی سووتاند).

هەر شتێك لە پەڕتووکەکاندا لەبارەی شوێنی شاردنەوەی تەرمی ئەسکەندەر نووسراوە یاخۆ دەوترێت تەنیا پروپاگەندەیە و کەس زانیاریی لەبارەی شوێنی ناشتنی ئەو پیاوە نییە، چوونکە یۆنانییەکان خەڵك بە خۆیان هەڵدەسەنگێنن و دوور نییە یۆنانییەکان دوای ناشتنی ئەسکەندەر و بۆ بە شاراوەیی هێشتنەوەی گۆڕەکەی، تەواوی ئەو کەسانەیان کوشتبێت کە شوێنەکەیان زانیوە تا کەس بە شوێنی گۆڕی ئەو نەزانێت.

* * *

لە مێژووی یۆنان و بە شوێنکەوتوویی لە ئەوانیش لە مێژووی ئەورووپا دەستەواژەیەك هەیە کە نەتەوە رۆژهەڵاتییەکان کەمتر بیستوویانە و برێتییە لە (دیادۆکی) یاخۆ (دیادۆخۆی)، ئەو وشە یۆنانییە بە واتای (جێنشینەکان) دێت، کە بەو جەنگانە وترا کە بە شێوەی زۆر بێ بەزەییانە لە نێوان سەردارەکانی ئەسکەندەر ڕوویاندا.

هێشتا تەرمی ئەسکەندەر بە تەواوەتی نەنێژرابوو، ئەو جەنگانەیان دەست پێکرد، جێنشینەکانی ئەسکەندەر لە هیچ جۆرە بێ بەزەیی و توندییەك بەرانبەر یەکدیی سڵیان نەکردەوە و نەوەستانەوە، سەردارەکانی ئەسکەندەر نێزیك پەنجا کەس دەبوون، هەشت کەسیان باڵادەستتر بوون بەسەر ئەوانی دیکە، بۆیە ئەوانەی دی فەرمانەکانی ئەوانیان بەجێ دەگەیاند.

ناوی هەشت کەسەکە برێتی بوو لە: لیزی ماخۆس، ئانتی پاتێر، کاساندێر، پێردیکاس، ئانتی گۆن، کۆلۆس، بەتڵەمیۆس و سلۆکۆس. ناوی هەریەکە لەو سەردارانە لە مێژوودا هاوڕێیە لەگەڵ کۆمەڵێك کارەسات کە کەمتر نین لە کارەساتەکانی جەنگیزخان و تەیموری لەنگ. ئەو هەشت کەسە دوای مردنی ئەسکەندەر هەوڵیاندا گەنجینەکەی داگیر بکەن.

ئەسکەندەر دەستکەوتە جەنگییەکانی خۆی گواستەوە بۆ یۆنان، بەشێك لە دەستکەوتەکانی هیندستانیشی بۆ یۆنان رەوانە کرد، هەموو ئەوانەی لە کاتی مردنیدا لە شووش یاخۆ بابل یان دەڤەریلی دیکە هەیبوو، بوو بە هی ئەو هەشت کەسە، هەریەکە لەو

هەشت کەسە سەرکردەی بەشێك لە لەشکرەکەی ئەسکەندەر بوون، دوای مردنیشی هەریەکەیان لەگەڵ نیزیکانی خۆی بەپێی دەڕوونی خۆیان لە ئەوانی دیکە جیا بوونەوە، چوونکە دەیانزانی ئەگەر دەستی ئەوانی دیکەی پیَ بگات دەکوژرێت.

ئەوەی لە گەنجینەی ئەسکەندەر دەست ئەوان کەوت، بۆ ئەوان بەس نەبوو، لەشکرەکانیشیان خەرجی پێویست بوو، ناچاربوون خەرجی ئەفسەر و سەربازەکانیان بە ئەستۆ بگرن. تالاَنکردن خێراترین و ئاسانترین رێگە بوو، بۆ بە دەستهێنانی سەرمایە، بۆیە هەریەکە لە سەردارەکان لەو شوێنەی لێی بوون کەوتنە تالاَنکردن. مەبەستی یەکەمی ئەوان زێڕ و زیو بوو، هەرکەسێك چەندی زێڕ و زیو هەبووایە لیَ یان دەستاند، بۆیە خەڵك لە ترسی ستەمکاران زێڕ و زیوەکانیان لە قوڵایی و لەژێر زەوی دەشاردەوە، ئەو کەسانەی بە زۆر پارەیان لە خەڵك دەستاند، دەیانزانی و ئاگەداربوونئەوان لە کویَ سامانەکانیان دەشارنەوە، هەر بۆیە ستەمکاران لە ڕادە بەدەر ئەشکەنجەی دەوڵەمەند و خاوەن سامانەکانیان دەدا تا شوێنی پارە و زێڕە شاراوەکانیان پیَ بڵێن، بۆیە نابێت دووچاری سەرسووڕمان بین لە ئەوەی خەڵکی ڕۆژهەڵات لە کۆندا خۆیان بە هەژار دەردەخست، هەموویان خۆیان بە نەدار دەناساند تا لە ستەمی دەسەڵاتداران بپارێزرێن.

ئانتی پاتێر لەنێو هەشت سەردارەکاندا باڵابەرز و لە هەمووان بەهێزتر بوو، ئازەربایجان و ولاَتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکی داگیرکرد، ئەوکات هەوڵیدا تا ولاَتانی ڕۆژئاوای ئاسیای بچووکیش داگیر بکات، کە لە ژێردەست (پێردیکاس) بوو.

پێردیکاس یەکێکی دیکە بوو لە سەردارەکانی ئەسکەندەر، کە لەسەروبەندی مردنیدا، ئەسکەندەر ئەنگوستیلەکەی خۆی بە دیاری پیَ بەخشی، ڤێجا دوای ئەسکەندەر بە جێنشینی دەسەڵات لە بابل دانرا و دەسەڵاتیی گرتە دەست. ئەو پیاوێکی ئازا بوو، لەو ساڵەی ئەسکەندەر، مرد واتە (٣٢٣ پ. ز) تا ساڵی (٣٢١ پ. ز) واتە دوو ساڵ بەرگری لە بەرانبەر ئانتی پاتێر کرد، دواتر شکستی خوارد و ولاَتەکانی بەردەستی کە ولاَتانی ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك بوون کەوتنە دەست ئانتی پاتێر.

ئانتی پاتێر دوای ئەوەی بەسەر پێردیکاسدا سەرکەوت و دەستگیری کرد، بە شێوازێکی زۆر دڕندانە ئەوی کوشت، چوونکە پێشتر پێردیکاس قسەی ناشیرینی بە ئانتی پاتێر وتبوو، فەرمانی کرد تا دەمی بکەنەوە و زمانی دەربهێنن، دواتر بە فەرمانی ئەو هەردوو چاوی ئەو

پیاوە بەدبەختەیان دەرهێنا، هێشتا ئەوەشی بە لاوە بەس نەبوو، بە زیندوویی پێستی لە لاشەی داماڵی تا گیانی دەرچوو.

دوای ئەوە ئانتی پاتێر بۆوە تاکە فەرمانڕەوای ئاسیای بچووك و ئازەربایجان، بەڵام دوای کوشتنی پێردیکاس پتر لە دووساڵ زیندوو نەمایەوە، لە ساڵی (٣١٩ پ. ز) بە هۆی خواردن و خواردنەوەی زۆری شەراب مرد، دوای ئەوەی نێژرا، دوژمنەکانی تەرمەکەیان دەرهێنا و سووتاندیان.

دوای مردنی ئانتی پاتێر، یەکێکی دیکە لە سەردارەکانی ئەسکەندەر ناسراو بە (ئانتی گۆن) ناسراو بە یەك چاو، کاتێك بینی شوێنی ئانتی پاتێری لە ئاسیای بچووك چۆڵە، خۆی کردە دەسەڵاتداری ئاسیای بچووك و شانشینێکی لەوێندەر دامەزراند و پاشایەتیی خۆی ڕاگەیاند، دواتر بەسەر مەکدۆنیا لە ئەورووپاش سەرکەوت، بووە پاشای مەکدۆنیا و ئاسیای بچووك و تەواوی گەنجینەی ئەسکەندەری کە لە مەکدۆنیا بوو، بەدەستهێنا.

بەتڵەمیۆس کە فەرمانڕەوای میسر بوو، لە نێوان سەردارانی ئەسکەندەر پیاوێکی ژیر و ئاقڵ بوو، لەگەڵ سلۆکۆس کە یەکێك لە سەردارەکانی دیکە بوو دۆستایەتی کرد و نامەیەکی بۆ نووسی کە: من و تۆ لە دوژمنایەتیی یەکدیی سوود نابەین، جگە لە زیان گەیاندن بەیەکدیی نەبێت، بەمەش هیچ زێڕ و زیوەك لە گەنجینەی ئەسکەندەر دەست ئێمە ناکەوێت، لەکاتێکدا هەموو ئەوەی لە مەکدۆنیایە کەوتووەتە دەست ئانتی گۆن.

ئەگەر من و تۆ جیاوازییەکان وەلا بنێن و ببینە هاوپەیمانی یەکدی، گەنجینەی ئەسکەندەر کە لە دەستی ئانتی گۆندایە دەتونین بخەینە دەست خۆمان، ئێمە کە لە سەردارە پایەبەرزەکانی ئەسکەندەر بووین شیاوی ئەوە نین کە بێبەش بین لەو گەنجینەیە، دژایەتیکردنمان وا دەکات هەموو زێڕ و زیو و خشڵە گرانبەهاکانی ئەسکەندەر بۆ ئانتی گۆن بێت.

سلۆکۆس لە وەڵامدا نووسییەوە: من وتەکانی تۆ پەسەند دەکەم بەو مەرجەی دۆستایەتیت لەگەڵ مندا ڕاستگۆیانە و لە دڵەوە بێت، نەك فێڵ لە من بکەی و بە هۆی منەوە ئانتی گۆن لەنێو ببەی و وڵاتەکانی ئانتی گۆن و گەنجینەکانی ئەو بخەیە بن دەستی خۆت.

بەتڵەمیۆس سوێندی بە خوداوەندیانی یۆنان خوارد کە دۆستایەتیی ئەو لەگەڵ سلۆکۆس لە دڵەوەیە و بۆ فێڵ  و تەڵەکەبازی نییە، بەڵام سلۆکۆس سوێندەکەی پەسەند نەکرد و وتی متمانەم بە سوێندەکەت نییە.

بەتڵەمیۆس وتی: پێویستە چ کارێك بکەم تا متمانەم پێ بکەی؟

سلۆکۆس وتی: کوڕەکەت وەك بارمتە لە لای من دابنێ.

بەتڵەمیۆس پەسەندی کرد کە کوڕە گەورەکەی وەك بارمتە بنێرێتە لای سلۆکۆس بەو مەرجەی ئەویش کوڕەکەی وەك بارمتە بۆ لای بەتڵەمیۆس بنێرێت. سلۆکۆس پەسەندی کرد و کوڕی ئەو لە کۆشکی بەتڵەمیۆس و کوڕی بەتلەمیۆس لە کۆشکی ئەو دانران، بڕیاردرا ئەو دوو کوڕە لە کاتە فەرمییەکان لە لای ڕاستی تەختی پاشا دابنیشن.

هەردووکیان بۆ جەنگی ئانتی گۆن لەشکریان پێکهێنا و هێرشیان کردە سەر ئاسیای بچووك، ئانتی گۆن بۆ جەنگی ئەوان بە لەشکرەکەیەوە هاتە ئاسیای بچووك.

ئانتی کۆس و کوڕەکەی دیمیتریۆس کە بۆ نوێکردنەوەی ئیمپراتۆرییەتیی ئەسکەندەر لە ساڵەکانی (٣١٦، ٣١٢، ٣٠٥ پ. ز) لەگەڵ سلۆکۆس و بەتڵەمیۆس جەنگیان کردبوو، جارێکی دیکە ناچاربوون کە بەرانبەریان بوەستنەوە، ئەوجارە کاساندێر کوڕی ئانتی پاتێر و لیزی ماخۆس کە یەکێکی دیکە بوو لە سەردارەکانی ئەسکەندەر، لەگەڵ بەتڵەمیۆس و سلۆکۆس بوون، هەموویان لە بەهێزی ئانتی کۆس ترسابوون. دوایین جەنگ لە نێوان ئانتی کۆس و دوژمنەکانی لە ساڵی (٣٠١ پ. ز) لە ئیسۆس بوو، کە ئێستە لە تورکیا شاری (ئیپ سیلی) لە شوێنی هەیە.

مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە کە لە یەکێك لە ڕۆژەکانی هاوینی ساڵی (٣٠١ پ. ز) دوو کرۆر سەرباز لە هەردوو لەشکری هەردوولادا هەبوون، ئەو ژمارەیە وەك بەشێکی دیکە لە ژمارەکانی یۆنانییەکان زێدەڕۆیی تێدایە.

ئانتی گۆن لە جەنگدا شکستی خوارد و لەگەڵ (مێتریۆسی) کوڕیدا دیل کران، دوو سەردارەکەی ئەسکەندەر داوای گەنجینەی ئەسکەندەریان لێ کردن، ئانتی گۆن لە سەرەتادا لە بەردەستخستنی زێڕ و زیوەکانی گەنجینە خۆی دەپاراست، بەڵام دواتر کە زانی ئەشکەنجە دەدرێت بە ناچاری ئەوەی لە زێڕ و زیو و خشڵی گرانبەهای ئەسکەندەری دەست کەوتبوو، دایەوە بەو دوو سەردارە و بەم شێوە بە زیندوویی مایەوە.

سلۆکۆس و بەتڵەمیۆس هەرچەندە بۆ خۆیان کوڕیان هەبوو، بەڵام بە پێچەوانەی خەڵکی دیکە کە بەزەییان دێتەوە، پێچەوانەی ئاکار و ڕەوتاری مرۆیانە، میتریۆسی کوڕی ئانتی گۆنیان کوشت، دواتر ئانتی گۆنیشیان کوشت.

چوونکه بەتڵەمیۆس و سلۆکۆس کوڕەکانی یەکدییان وەك بارمتە لە لابوو، دوای ئەوەی ئانتی گۆنیان شکستدا، دەستیان گرت بەسەر گەنجینەی ئەسکەندەردا، نەیانوێرا یەکدیی بخەڵەتێنن، هەردووکیان یەکدییان دەناسی و دەیانزانی ئەگەر ئەوکارە بکەن، کوڕەکانیان لە دەست دەدەن. گەنجینەی ئانتی گۆن و ئەو وڵاتانەی لە بەردەستی بوون لەنێو خۆیاند دابەش کرد و سنوورێکیان لە نێوان ناوچەی پاشایەتیی خۆیان چێ کرد تا کێشە بۆ یەکدیی نەنێنەوە.

ئەو سنوورەی لە نێوان سلۆکۆس و بەتڵەمیۆس دیاری کرا لە شاخەکانی ئاراراتی گەورە لە باکورەوە دەستی پێ دەکرد و لە دماهیی دیجلە کۆتایی دەهات، بڕیاریاندا تەواوی ئەو وڵاتانەی لە ڕۆژهەڵاتی ئەو سنوورەن ببنە شوێنی فەرمانڕەوایی سلۆکۆس، ئەوانەش دەکەونە باشووری ئەو سنوورە ببنە هی بەتڵەمیۆس.

لێرەوە دوو ئیمپراتۆرییەت بە ناوەکانی (بام) یاخۆ ڕۆژهەڵات (شام) یان ڕۆژئاوا دامەزران، ئیمپراتۆرییەتی بام هەمان ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی کۆن بوو، کە ئاسیای بچووکی لێ کرابۆوە، شامیش برێتی بوو لەم وڵاتانە (ئاسیای بچووك، سوریا و میسر) کە فەڵەستینیش بەشێك بوو لە سوریای کۆن، بەڵام لە یۆنان چەند سەردارێکی ئەسکەندەر لەوانەش (کاساندر، کۆلۆس و لیزی ماخۆس) پاشابوون، سلۆکۆس و بەتڵەمیۆس هەریەکەیان ببوونە ئیمپراتۆرێکی مەزن و بوونە دۆستی سەردارەکانی ئەسکەندەر لە یۆنان، دواتر لەگەڵیاندا جەنگان و ئەوانیان کوشت، وڵاتەکانیان داگیرکردن، ڤێجا ئەو وڵاتانەیان لە دەست دایەوە و وڵاتانی یۆنان نە بۆ بەتڵەمیۆس و نە بۆ سلۆکۆس نەبوون.

لە سەردەمانی دواتر وڵاتانی ئاسیای بچووك و سوریا لەدەست نەوەکانی بەتڵەمیۆس هاتەدەر، تەنیا میسریان بۆ مایەوە، هەڵبەتە نەوەکانی بەتڵەمیۆس بە ناوی زنجیرەی پاشایەتیی بەتاڵسە ماوەی سێ سەدە لە میسر پاشایەتیان کرد و لەنێو ئەواندا کەس نەبوو کە دوای بوونی بە پاشا براکانی خۆی کوێر نەکات، لە ترسی ئەوەی ئەوان لە داهاتوو بانگەشەی پاشایەتیی نەکەن، بەڵام نەوەکانی سلۆکۆس کە بە ناوی زنجیرەی سلوکی فەرمانڕەوایی ئێرانیان کرد، باشتر بوون لە پاشاکانی زنجیرەی بەتاڵسەی میسر، سلوکییەکان هەرچەندە بە ڕەگەز یۆنانی بوون، بەڵام پاشای ئێران بوون، کەمتریش ناوی ئەو پاشایانەمان بیستووە.

# دەسەڵاتداری یۆنانییەکان

یەکەم پاشای یۆنانی ئێران سلۆکۆس بوو، ناسراو بە (نیکاتۆر) واتە سەرکەوتوو، ئەو پیاوە کە زنجیرەی پاشایەتیی سلوکی لە ئێران لە ساڵی (٣١٢ پ. ز) دامەزراند لە کەسانی دیاری دنیای کۆن دەژمێردرا، ئەو لە سەرەتای لاوییەتی هاتە نێو لەشکری ئەسکەندەر و لە سەردارە ئازا و دلێرەکانی ئەسکەندەر بوو، سلۆکۆس لە زۆرینەی لەشکرکێشیی و جەنگەکانی ئەسکەندەر وەك کەسێکی پایەبەرزی لەشکر بەشدار بوو، بە تایبەتی لە کاتی لەشکرکێشیی بۆ هیندستان توانا و لێهاتوویی بێ وێنەی خۆی خستەڕوو، بەوەش متمانە و پاڵپشتی ئەسکەندەری بە دەست هێنا.

دوای گەڕانەوەیان لە هیندستان لە شاری شووش بە فەرمانی ئەسکەندەر لەکاتی هاوسەرگیرییە بە کۆمەڵەکەدا لەگەڵ (ئاپاما)ی کچی (ئێسپیتامین)ی سەرداری ئێران هاوسەرگیری کرد، دوای مردنی ئەسکەندەریش، ئەوکاتەی ئیمپراتۆرییەتی ئەسکەندەر بەسەر جێگرەکانیدا دابەش کرا، لە بابل بوو بە جێگری (پێردیکاسی) جێنشینی ئەسکەندەر، بەڵام لە کاتی لەشکرکێشیی پێردیکاس بۆ سەر میسر، لەو سەروبەندەشدا سەردارەکانی ئەسکەندەر لە دژی پێردیکاس پیلانگێڕییان کرد، سلۆکۆسیش چووە نێو ئەو هاوپەیمانییەوە، بۆیە لەلایەن ئانتی پاتێر کە ئەودەمە پاشای مەکدۆنیا بوو، خۆی بە جێنشینی پێردیکاس دەزانی، بووە فەرمانڕەوای بابل.

سلۆکۆس لە دوای جەنگە ناوەخۆییەکانی سەردارەکانی ئەسکەندەر کە بە (دیادۆخۆ)ی ناسران، دوای کێشمەکێشمی زۆر لەگەڵ ئەو سەردارانەدا سەرئەنجام لە ساڵی (٣٠٦ پ. ز) بە فەرمی لە بابل تاجی کردەسەر و خۆی بە پاشا ناساند، دوای گرتنی شووش و ئەکباتان و وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی ئەسکەندەر، بووە میراتگری بێ ڕکابەری ئەو سەرزەوییە گەورەیە.

هۆکاری تاج لەسەرکردنی سلۆکۆس لە بابل بۆ شوێنکەوتوویی ئەو دەگەڕێتەوە، چوونکە ئەسکەندەری مەکدۆنی دوای زاڵبوونی بەسەر ئێراندا لە بابل تاجی کردەسەر، ئاخر مامۆستای ئەسکەندەر واتە ئەرستۆ پێی وتبوو تەمەنی بابل بە ئەندازەی تەمەنی جیهانە، لەو ڕۆژەوە کە

مرۆڤ دروست کراوە بابلیش هەیە، ئەوێندەر بکە پایتەختی خۆت، تا گەورەیی و شکۆی بابل بۆ تۆ بێت.

سلۆکۆس نیکاتۆری یۆنانی بۆ بە یۆنانیکردنی ئێران توندتر بوو لە ئەسکەندەر، دوای ئەوەی لە بابل تاجی نایەسەری، پەیکەری مەردۆك خوداوەندی گەورەی بابلی لە پەرستگەی بابل لادا و پەیکەری زێئۆس خوداوەندی گەورەی یۆنانی لەو پەرستگەیە دانا، بۆ ناچارکردنی خەڵکیش بە پێڕەوکردنی ئاینی یۆنان، غەیببێژێکی وەك غەیببێژەکانی پەرستگەی دۆلفی لە پەرستگەی بابل دانا، هەرکەسێك کە ویستبای سەفەری درێژ بکات یاخۆ هاوسەرگیری بکات، دەبووایە بچێتە لای غەیببێژەکە و داوای ڕوونکردنەوەی لەبارەی خۆی لێ بکات، غەیببێژەکەش دوای پرسیار لە خوداوەندیانی یۆنان وەڵامی دەدایەوە، کەی پێویستە هاوسەرگیری بکات یاخۆ بچێتە سەفەر. سلۆکۆس ئەو ڕێسایانەی بۆ نەتەوەیەك دانا کە خۆیان پێشدەست بوون لە ئەستێرەناسی و دەرهێنانی زانیاریی و ڕێساکان لە ئەستێرەکان.

ساڵێك دوای ئەوەی سلۆکۆس لە بابل تاجی کردەسەری و پەیکەری خوداوەندی گەورەی یۆنانی هێنایە پەرستگەی ئەو شارە، لە خەوندا بینی کە بۆ دیتنی پەیکەری زێئۆس چۆتە پەرستگە، ئەودەمەی لە بەرانبەری وەستابوو، زێئۆس بوو بە مارێکی گەورەی ڕەش، هاوکات دەیان مار لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردە نێو پەرستگە، سلۆکۆس لە ترسان هاواری کرد و لە خەو ڕابوو. بەیانی لە کەسانی نێو کۆشکی ویست تا کەسێکی شارەزا لە خوێندنەوەی خەونی بۆ بێنن، ئەوانیش وتیان گەورەترین خەونگرەوە ناوی "ساخۆن"ـە لە رابردوودا سەرۆکی زانایانی ئاینی بابل و کاهینی گەورەی پەرستگە بووە، ساخۆنی ساڵمەند بە هۆی ئەوەی پەیکەری خوداوەندی یۆنان جێگەی پەیکەری خوداوەندی بابلی گرت بۆوە، چیتر نەدەهات بۆ پەرستگە و لە ماڵەکەی خۆی دەرنەدەچووە دەرێ، لەبەرئەو خەم و داخەش، ڕۆژ لە دووی ڕۆژان بنێس و لاوازتر دەبوو، کاتێك لە کۆشکی سلۆکۆسەوە چوون بۆ ماڵەکەی تا ئەو ببەن بۆ لای پاشا، وتی: ئێوە کە خودای منتان لە من ستاند!، ئیدی چیتان لە من دەوێت؟، لێ گەڕێن تا لە دوارۆژەکانی تەمەنم لەگەڵ خۆم بم و بە ئاسوودەیی بژیم.

ئەو کەسانەی هاتبوون تا ئەو ببەن بۆ کۆشك وتیان: ئێمە نەهاتووین تا تۆ ئازار بدەین، هاتووین تا تۆ بۆ لای پاشا ببەین، بۆ ئەوەی خەونەکەی بۆ لێك بدەیەوە، چوونکە بە پاشایان ڕاگەیاندووە، کە زاناترین کەس بۆ ئەو کارە تۆی، کەس لە تۆ باشتر لێکدانەوەی خەو نازانێت.

ساخۆن هەر کە بیستی کە ئەو بۆ لێکدانەوەی خەون بۆ لای پاشا دەبەن، بیری کردەوە کە لەوانەیە بکارێت ڕێگەیەك بۆ گەڕاندنەوەی پەیکەری خوداوەندکەیان بۆ پەرستگە بدۆزێتەوە.

دوای ئەوەی ڕۆیشتە لای پاشا و گوێی لە خەونەکەی گرت، وتی: ئەی پاشای مەزن خوداوەندکەت پێت دەڵێت، کە ئەو شارە شیاوی ئەوە نییە، کە ببێتە پایتەختی پاشایەکی مەزنی وەك تۆ، ئەگەر کەسێکی دیکە، جگە لە خوداوەندکەت بە شێوەی مارێکی ترسناك هێرشی بۆ تۆ کردبایە بە شێوەیەکی دیکە خەونەکەتم لێکدەدایەوە، بەڵام چوونکە خوداوەندی خۆت هێرشی کردووەتە سەرت و خوداوەندیانی دیکەی یۆنان وەك ماری بچووکتر هێرشیان کردووە، واتای ئەوەیە کە بابل شیاو نییە بۆ ئەوەی ببێتە پایتەختی تۆ، پێویستە پایتەختەکەت بۆ جێگەیەکی دیکە بگوازیەوە.

سلۆکۆس وتی: هیچ شارێکی لێ نییە، وەك بابل بێت بۆ ئەوەی من پایتەختەکەم بۆ ئەوێندەر بگوازمەوە.

ساخۆن وتی: ئەم شارە پایتەختی دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا بچووکەکان بووە، شیاوی ئەوە نییە ببێتە پایتەختی پاشایەکی مەزنی وەك تۆ، بۆیە پێویستە تۆ شارێك هەڵبژێری کە لە جیهاندا بە ناوی خۆت بناسرێت، نەك بە ناوی هەندێك دەسەڵاتداری بچووك و بێ بایەخ ناسرا بێت. فەرمان بدە بۆ ئەوەی شارێك بینا بکەن و ئەو شارە بە ناوی خۆت ناو بنێ.

سلۆکۆس نیکاتۆر وتی بە دڵنیاییەوە وادەکەم، هەر ئەو ڕۆژە فەرمانی کرد شارێك لە میزۆپۆتامیا چێ بکەن، بە هەندوەرگرتنی پێداویستییەکان، باشترین شوێن بۆ دروست کردنی ئەو شارەیان لە کەنارەکانی ڕووباری دیجلە دیارکرد، نەك فورات کە بابل لەوێندەر بوو، دەستبەجێ دەست بەکاربوون بۆ دروست کردنی ئەو شارە.

سلۆکۆس نیکاتۆر تەنیا بە دروستکردنی شارێکی گەورە بە ناوی سلۆکۆس دەسبەردار نەبوو، حەفتا و یەك شاری دیکەی بە ناوی سلۆکۆس لە ئیمپراتۆرییەتەکەی بیناکرد، بۆ ئەوەی لە هەریەکە لە شارەکان، شارێك بە ناوی سلۆکۆس هەبێت، بەڵام دەستی ڕۆژگار ڕێگەی نەدا، هیچ کام لەو شارانە بمێنێتەوە، تەنانەت زانیاریمان نییە لەسەر هیچیان جگە لە شاری سلوکی کەناری دیجلە نەبێت، شاری سلوکی تا نۆ سەدساڵ دواتریش مابوو، واتە تا ئەو کاتەی عارەبەکان هێرشیان کرد بۆ ئەوەی تیسفوون (مەدایەن) بگرن، پاشان وێران بوو، ئێستە شوێنەواری ئەو شارە لە کەنارەکانی دیجلە ماوەتەوە.

کاهینی گەورە ساخۆن بەو جۆرە لێکدانەوەیە، سلۆکۆس نیکاتۆری ناچار کرد، پایتەختەکەی لە بابلەوە بۆ سلۆکۆس بگوازێتەوە، سلۆکۆس بوو بە پایتەخت، هەر بەو هۆیەوشەوە خوداوەندی گەورەی یۆنانیش لە بابلەوە بۆ سلۆکۆس گوازرایەوە، مەردۆکی خوداوەندی گەورەی بابلییەکان کە لەو شارە دەرکرا بوو، گەڕایەوە و لە پەرستگەکەی خۆی دانرایەوە، ساخۆن وەك رابردوو بۆوە خزمەتکاری خوداوەندی گەورەی بابل.

شاری سلۆکۆس دواتر بە شاری سلۆکی ناسرا، لەمبەر و لەوبەری ڕووباری دیجلە بناخەی بۆ دانرا، بە وتەی مێژوونووسان دوازدە پرد لەسەر دیجلە چێکران تا هاتوچۆ لە نێوان لای رۆژهەڵات و لای رۆژئاوا ئاسان ببێت و بەردەوامی هەبێت، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان نەیان نووسیوە، کە ئەو پردانە چۆن بوون؟، ئایا لەلایەن ئەندازیار و وەستاکان چێکرا بوون یاخۆ لەو جۆرە پردانە بوون کە لە ڕابردوودا لەسەر پشتی بەلەمەکان چێ دەکران.

لە نووسینی مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە دیارە کە ئەو شارە لە شارە هەرە جوان و مەزنەکانی جیهان بووە لەو سەردەمەدا، بەڵام لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا بە هۆی ئەوەی مەدایەن بوو بە پایتەخت، بایەخی خۆی لە دەستدا، دواجار لە بویەر و جەنگەکاندا لەنێوچوو.

یەکێکی دیکەش لە کارە گەورەکانی سلۆکۆس نیکاتۆر لەشکرکێشیی بوو بۆ سەر هیندستان، بەڵام وەك ئەسکەندەر لە وشکانییەوە نەبوو، لە رێگەی دەریاوە بوو، هەروەسا سلۆکۆس نیکاتۆر هێزی دەریایی ئێرانی جارێکی دیکە نوێکردەوە بۆ لەشکرکێشیی بۆ سەر هیندستان، ژمارەیەکی زۆر کەشتیی بۆ گواستنەوەی سەرباز، ئاو، خۆراك و چەك چێ کرد.

لە تەنگەی هورمز لە دەڤەرێك دەکەوێتە رۆژهەڵاتی بەندەر عەباسی ئێستە، شارێکی بەندەری گەورە هەبوو، بە (سێرك) ناودەبرا.

ئەو شارە دوای هاتنی عارەبەکان بۆ ئێران، ناوی بۆ (سیراف) گۆڕ، لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٦١ ز) دەستەیەك لەو کەسانەی لە کۆڵینکاری شوێنەوار کاریان دەکرد، لەژێر خۆڵدا هەندێ پاشماوەیان دۆزییەوە، ئەو بەڵگانە ئەوەی نیشان دەدا، سێرك شارێکی مەزن بووە و خودان شارستانییەتێکی درەوشاوەی مەزن بووە.

بەندەری سێرك بە هۆی بازرگانییەوە پێوەندیی بە تەواوی وڵاتانی باشووری ئاسیا و رۆژهەڵاتی دوور هەبوو، بەردەوام لەنێو بەندەرەکە بە سەدان کەشتیی دەبینران. ئەو بابەتە ئێستە بە زێدەڕۆیی دەزانرێت، بەڵام ئەگەر سەرەنج بدەین سێرك، دواتر دەبێتە سیراف، بووەتە

گەورەترین بەندەری باشووری ئێرانی لەو سەردەمانەدا، لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەمە زێدەڕۆیی نییە.

ئەورووپاییەکان تا سەرەتای سەدەی شازدە و دۆزینەوەی (دوورگەکانی ملوك) لە ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوی لەلایەن دەستەکانی ماجەلان، کە لە ئەمەریکای باشوورەوە هاتبوون، زانیاریان لەبارەی ئەو دوورگانە نەبوو، بەڵام لە سەردەمی سلۆکۆس نیکاتۆر واتە سێ سەدە پێش زاین، کەشتییەکان لە بەندەری سێرکەوە کاڵاکانیان بۆ ئەو دوورگانە دەبرد، لە ڕۆژهەڵاتی دوور و لەوێشەوە دەرمانیان دەهێنایەوە بۆ سێرك.

سلۆکۆس نیکاتۆر بۆ هێرشکردنە سەر هیندستان تەواوی کەشتییە جەنگی و بارهەڵگرەکانی خۆی لە بەندەری سێرك لە ڕۆژهەڵاتی تەنگەی هورمز کۆکردەوە، لەو شوێنەوە کەوتەڕێ، ئەو تەریب بە کەنارەکانی دەریای عومان و زەریای هیند ڕۆیشت تا گەیشتە هیندستان. بە داخەوە سەبارەت بەو گەشتە دەریایی و جەنگە مەزنە، کە لە ڕووداوە گەورەکانی ئەوکات بووە، لە سەرچاوە یۆنانییەکاندا هیچ باس و ڕوونکردنەوەیەك نییە.

سلۆکۆس هێزەکانی لە باکوری کۆتایی ڕووباری سێند دابەزاند، بێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ بەرگرییەك ببێتەوە، چوونکە (چاندراگۆپ) پاشای وڵاتی سێند ئاگەداری هاتنی سلۆکۆس نەبوو، بۆیە بە تەواوەتی کەوتە شڵەژان و هێرشەکە بۆ ئەو بە تەواوەتی لەپڕ بوو.

سلۆکۆس بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە پایتەختی جاندراگۆپ، لە ڕووباری مەزنی سێندیش پەڕییەوە، لە کاتی پەڕینەوەدا دووچاری هیچ بەرگرییەك نەبوو، چوونکە دیسان جاندراگۆپ پاشای وڵاتی سێند لە نێزیك کەوتنەوەی سلۆکۆس ئاگەدار نەبوو، لەپڕ چاندراگۆپ لەشکرێکی گەورەی لە نێزیك پایتەخت بینی، چوونکە ئامادەیی بۆ بەرگری نەبوو، پێشنیازی ئاشتی بۆ سلۆکۆس کرد، ئەویش بەو مەرجەی باج بدات پیشنیازەکەی پەسەند کرد.

بەپێی نووسینی مێژوونووسە یۆنانییەکان چاندراگۆپ ڕازی بوو هەرچی سلۆکۆس دەیەوێت پێی بدات، یەکێك لەو باجانەی ئەو بە سلۆکۆسی بەخشی برێتی بوو لە دوو هەزار فیل.

هەڵبەتە هیندییەکان راهێنانیان بە فیلەکان دەکرد، ڕۆیشتنی سەربازی (ڕۆیشتنی ڕێکیان) فێردەکردن و لەو ڕۆژانەی فیلەکانیان بۆ ڕۆیشتنی سەربازی دەهێنا، ئەوانیان بە جوانترین شێوە دەڕازاندەوە، دوای هەزاران ساڵ هێشتا ئەو نەریتە لە هیندستان هەر ماوە، لە ڕۆژی

دیاریکراو و لە کاتێکدا کە سلۆکۆس لە تەنیشت چاندراگۆپ وەستابوو، دوو هەزار فیل لە بەرانبەریان ڕێ ڕۆیشتنیان ئەنجامدا.

چاندراگۆپ هەزاران تالآن زێڕ و ڕێژەیەکی زۆر خشڵی گرانبەها، کە لە مێژوودا پێوانەکەی دیار نەکراوە بە سلۆکۆسی بەخشی، سلۆکۆسیش لە بەرانبەردا بەڕێوەبردنی ئەو ویلایەتانەی کێشەداربوون، بەردەوام جەنگیان تێدابوو بە پاشای هیندستانیان سپارد.

کاتێك سلۆکۆس بەرەو ئێران دەگەڕایەوە بۆی دەرکەوت ناتوانێت دووهەزار فیل لەگەڵ خۆیدا بۆ ئێران ببات، بۆیە سلۆکۆس لە نێوان دوو هەزار فیل، تەنیا پێنج سەد فیلی هەڵبژارد، فەرمانی کرد تا ئەوانی دیکە بفرۆشن، بەڵام لەبەرئەوەی فیلەکان زۆر بوون و کڕیار کەم بوو، فیلەکانیان هەرزانفرۆش کرد، دواتر دەرکەوت ئەوانەی فیلەکانیان دەکڕییەوە، هەر بە هەمان نرخ بۆ چاندراگۆپیان دەبردەوە، ئەویش بەو شێوەیە فیلەکانی خۆی بۆ گەڕایەوە، بەڵام ئەو پێنج سەد فیلە بۆ سلۆکۆس سوودبەخش بوون، پاڵپشت بەو هێزە مەزن و تۆقێنەرە توانی بە هاوکاری هاوپەیمانەکانی واتە (بەتڵەمیۆس، لیزی ماخۆس و کاساندر) لە دژی ئانتی گۆن جەنگ بکات و لە ئیسپۆس ئەو پیاوەی کوشت کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە جێنشینی ئەسکەندرە.

سلۆکۆس دوای ئەو جەنگە لەگەڵ سەردارەکانی دیکەی ئەسکەندەریش کەوتە جەنگ، ئەوانیشی شکستدا و سەرزەوییەکانی ژێر دەستی ئەوانی خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی. بەم شێوەیە دوای سی ساڵ لە مردنی ئەسکەندەر، تەواوی ئەو خاکانەی لەژێر دەستی ئەسکەندەردا بوون، جارێکی دیکە کەوتەوە ژێر دەستی سلۆکۆس، تەنیا میسر مایەوە کە لەژێردەستی بەتڵەمیۆس بوو.

سلۆکۆس پیاوێکی زانا و مشورخۆر بوو هەرچەند هەوڵی نەهێشتنی کولتووری ئێرانیدا، بەڵام ناکرێت کارە باشەکانی لەبیر بکرێن. لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا سنووری ئەو ئیمپراتۆرییەتە خاوەنی بیست و یەك ساتراب بوو، سلۆکۆس لەبەر مەترسی ساترابە یۆنانییەکان کە لە فەرمانڕەوایی ئەو ویلایەتانەی دانابوون، سنووری خۆی کردە حەفتا و دوو فەرمانڕەوا، تا توانا و دەسەڵاتیی ئەوان کەم ببێتەوە و توانای وەرگرتنی باجیان کەمتر بێت، بەو شێوەیەش هێزیان کەمتر دەبێت.

لێتۆژی فەرەنسی (هانری بێر) لە سەردەمی دووەمین جەنگی جیهانیدا دوو پەڕتووکی لەبارەی ئێران نووسیوە، ئێمە سوود لەو بەشانە وەردەگرین کە باس ئێران لە سەردەمی

سلوکییەکان دەکات. سەردەمی سلوکییەکان لە سەردەمە هەرە سەخت و دژوارەکانی ئاینی بووە لە ئێران، لەو بارەوە دەڵێت دوای ئەوەی سلۆکۆس نیکاتۆر و جێنشینەکانی پاشایەتیان لە ئێران کرد، دانیشتووانی ئێرانیان ناچار کرد یاخۆ خوداوەندیانی ئەوان بپەرەستن یان دەبووایە باج و سەرانە بدەن، هەروەسا پتر دەبێژێت: گریمان دەکرێت یەکەمجار لەلایەن یۆنانییەکانەوە باج و سەرانە وەرگیرا بێت لە شوێنکەوتووانی ئاینێك، کە لە ئێران برەوی سەندبوو، بۆیە هەر ئێرانییەك ناچار دەکرا ساڵانە بڕە پارەیەك بداتە پاشای سلوکی تا بتوانێت سرووتە ئاینییەکانی خۆی بەجێ بگەیەنێت.

سلۆکۆس نیکاتۆر بە لاسایکردنەوە و چاولێکەری لە کوروش دامەزرێنەری زنجیرەی هەخامەنشیی زۆر کەناڵی ئاودێری دروست کرد، بەڵام ئەو کەناڵانە بۆ یارمەتیدانی جووتیاران نەبوو، بۆ ئاودانی ئەو هەموو زەویوزارانە بوو کە لە ئێران دەستی بە سەردا گرتبوون.

مێژوونووسێکی ڕووسی بە ناوی (کۆرنلیۆس نیپۆس) دەڵێت سلۆکۆس لە حەفتا و دوو شاری سلۆکی زەوی و موڵکی هەبووە، شارێك نەبووە کە ئەو موڵکی تێدا نەبووبێت، لەوانەیە ئەو وتەیە زێدەڕۆیی تێدا هەبێت، بەڵام چوونکە مێژوونووسی دیکەش باسیان لە زۆری مۆڵك وماڵی ئەو لە ئێران کردووە، وتەی ئەو مێژوونووسانە پشتڕاست دەکاتەوە کە دەڵێن سلۆکۆس خاوەن زەوی و مۆڵکی زۆری ئێران بووە، کەناڵی زۆری ئاودێری لێداوە، ژمارەیەك لە جووتیارە یۆنانییەکانی هێنا و لەسەر زەوییەکانی خۆی خستنییە کار، ئەو وتەیەی دوایی نائاسایی نییە، وەك زانراوە ساڵانە ژمارەیەك یۆنانی کۆچیان بەرەو دەرەوە دەکرد، ڕەنگە سلۆکۆس لە مۆڵکەکانیدا هەندێك لەو کۆچبەرانەی جێ کردبێتەوە.

سلۆکۆس نیکاتۆر لە ساڵی (٢٨١ پ. ز)، بە دەست خوشکەزای (کاساندەر) کوژرا، هەڵبەتە کاساندەر لە سەردارەکانی ئەسکەندەر بوو، بە دەست سلۆکۆس لە نێزیك گەڕووی داردانێل کوژرا بوو.

سلۆکۆس پێش ئەوەی بکوژرێت کوڕەکەی خۆی واتە (ئانتیۆکۆس) بە شازادەی جێنشین ڕاگەیاندبوو، دەیەویست لە دەسەڵات بکشێتەوە و تەخت و تاجەکەی بدات بە کوڕەکەی و خۆی لە سوچێکی خاکی یۆنان پشوو بدات و ئاسوودە بێت.

میراتی سلۆکۆس بۆ کوڕەکەی ئانتیۆکۆس برێتی بوو لە دەسەڵاتداری بەسەر سەرزەوییەکی پانوبەرین کە بە هۆی زۆری نەتەوە و ئاینەکانییەوە، فەرمانڕەوایی تیایدا کارێکی سەخت بوو.

ئانتیۆکۆس لە سەرەتاوە ناچاربوو بکوژی بابی ببەخشێت و فەرمانڕەوایی مەکدۆنیاشی پێ بسپێرێت، لە سەردەمی پاشایەتیی خۆی لە (٢٨١ تا ٢٦١ پ. ز) لەگەڵ زۆر یاخیبووندا جەنگا، کە سەختترینیان یاخیبوونی سوریا بوو، ئانتیۆکۆس کە بە توندی و ڕەقییەکی زۆر توانی یاخیبوونی سوریا دامرکێنێتەوە، دوای ئەو سەرکەوتنە نازناوی (سۆتەر) واتە رزگاریکاری بۆ خۆی دیاری کرد.

دایکی ئانتیۆکۆس ناوی (ئاپاما) بوو، هەرچەندە کچی یەکێك لە سەرداره ئێرانییەکانی داریوشی سێیەم بوو بە ناوی (ئێسپیتامێن)، بەڵام ئەو لە بابی توندتر بوو بەرانبەر بە ئێرانییەکان.

سلۆکۆس نیکاتۆر پێداگری دەکرد تەواوی نامە گۆڕینەوە و فەرمانەکانی دەوڵەت لە سەرتاسەری ئێران بە زمانی یۆنانی بێت، لەگەڵ ئوەشدا خەڵکی ئاسایی ناچار نەدەکرد لە شوێنە گشتییەکان بە یۆنانی بدوێن، بەڵام ئانتیۆکۆس دوای بوونی بە پاشا فەرمانیدا تا لە هەموو ئێران هەمووان بە زمانی یۆنانی بئاخڤن. ئاساییە کە ئەو فەرمانە لە گوندان و ئەو شوێنانەی ڕاسپێردراوانی ئانتیۆکۆسی لێ نەبوو، جێبەجێ نەدەکرا، لە شارە گەورەکان کە پیاوانی ئانتیۆکۆس بەردەوام لە هاتوچۆ بوون، بە توندی ئەو رێنوێنییانە جێبەجێ دەکرا.

ڕاسپێردراوان لەنێو بازاڕ و رێگەکانی نێو شار لە بەرانبەر ئەو شوێنانە دەوەستان کە خەڵك بۆ کڕین و فرۆشتن لێ یان دەوەستان، هەر کە یەکێکیان دەبینی بە فارسی بئاخڤێت، دەستگیریان دەکرد و دەیان برد بۆ لای کاربەدەستان، ئەوانیش بە یەك سککەی زیو لە دراوی (ئانتیۆکۆس) سزایان دەدا، پێدانی ئەو پارەیە بۆ خەڵکی ئاسایی سەخت بوو، چوونکە بەرانبەر بوو بە پارەی دوو رۆژ کارکردنیان، لە ئاکامدا وای لێهات زۆرینەی خەڵك کە یۆنانیان نەدەزانی لاڵبوون و لە شوێنە گشتییەکان بە ئاماژە و نیشانە وەك کەڕ و لاڵەکان دەئاخڤین و مەبەستیان دەگەیاند، بۆ ئەوەی دەستگیر نەکرێن و ناچار نەبن یەك سککە لە دراوی ئانتیۆکۆس بدەن.

ئەو توندکارییە لە سەردەمی جێنشینە بەردەوام سەرخۆشەکەی ئانتیۆکۆس، کە ماوەی دەسەڵاتیی کورت بوو، نەما، دواتر لە سەردەمی دوای ئەو پیاوە دووبارە سەریهەڵدایەوە، بۆیە کاتێك سەردەمی پاشایەتیی سلوکی کۆتایی هات، زمان و رێنووسی ئێرانییەکان گۆڕابوو بە

یۆنانی. ڕوونە کە لە شوێنە دوورەکان و گوندەکان هێشتا هەندێ کەس بە فارسی دەدوان، بەڵام لەو شوێنانەی شارستانی بوون، تەنیا زمانی یۆنانی دەنووسرا و قسانی پێ دەکرا.

ئانتیۆکۆس زۆر هۆگری بابەتە دەریاییەکان بوو، سێ کاری لەو بوارەدا کرد، هەرسێکیان شیاوی باسن:

یەکەم ئەوەبوو کە دەریاسالارێکی یۆنانی بە ناوی (پاترۆکۆل) ڕاسپارد تا تەواوی دەریای مازەندەران بگەڕێت و زانیاریی تەواو لەبارەی هەموو کەنارەکانی وەربگرێت، کە لە کوێی ئەو دەریایەوە دەتوانرێت بە کەشتیی بۆ هیندستان گەشت بکرێت، هەڵبەتە مازەندەران دەریاچەیەکی داخراوە، ڕێگەی بۆ ئاوی ئازاد نییە و ناتوانرێت لەوێوە بە کەشتیی بچین بۆ هیندستان، بۆیە دووچاری سەرسووڕمان دەبین کاتێك ئەو بابەتە لەلایەن سەردارێکی یۆنانی دێتە پێش و دەپرسین بۆچ سەردارێکی یۆنانی هێندە بێ زانیارییە کە ئەوە نەزانێت؟!، بەڵام ئەوکات ڕووباری جەیحون، سەرچاوەی لە شاخەکانی باکوری هیندستانەوە دەڕژایە نێو ئەو دەریاچەیە، لە کاتێکدا ئێستە دەڕژێتە نێو دەریاچەی ئارالْ (خوارەزمی کۆن).

دەریاوانەکان بەهۆی ئەوەی ئاوی جەیحون لە باکوری هیندستانەوە دەڕژێتە ئەو دەریایەوە، بیریان کردەوە، کە لەوانەیە بتوانرێت لەو ڕێگەوە بەرەو هیندستان بڕۆن، بەڵام دەرکەوت کە ئەو کارە ئەستەمە و ڕووباری جەیحون لە بەشەکانی سەرەوەیدا بۆ کەشتیرانی نابێت، لە لایەکی دیکە بەشێکی زۆری ئەو ڕووبارە تا سەرچاوەکەی بە دەڤەرەیلی شاخاوی سەختدا تێپەڕ دەبوو.

پاترۆکۆل دەریاوانی یۆنانی نەیتوانی ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە هیندستان لە ڕێگەی دەریای مازەندەرانەوە بدۆزێتەوە، لە بەرانبەردا ئەوەی بۆ دەرکەوت کە لە دەریای خەزەردا جۆرەکانی ماسی سپی و ماسی ئازادی لێ نییە، ئەو جۆرە ماسییە تەنیا لە کەنارەکانی ئێران هەن، ئەوکات ئەو وڵاتە دەکەوتە سەرووی دەریای خەزەر بە وڵاتی خەزەر ناودەبرا.

دۆزینەوەکەی پاترۆکۆڵی یۆنانی کردی تا ئێستەش مشتومڕی زۆری لەسەرە، بۆیە تا ئەمڕۆش هۆکارە زانستییەکەی نەدۆزراوەتەوە، هەرچی لەبارەیەوە دەوترێت تەنیا گریمانە و هیچ زانایەك نازانێت بۆچی ماسی سپی و ماسی ئازاد لە کەنارە باکورییەکانی ئەو دەریایە نابینرێت و لەوێ ناژین.

دووەم کاری گرینگی ئانتیۆکۆس ئەوە بوو، کە لە تەنیشت ئەو گەرووەی ئەمڕۆ بە گەرووی هورمز دەناسرێت، دەروازەی کەنداوی فارسە، بەندەری لائۆدیسای دامەزراند، دواتر بە بەندەری (گۆمبێرۆن) ناسرا، کە هەمان بەندەر عەباسی ئەمڕۆیە.

سێیەم کار کە ئان تیۆکۆس کردی ئەوە بوو کە هەوڵیدا بە هۆی کاناڵەوە دەریای مازەندەران بە دەریای رەش ببەستێتەوە. ئێستە رێگە لە دەریای مازەندەران بۆ دەریای ڕەش لە رێگەی بەیەك گەیاندنی زێەکانی (ڤۆڵگا و دۆن) هەیە، لەو شوێنەی ئەو دوو زێە زۆر لە یکتری نێزیك دەبنەوە بە کەناڵ بەیەکەوە بەستراونەتەوە و کەشتیوانێك کە بە کەشتییەکەی لە دەریای مازەندەران دێتە ناو زێی ڤۆڵگا، دەتوانێت دوای تێپەڕ بوون بەو کەناڵەدا تێپەڕ بوون لە زێی دۆن، بگاتە دەریای ڕەش.

ئانتیۆکۆس هەوڵیدا کەناڵێك لە خاکی قەوقازیاوە لە نێوان هەردوو دەریا هەڵبکەنێت و ئەو کارەی تەنانەت ئێستەش کارێکی گەورە و سەختە، جا چ جای ئەوەی ئەوکات بە کولینگ هەلکەندن دەکرا و بە بیلٚ خۆلەکە لادەدرا. وێڕای ئەوەش ئەو ماوەی دوو ساڵ لە دەریای مازەندەران بەرەو رۆژئاوا سەرگەرمی هەڵکەندنی کەناڵ بوو و دواتر بە هۆی سەختی کارەکە و زۆری تێچوونەکەی دەستی لەوکارە هەڵگرت.

سلۆکۆس بابی ئانتۆکۆس لە بابەت ئاینەوە زۆر لەگەڵ ئێرانییەکان توونd بوو، بەڵام رێگەی لە زمانی قسە کردن لە شوێنە گشتییەکان نەدەگرت و هیچ کاری بە شێوەی ریش و پرچ و جلوبەرگی پیاوان نەبوو، بەڵام ئانتیۆکۆس نەتەنیا پیاوانی ئێرانی ناچار کرد لە شوێنە گشتییەکان و ئەو شوێنانەی فەرمانبەرانی ئانتیۆکۆسی لێ بوو بە زمانی لالەکان بدوێن، بگرەتەواوی پیاوانی ناچار کرد وەك یۆنانییەکان ریش و سمێڵیان بتاشن و پرچیان کوڕت بکەنەوە.

چوونکە ئەو دەیەویست ئێرانییەکان لە هەموو روانگەیەکەوە بکاتە یۆنانی، فەرمانی کرد تا پیاوان جلوبەرگی وەك هی یۆنانییەکان لەبەر بکەن، ئەو فەرمانەش لە شارەکان کەوتە بواری جێبەجێکردن، لە گوندەکان و شوێنە دوورە دەستەکان خەڵك هەروەك جاران پۆشاکیان لە بەردەکرد.

دیۆدۆری سیسیلی دەڵێت: هەرچەندە لە ئاینی ئێرانییەکان خۆکوشتن نەبوو، تەنانەت بە گوناهێك دادەنرا کە بەخشینی نەبوو، بەڵام هەندێ لە پیاوان خۆیان دەکوشت تا ڕیش و

سمێڵیان نەتاشن، ئەوان ئەو کارەیان بە پستی هەژمار دەکرد و نەیاندەتوانی بەرگەی ئەو نەنگییە بگرن، هەندێك لە پیاوانی دیکەی ئێرانیان هەوڵیاندا ئانتیۆکۆس لەنێو ببەن.

ئانتیۆکۆس کوڕێکی هەبوو بە ناوی باوکی (سلۆکۆسی) ناو نابوو، بە شازادەی جێنشین دانرا بوو، ئەو کوڕە ئەو هەموو توندییەی باوکی لە هەمبەر ئێرانییەکان پێ باش نەبوو، بۆیە لەگەڵ ئەودا کۆك نەبوو، ئێرانییەکان ئەو کوڕەیان خۆش دەویست، چوونکە لایەنگریان بوو، بە وتەی دیۆدۆر ئێرانییەکان بۆ کوشتنی ئانتیۆکۆس لەگەڵ ئەو کوڕەدا ڕێك کەوتن.

ئەگەر پرسیار بکرێت کە چۆن ئەو کوڕە ناسراو بە (سلۆکۆس) بۆ کوشتنی باوکی لەگەڵ ئەوان ڕێك کەوتن؟!، بۆ ئەوەش وتەی دیۆدۆر بە گەواهی و بەڵگە دێنینەوە، ئەو دەڵێت جەنگە براکوژییەکانی یۆنانییەکان لە دوای مردنی ئەسکەندەر بە ڕادەیەك ئاکار و ڕەوشتی یۆنانییەکانی شێواند، کە کوشتنی کوڕ بە دەستی باوك یاخۆ پێچەوانەکەی ئاسایی بێت، تەنانەت کوشتنی خوشك و دایك بۆ ئەوان ئاسایی بوو، لە هەر شوێنێك کە سەردارێکی یۆنانی دەگەیشتە پاشایەتیی، خۆی و شوێنکەوتووانی کوشتن و کوێرکردنی کەسوکاری خۆیان بە کارێکی ئاسایی دەزانی، هەر بۆیە ئەو ڕەوتارەی سلۆکۆس کە ویستی بابی بکوژێت شتێکی نامۆ نییە لەو ڕەوشە شێواوەدا، بەڵام وەك دیۆدۆر دەڵێت: یەکێك لە برادەرەکانی سلۆکۆس هەواڵی ئەو بابەتەی بە ئانتیۆکۆس گەیاند، ئەویش فەرمانی بە یەکێك لە دادوەرەکان کرد تا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکات، دادوەر دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵ سلۆکۆسی کوڕ و بیستنی وتەی کەسانی ئاگەدار، ڕاپۆرتی خۆی گەیاندە ئانتیۆکۆس، کە بێگومان کوڕەکەی لەگەڵ هەندێك کەس بۆ کوشتنی ئەو ڕێك کەوتووە.

ئانتیۆکۆس بڕیاریدا سلۆکۆسی کوڕی بە شێوەیەك سزا بدات، کە ببێتە پەند بۆ هەمووان، بۆیە هەموو ئەو سەردارانەی خۆی کە پێی وابوو ڕۆژێك لە دژی یاخی دەبن بۆ خووانێکی نان خواردن بانگهێشت کرد، ئەو کاتەی هەمووان دانیشتن و دەستیان بە نان خواردن کرد، سەری بڕاوی سلۆکۆسیان هێنا، کە هێشتا چاوی کراوە بوو، لەسەر سینییەك دانرابوو، خستیانە ناوەندی مێزی نان خواردن، ئانتیۆکۆس وتی: ئەوە سەری سلۆکۆسی کوڕی منە، کە ویستی ناپاکیم لەگەڵدا بکات، بۆیە سەریم بڕی و لە لاشەکەی جیام کردەوە، هاوار بەماڵی ئەو کەسەی بیەوێت ناپاکیم لەگەڵدا بکات.

دواتر تەواوی ئەو کەسانەی ببوونە هاوکار لەگەڵ سلۆکۆس بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکە، هێنرانە ئەویّ، بە بەر چاوی میوانەکانەوە کە سەرگەرمی خواردن و خواردنەوە بوون، دەستیان بە سەربڕینیان کرد، هێندە خوێن لەنێو تەلارەکەدا رژا کە لاقی میوانەکان کەوتە نێو خوێن و چیدیکە جێگە بۆ دانانی لاشە بیّ سەرەکان لەنێو هۆڵەکە نەما، لاشەکانیان دەبردە نێو حەوشەی کۆشك، هەڵبەتە هەموو ئەوانەی لەو هۆڵە سەربڕدران ئێرانی بوون.

رۆژی دواتر ئانتیۆکۆس کوڕە بچووکەکەی کە بە (ئانتیۆکۆس) ناو دەبرا بە شازادەی جێنشین ڕاگەیاند، کە هەردەم سەرخۆش بوو، کەموکورتی دیکەیشی هەبوو، تا ئەو کاتەی بابی زیندوو بوو نەیدەوێرا سەرخۆشی و کێماسییەکانی دەربخات.

ئانتیۆکۆسی یەکەم لە ساڵی (٢٦١ پ. ز) مرد و کوڕە گەنجەکەی واتە ئانتیۆکۆسی دووەم بوو بە جێنشینی، یەکەم ڕووداوی گرینگی سەردەمی پاشایەتیی ئەو برێتی بوو لەوەی (ئازۆکا) پاشای هیندستان واتە پاشای (سێند و پونجاب)، کە ئێستە بە پاکستانی رۆژئاوا ناسراوە، شاندێکی لە نێردراوەکانی خۆی نارد بۆ کۆشکی ئەو.

ئەو شاندە هەندێك دیارییان لەلایەن پاشای هیندستان بۆ ئانتیۆکۆسی دووەم هێنابوو، نامەکەی ئەویان کە بە زمانی سانسکریت نووسرابوو بۆ پاشا وەرگێڕایە سەر زمانی یۆنانی. لەو نامەیەدا پاشای هیندستان داوای لە پاشای ئێران دەکرد، کە بێتە سەر ئاینی بوودی.

ئازۆکا پاشای هیندستان یەکێك لە ڕووخسارە دیارەکانی مێژووی جیهانە و جێگەی سەرسووڕمانە کە ئەو بەو شێوە بیرکردنەوەیەی چۆن توانی ماوەیەکی زۆر پاشا بێت. ئەو یەکەمین کەس بوو لە جیهاندا کە نەخۆشخانەی ئاژەڵانی دروست کرد، لە هەر نەخۆشخانەیەك دوو پزیشك و چوار یاریدەدەری پزیشك و بیست پەرەستاری کردە بەرپرس لە چارەسەرکردنی ئاژەڵە نەخۆشەکان و پێدانی ئالیك و ئاو پێیان.

ئازووکا لەو رۆژە کە بوو بە پاشا تا ئەو رۆژەی مرد، فەرمانی کوشتنی کەسی دەرنەکرد، ئەستەمە جگە لە هیندستان کە دانیشتووانی بوودایی بوون، بتوانرێت بەو شێوەیە دەسەڵاتداری بکرێت، چوونکە لەنێو نەتەوەکانی دیکەدا خەڵکی خراپکار و تاوانبار دەردەکەون و ژیان لە خەڵك تاڵ دەکەن، بۆیە ئەوەی دەسەڵاتدارە ناچارە ئەوان سزا بدات تا کۆمەڵگە لەبەر یەك هەڵنەوەشێتەوە و لێك نەترازێت، بۆیە ئازۆکا نەیدەتوانی لە کۆمەڵگەیەك پاشا بێت کە بوودایی نەبن، خەڵکی هیندستان چوونکە بۆدایی بوون، هەوڵی

ئازاری یەکدییان نەدەدا و خۆیان لە کوشتنی ئاژەڵ دەپاراست و گۆشتی ئاژەڵانیان نەدەخوارد، هەموو خواردنەکانیان ڕووەکی بوون، زۆرتر ئەو خواردنانەیان دەخوارد کە بە خاوی دەخوران، ڕەوتاریان لەسەرخۆ بوو، بۆیە ئازۆکا دەیتوانی بێ ئەوەی فەرمانی سزادان دەربکات، پاشایەتیی بکات.

ئەو ڕۆژەی نێردەکانی ئانتیۆکۆس لە پایەختی ئێران گەیشتنە خزمەتی ئانتیۆکۆسی دووەم، ئەو مەست بوو، بەڵام ئەوان کە لە هیندستانەوە هاتبوون نەیاندەزانی کە مەستە، دوای ئەوەی نامەی پاشای هیندستانیان بۆ وەرگێڕا، ئەو وتی: "من وێڕای ئەوەی دەزانم خوداوەندیانی گەورە لە یۆنان زۆرن، هیچیان ناپەرستم، ئەی چۆن خوداوەندی پاشای ئێوە بپەرستم".

دوای چەند ڕۆژێك لە مانەوە، شاندە نێردراوەکەی هیندستان کە دەیانەویست بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان، بۆ وەرگرتنی مۆڵەت بۆ گەڕانەوە چوونە لای ئانتیۆکۆسی دووەم. دیسان ئەو مەست بوو، کاتێك بیستی ئەندامانی شاندەکە داوای مۆڵەتی لێدەکەن، فەرمانی کرد تا هەموویان سەرببڕن، بەڵام نەزانرا بۆ ئەو فەرمانەی دەرکرد.

شانس یاوەری ئەوان بوو، لەوکاتەدا (پاترۆکۆڵ)ی دەریاسالار لەوێندەر ئامادە بوو، ئانتیۆکۆس تەنیا قسەی ئەوی پەسەند دەکرد، پاترۆکۆڵ تکای لێ کرد، کە کوشتنی ئەندامانی شاندەکە تا سپێدەی بەیانی جێبەجێ نەکات.

پاترۆکۆڵ هەر هەمان ئێوارە چەند دڵۆپەیەك لە ئامۆنیاکی کردە نێو خواردنەوەی ئانتیۆکۆس تا مەستی لێ دوور بخاتەوە، نیو کاتژمێر دوای ئەوەی ئانتیۆکۆس خواردنەوەکەی خواردەوە، مەستییەکەی نەما، پاترۆکۆڵ کە زانی ئەو مەستییەکەی نەماوە، پرسیاری کرد کە ئایا دەزانی ئەمڕۆ چ فەرمانێکت دەرکردووە؟.

ئانتیۆکۆس وەك هەموو مەستەکان تازە دەهاتەوە سەرخۆ و ڕووداوەکانی ئەوکاتی وەك خەیاڵ دەهاتەوە بیر، وتی: بیرمە کە فەرمانی کوشتنی چەند کەسێکم دەرکرد، بەڵام نازانم ئەوان کێ بوون و بۆ ئەو فەرمانەم دەرکرد.

پاترۆکۆڵ وتی: ئەوان ئەندامانی شاندی نێردەی هیندستان بوون، کەمترین هەڵەیان نەکردبوو، ئەگەر من تکام لە تۆ نەکردبایە تا کوشتنی ئەوان دوابخەیت، بۆ سپێدەی ڕۆژی داهاتوو، ئەوان هیچیان زیندوو نەدەمان.

ئانتیۆکۆس وتی: باشت کرد کە ئەو مۆڵەتەت لە من وەرگرت.

پاترۆکۆڵ وتی: ئەو کەسانەی رات سپاردوون بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکە بانگ بکە و پێیان ڕابگەیەنە کە بە تەواوەتی بە فەرمانەکەتدا چوویتەوە، سەبارەت بە شاندی هیندستان، ئەوان ئازادن بۆ هەر شوێنێك کە دەخوازن بچن.

ئانتیۆکۆس ڕاسپێردراوەکانی بەجێگەیاندنی ئەرکەکەی بانگ کردن و ئازادبوونی شاندەکەی پێیان ڕاگەیاند و وتی دەکارن بۆ هەر شوێنێك کە دەیانەوێت بڕۆن، پاترۆکۆڵ هەر هەمان رۆژ ئەندامانی شاندەکەی لە پایتەخت کە شاری (سلوکییە) بوو، دەکەوتە کەناری دیجلە، بردە دەرەوە و بەڕێی کردنەوە، چوونکە دەترسا ئەگەر ئەو شاندەی هیندستان تا رۆژی دواتر لە پایتەخت بمێننەوە، ئانتیۆکۆس لە رۆژی داهاتوودا لە کاتێك کە مەست دەبێت فەرمانەکەی خۆی بیردێتەوە و ئەوان دەکوژێت، بەڵام پاترۆکۆڵ کە دەریاسالار بوو، بەردەوام لە کۆشك دەبوو، تا ئەو کەسە بێ تاوانانەی دەکەوتنە بەر ڕقی ئانتیۆکۆس، رزگار بکات.

تاکە سوودی مەستبوونی بەردەوامی ئانتیۆکۆس ئەوە بوو کە لەبەر مەستییەکەی فریای کاروباری حکوومەت نەدەکەوت و هەوڵی نەدەدا تا بەرانبەر زمان و ئاینی ئێرانییەکان توندی بنوێنێت، بۆیە ئێرانییەکان وەك جاران مەزدا پەرستییان دەست پێ کردبۆوە، واتە ئەوەی تا ئەوکات بە نهێنی دەیانکرد ئاشکرایان کرد، چوونکە ئانتیۆکۆس بەردەوام شەرابی دەخواردەوە و شەرابی پێ خۆش بوو، لە سەردەمی پاشایەتیی ئەودا رەزەکانی مێو لە ئێران زۆر زیادیان کرد، ئەو نەتەنیا لە دەڤەرە سارد و فێنکەکان کە بۆ چاندنی داری ترێ یاخۆ مێو باش بوو، پەرەی بەو کارەدا، بگرە لە ناوچە گەرمەکانیش کە بۆ چاندنی مێو باش نین، جووتیارانی ناچار کرد تا مێو بچێنن، بەو کارەشیان شەرابیان دەست بکەوێت.

جارێکیان ئانتیۆکۆسی دووەم لە کەناری دەریاچەی چیچەست ئاشێکی ئاوی بە رشتنی شەراب خستەگەڕ، جارێکی دیکەیش لە کاسپێن (قەزووین) لە حەوزێکی گەورەی پڕ لە شەرابدا، بەلەمی لێخوڕی.

ئاشکرایە کاتێك پاشایەك بەردەوام مەست بێت و کاتی نەبێت بە کاروباری دەوڵەت ڕابگات، دۆخی وڵات چی لێ بەسەر دێت، هەموو دەسەڵاتدارانی شوێنە جیاکانی ئێران ئەوەی ویستبایان دەیانکرد، چوونکە دەیانزانی لێ پێچینەوە لەکاردا نییە، کەسیش توانای نییە لە

لای پاشا سکالاّ بکات. هەندێ لە دەسەلاّتدارانی ئێران کە زۆریان متمانەیان بە دۆخی ئانتیۆکۆس هەبوو، ترسیان لێ نەبوو، هێندە ستەمیان دەکرد کە جێگەی سەرسووڕمان بوو.

دیۆدۆتۆس فەرمانڕەوای ویلایەتی باکتریا (باختەر) بوو، باجی بۆ هەموو مریشکێکی هێلکەکەر سەپاند بوو بە رێژەی سی هێلکە لە سالّێکدا، بەو پێوەرە دەردەکەوێت کە ستەم لەگەلّ خەلّك گەیشتووەتە چ ڕادەیەك. هێشتا پێنج سالّ لە پاشایەتیی ئانتیۆکۆسی دووەم نەڕۆیشتبوو کە باکتریا لە ئێران جیا بۆوە و دیۆدۆتۆس خۆی بە پاشا ناساند و تاجی کردە سەر.

رۆژێك کە پاترۆکۆلّی دەریاسالار لە گەشتێکی دەریایی هاتبۆوە و لە کۆشك بوو، بەو دەرمانەی لای بوو ئانتیۆکۆسی لە مەستی ڕزگار کرد و پێی وت: دیۆدۆتۆس ویلایەتیی باکتریای داگیرکردووە و پێویستە ئەو سزا بدات.

ئەو رۆژە ئانتیۆکۆسی دووەم یەك لە سەردارەکانی بە ناوی (ئاشیل) ڕاسپارد تا بە لەشکرێکەوە بڕواتە باکتریا و دیۆدۆتۆس بە زنجیر ببەستێتەوە و بینێرێت بۆ پایتەخت یاخۆ سەری بۆ بنێرێتەوە و سەد هەزار سککەی زێڕی بە ناوی ئانتیۆکۆس بە دیاری وەربگرێت.

ئاشیل لەگەلّ هەندێ لە خەلّکی نێو کۆشك رێککەوت، دە رۆژ خۆی شاردەوە، دوای ئەوە سەری کەسێکی بێ تاوانی بۆ ئانتیۆکۆس هێنا و وتی ئەوە سەری دیۆدۆتۆسە و سەد هەزار سککەی زێڕی بە دیاری وەرگرت، هەندێکی دابە ئەوانی دیکە و ئەوەی دیکەیش بۆ خۆی مایەوە.

لە سلوکییەی پایتەختی ئەوسای ئێران کە لە کەناری دیجلە بوو، تا بەکتریا بەو ئامێرە هێواشانەی ئەوکات، کە نێزیکەی دوو مانگ رێگە دەبوو، ئەگەر ئاشیل ویستبای بە لەشکرێك بەرەو باکتریا بچێت و بێ وێستان سەری دیۆدۆتۆس ببڕێت و بگەڕێتەوە، پێویستی بە چوار مانگ هەبوو، بەلاّم مەستی بە رادەیەك بە سەر ئانتیۆکۆس زالّ ببوو، کە نەیدەتوانی جیاوازیی لە نێوان ئەو رێگەیە کە چوار مانگی دەخایاند و مەودای دە رۆژی لێ تێك چوو بوو.

لە رۆژهەلاّتی ئێران و لەو ناوچەیەی بە (پارتیا) ناسرابوو، پیاوێکی مەڕدار هەبوو بە ناوی (ئەرشەك) کە وەك ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی ناوداری خۆراسانن، وێڕای ئەوەی شوان بوو، بەلاّم خودان زانست بوو.

ئێسترابوون لە جوگرافیای مێژوویی خۆی نووسیویەتی: خەڵکی پارتیا لە تەواوی دانیشتووانی دیکەی ئێران زیرەکتر و تێگەیشتوتر بوون، مەبەستی ئەو لە پارتیا هەمان خۆراسان و باکوری رۆژئاوای وڵاتی ئەفغانستانە.

ئێستەش ئەو جیاوازییە لە نێوان دانیشتووانە رەسەنەکانی خۆراسان بە تایبەتی خەڵکی مەشهەد و شوێنەکانی دیکەی ئێران هەستی پێ دەکرێت، تەنیا پێویستە خاوەن هزرێکی ڕاهێندراو بۆ لێکۆڵینەوە، لە ورە و هۆشی دانیشتووانی شارە جیاوازەکانی ئێران بکۆڵێتەوە تا تێ بگات کە دانیشتووانی خۆراسان، بە تایبەتی دانیشتووانی شاری مەشهەد لە ئەوانی دیکە بەهۆشترن، بە هەمان هۆکاریشە کە ژمارەی خەڵکی هەڵکەوتوو لە خۆراسان زۆرترن بە بەراورد بە خەڵکی شوێنەکانی دیکە.

پارتیای سەردەمانی کۆن و خۆراسانی ئێستە، بەردەوام هەندێ جووتیاری هەبووە، کە زانا بوون و ئاژەڵیشیان هەبووە، کە خاوەن زانست بوون. فیردەوسی لە سەدەی چوارەم و غەزالی لە سەدەی پێنجەم و خواجە نیزامولمولك لە سەدەی دواتر جووتیار بوون، لە رێگەی کشتووکاڵەوە ژیانیان بەسەر دەبرد، تا سەرەتای سەدەی رابردووش لە شارەکانی (خۆراسان، ئەسفەراین، جوین، توربەت حیدریە، توربەت جەم، توربەت شێخ جام، بەشرۆیە، توون و قائێن) مامۆستایانی کۆن لە رێگەی ئاژەڵداری ژیانیان دەبردەسەر یاخۆ لە بیابان بە گاسن جووتیان دەکرد و کێڵگەکانیان دەچاند و بەرهەمیان هەڵدەگرتەوە.

ئەرشکیش یەکێك لە زانایانی خۆراسان بوو، خاوەنی مەڕ و ماڵات بوو، ئەو لە ستەمی فەرمانڕەوای پارتیا کە سوودی نا بەجێی لە مەستی ئانتیۆکۆس وەردەگرت، تەنگی پێ هەڵچنرا بوو، بڕیاریدا فەرمانڕەوا لابدات، ئەرشەك و بنەماڵەکەی نیشتەجێی زابولێستان بوون، وەك هەموو پیاوانی ئەو دەڤەرە بالاّبەرز و چوارشانە بوون.

ئەرشەك لە ساڵی (٢٥١ پ. ز) بە لەشکرێکی بچووك لە پیاوانی زابۆلێستان کە هەموویان سواری گا دەبوون، لە فەرمانڕەوای پارتیا یاخی بوو، بەشی باشووری ئەو ویلایەتەی لێ دابڕی، کە بە (کوهستان) ناودەبرا، دواتر لە سەردەمی ئیسلامی ناوی بە (قەهستان) دەهات. فەرمانڕەوای پارتیا لەشکرێکی بۆ جەنگی ئەرشەك نارد، سەربازەکانی پەرش و بڵاو بوون و شکستیان خوارد و هەندێکیان کوژران.

ئەرشەك تا ساڵی (٢٥٠ پ. ز) لە باشووری خۆراسان مایەوە، ئەوکات بە لەشکرە گاسوارەکەی، هێرشی بۆ باکوری خۆراسان کرد و فەرمانڕەوای باکتریا هەڵات، ئەرشەك لە باکوری پارتیاش بۆوە خاوەن هێز. ئەرشەك لە ساڵی (٢٥٦ پ. ز) و بەپێی هەندێك گێڕانەوە لە ساڵی (٢٥٠ پ. ز) خۆی بە پاشای پارتیا ناساند، هەر ئەو پیاوە زانایە بووە دامەزرێنەری زنجیرە پاشایەتیی بەناوبانگی ئەشكانییەکان.

بە پێچەوانەی نووسینەکانی مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەیەم، ئەرشەك مەغۆل نەبوو. بگرە ئێرانی ڕەسەن و خەڵکی خۆراسان بوو، لەگەڵ بە پاشابوونی ڕاستەوخۆ یاساخبوونی ئاگرخانەکانی هەڵوەشاندەوە و وتی خەڵك ئازادن لە کردنەوەی ئاگر لە ئاگرخانەکان.

# باڵادەستی پارتەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران

بابەتی دەرکەوتنی ئەشك کە لە مێژوودا بە (ئەسك یاخۆ ئەرشەك یان ئەرشاك) هاتووە، لە ڕۆژهەڵاتی ئێران بە هۆی ئەو بایەخەی هەیبووە وەك دەرکەوتنی کوروش دامەزرێنەری هەخامەنشییەکان و داریوشی یەکەمی بکوژی گۆماتەی ماسك لەسەر، یەك لەو ڕووداوە مێژووییانەیە کە گێڕانەوەی زۆری بۆ کراوە.

ئەگەر گریمان بکەین کە لە سەردەمی ئێستەدا کەسێك بۆ سەرۆکایەتیی ئەمەریکا دەربچێت، دەبینین میدیاکان بە هەموو توانایانەوە دەیانەوێت هەندێ بابەت لەسەر ئەو کەسە بڵێن کە خۆشی نەیزانی بێت، ئا لەو بابەتەوە دەزانین کە لە رابردوودا سەبارەت بە پیاوانی گەورە چ وتراوە.

ئەو گێڕانەوانەی سەبارەت بە سەرهەڵدانی ئەشك لەبەردەستن لەگەڵ گێڕانەوەکانی پێوەست بە کوروشی گەورە و داریوشی یەکەم زۆر لێکچوونە. سەرەتا سەبارەت بە لە دایکبوون و پەروەردەکردنی ئەشکی دامەزرێنەری زنجیرەی پاشایەتیی ئەشکانییەکان، گێڕانەوەیەك هەیە کە ئێستە هیچ یەك لە مێژوونووسەکان پەسەندی ناکەن، چوونکە هەندێ لەو گێڕانەوانە لەگەڵ ئەقڵدا کۆك نین، لەوانەش ئەفسانەی تایبەت بە پەروەردەکردنی ئەشك لەلایەن هەڵۆیەك لە هێلانەکەی خۆیدا.

ئەگەر گریمان بکەین بەپێی بڕوای هەندێك لە لێتۆژان، پاڵەوانەکانی نێو شانامەی فێردەوسی هەموویان لە سەردەمی ئەشکانییەکان ژیاون، دوور نییە فێردەوسی چیرۆکی (زاڵی) واتە بەخێوکردنی ئەو لەلایەن سیمرغی لە ئەشك وەرگرتبیت[1]، ئاشکراشە فێردەوسی

---

(١) فیردەوسی پەڕتووکی شانامەی نووسیوە، کە بە هۆنینەوەی شیعر هەندێك پاڵەوانی گەیاندووەتە پلەی ئەفسانەیی، لەوانەیە هەندێ بابەت لە شانامەدا بشێت بۆ مێژوو بەکار بێن، بەڵام وەك خۆی دەڵێت: "رۆستەم یلی بود در سیستان، منش کردم روستەم دەستان" واتە رۆستەم پاڵەوانێك بوو لە سیستان، منیش کردم بەو رۆستەمەی لەسەر زاران بێت. بە واتایەکی دیکە هەندێ لە بەسەرهاتەکانی نێو شانامە تا رادەیەك راستن، بەڵام دەیان جار گەورەتر لە قەبارەی خۆیان خراونەتەڕوو. "وەرگێڕی کوردی"

کەسێکی ڕاستگۆ بووە، بۆیە ناوی ئەشکی نەگۆڕیوە، ئەو سەرچاوانەی ئەو بابەتەکەی لێوەرگرتوون ناوەکەیان لە ئەشکەوە گۆڕیوە بۆ زاڵ، لە گێڕانەوەکاندا ئەشك پرچی درێژی سپی هەبووە، لە گێڕانەوەی فێردەوسیش، زاڵ بە هەمان شێوە پرچی درێژی سپی هەبووە.

فێردەوسی لە پەڕتووکە زیندووەکەیدا دەڵێت:"یکی کوه بدنامش البرکوه. به خورشید نزديك و دوور از گروه."ئەو گێڕانەوەیە سەبارەت بە ئەشکە و وتوویانە "شاخێك لە پارتیا هەبووە کە هێندە بەرز بووە، گەیشتووەتە هەتاو، بابی ئەشك ئەو منداڵەی لە کاتی شێرەخۆریدا لە دامێنی شاخەکە داناوە تا لە برسان بمرێت، هەڵۆیەك کە هێلانەی لەو شاخە بووە، منداڵە شێرەخۆرەکە دەباتە هێلانەکەی و ئەشك لە لووتکەی شاخ لەگەڵ بێچووە هەڵۆکان گەورە دەبێت.

بەڵگەی ئێرانی بوونی پاشا ئەشکانییەکان زۆرن، یەکێك لە بەڵگەکان هەر ئەوەیە کە ئەشك لەسەر شاخ و لە هێلانەی هەڵۆ بەخێو کراوە. چوونکە لە نەتەوە ئارياييەکان بۆ نموونە هیندی و ئەڵمانەکان ئەو گێڕانەوانەیان هەیە، هەندێ لە پاڵەوانە ئاریاییەکان بە گێڕانەوەی ئەفسانەکان لە هێلانەی هەڵۆ پەروەردە کراون و دواتر لە شاخ دابەزیون.

لە بەسەرهاتی داریوشی یەکەم باسکرا کە ئەوکاتەی ئەو فڕوفێڵی و ستەمکارییەکانی گۆماتەی بیست، بۆ ئەوەی ئێرانییەکان لە دەست ئەو رزگار بکات، لەگەڵ شەش کەس لە گەورەکانی ئێران کە هەر یەکەیان گەورەی خێڵێك بوون، بووە هاوپەیمان، لەگەڵ خۆیدا بوونە حەوت کەس.

هەر ئەو گێڕانەوەیە لەبارەی ئەشك دامەزرێنەری ئەشکانییەکان هەیە، ئەو بۆ بە دەستەوەگرتنی دەسەڵات لە پارتیا لەگەڵ شەش کەس کە هەریەکەیان گەورەی یەکێك لە خێڵەکانی پارتیا بوون، بووە هاوپەیمان کە یەکیان گەورەی خێڵی (کارن) یاخۆ (قارن)، یەکێکی دیکە گەورەی خێڵی (سۆرن) و ئەوی دیکەیش گەورەی خێڵی (ئیسفەهاپی) بوو.

لەنێو حەوت سەرۆکەکان، ناوی ئەشك و ئەو سێ کەسە زانراوە، ئەوانی دیکە ناویان لە مێژوودا نەهاتووە، ئەو حەوت کەسە بوونە هاوپەیمان تا بەسەر سلوکییە یۆنانییەکاندا سەربکەون و ئێران لە دەست ئەوان رزگار بکەن.

گێڕانەوەیەکی دیکە دەڵێت ئەشك لە نەوەکانی ئەردەشێری دووەم پاشای هەخامەنشیی و شازادەی ئێرانی بووە، دیسان دەوترێت کە ئەو فەرماندەی ڕێگرەکان بووە، بەڵام مێژوونووسی

ناسراوی ئەرمەنی (موسی خۆرنی) و چەند مێژوونووسێکی دیکەی ئەرمەنی ئەو بابەتە رەت دەکەنەوە و دەڵێن ئەشك لە گەورەکانی پارتیا بووە، زانراوە (پارتیا) یاخۆ (پارپوا) لە کەتیبەی داریوش لە بێستوون تۆمار کراوە.

بۆ ئەو کەسانەی پێیان وایە ئەشك خانەدانێکی ئێرانی یاخۆ خاوەن ئاژەڵێك نییە، دوو هۆکار دێنینەوە کە پێمان وایە دەبێتە بەڵگە بۆ بڕوا هێنانیان:

بەڵگەی یەکەم ئەوەیە کە بە وتەی موسی خۆرنی و چەندان مێژوونووسانی دیکەی ئەرمەنی کە لەلایەن نۆڵدکەی ئەڵمانی و زۆرینەی ئێرانناسەکانی ئەو سەردەمە پشتڕاست کراوەتەوە، ناوی دیکەی پارتوا یاخۆ پارتیا هەمان ئێران بووە، ناوی ئێران لە پارتیا بووە ناوی تەواوی ئەو دەڤەرەی لە سەردەمی هەخامەنشییەکان لە کەناری ڕووباری سێند تا کەناری دەریای مەدیتەرانە فرەوان بوو.

بەڵگەی دووەم ئەوەیە کە سنووری سەرزەوی پارتیا خۆی بەڵگەیە، کە لە رۆژئاوای کاسپین واتە دەروازەی قەزووین تا رۆژهەڵات لە باکوری رۆژئاوای ئەفغانستان و هەموو خۆراسانی ئێستەی گرتووەتە خۆی.

هۆکاری ئەوەی ئەشك و جێنشینەکانی کە هەموویان نازناوی ئەشکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد بوو، بە نائێرانی بناسێنرێن، دەگەڕێتەوە بۆ دوژمنایەتیی ساسانییەکان لەگەڵ ئەوان، ساسانییەکان دوای ئەوەی دەسەڵاتیان گرتەدەست، هێندەی لە توانایان بوو شوێنەواری ئەشکانییەکانیان کوێر کردەوە تا ئەوان بە بێگانە و نائێرانی بناسێنن.

هەر ئەو دوژمنایەتییە لەلایەن ئەسکەندەر و جێنشینەکانی بەرانبەر بە مێژوو و ئاینی ئێرانییەکان ئەنجامدرا، ساسانییەکان بەرانبەر بە مێژووی ئەشکانییەکان ئەنجامیاندا، دامەزرێنەری ئەو دوژمنایەتییە (پاپك) باپیرەی ئەردەشێر بوو، کە بە میرات بۆ ئەردەشێری دامەزرێنەری ساسانییەکان گوازرایەوە، ئەو پاشا گەورەیە شوێنەوار و بە تایبەتی مێژووی ئەشکانییەکانی سڕییەوە، بۆیە مێژووی ئێران لە سەردەمی ئەشکانییەکان وەك فیردەوسیش دەڵێت، هیچی لێ نەزانراوە، جگە لەنێوی پاشاکانیان.

هەر زانیارییەکیش کە بەردەستمان کەوتووە لەبارەی پاشاکانی ئەشکانییەوە لە سێ سەرچاوەی مێژووییەوەیە کە برێتین لە سەرچاوە مێژووییەکانی رۆم، سەرچاوە مێژووییەکانی ئەرمەن و سەرچاوە مێژووییە سریانییەکانە.

ڕۆمەکان چوونکە هاوسەردەمی ئەشکانییەکان بوون مێژووی ئەوانیان نووسیوەتەوە، ئەرمەنەکانیش چوونکە لە ڕووی مێژوویی هۆگری ئەوان بوون، مێژووی ئەوانیان نووسیوەتەوە، سریانەکان لە روانگەی هۆگربوونیان بۆ مێژووی جیهان هەوڵیانداوە مێژووی پاشا ئەشکانییەکان بنووسنەوە، هەرسێ نەتەوە وێڕای ئەوەی ئێرانی نەبوون، بەڵام خزمەتی مێژووی ئێرانیان کردووە.

ئەشك و سوارەکانی هەموویان سواری گا دەبوون و تیرهاوێژ بوون، لە کاتی رۆیشتنی گا بەرەو پێشەوە دەیانتوانی تیر بۆ دواوەیان بهاوێژن، دواتریش لەنێویاندا ئەسپسواری برەوی سەند، هەمان شێوە تیرهاویشتنیان لەسەر پشتی ئەسپ ئەنجام دەدا، ئەو کارە بە (قەیقاج) ناودەبرا، بەڵام دوای ئەوەی ئەشك بووە خودان دەسەڵاتیی پارتیا، بە زوویی نەتوانرا دەوڵەتی سلوکی لەنێو ببردرێت، حکوومەتی ئەشك لە پارتیا تا ماوەیەك دوای دامەزرانی ئەشکانییەکان بەردەوام بوو.

ئانتیۆکۆسی دووەم پاشای ئێران لە زنجیرەی سلوکی بە مردنی ئاسایی مرد و کوڕەکەی واتە (سلۆکۆسی دووەم) لە ساڵی (٢٤٦ پ. ز) بووە پاشای ئێران، لە یەکەم رۆژی دەسەڵاتییەوە بەرانبەر بە ئێرانییەکان تووند بوو، ڕێوڕەسمی ئاینی لێ یاساخ کردن، قوتابخانە ئێرانییەکان کە بە نەریتی هەخامەنشییەکان کرابوونەوە و منداڵان لەو قوتابخانانە زمانی فارسیان دەخوێند، بە فەرمانی ئەو داخران و بانگەشەی کرد لە هەر شوێنێکی ئێران قوتابخانەیەك بۆ خوێندن و نووسینی فارسی بکرێتەوە، ئەوا دامەزرێنەر و مامۆستاکانی دەکوژرێن و لە قوتابخانەکان تەنیا دەبێت زمان و رێنووسی یۆنانی بخوێندرێت.

جارێکی دیکە خەڵکی ئێران ناچاربوون پۆشاکی یۆنانی بکەنە بەریان و سەرلە نوێ زمانی شوێنە گشتییەکان بووە یۆنانی، لە سەرەتای پاشایەتیی سلۆکۆسی دووەم، مێژووی ئێران لە روانگەی پێوەندی ئێرانی و یۆنانییەکان خۆی دووبارە کردەوە.

لە سەردەمی دەسەڵاتیی ئاتیۆکۆسی یەکەم کە ئێرانییەکانی خستبۆوە ژێر گووشار، ئێرانییەکان بوونە هاوپەیمانی سلۆکۆسی کوڕی تا بیکوژن، ئاکامیش وەك باسکرا چییان بە سەر هات. لە سەردەمی دەسەڵاتداری سلۆکۆسی دووەم هەمان ڕووداو دووبارە بۆوە، تاکە جیاوازیی ئەوە بوو کە ئێرانییەکان لەگەڵ براکەی سلۆکۆس کە ناوی ئانتیۆکۆس بوو، دەستیان تێکەڵ کرد و بە هۆی ئەوەی ئانتیۆکۆس نەگەیشتە دەسەڵات نازناوی ئانتیۆکۆسی سێیەمی بۆ

دانەنرا. ئەوان یارمەتییاندا تا لە جیاتی سلۆکۆسی دووەم ببێتە پاشا، بۆ ئەوەی لە گووشاری زۆری سلۆکۆسی دووەم رزگاریان ببێت.

لە (٢٤٦ تا ٢٤٢ پ. ز) ئانتیۆکۆس بە یارمەتی ئێرانییەکان چەندین جار لەگەڵ سلۆکۆسی دووەم جەنگا، بەڵام نەیتوانی سەربکەوێت، لە جەنگێکی گەورە لە ناوچەی ئەنگوریە بەرانبەر بە براکەی بە سەختی شکستی خوارد، وێڕای ئەوەش توانی لە بەشێك لە ئاسیای بچووك ببێتە خاوەن دەسەڵات.

لە سەردەمی دەسەڵاتداری سلۆکۆسی دووەمدا ژمارەیەکی زۆر لە ئێرانییەکان کە لە ناوچەی مادەکان (واتە ئازەربایجان و کوردستان و کرماشانی ئێستە) یاخۆ لە راقس (رێ و بەشێك لە ویلایەتە ناوەندییەکانی ئێران) یاخود لە کارمانیا و گدرۆزیا (کرمان و بلوچستان) دەژیان، بۆ ئەوەی بتوانن بە کاروباری ئاینی خۆیان ڕابگەن یاخۆ بە زمانی فارسی[٢] بدوێن، کۆچیان کرد. ئەوانەی لە پارتیا نێزیك بوون کۆچیان کرد بۆ ئەو شوێنە، ئەوانەی لە ئاسیای بچووك نێزیك بوون، کۆچیان کرد بۆ ئەو وڵاتەی پاشاکەی ناوی "ئانتیۆکۆس"ی برای سلۆکۆسی دووەم بوو، ئەو دوو وڵاتە لە ڕووی زمان و ئاین ئازادییان هەبوو.

بە هۆی کۆچی فارس و کرمانی و بلوچەکان بۆ پارتیا و تێکەڵ بوونی زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی لەگەڵ زمانی ئەو دەڤەرە، زمانێکی نوێ سەریهەڵدا بە ناوی (فارسی دەری)، دواتر لە دوای هێرشی عارەبان بۆ ئێران، شاعیرە ئێرانییەکان بەو زمانە شیعریان وتووە، یەکێك لە دیارترین پەڕتووکەکان بەو زمانە برێتییە لە (شانامەی فیردەوسی)، هەر ئەو زمانەشە کە ئێستە زمانی فەرمی ئێرانە و بەو زمانە دەئاخڤن و دەنووسن.

زمانی فارسی دەری بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی مێژوونووسان لە سەردەمی ساسانییەکان چێ نەبووە، هەروەها بە شێوەی سەرەتایی لە دوای هێرشی عارەبانیش بۆ سەر ئێرانیش دروست نەبوو، بگرە بناخەی زمانی فارسی دەری لە سەردەمی ئەشکانییەکان هاتەکایە، وەك

---

(٢) هەڵبەت زەبیحوڵڵا زۆر کلۆڵی پان ئیرانیزم و ناساندنی ئێران بە خاکی فارس بووە، بۆیە بەردەوام تەنیا جەخت لە فارس و زمانی فارسی دەکات، لەکاتێکدا مادەکان بە کوردی دەئاخڤین و بلوچیش هەمان سکاکانن و لە رەچەڵەکی کوردن، ئێران فرەنەتەوە و زمانە. "وەرگێڕی کوردی"

بەربەستێکی بەهێز لە بەرانبەر زمانی نەتەوە کۆچبەرەکان وێستا، نووسراوی ئەدەبی بەپێز و هەمیشەیی لێکەوتەوە کە لە هیچ شوێنێك نەبووە و نییە.

پرۆفیسۆری بەریتانی (ئاربێر) کە کارەکانی ئەو لە بواری زمانی فارسی هێندە بەناوبانگە کە پێویستی بە ناساندن نییە و قوتابی پرۆفیسۆری بەریتانی (نیکلسۆن) بوو، دەیوت ئەگەر ئەدەبیاتی زمانی فارسی کە لە ئەدەبیاتی زمانی دەری هاتەکایەوە، بخەینە لایەك و ئەدەبیاتی تەواوی دنیا لە لایەکی دیکە دابنین، ئەدەبیاتی زمانی فارسی لە ڕووی چۆنایەتیی نەك چەندایەتیی بەرانبەر ئەدەبیاتی تەواوی دنیا دەوەستێت، ئەوە وتەی مامۆستایەکی بەریتانییە، لە کاتێکدا کە ئەدیبە ئینگلیزەکان شانازی بە ئەدەبیاتی خۆیان دەکەن و شکسپیری شاعیری بەریتانی لە ریزی خوداوەندیانی بەریتانیا دەناسن.

توانەوەی زمانی فارسی لە زمانی ناوچەیی پارتیا، بووە هۆی سەرهەڵدانی زمانی دەری، بەڵام توانەوەی زمانی فارسی لەنێو ئەو زمانانەی دیکە کە لە ئاسیای بچووك هەبوون، نەبووە مایەی دروستبوونی زمانێکی نوێ، هۆکارەکەش ئەوەبوو کە لە یۆنان زمانی فەرمی یۆنانی بوو، زمانی فارسیش نەیتوانی لەگەڵ یۆنانی تێکەڵ ببێت.

هەندێك باوەڕیان وایە دوای لەنێوچوونی سلوکییەکان، ڕاستەوخۆ ئەشکانییەکان هاتنەسەر دەسەڵات، لە کاتێکدا وانەبووە، حکوومەتی ئەشکانییەکان و حکوومەتی سلوکی ماوەیەك هاوشانی یەکدیی بوون، بەڵام پاشا سلوکییەکان نەیاندەتوانی هێزی پاشا ئەشکانییەکان لەنێو ببەن، کە سەرەتا لە پارتیا، دواتریش لە باکتریا (واتە ئەفغانستان و باشووری ئەودیو ڕووبار)، پاشان لە سۆکدیا (سەغدیان و خوارەزمی سەردەمانی دواتر) و شارەکانی کەناری ڕووباری جەیحون پەرەی گرت.

ئەشکانییەکان تا ئەو رۆژەی رەسەنایەتیی خۆیان لە دەست نەدابوو، بەردەوامبوون لە بەخێوکردنی گا. مێژوونووسە ئەرمەنییەکان دەڵێن لە دەڤەرە جیاوازەکانی سنووری ئەشکانییەکان بە رێژەیەکی زۆر گا بەخێو دەکران، شیر بە رێژەی زۆر بەردەست دەکەوت، باشترین جۆری پەنیر لە جیهان لە خۆراسان بەرهەم دەهات، دوای چێکردنی پەنیر، بە مۆم دایاندەپۆشی تا رێگە لە تێکچوونی بگیرێت، ئەوکات پەنیرەکانیان دەخستە ژێرخانە فێنکەکان، لانی کەم ماوەی سێ ساڵ ئەو پەنیرانە دەمانەوە، ئەو پەنیرانە بە نانی تازە دەخوران، خواردنێك نییە خۆشتر بێت لە نانی نوێ و پەنیری کۆن، بۆیە ئەوانەی حەزیان بەو

خواردنە دەکرد، هێندە پەنیرەکەیان لەژێرخان ڕادەگرت تا کۆنتر ببێت، تەنانەت دەیان توانی تا ماوەی دە ساڵ پەنیرەکە هەڵبگرن.

نووسەری شانامە لەو ڕووداوانەی تایبەتن بە قارەمانەکانی سەردەمی ئەشکانییەکان، چەند جار لە شیعرەکانی باسی پەنیری کۆنی کردووە، بێگومان ئەو باسکردنەی پەنیری کۆن لە شیعرەکانی فیردەوسیدا، ڕەنگدانەوەی هۆگری ئەشکانییەکانە بۆ پەنیری کۆن، لە هەمان ناوچە کە پەنیریان دەنایەوە تا کۆن ببێت، شاعیری خۆراسانی و نووسەری شانامە باسی پەنیری کۆنی دەکرد.

بەخێوکردنی ماڵات لە خۆراسان بە ژمارەی زۆر کە باس دەکرێت، ئەو بیرۆکەیە دێنێت کە لەوەڕگەی فرەوان بۆ بەخێوکردنیان لە خۆراسان هەبووە، چوونکە ئەگەر لەوەڕگەی بەرفرەوان نەبووبێت، ئەوا ناتوانرێت ئەو ژمارە زۆرە لە ماڵات پەروەردە بکرێت، وەك زانراوە کەشوهەوای ئەوکاتی ئێران، جیاواز بووە لەو کەشوهەوایەی ئێستە هەیە.

ئەشکانییەکان لە تیر هاویشتن زۆر کارامە بوون، بۆیە بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ئەو کارە وردبینیان دەکرد، لە سەردەمی ئەوان باشترین تیر و کەوان لە پارتیا، باکتریا و سوکدیا چێ دەکرا، داری کەوانەکە لە داری بادامی کێوی چێ دەکرا، کە لە جەنگەڵەکانی پارتیا و سۆکدیا زۆر بوو، لە ڕۆژهەڵاتی ئێران دارێکی پتەوتر لەو دارە نەبوو.

ژێی کەمانەکەشیان لە پێستەی مامز چێ دەکرد، مێژوونووسە ئەرمەنییەکان دەبێژن کە خەڵکی پارتیا نەك هەر ماڵاتیان بەخێودەکرد، بگرە مامزیشیان بەخێو کردووە، شوێنەواری بەخێوکردن و ماڵی کردنی مامز تا سەدەی پازدەیەم واتە هەژدە سەدە دوای ئەو باسەی کە ئێستە لە بەردەستمانە، لە ئێران هەبووە.

گۆشتی ئەو مامزەی لە ئێران ماڵی دەکرا، ناسك و بەتام و بێ چەوریتر بووە، خەڵکی ئێران مامزی ماڵی کراویان وەك گا بۆ بارکێشی بەکار هێناوە و سوودیان لە شیر و گۆشتەکەی بینیوە، لە خۆراسان و سەغدیان ژێی مامزیان پێ باشتر بووە لە ژێیەکانی دیکە، هەر لەو دوو ناوچەیە پێیان باشتر بوو کە تیرەکانی کەوان کە پەیکانێکیان دەخرایەسەر لە داری گەز چێ بکەن کە لە باشووری خۆراسان و لە سەغدیان زۆر دەست دەکەوت، ئێستە بنە دەوەنەکانی ئەو دارە بچووکە لەو دوو دەڤەرە بەرچاو دەکەون.

بەڵگەیەکی دیکە نیشانی دەدات قارەمانەکانی شانامە هەمان ئەو قارەمانانەن کە لە سەردەمی ئەشکانییەکان ژیاون، ئەوەیە کە لە شیعرەکانی فیردەوسی زۆر باس لە کەوانی سەغدی بە ناوی (کەوانی چاچ) دەکرێت، کە ئەمڕۆ هەندێ لە مێژوونووسان پێی دەڵێن تاشکەند، باس لە ژێی مامز و تیری گەزین واتە تیری دروستکراو لە داری گەز دەکرێت. کەوانی چاچ بە رواڵەت بە تەواوی ئەو کەوانانە دەوترێت کە بە شێوەی کەوانسازی چاچ دروست بکرێت، کەوانێك بوو کە لە یەك نیوەبازنەدا سێ چەماوەی هەبوو، کە گەورەکەیان لە نێوەڕاست و دوو چەماوە دەکەوتنە دوو لای چەماوەی ناوەڕاست، واتە نیوە بازنەی کەوانی چاچ، جگە لە چەماوەی ناوەڕاست دوو گوێی لە دوولای کەوانەکە هەبوو، هەر کەوانێك لە هەر شوێنێك بەو شێوە دروست کرابووایە بە کەوانی چاچ دەناسرا.

هەندێ لە مێژوونووسان چاچ بە تاشکەندی ئێستە ناو دەبەن، بۆیە وتمان هەندێك، چوونکە ڕای هەمووان نییە، لە بەشەکانی دیکەی ئێرانیش هەندێ شار بە ناوی چاچ هەبوونە، بۆ نموونە لە داوێنی شاخی ئەلبۆرز شارێك بەو ناوە هەبووە، ئەو ڕووبارەی بە تەنیشت ئەو شارەدا ڕۆیشتووە بە (چاچ ڕوود) ناسراوە، دوای ئەوەی پیتی (چ) کە فارسی بوو لە عەرەبیدا گۆڕا بە (ج) بە (جاجڕوود) خوێندرایەوە، ئەو زێیە هێشتا لە نێزیك تاران ماوە، گوندەکانی وەرامین ئاودێری دەکات، دوور نییە شاری چاچ لە وەرامینی ئێستە بووبێت.

لە باشووری ڕۆژئاوای خۆراسان و لە تەنیشت کەویری ناوەندیی ئێران، گوندێکی بچووك، بە دەستەواژەی خەڵکی ناوچەکە (کەلاتەیەك) بە ناوی چاچ هەیە، چوونکە دەربڕینی پیتی (چ) لە کۆتایی وشەکە بۆ ئەوان سەختە، بۆیە زیاتر بە (چاە) ناوی دەبەن، بەڵام ئەگەر لە ساڵمەندەکانی ئەو گوندە پرسیار بکرێت، دەڵێن ئاواییەکەیان ناوی چاچە. لە نێزیك ئەو ئاواییە بێشەیەك لە داری بادامی کێوی هەیە، ئەگەر خەڵکی ئەو گوندە بچووکە، کە لە رابردوودا لەوانەیە شارێك بووبێت، لە سەردەمانی باستان کەوانیان دروست کردبێت، بێگومان داریان بۆ ئەو کارە لەو بێشەیە دەهێنا.

بە ڕەچاوکردنی ئەوەی لە شوێنەکانی دیکەی ئێرانیش چاچ هەبووە، بۆ نموونە لە خودی خۆراسانیش، ئەوا گریمانە گوایە چاچ هەمان تاشکەندە، پێویستی بە وردبوونەوەیە. ئەوەی فیردەوسی لەبارەی بادامی کێوی و ژێی مامز و تیر و داری گەز دەیلێت لەگەڵ وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان یەك دەگرێتەوە.

ئەو ناوچەیەی پاشا ئەشکانییەکان لێی بە دەسەڵات گەیشتن، لەو دەڤەرەیلە بوو کە بەردەوام بوومەلەرزەی هەبوو زۆرجار لەو ناوچەیە بوومەلەرزە شارەکانی وێران و دانیشتووانی دەکوشت.

باپیرانی ئەشك لە بیابان لەنێو ئەو لەوەڕگانەی ماڵاتیان تێدا دەلەوەڕاند، لە ڕەشماڵدا دەژیان، ئەوان ڕەشماڵەکانیان بە شێوەیەك دەچنی کە ئاو نەدات، بۆ ئەو کارەش مووی بزنیان لەو بزنەوانانە دەکڕی، کە لە نێوەندی ئێران مێگەلی گەورەیان پەروەردە دەکرد، ئەو کوتاڵانەیان لێ چێ دەکردن، کە ڕەشماڵی لێ دروست دەکرێت، لەنێو ئەو ڕەشماڵانەش لە باران و بەفر دەپارێزران و بەفر نەدەچۆوە نێو ڕەشماڵەکانیانەوە.

تا ئەوکاتەی ئەشکانییەکان لە ڕەشماڵدا دەژیان لە بوومەلەرزە نەدەترسان، چوونکە بوومەلەزە ڕەشماڵەکانی بەسەردا نەدەڕووخاندن، بەڵام دوای ئەوەی ئاکینجیی شارەکان بوو، بە هۆی بوومەلەرزەوە هەراسان ببوون، بۆ ئەوەی خانووەکانیان بە هۆی بوومەلەرزە نەڕووخێت، بڕیاریاندا بە شێوەیەك دروستیان بکەن کە بەرگەی بوومەلەرزە بگرن.

زانیاریمان نییە یەکەم خانووی بەرگەگەری بوومەلەرزە کە لەلایەن ژاپۆنییەکان دروستکرا، لە چ ساڵێك بوو؟!، بەڵام لە پارتیا خانووی تایبەتیان دروستکرد کە بەرگەی بوومەلەرزەیان دەگرت و نەدەڕووخا، دروستکردنی ئەو خانووانە بە پێچەوانەی بیرکردنەوە، کارێکی سەخت نەبوو، تەنیا پێویست بوو کۆڵەگە لەژێر داری دارەڕێی خانووەکانیان دابنێن تا لە کاتی بوومەلەرزە ڕێگر بێت لە داڕووخانی خانووەکانیان، لەوانەیە ئەو شێوە خانوو دروستکردنە پێش ئەشکانییەکان لە شارەکانی پارتیا هەبووبێت و مێژوو ئەو جۆرە خانووەی بە ناوی ئەوان تۆمار کردبێت، ئەوان بۆ دروستکردنی خانووەکانیان وەك وترا سوودیان لە کۆڵەگە وەرگرتووە و لەکاتی بوومەلەرزەی توونד خانەوەکانیان نەڕووخاوە، تەنیا هەندێك شوێن نەبێت، دوای بوومەلەرزەش دروستکردنەوەی خانووەکە ئاسانتر دەبوو.

هێشتا نەگەیشتووینەتە نێو مێژووی سەردەمی ئەشکانییەکان و لە سەردەمی سلوکییەکانداین، بەڵام دووخاڵ سەبارەت بە ئەوان بە پێویست دەزانین کە باسی بکەین:

یەکەم ئەوەیە کە سەردەمی پاشایەتیی ئەشکی یەکەم لە پارتیا کورت بوو، ئەو لە ساڵی (٢٥٦ پ. ز) لە پارتیا هاتە سەر دەسەڵات و ئەوێی لەژێردەستی سلوکییەکان دابڕی. کەواتە کاتێك سلۆکۆسی دووەم پاشای ئێران لە ساڵی (٢٤٦پ. ز) بوو بە پاشا، دە ساڵ بەسەر

جیابوونەوەی پارتیا لە دەسەڵاتیی سلوکی و پاشایەتیی ئێران تێپەڕ ببوو، نازانرێت ئەشکی یەکەم چەند ساڵ پاشا بووە، هەندێك بە دووساڵ، هەندێك پێنج ساڵ بە و حەوت ساڵ و پتریش دیار دەکەن. بە گشتیی ماوەی پاشایەتیی دامەزرێنەری ئەشکانییەکان کورت بووە، بەڵام ئەو هەر لەو ماوە کورتەدا توانیویەتیی نیاز پاکی خۆی بۆ ئێرانییەکان دەربخات.

خاڵی دووەم ئەوەیە کە دەرکەوتنی پاشا ئەشکانییەکان هۆکاری برەودانی پیشەسازی بوو لە ئێراندا، کاتێك بگەینە سەردەمی ئەشکانییەکان باسی دەکەین. ئێستە دەڵێین کە سلۆکۆسی دووەم پاشای ئێران کە دەیەویست ئاسیای بچووك لە ئانتیۆکۆسی برای وەربگرێتەوە، لەشکرێکی بەهێزی ئامادە کرد، لە بەهاری ساڵی (٢٤٢ پ. ز) لە رێگەی ئازەربایجان بەرەو ئاسیای بچووك رۆیشت، ئانتیۆکۆسیش کە ئەوکات لە لیدی بوو، بە لەشکرێکەوە کە سەربازی ئێرانیشی تێدا بوو، بۆ جەنگی براکەی رۆیشت و لە ناوچەی ئەنگوریە کە ئێستە بە ئانکارا ناسراوە پێکگەیشتن، ماوەی پێنج رۆژ لەشکری سلۆکۆسی دووەم و لەشکری ئانتیۆکۆسی برای بەرانبەر یەك وەستان.

هەموو بەیانییەك هەردوو لەشکر، دوولای لەشکرە واتە لای راست و لای چەپ و دڵ و یەدەگیان چێ دەکرد، تا کاتی ئێوارە بەرانبەر یەك دەوەستان، هەریەکەیان چاوەڕوان بوون تا ئەویدیی هێرش بکات، ئەوکات چوونکە رۆژ دەگەیشتە شوێنێك کە ماوەی جەنگ نەدەما، هەردوولا دەکشانەوە، ئەودەمە دەگەڕانەوە ئۆردووگەی شەوی پێشتریان و سەربازەکان دەستیان دەکرد بە ئامادەکردنی خواردن. نەزانراوە بە چ هۆکارێك هەریەکە لەو دوو لەشکرە دوای ئەوەی بەرانبەر لەشکرەکەی دیکە دەوەستا، چاوەڕوانی هێرشی لایەنەکەی دیکە دەبوو.خەڵکی ئاسایی وەك ئێمە لەوانەیە وابیر بکەینەوە ئەو دوو لەشکرە لە یەکدیی ترساون، بۆیە کاتێك بەرانبەر یەك وەستاون، هیچان نەیدەوێرا هێرش بکات، هەریەکەیان چاوەڕوانی هێرشی ئەویدیی بووە، بەڵام کاتێك سەردارێك یاخۆ ئەفسەرێکی جەنگاوەر ئەو بەشەی مێژوو دەخوێنێتەوە وەك ئێمە بیر ناکاتەوە، چوونکە سەردار لە جەنگدا ناترسێت و ئەفسەرەکانیشی ناترسن، تەنانەت سەربازێکیش کە جەنگی بینی بێت لە جەنگ ناترسێت. هەر سەردارێکی جەنگی کە هێرش ناکات بۆ ئەوەیە کە سەربازەکانی کەمتر بە کوشت بدات، بۆیە هێرش ناکات تا سەربازەکانی بە رێژەیەکی زۆر نەکوژرێن. بە گریمانی زۆر ئەو رۆژانە هەریەکە لە سلۆکۆس و ئانتیۆکۆس چاوەڕوانی هێرشی ئەویدیی بووە تا زۆرتر لە بەرانبەرەکەی بکوژێت.

ڕۆژی شەشەم دوای ئەوەی لەشکرەکان ریزەکانیان بەرانبەر بە یەکدیی ڕێکخست، سلۆکۆس لە هەموو لایەکەوە واتە لای ڕاست و لای چەپ و دڵی لەشکر هێرشی کرد.

شەڕ لە ئەنگۆریە سێ ڕۆژی خایاند بێ ئەوەی هیچ لایەك ئاکامی یەکلاکەرەوەی لە جەنگ دەست بکەوێت، ئێرانییەکانی نێو لەشکری ئانتیۆکۆس بە باشی دەجەنگان، چوونکە دەیانزانی بوونی ئەوان بەستراوەتەوە بەوەی بتوانن بگەنە پشت لەشکری سلۆکۆس. لە ڕۆژی چوارەم ئانتیۆکۆس هێڵی پێشەوەی لەگەڵ دوژمندا پساند و بە سەربازەکانییەوە، لەنێویشیاندا سەربازە ئێرانییەکان، دەستیان بە پاشەکشە کردبوو.

هیچ کام لە دوو لایەنەکە نەیانتوانی لەشکری بەرانبەر شکست بدات، بەڵام چوونکە ئانتیۆکۆس پاشەکشەی کرد و گۆڕەپانی جەنگی ئەو بوو بە هی سلۆکۆس، بۆیە مێژووی کۆن سلۆکۆسی دووەمی بە سەرکەوتوو لە جەنگی ئەنگور داناوە و ئانتیۆکۆس بە لەشکرەکەیەوە بەرەو دواوە، بۆ لای ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك واتە لیدی پاشەکشەی کرد.

سلۆکۆسی دووەم دەیەویست کە بە دووی لەشکری براکەی بکەوێت، بەڵام هەر ئەو ڕۆژە پەیکێکی خێرا هات و نامەیەکی بە پەلەی بە دەستی گەیاند. کاتێك نامەکەی کردەوە زانی کە پیاوێك بە ناوی (تیری دات) لە بنەماڵەی ئەشکانی بە لەشکرێکی بەهێزەوە کە پێکهاتوو لە (پارتەکان و خاندیان) هێرشی کردووەتە سەر (هێرکانیا) واتە (گۆرگان یاخۆ ئەستەر ئاباد) داگیریانکردووە و دەیەوێت دوای ئەو شوێنە، هەموو ئەو دەڤەرانە داگیر بکات کە دەکەونە کەنارەکانی دەریای خەزەر واتە ناوچەکانی (ڕەشت و گەیلانی ئێستە) و ئەو شوێنانەش داگیر بکات.

ئەشك یاخۆ ئەرشەك خۆراسانی لەژێردەسەڵاتیی پاشا یۆنانییەکانی ئێران دابڕی، پاش ماوەیەکی کورت مرد، دوای ئەو تیری دات لە هەمان شوێن بوو بە پاشا.

تیری دات یاخۆ (تیرداد) برای ئەشکی دامەزرێنەری زنجیرەی پاشایەتیی ئەشکانییەکان بوو، لە کاتی فەرمانڕەوایی براکەی پاڵپشتی ئەو بوو، دوای مردنیشی بووە جێنشینی ئەو. تیری دات (تیری داتس بە خوێندنەوەی یۆنانی) بە ئەشکی دووەم ناسرا، ئەویش وەك براکەی، ئێرانییانی لە ڕووی داب و نەریت و ئاینەوە ئازاد کرد.

ئەوکات لە سەرووی زێی جەیحوون و لە نێوان ئەو زێە و زێی سەیحوون خێڵێکی گەورە لە ئێرانییەکان بە ناوی (خاندیان) یاخۆ (پەرنیان) دەژیان.

زانیاریمان لەبارەی هۆکاری ناساندنی ئەو خێڵە بەو ناوە نییە، لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی ناونانی نەتەوە ئێرانییەکان تا ئێستە نەکراوە، کەسانێك دەبێت ئەو کارانە ئەنجام بدەن، کە چەند زمانێکی کۆنی وەك (پەهلەوی ساسانی و پەهلەوی هەخامەنشیی و پەهلەوی ئەشکانی)، تەنانەت سانسکریتیش بزانن کە بنەچەی بەشێك لە زمانی نەتەوە هیند و ئەورووپاییەکانە.

خێڵی گەورەی خاندیان یاخۆ پرنیان لە ڕێگەی کشتووکاڵ و ئاژەڵداری خۆیان دەژیاند، ناوچەی نێوان دوو زێی سەیحون و جەیحون بە کۆششی ئەوان ببوو بە یەکێك لە ئاوەدانترین دەڤەرەیلی ئاسیا، بۆیە مێژوونووسان نووسیویانە بەهەشت لەودیو ڕووباردایە، واتە نێوان دوو زێیەکەی سەیحون و جەیحون دایە، یاخۆ یەکێك لە چوار بەهەشتەکە لەوێندەرە.

نەتەوە بیابانییەکان و نیمچە وەحشی ئەودیوی ڕووبار، کە هیرۆدۆت بە (ماساژێت یاخۆ ماساگێتی) ناساندوون، هێرشیان کردە سەر ناوچە ئاوەدان و بەپیتەکانی خێڵەکانی پەرنیان، ئەو خێڵەش کە توانای بەرگریان نەبوو، ئاژەڵەکانیان کۆکردەوە و ماڵ و زەوی خۆیان جێهێشت و بەرەو باشوور هاتن، لە ڕێگەدا بەشێکی زۆر لە ئاژەڵەکانیان مردن، بەشەکەی دیکەیان گەیاندە پارتیا و تیری دات ئەوانی حەواندەوە.

بە تەمەنەکان و ژنەکان لەو زەویانەی تیری دات بە ئەوانی بەخشی کەوتنە کشتووکاڵکردن، گەنجەکانیش هاتنە نێو لەشکری ئەو، پاشای ئەشکانی بە هۆی ڕاهێنەرانەوە، هونەرەکانی جەنگی فێرکردن، ئەوان هونەرەکانی سوارچاکی و تیرهاویشتن و قیقاج لێدان و...هتد فێر بوون.

ڕەچەڵەکی ئاریایی خاندیان یاخۆ پەرنیان لە ڕووی جەستە و ڕێکی باڵاوە جوانترین یاخۆ یەکێك لە جوانترین ڕەگەزەکانی ئاریایی بوون.

ئەشکانییەکان ئاژەڵداربوون، زۆر ڕوویان لە کشتووکاڵ نەبوو، بەڵام کۆچبەرەکانی خاندیان یاخۆ پەرنیان لە زانستەکانی کشتووکاڵ شارەزا بوون، دوای ئەوەی لە خۆراسان نیشتەجێ بوون، کشتووکاڵیان لەو ناوچەیە پەرە پێدا، شارەزایی خۆیان بەکارهێنا تا لە کێڵگەکان باخ و میوە و دانەوێڵە و سەوزەجات و...هتد باشترین جۆر بە دەست بخەن.

ڕەچەڵەکناسانی ڕۆژئاوا جووتیارانی ئێستەی خۆراسان بە جوانترین جووتیارانی کیشوەری ئاسیا دەزانن، بە تایبەتی لە باکوری ئاسیا ئەو جوانییە لە باڵای ئەوان زۆر هەستی پێ دەکرێت، تا کەسێك بەژن و باڵای جووتیاری خۆراسان و جووتیارانی دیکەی بە تایبەتی

ئەورووپایی بەرانبەر نەکات، نازانێت بۆ ڕەچەڵەکناسان باڵای ئەوانیان بە جوانترین باڵا دیار کردووە. هەندێ لە مێژوونووسان باوەڕیان وایە کە جووتیارانی ئێستەی خۆراسان پاشماوەی جووتیارانی پەرنیانن، هەندێکیشیان باوەڕیان وایە کە ئەشکانییەکان لە بنەچەدا خۆشیان لەو خێڵانەن.

ئەوکاتەی سەربازە گەنجەکانی خاندیان هاتنە نێو لەشکری تیری دات و هونەرەکانی جەنگ فێر بوون، لەو گاڤانەدا سلۆکۆسی دووەم بۆ جەنگی براکەی ئان تیۆکۆس بەرەو ئاسیای بچووك بەڕێکەوت.

تیری دات ئەو هەلەی بە سوودی خۆی قۆستەوە و بەو لەشکرەی ئامادەی کرد بوو، هێرشی کردەسەر ناوچە جەنگەڵییەکانی هێرکانیا (گۆرگان) و فەرمانڕەوا یۆنانییەکەی ئەو شوێنەی کوشت، کە لەلایەن سلۆکۆس دانرابوو، ئەو شوێنەشی خستە سەر وڵاتی پارت. فەرمانڕەوا یۆنانییەکەی ئەو شوێنە تەنیا یەك ڕۆژ توانای بەرگری هەبوو، هەر ئەو ڕۆژە کوژرا و هێرکانیا بووە بەشێك لە وڵاتەکانی ژێر دەستی تیری دات، چوونکە پاشای ئەشکانی بە ئاسانی هێرکانیای کەوتبووە بەردەست، هەوڵیدا تا وڵاتی دراوسێی ئەوێ واتە مازەندەرانیش بە خێرایی داگیر بکات، نەیدەزانی دانیشتووانی مازەندەران وەك خەڵکی دیکە نین، ئەوان هێندە بەهێزبوون کە لە هێرکانیا ئەوانیان بە (دئەوا) ناودەبرد، وشەی (دێو) لە بنەچەی ئەو وشەیەوە هاتووە.

هۆکاری ئەوەی فیردەوسی لە چیرۆکەکانی شانامەدا شوێنی نیشتەجێبوونی دێوی سپی بە مازەندەران دەزانێت، هەر ئەوەیە، ئەگەر لە ڕابردوو خەڵك هەموو دانیشتووانی ئەو شوێنەیان بە دێو ناونەبرد بێت، ئەوا هەندێکیان بەوە ناوزەد کرابوون، ناوی دێو لە سەردەمانی دواتر بووە پاشگری هەندێ لە سەرکردەکانی مازەندەران.

بە وتەی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان (دێوەکانی مازەندەران) و بە وتەی ئێمە پیاوانی ئازای مازەندەران پێشیان بە لەشکری تیری دات گرت، تیری دات زۆر هەوڵیدا مازەندەران داگیر بکات، بەڵام تەنیا توانی بەشێکی کەم لە کەنارەکانی داگیر بکات. ئەو نەیتوانی بگاتە ناوچە شاخاوییەکان و پیاوانی ئازای مازەندەران ڕێگەکانیان لێ داخستن.

تیری دات بە داگیرکردنی بەشێکی کەم لە کەنارەکان رازی بوو، زانیاریمان نییە کە تا کوێ کەوتە بەردەستی ئەو، بەڵام دانیشتووانی شاخەکانی مازەندەران هەروا ئەویان بەجێ نەهێشت، چەند جارێك لە شاخەکان هاتنە خوارێ و هێرشیان بۆ کرد.

ئەوان بۆ لایەنگری لە پاشا یۆنانییەکەی ئێران نەدەجەنگان، تەنیا نیشتمانپەروەری خۆیان رێگەی نەدەدان کە بهێڵن خەڵکی دیکە ناوچەکانیان داگیر بکەن. وێڕای ئەوەش تیری دات بەرگەی هێرشەکانی گرت و بۆ ئەوەی خەڵکە شاخاوییەکان نەتوانن ئەوان لەو شوێنە دوور بخەنەوە، هەندێ قەڵای جەنگی چێ کرد و سەربازەکانی خستە نێو قەڵاکان.

دانیشتووانی شاخەکانی مازەندەران هەوڵیاندا پێوەندیی نێوان قەڵاکان بپچڕێنن تا تیری دات نەتوانێت ئازووقەیان پێ بگەیەێت، بەڵام تیری دات بەبێ کێشە لە رێگەی دەریاوە خۆراکی دەگەیاندە سەربازەکانی نێو قەڵاکان تا وەرزی زستان گەیشت.

دانیشتووانی مازەندەران دەیانتوانی وەرزی زستان لەو خانووانەدا بمێننەوە کە لە شاخەکان هەیانبوو، بەڵام دەبووایە ئاژەڵەکانیان لە شاخ دابەزێنن و بیانهێنن بۆ لەوەڕگەکانی کەناری دەریا کە ناوچەی گەرمینی مازەندەران بوو، بۆیە وێڕای ئەوەی نەفرەتیان لە تیری دات و سەربازەکانی دەکرد، پێشنیازی ئاشتییان بۆ کرد، تیری دات پێشنیازەکەی پەسەند کردن، بەو مەرجەی باج بدەن، ئەوانیش لە ترسی لەنێوچوونی ئاژەڵەکانیان ئەو مەرجەیان پەسەند کرد.

لە وەرزی بەهار پاشا یۆنانییەکەی ئێران لە ئاسیای بچووك گەڕایەوە، ئەو پێش وەرزی بەهار گەڕابۆوە، بەڵام نەیدەتوانی پێش بەهار لەشکرکێشیی بکات.

پاشا یۆنانییەکەی ئێران پێش هاتنی بەهار دوودڵ بوو لەوەی هێرش بۆ هێرکانیا بکات یاخۆ بۆ پارتیا. ئەگەر هێرشی بۆ پارتیا کردبایە، ئەوە هێرشی بۆ ناوەندیی دەسەڵاتیی تیری دات کردبوو، بەڵام لەوێندەر تەواوی دانیشتووان لایەنگری تیری دات بوون، بۆ یارمەتی ئەو بەشدار دەبوون لە جەنگی سلۆکۆسی دووەم. ئەو وای بیردەکردەوە تیری دات لە هێرکانیا و مازەندەران لایەنگری نییە، ئەگەر هێرشی بۆ بکات، بلەز لەنێوی دەبات، بۆیە بڕیاریدا دوای هاتنی وەرزی بەهار لە هێرکانیا هێرش بکاتەسەر تیری دات.

کەسێك کە ویستبای بۆ هێرکانیای کۆن و گۆرگانی ئێستە لەشکرکێشیی بکات، لە سێ رێگەوە دەیتوانی لەشکرەکەی بگەیەنێت کە یەکەمیان لە رێگەی دەریاوە بوو، ئەو رێگەیە لە سلۆکۆسی دووەم داخرابوو، ئەو ئامرازەکانی گواستنەوەی بۆ لەشکرەکەی لە رێگەی دەریای

خەزەر بۆ هێرکانیا نەبوو. دووەمیان لە ڕێگەی پارتیا واتە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە: سلۆکۆس هێزی لە پارتیا نەبوو، بۆیە نەیدەتوانی بەو ڕێگەیەدا بڕوات بۆ هێرکانیا.

سێیەم ڕێگە ئەوەبوو کە مێژوونووسە یۆنانییەکان بە ناوی دۆڵی (پراداس) ناوی دەبەن، ئێستە بە دۆڵی (شاهروود) ناسراوە، دۆڵێکە لە نێوان شاهروود و ئەستەر ئاباد، ئەو لەشکرەی بەو دۆڵەدا ڕۆیشتبایە دەیتوانی خۆی بگەیەنێتە ڕۆژئاوای هێرکانیا. ئەو دۆڵە بەو شاخانە دەورەدراوە کە بەرزاییان زۆر نییە و لەشکر توانای پەڕینەوەی بەو ڕێگەیدا هەبوو، لە وەرزی بەهاردا ئاوی زۆر بە هۆی سەرڕێژی ڕووبارەکان لەو دۆڵەدا دەست دەکەوت. بۆیە سلۆکۆسی دووەم کە دەیەویست لەشکرەکەی لەو دۆڵەوە بباتە هێرکانیا، ناچار بوو خۆی ڕابگرێت تا ئاو کەم ببێتەوە و سەربازەکانی بە پێداویستییە جەنگییەکانیانەوە لە دۆڵەکە بپەڕنەوە. دوای ئەوەی ئاو کەم بۆوە، سلۆکۆسی دووەم لە ڕۆژی چل و پێنجەمینی بەهار، سەربازەکانی چوونە نێو دۆڵەکە و بەرەو باکور بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن.

پاشا بە ڕەچەڵەك یۆنانییەکەی ئێران سەبارەت بە لەشکرکێشیی بۆ باکور بۆ جەنگ لەگەڵ تیری دات هەڵەی کرد، ئەگەر لە جیاتی باکور بەرەو خۆراسان ڕۆیشتبایە، دەیتوانی تیری دات شکست بدات، چوونکە لەوکاتەدا کەس لە پاڵپشتەکانی تیری دات لە خۆراسان نەبوو، ئەو فەرمانڕەوایەش کە پاشای ئەشکانی دابنابوو، توانای بەرگری لە بەرانبەر سلۆکۆسی دووەمدا نەبوو.

موسی خۆرنی دەڵێت: سلۆکۆسی دووەم نەیدەزانی تیری دات لە مازەندەرانە، وایدەزانی ئەوەی هێرکانیا و مازەندەرانی داگیرکردووە، یەکێکە لە سەردارەکانی و تیری دات بۆ خۆی لە پارتیایە، بەم پێیە ڕۆیشتن بۆ پارتیا، بووە مایەی ئەوەی جەنگ لەگەڵ پاشای ئەشکانی بە سوودی خۆی تەواو نەبێت.

مێژوونووسێکی دیکەی ئەرمەنی بە ناوی (مار ئایبا کاتی نا) کە زۆر لە سەردەمی سلۆکۆسی دووەم نێزیك بووە، تەنیا نەوەد و یەك ساڵ لە دوای هاتنی تیری دات بۆ گۆرگان بووە، دەڵێت: سلۆکۆسی دووەم دەیزانی تیری دات لە باکورە، بۆیە بەرەو باکور کەوتەڕێ و مەبەستی بوو کە خودی تیری دات لەنێو ببات. ئەو دەیزانی ئەگەر تیری دات لەنێو ببات، چیدیی ئەشکانییەکان ناتوانن پارێزگاری لە پارتیا بکەن، ئەویش پارتیا دەخاتەوە سەر خاکی ئێران.

سلۆکۆسی دووەم لە ڕێگەی دەربەندی شاهرووود بەرەو باکور ڕۆیشت، لە ڕۆژی دووەم لە کاتی ڕێپێواندا، سلۆکۆسی دووەم و سەربازەکانی دووچاری باران بارینی توووند هاتن، ئەوان وایاندەزانی ئەوە تەنیا ڕشێنەیەکە و بە زوویی کۆتایی دێت، بەڵام باران تا بەرەبەری ئێوارە واتە ئەوکاتەی لەشکری سلۆکۆس بۆ پشوودان وەستان، بەردەوام بوو.

ئەو شوێنەی لەشکرەکەی لێ وەستا، گوندێکی بچووك هەبوو، سلۆکۆسی دووەم و چەند کەسێك لە سەردارەکانی چوونە ماڵەکانی گوندەکە، سەربازەکان ناچاربوون لەنێو ئەو خێوەتانەدا بمێننەوە کە بەردەوام دڵۆپەی ئاویان لێدەهات.

پێش ئەوەی سەربازەکان بۆ پشووی شەوانە خێوەتگەی خۆیان دامەزرێنن، ئەو ڕووبارەی بە دۆڵەکەدا دەهات پڕ بوو لە ئاو، ئەوکاتەی سەربازەکان بۆ پشوو وەستان، ئاو تەواوی دۆڵەکەی داگیرکرد، سەربازەکانیش دەیانزانی ئاو پتر دەبێت، بۆیە خێوەتەکانیان لە بناری گردەکاندا هەڵدا.

دۆڵی شاهرووود جگە لەوەی زۆر پێچ و سووڕانەوەی هەیە، دۆڵێکە لە باکور بۆ باشوور دەڕوات، کاتێك سەربازەکان بۆ پشوودان چادرەکانیان هەڵدا، چوونکە نەیاندەتوانی هەموویان خێوەت لە یەك لای دۆڵەکە هەڵبدەن، لە هەردوولا و لە دامێنی گردەکان هەڵیان دان.

دوای ئەوەی کەمێك لە شەو ڕۆیشت، ئاو هێندە زیادی کرد کە ئەو بەشەی لەشکر کە لە دامێنی گردەکانی ڕۆژهەڵات بوون لە ئەوانی دیکە دابڕان، تەنانەت بە سواری ئەسپیش نەیاندەتوانی لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە، چوونکە گووشاری ئاو ئەسپەکانی دەبرد. هەوا سارد بوو، بەڵام گردەکان لە هەردوولا داری زۆریان لێبوو، سەربازەکان هەرچەندی ویستبایان دەیانتوانی دار ببڕن بۆ ئاگرکردنەوە. ئاگرکردنەوە لەژێر باران ئەستەم بوو، تەنیا دەتوانرا لەنێو خێوەتەکاندا ئاگر بکەنەوە، بەهۆی گەورەیی دارەکانیش بۆ کردنەوەی ئاگر لەنێو خێوەتەکان دووچاری گرفت دەهاتن، چوونکە بەو شەوە نەیاندەتوانی قەدی دارەکان پارچە پارچە بکەن.

باران تا نێزیك بەرەبەیان بەردەوام بوو، دواجار وێستا، هەورەکان پەرش و بڵاوبوون، ئەستێرەکان دەرکەوتن، سەربازەکان کە تا ئەوکات تەنانەت لەنێو خێوەتەکانیان بە دەست سەرماوە هەراسان بوون و دەیانناڵاند، لە دەرەوەی خێوەتەکانیان بە قەدی دارەکان ئاگری گەورەیان کردەوە، ئاگرەکان هێندە بە گڕ و تین بوون، کە زوو پۆشاکی سەربازان و خێوەتەکانیان وشك کردەوە.

کاتێك ڕۆژ داهات، ئاو هێشتا زۆر بوو، کە ئەو بەشەی لەشکری سلۆکۆس کە لەوبەری دۆڵەکە بوون نەیاندەتوانی لە ئاو بپەڕنەوە بۆ لاکەی دیکە، جووڵەی لەشکری سلۆکۆس بە هۆی زۆری ئاوەکە لە توانادا نەبوو، چوونکە ئەوان دەبووایە بە ڕێڕەوی ئاودا بەرەو باکور بڕۆن، تا سەرکێشی ئاو نەنیشتبایەوە، ڕێگەیان نەدەبۆوە و نەیاندەتوانی بەردەوام بن لە ڕێگە بڕین.

ماوەی دوو شەو و دوو ڕۆژ لەشکری سلۆکۆس لەو شوێنە مانەوە، بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەم کاتێك ئاو کەم بۆوە و زانیان کە دەکارن بە نێو ئاوەکەدا بڕۆن، لەشکری سلۆکۆس کەوتنەڕێ و نێزیك نیوەڕۆ ئاوی ڕووبارەکە گەیشتەوە باری ئاسایی خۆی، واتە ئاوەکە گەیشتەوە ئەو ئاستەی لە کاتی هاتن لەشکری سلۆکۆس بۆ ئەو دۆڵە هەیبوو. لە ڕێگەی سەربازەکانی سلۆکۆس و لەنێو هەردوو لای دۆڵەکەدا توو بە ڕادەی زۆر هەبوو، سەربازەکان هەرچەندی ویستبایان دەیانخوارد یاخۆ لەو توورەگانەیان دەکرد کە لایان بوو تا لەکاتی پشوودا بیانخۆن، لەو گەشتەدا سلۆکۆس و یاوەرەکانی بۆیان دەرکەوت کە دۆڵی شاهروود یەکێکە لەو شوێنانەی زۆرترین تووی لێیە.

ئەو ناوچەیەی سلۆکۆس و سەربازەکانی پیایدا دەڕۆیشتن، ناوچەیەکی هاوینەهەوار بوو، لە ڕۆژی پەنجا و دووەمی بەهاردا، کاتێك سەربازەکان لە خەو هەستان، ڕێپیێشاندەرەکان بە سلۆکۆسیان وت ئەمڕۆ دوارۆژە لەو ناوچەیە بن، لە ڕۆژی دواترەوە دەکەوینە ناوچەی گەرم و زستانە هەوار.

هەندێ لە سەربازەکانی سلۆکۆس سوارە و هەندێکیان پیادە و پێداویستییە جەنگییەکانی ئەو سەردەمیان دەگواستەوە، هەوا نەگەرم بوو، نە سارد، هەتاو لە ئاسمانێکی ڤالاّ لە هەور بەسەر ئەو دۆڵەدا دەدرەوشایەوە، جارجارێك یەکێك لە سەربازە یۆنانییەکان گۆرانییەکی دەچڕی، دوای ئەوەی لە شاخدا دەنگی دەدایەوە لە چەند لایەکەوە وەلاّمی دەدرایەوە.

لەپڕ لەسەر گردەکانی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاواوە بەرد و کەڤران بەسەر سەربازەکانی سلۆکۆسدا باراندرا، بەردەکان گەلەك مەزن بوون کە دوای بەرکەوتنیان بە سەربازەکان، یاخۆ دەیانکوشت یان بە سەختی برینداریانی دەکرد و توانای هەستانەوە و جووڵەی لێ دەستاندن.

کاتێك سەربازەکان لە سەرووی گردەکانیان ڕووانی، بینیان کە لەسەر گردەکان هەندێ پیاو وێستاون کە ریش و پرچیان درێژە و هەریەکەیان بەردەقانییەکی لە دەست دایە کە بنکەکەی گەورەیە، چوونکە دەیانتوانی بەردی گەورەیان پێ ڕاوەشێنن، ئەگەر بەردەقانییەکان بچووك بوونایە توانای هەڵدانی بەردی گەورەیان نەدەبوو.

ئەفسەرە یۆنانییەکان فەرمانیان بە سەربازەکان کرد تا بە تیر لەو کەسانە بدەن و ڕێگەیان نەدەن بەردبارانیان بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی تیرەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوەی گرد دەڕۆیشتن، کاریگەرییان لەسەر بەردبارانی ئەوان نەبوو، ئەوان بێ پسانەوە بەردی گەورە و بچووکیان بۆ سەربازەکان هەڵدەدا، لەگەڵ بەرکەوتنی هەر بەردێك سەربازێکی پیادە یاخۆ سوارە دەکەوت. سەربازەکانی سلۆکۆس نەیاندەتوانی نە بۆ پێشەوە بڕۆن، نە بگەڕێنەوە، بۆیە بۆ هەر لایەك جووڵەیان دەکرد، هەر ببوونە ئامانجی بەردەکان.

سلۆکۆسی دووەم فەرمانیدا لە هەر دوو لاوە هێرش بکەنە سەر گردەکان، ئەو پیاوانە لەنێو ببەن، چوونکە تەنیا بە هێرشکردن بۆیان دەتوانرا لە مەترسی ئەوان بپارێزرێن. سەربازەکان بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی پاشا لە هەردوو لاوە پێشوازییان لە بەردەکان کرد و هێرشیان برد، بەڵام کاتێك گەیشتنە سەر گردەکان پیاوەکان دیار نەمابوون.

سلۆکۆسی دووەم دوای ئەوەی هەواڵی دیار نەمانی ئەو پیاوانەی بیست، پرسیاری لە ڕێپیشاندەرەکان کرد: مادام ئێوە شارەزان، ئایا ئەو پیاوانە چوونە کوێ؟.

ئەوان وتیان: ئەوانە دێو بوون و دێوەکان دەتوانن ون ببن.

سلۆکۆسی دووەم وتی: بۆ ئەوانە مرۆڤ نین؟.

ڕێ پیشاندەرەکان وتیان: مرۆڤن، بەڵام لە جۆری تایبەت کە لەپڕ دەردەکەون، هەر بە هەمان شێوەش ون دەبن و کەس نازانێت لە کوێ دێن و بۆ کوێ دەچن!.

سلۆکۆس فەرمانی بە ئەفسەرەکانی کرد تا پشت گردەکان بگەڕێن و پیاوە ریشدارەکان بدۆزنەوە و بیانگرن، ونبوونی ئەوان ئەوە نیشان دەدات، کە لە پشت گردەکان هەندێ شوێن هەیە، کە ئەوان دەکارن خۆیانی تێدا حەشار بدەن. ئەفسەرەکان و سەربازەکان ڕۆیشتن، هێندەی توانایان هەبوو، پشت گردەکان گەڕان و دێوەکانیان نەدۆزییەوە، نە شوێنێکیانیش بینی کە مرۆڤ بتوانێت خۆی تێدا بشارێتەوە.

هێرشی پیاوە ریشدارە دێوەکان، بە وتەی ڕێپێشاندەرەکان، ڕۆیشتنی لەشکرەکەی نارێك ناتەکووز کرد، بەڵام دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، سەربازەکان دەستیان بە جووڵە کرد، لاشەی کوژراوەکانیان لەژێر بەردە گەورەکان ناشت و بریندارەکانیان لەگەڵ خۆیاندا برد تا چارەسەریان بکەن و کەوتنەوە ڕێ.

سلۆکۆسی دووەم بە پەنجا هەزار سەربازی سوارە و پیادەوە بۆ جەنگی تیری دات دەڕۆیشت، ئەو لەشکرە ڕێچکەیەکی ڕێکی بە درێژایی نۆ کیلۆمەتر لەو نێو دۆڵەدا پێکهێنا بوو، هیچ یەکێك لە سەردارەکان توانای بینینی تەواوی لەشکرەکەیان نەبوو، بۆیە هەر ئەفسەرێك مەودایەکی کورتی لە کاروانەکەی ڕێبەری دەکرد، کاتێك لەشکر بەڕێکەوتەوە، دێوەکان لە شوێنێکی دیکەوە کەوتنە بەردبارانکردنیان، ژمارەیەکی دیکەیان کوشت و بریندار کرد. دیسان فەرماندەیی لەشکر کە لەو شوێنە ئامادە بوون، فەرمانی هێرشیاندا، دیسان کاتێك گەیشتنە سەر گردەکان، دێوەکان دیار نەمابوون.

ناونیشانی دێو لەنێو پەڕتووکی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان هەیە، لە پەڕتووکی مێژوونووسە یۆنانی و ڕۆمییەکان نووسیویانە بەربەرەکان بەردیان بەسەر سەربازەکانی سلۆکۆسدا دەباراند. لە پەڕتووکی ئەرمەنییەکان ناوی دێو بەرانبەر بە ریش و پرچە درێژەکانیانەوە، گومانمان نییە کە ئەو پێناسەیە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لە سەردەمی سلۆکۆس و پێشینەکانی، پیاوان دەبووایە ریش و سمێڵیان بتاشن و پرچیان وەك یۆنانییەکان کورت بکەنەوە، چوونکە پیاوان چیدیی وەك سەردەمی هەخامەنشییەکان ریش و پرچی درێژیان نەبوو، هەبوونی ریش و پرچی درێژ بۆتە کارێکی نائاسایی و زۆر سەرەنجی ئەوانی دیکەی بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە، چوونکە ناوی خەڵکی مازەندەرانیش (دئەوا) بووە، وشەی دێوی لێ وەرگیراوە، لە هزری خەڵکی ئەوسادا دێو واتای پیاوێکە ریشن و پرچن بووە، ئەو وێنەیە بەم شێوەیە لە مێژوودا ماوەتەوە.

ئەو ڕۆژە تا شەو جەنگاوەرە مازەندەرانییەکان ماوە ماوە بەردیان بەسەر سەربازانی سلۆکۆسدا دەباراند، هەر کە سەربازەکان هەوڵی هێرشیان بۆ دەدان، هەڵدەهاتن و دیار نەدەمان. بەم شێوەیە سلۆکۆس ئەو ڕۆژە نەیتوانی ئەو دۆڵە ببڕێت و لە شەوی پەنجا و سێیەمی بەهار لەو دۆڵە مایەوە.

# کۆتایی دەسەڵاتیی یۆنانییەکان لە ئێران

پێش ئەوەی دنیا تاریك ببێت، ئاسمان بە هەور داپۆشرا، سلۆکۆس جارێکی دیکە لافاوی لەو دۆڵەدا بینی بوو، لەشکرەکەی لە داوێنی گردەکان دانا تا دیسان دەرگیری لافاو نەبنەوە. ئەو شەوە چەند جارێك باران باری، بەڵام بەو رێژەیە نەبوو کە ئاوی ڕووبارەکە لافاوی لیَ بکەوێتەوە.

بەیانی رۆژی پەنجا و سێیەمی بەهار، کاتێك هەتاو درەوشایەوە، سەربازەکان خێوەتەکانیان کۆکردەوە و بەڕێ کەوتن. ئەو رۆژە دەبووایە لەشکری سلۆکۆس لە پێچەکانی (بافت) سەربکەون، دوای سەرکەوتن دەگەیشتنە لووتکەی شاخ و لە خوار خۆیانەوە دەریای کاسپین (خەزەر)یان دەبینی و دەگەیشتنە دەڤەرە زستانە هەوارەکەی مازەندەران، هەر ئەو شوێنەی تیری داتی لیَ بوو.

سەربازانی سلۆکۆس گەیشتنە شوێنێك کە دۆڵی شاهروود تەواو دەبوو، لۆفەکانی (بافت) دەستی پیَ دەکرد، لەوانەیە واتای لۆفە بۆ هەندیَ کەس ڕوون بێت، چوونکە ئێستە چیتر ئەو لۆفانە نەماون، ئەگەر کەسێك بەو دۆڵی شاهروودا بڕوات تا لۆفەکانی بافت ببینێت، چوونکە لەو ملە شاخەی شوێنی لۆفەکان بوو، ڕێگەیەکی خۆشی چەو و خیزەڵێن هەیە، ئەو لۆفانە نابینن تا بزانن ڕەوشی لەشکری سلۆکۆس چۆن بووە، لە کاتێکدا ئەو لۆفانە تا سەرەتاکانی سەدەی ڕابردووش هەبوون، ئەوکات رۆیشتنی گەشتیاران بەو شوێنەدا بچووکترین جیاوازیی لەگەڵ کاتی رۆیشتنی سەربازەکانی سلۆکۆسی دووەم لە (٢٤١ — ٢٤٠ پ. ز) نەبووە.

ئەو ملە شاخە برێتی بوون لە ڕێگەیەکی وەك ڕێڕەوی مار واتە لوول و پێچەڵ پێچ لە دامێنی شاخ دەستیان پیَ دەکرد و سەردەکەوتن، ئەو کەسەی سەردەکەوت بەردەوام دۆڵەکەی لە لای ڕاستی خۆی واتە لە رۆژهەڵات دەبینی، شاخەکەش لە رۆژئاوای بوو. بەرینی ڕێگەی یافت بە بەراورد لەگەڵ شوێنە شاخاوییەکانی دیکە باش بوو، چوونکە دوو سوار پێکەوە توانای تێپەڕبوونیان دەبوو.

هەر کەس ئەو ڕێگەیەی دیبایە دەیزانی لەلایەن مرۆڤەوە چیَ کراوە، بزنەڕیَ یاخۆ ئەو ڕێیەی ئاژەڵ بە تێپەڕبوونی ساڵان دروستی دەکات، هێندە بەرین نابێت. وێڕای ئەوەی دەزانرا

مرۆڤ دروستی کردووە، بەڵام نەدەزانرا کەی دروست کراوە. پێچەکانی یافت بەرەبەرە لە دامێنی شاخەوە دەسووڕانەوە، ئەو ڕێبوارانەی پیایدا دەڕۆیشتن، وردە وردە لە لووتکەی شاخێکی هەزار مەتری بەرز سەردەکەوتن.

کاتێك سەربازەکانی سلۆکۆس یەك بەش لە سێ بەشی شاخیان بڕی، لەسەر شاخەکەوە واتە لە ڕۆژئاواوە بەردیان بەسەردا باری، کاتێك ڕووانیان، بینیان هەر ئەو کەسانەن کە ڕۆژانی پێشتر بەردیان بەسەردا باراندون، ئێستە لەسەر شاخەکەن.

ئەوان نەیاندەزانی دێوەکان چۆن چوونە سەر شاخ، چوونکە وایاندەزانی تاکە ڕێگە بۆ سەرکەوتن لە شاخ ئەو ڕێگەیە کە خۆیان پیایدا دەڕۆن، نەیاندەزانی ڕێگەیەکی دیکە لە دامێنی ڕۆژئاوای شاخەکە هەیە، بەڵام ڕێگەی دەستکردی مرۆڤ نییە و بزنەڕێیە، کە بە هۆی ڕۆیشتنی ئاژەڵە کێوییەکان لە ساڵانی زۆردا دروست بووە، بەڵام هیچ سوارکارێك ناتوانێت لەو ڕێگەیەوە بڕوات، ڕۆیشتنی خەڵکی پیادەش تیایدا مەترسیدارە و لەوانەیە بەرببنەوە، بەڵام دانیشتووانی ناوچەکە کە ڕاهاتوون لەگەڵ ڕۆیشتن لە شاخدا دەتوانن بەو ڕێگەیەدا بڕۆن.

سەربازەکانی سلۆکۆسی دووەم بە سەختی کەوتبوونە بەرمەترسی و دێوەکان خۆیان ماندوو نەدەکرد تا بە بەردەقانی بەردیان تێ بگرن، تەنیا بەردەکانی شاخەکەیان بە سەردا دەباراندن، زەربەی هەندێك لە بەردەکان هێندە بەهێز بوو کە سواری بە ئەسپەوە لە شاخ هەڵدەدایە خوارەوە بۆ ناو دۆڵەکە.

هاواری سەربازەکان کە لە پێچەکاندا کەوتبوونە بەر هێرش، سلۆکۆسی دووەمی تێگەیاند کە هێرشیان کراوەتەسەر. لەنێو هات و هاواری سەربازەکاندا دەنگی بەردەکان و سەربازەکان دەهات کە دەکەوتنە ناو دۆڵەکەوە، وەك دەزانرێت کەوتنی بەرد لە دەڤەرە شاخاوییەکان، هەروەسا بەربوونەوەی مرۆڤ لەو بەرزاییانەوە، دەنگی تۆێنەری وەك هەورە تریشقە دەخاتەوە.

وێڕای ئەوەی سلۆکۆس دۆخی سەربازەکانی خۆی نەدەبینی کە دووچاری هێرشی دێوەکان بوونەتەوە، بەڵام لە دەنگی کەوتنی بەردەکان و هاواری سەربازەکان و ناڵەی ئەوان دەکەوتنە نێو دۆڵەکەوە، دەیزانی هێرشی ئەو ڕۆژە تووندترە لەو هێرشانەی ڕۆژی پێشتر دێوەکان کردیان.

مێژوونووسە ئەرمەنییەکان دەڵێن فەرماندەی ئەو بەشەی لەشکری سلۆکۆس کە کەوتبووە بەر هێرشی دێوەکان، ئەفسەرێکی یۆنانی بوو بە ناوی (تلادۆس) بە پەلە سەربازێکی پیادەی نارد بۆ لای سلۆکۆس و پێی ڕاگەیاند کە هێرشەکە هێندە قورسە کە ئەگەر بیانەوێت لە شاخ سەربکەون

دواکەسیان دەکوژرێت، بۆ پاراستنی گیانی سەربازەکان هیچ ڕێگەچارەی دیکە نییە جگە لە پاشەکشەکردن نەبێت.

پەیکەکە بە ڕاکردن بەرەو خوارەوەی شاخ دەهات، بلەز ڕێگەی دەبڕی، چەند خوولەکێك دوای رۆیشتنی پەیکەکە، بەردێك بەسەری تلادۆس کەوت کە زەربەکەی هێندە بەهێز بوو، کە دەستبەجێ ئەفسەرەکەی کوشت و هیچ دەنگی لێوە نەهات. کاتێك وەڵامی تلادۆس گەیشتە سلۆکۆس، ئەو زیندوو نەمابوو، وەڵامی پاشا گەیەندرایە ئەفسەرێکی دیکە و فەرمان درا تەواوی سەربازەکان بگەڕێنەوە.

ریزی درێژی سەربازان دەستی بە پاشەکشە کرد، بەڵام تا کۆتایی سەربازەکان گەیشتنە خوارەوە ژمارەیەکی دیکەیان لێ کوژران. بەو شێوەیە بە وتەی یۆنانییەکان دەستەیەك لە دڕندەکان و بە وتەی ئەرمەنەکان دەستەیەك لە دێوەکان توانیان رێگە لە پێشڕەویکردنی لەشکرێکی پەنجا هەزار کەسی بگرن، لە دوایین شوێن حەوانەوە کە دەبووایە بگەنە کەنارەکانی دەریای خەزەر، ئەوانیان گەڕاندەوە و هەندێك لە پیادە و سوارەکانی سلۆکۆسیان کوشت.

سلۆکۆسی دووەم ناچار بوو بگەڕێتەوە و رێگەی گەلی شاهروود بە پێچەوانەوە لە باکور بۆ باشوور بگرێتەبەر، بۆ ئەوەی دیسان نەکەوێتەوە بەر هێرشی دێوەکان، لە پێش و پاشی لەشکرەکەی بەردەوام لووتکەی گردەکانیان لە هەردوولای رۆژئاوا و رۆژهەڵات دەگرت. هێزێکی پێشەنگی بەهێزیش لە هەردوو لای دۆڵەکە بەردەوام بەسەر گردەکاندا دەڕۆیشت، بە هەمان شێوەش هێزێك لە دواوە ئەوکارەی دەکرد، بۆیە دێوەکان چیدیی نەیانتوانی سەربازەکانی سلۆکۆس بخەنەبەر هێرش.

سلۆکۆسی دووەم گەیشتە پراداسێن یاخۆ شاهروود، داوای لە خەڵکی ئەو دەڤەرە کرد تا رێگەیەکی دیکەی بۆ رۆیشتن بۆ مازەندەران پێ نیشان بدەن، کە دووچاری دێوەکان نەبێت.

ئەوان وتیان لێرەوە رێگەیەك بەرەو هێرکانیا دەڕوات، لەو رێگەیەدا دێوەکان نابینرێن، چوونکە ئەو رێگەیە بە هێرکانیادا دەڕوات، نەك بە مازەندەران، بەڵام لووتکەیەکی لۆفاوی بە ناوی (کۆزلووك) هەیە کە لەشکرەکەت ناتوانێت لەوێوە تێپەڕ ببێت.

رێگەیەکی دیکەیش بۆ گەیشتن بە هێرکانیا هەیەن دەبێت بەو رێگەیەدا بەرەو رۆژهەڵات بڕۆی، دوای ئەوەی چوارده فەرسەنگ واتە (٨٤ کم) بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتی، دەگەییە شوێنێك دەروازەیەك لە باکور دەردەکەوێت، دەکەوێتە نێوان دوو گرد کە بە (زێدەر) ناسراوە،

ئەگەر بەو دەروازەیەدا بڕۆی دەگەیتە هێرکانیا. دواتر ئەوە دەتوانی خۆت بگەیەنیتە کەناری دەریا، کاتێك گەیشتییە ئەو شوێنە، بە ئاسانی دەچیتە مازەندەران، لە کەناری دەریاش شاخ ناکەوێتە سەر ڕێگەت تا دێوەکان هێرشت بکەنە سەر، ئەگەر لەکەناری دەریا هێرشت بکەنە سەر بە ئاسانی دەتوانی بەرگری لە خۆت بکەی.

دوو بابەت هۆکاری ئەوە بوون کە سلۆکۆس ڕێگەی گەیشتنی خۆی بۆ مازەندەران زۆر دوور بخاتەوە، بە ڕێگەی زێدەردا بچێتە دەشتی بەرینی هێرکانیا کە دەگەیشتە سەر دەریا.

هۆکاری یەکەم هاتنی راپۆرتێك بوو لەبارەی نالەباری دۆخی سلوکییەی پایتەختەوە، ئەوەی زانی کە بوونی خۆی لەو شوێنە وا پێویست دەکات بگەڕێتەوە.

هۆکاری دووەم ئەو نەخۆشییە بوو کە لە کاتی گەڕانەوەی لە ئاسیای بچووك دووچاری ببوو، تا ئەوکات زۆر ئازاری نەبوو، بەڵام تا دەهات نەخۆشییەکە پتر تەشەنەی دەکرد، بۆیە پاشای سلوکی بە پێویستی زانی دەبێ پشوو بدات و شەڕکردن لەگەڵ باری تەندروستی ئەودا ناگونجێت.

ئەو دوو نەخۆشی هەبوو، یەکێکیان لە سینگی و ئەوی دیکەیان لە چاوەکانی بوو. مێژوونووسە ئەرمەنییەکان زانیاریی باشیان سەبارەت بە سلوکی و ئەشکانییەکان بەجێ هێشتووە، سەبارەت بە نەخۆشی سینگی سلۆکۆس هیچیان نەنووسیوە، لەبارەی نەخۆشی چاوەکانیشی چاوەڕوان نین لە پەڕتووکە کۆنەکاندا هیچ هاتبێت، چوونکە مێژوونووسە کۆنەکان تەواوی نەخۆشییەکانی چاویان بە یەك دادەنا، هەموویان بە دەردە چاو ناو دەبرد، بەڵام دەیانزانی نەخۆشییەکانی جەستە، بۆ نموونە نەخۆشی سینگ لە یەك جۆر نین، بەڵام باسیان نەکردووە کە نەخۆشی سینگی چ نەخۆشییەك بووە.

سلۆکۆس بێ ئەوەی دەستی بە تیری دات ڕابگات کە گوایە نیشانی (ئەشکی دووەم) بووبێت، گەڕایەوە، بۆیە وشەی گوایەمان بەکار هێناوە، چوونکە مێژوونووسان دڵنیا نین لەوەی تیری دات ئەشکی دووەم بوو بێت.

دوای ئەو ڕووداوە هێرکانیا بۆوە بەشێك لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتیی ئەشکانییەکان، چوونکە دێوەکان ڕێگریان کرد لە گەیشتنی سلۆکۆسی دووەم بۆ کەناری دەریای خەزەر (کاسپین) تا هێرش بکاتە سەر تیری دات، هەندێك ئەو بیرکردنەوەیان هەبووە کە ئەوان پاڵپشتی تیری داتیان کرد بێت، بۆ یارمەتی ئەو لەگەڵ سلۆکۆسی دووەم جەنگابن.

ئەو کەسانەی ئەو بیرۆکەیان لادروست بووە، وتوویانە کە دێوەکان واتە دانیشتووانی ناوچە شاخاوییەکانی ناوچەی مازەندەران لە نەتەوە ئارییاییەکان بوونە، ئەشکانییەکانیش تیرەیەك بوونە لە ئارییاییەکان یان باشتر بڵێین ئێرانی بوونە، بۆیە دێوەکان لەگەڵ ئەواندا لە دژی سلۆکۆسی دووەم کە یۆنانی بوو هاوپەیمانیان کرد.

ئەو شێوەیە لە بڕیاردان لەبارەی مێژووی کۆن پتر قووڵ نەبوونەوەیە، هەرچەندە هەموو رەگەزە سەرەکییە ئێرانییەکانی وەك (پارسەکان، مادەکان و پارتەکان یاخۆ ئەشکانییەکان) لە یەك بنەچەوە بوون، بەڵام ئەو بەسترانەوەیە هەرگیز رێگر نەبووە لە هەبوونی کێشە لە نێوانیاندا.

دانیشتووانی ناوچە شاخاوییەکانی مازەندەران رازی نەبوون بێگانە بێت و بە ناوی سەرکەوتوو ببێتە دەسەڵاتدار بەسەریانەوە، ئەوان بەگژ هەموو بێگانەیەکدا دەچوونەوە، چوونکە تیری دات دوای گۆرگان لە کەنارەکانی خەزەر گیرسایەوە و نەڕۆیشتە ناوچە شاخاوییەکان، بۆیە جەنگی ئەویان نەکرد، ئەگەر تیری دات دوای داگیرکردنی گۆرگان هاتبایە بۆ ناوچەی شاخاوی، لەگەڵیدا دەجەنگان، هەروەك لەگەڵ رۆستەمدا جەنگان، ئەو حەوت قۆناخەی فیردەوسی لە شانامەدا باسیان دەکات ئەو گرفتانەن کە ئەوان بۆ رۆستەمیان دەنایەوە، بەڵام بە گوێرەی ئەو سەرچاوانەی فیردەوسی سوودی لێ دیتن، ئەو باسانە تێکەڵ بوون بە ئەفسانە. لە قۆناخەکاندا کە باس لە دێوەکان دەکرێت، مەبەست دانیشتووانی ناوچە شاخاوییەکانی مازەندەرانە، ڕووداوەکانی شانامەی فیردەوسی لە سەردەمی ئەشکانییەکان ڕوویداوە، جگە لە چەند ڕووداوێکیان کە هی سەردەمی هەخامەنشییەکانە.

کاتێك دێوەکان بینیان سلۆکۆسی دووەم بە لەشکرێکی بەهێزەوە هاتووە تا ناوچەکەیان داگیر بکات، ناچاریان کرد بگەڕێتەوە، بێ ئەوەی خۆیان بزانن بەو گەڕانەوەیە، سەرەتاکانی لەنێوچوونی دەسەڵاتیی یۆنانی لە ئێرانیان پێکەوەنا. چوونکە لاوازی سلوکییەکان ئەوکات دەرکەوت، ئەگەر سلۆکۆس لە دۆڵی شاهروود پەڕیبایەوە و خۆی گەیاندبایە تیری دات و لەنێوی بردبایە، مێژووی ئێران بە شێوەیەکی دیکە دەگۆڕا.

تیری دات کە تا ئێستە نموونەی ئەو سککەکانی لە مۆزەخانەکانی جیهان ماون، لە پیاوە دیارەکانی مێژووی کۆنی ئێرانە، دوای کوروش و داریوش تا سەردەمی ساسانییەکان، کەسێکی گەورە و دووربینی وەك ئەو نابینرێت.

ئەو پیاوە مەزنە دوای ئەوەی دەسەڵاتیی ئێرانی بە دەستەوە گرت، نەریت و ئاینی ئەوانی ئازاد کردەوە، لە تەواوی ئێران ئاگرخانەکان داگیرسانەوە، هەموو جەژنە کۆنەکان وەك جەژنی سەری ساڵی نوێ (نەورۆز کە لە مێژوودا تا هاتنی هەخامەنشییەکان رۆژەکەی دیاری نەکرابوو) جەژنی شەدە واتە جەژنی سێ دەڕۆژ دوای دەستپێکی زستان و ڕێوڕەسمی شیوەنی سیاوەش کە هێشتا لە خۆزستان ماوە، سەرلە نوێ سەریهەڵدایەوە.

لە ڕووخانی پێرسپۆلیس بە دەست ئەسکەندەری مەکدۆنی تا ئەوکاتەی تیری دات پاشای ئەشکانی گەیشتە دەسەڵات، سەدەیەك پتر نەبوو، بەڵام ئێرانییەکان بە زمانی فارسی نەدەئاخڤین زمانیان بۆ یۆنانی گۆڕابوو، مەبەستمان ئەوە نییە کە کەس زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی یاخۆ فارسی بیر نەمابوو، هێشتا خەڵکانێك هەبوون کە لە دایك و بابیان ئەو زمانە فێر دەبوون، بەڵام ژمارەیان کەم بوو.

ئەو هەنگاوانانەی دوای گەیشتنی تیری دات بە دەسەڵات بۆ بووژاندنەوەی زمانی فارسی نرا، ئاکامی نەبوو، هەرچەندە ئەو زمانە لە قوتابخانەکان دەوترایەوە، بەڵام بە شێوەیەکی مردوو بوو، وەك ئەوەبوو کە ئێستە زمانی یۆنانی کۆن لە ئەورووپا بۆ زانا و شاعیر و ئەدیبەکان دەوترێتەوە، بۆ خەڵکی ئاسایی سوودی نەبوو.

لە سەردەمی پاشایەتیی تیری دات دا هەموو نەریتەکانی ئێرانی کۆن گەڕانەوە، جگە لە زمانەکەی. لە خۆراسانی کۆن کە گەورەتر بوو، لە خۆراسانی ئێستە بە زمانێکی ناوچەیی کە جیاوازیی هەبوو لەگەڵ زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی دەئاخڤین، دوای ئەوەی ئەشکانییەکان بوونە خاوەن دەسەڵات و فەرمانڕەوایی هەموو ئێرانیان گرتە دەست، ئەو زمانە بۆوە جێگرەوەی زمانی یۆنانی، هەر ئەو زمانەیە کە لای ئەو کەسانەی لە مێژوو دەزانن بە پەهلەوی ئەشکانی ناسرا.

هۆکاری برەوسەندنی زمانی پەهلەوی ئەشکانی لە ئێران دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی تیری دات و کەسانی ناو کۆشکی ئەو بەو زمانە دەئاخڤین، زمانی کۆشك سەرەتا دەبوو بە زمانی تەواوی ئەو کەسانەی کارمەندی حکوومەت بوون، ئەوان زمانی کۆشکیان لەنێو ماڵ و منداڵەکانیان برەو پێدەدا، ئەوی گاڤێ ئەو زمانە بە هۆی ژن و منداڵان و باوانەکانیان لەنێو خەڵکدا بڵاو

دەبۆوە و بەرەبەرە دەبوو بە زمانی هەمووان.[1] زمانی ئێران لە سەردەمی تیری دات و جێنشینەکانی بۆوە زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی.

تیری دات رێزی زۆری بۆ داریوشی گەورە هەبوو، بۆ بەرزراگرتنی ناوەکەی لە نێزیك ئەو شوێنەی شاری (ئەبیگەرد)ی ئێستەی لێیە، شارێکی دروست کرد بە ناوی (دارا) یاخۆ (داریۆم) کە هەمان وشەی داریوشی مەبەستە.

(مار ئایبا کاتی نای) مێژوونووسی ئەرمەنی لە (١٤٩ پ. ز) توانی مێژووەکەی خۆی لە چوارچێوەی پەرتووکێکدا تەواو کرد واتە (٦٢) ساڵ دوای مردنی تیری دات، بۆیە ئەو زۆر لە سەردەمی دەسەڵاتیی تیری دات نێزیك بووە و دەڵێت: شاری دارا (داریۆم) کە تیری دات دروستی کرد، پێنج فەرسەخ درێژ و پێنج فەرسەخ پان بوو، بێگومان ئەو وتەیە زێدەرۆیی زۆری تێدا کراوە، ئەوکات هۆکانی گواستنەوە برێتی بوون لە چوار پێ و ماڵات و ئەسپ و وشتر، بۆیە شارەکانیان بچووك دروست دەکرد تا خەڵك بتوانن لەنێو شار بە کاری رۆژانەیان رابگەن، لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری شاریش هاتوچۆ بکەن، شارێك درێژی و پانی سی کیلۆمەتر

---

(١) پێش ساڵی ١٢٠٠ کۆچی تەواوی خەڵکی شاری تاران پایتەختی ئێستەی ئێران بە زمانی سۆلقانی دەئاخڤین، دوای ئەوەی ئاغا محەمەد خانی قاجار ئەو شارەی کردە پایتەختی خۆی، نەیتوانی زمانی خۆی کە برێتی بوو لە تورکی شیرازی لەو شارە برەو پێبدات. ئەو دەنگی نەوی و ژنانە بوو، ئەوەندەی بۆی دەکرا قسەی نەدەکرد تا دەنگەکەی بشارێتەوە، ئەو یەکەم کەس بوو لەنێو دەسەڵاتدارانی ئێران کە لە جیاتی بانگی کارگوزارەکانی بکات، سەنجێك یاخۆ زەنگێکی لای خۆی دانابوو، ئەوکاتەی دەیویست بانگی کارگوزارەکەی بکات بە گۆچان لەو زەنگە یاخۆ سەنجەی دەکوتا، ئەویش بە بیستنی دەنگەکە دەهات. لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەودا زمانی خەڵکی تاران هەر سۆلقانی بوو، دواتر لە سەردەمی فەتحەعلی شای برازایدا کە لە ساڵی ١٢١٢ کۆچی دەستی پێکرد، بەرەبەرە زمانی تارانییەکان گۆڕا. چونکە فەتحەعلی شا بەو زمانە دەئاخڤا، کە ئێستە بە فارسی تارانی ناسراوە، بەو شێوەزارە شیعری دەووت، شاعیرەکانی دەربار و کۆشکەکەی بە هەمان شێوەزار شیعرەکانیان لە پێشگەی ئەودا دەخوێندەوە، خەڵکانی کۆشکیش بەو زمانە دەدوان. بۆیە شێوەزاری ئەو بەرەبەرە بۆوە شێوەزار و زمانی تارانییەکان، بەڵام زمانی سۆلقان و کەن بە زوویی لە ئێران لەنێونەچوو، تا سەرەتای سەدەی رابردووش لە تاران، بە تایبەتی لە گەڕەکی (چاڵە مەیدان) خەڵك پێی دەدوان، لەوانەیە بکارین بێژین تاکە بابەتی باش و بە سوود کە لەوەوە بۆ خەڵکی ئێران و تارانییەکان مایەوە شێوەزاری ئێستەی تاران بوو. "زەبیحوڵڵا"

بێت، رووپێوی دەبێتە نۆسەد کیلۆمەتری چوارگۆشە، جیهانی کۆن ڕێگەی دامەزراندنی شارێکی ئاوا گەورەی نەدەدا، دانیشتووانی جیهان هێندە زۆر نەبوون کە شاری ئاوا مەزن چێ بکەن، بەڵام مێژوونووسەکانی دیکەی ئەرمەنی لەبارەی ئەو شارە کە پاشای ئەشکانی بۆ ڕێزلێنان لە پاشای هەخامەنشیی دروستی کرد، ئەوە نیشان دەدەن ئەو شارە شارێکی گەورە بووە، ئاوی شار بە کەناڵی سەر داخراودا گواستراوەتەوە، زێراب لە شارەکەدا هەبووە، هەموو خانووەکانی ئەو شارە سیستەمی گەرمیان تێدا بووە کە دوای هاتنی عارەبان بۆ ئێران بە (بوخاری) ناسراوە.[٢]

یەکێك لە داهێنانەکانی تیری دات دانانی ڕۆژێك بوو بەناوی ڕۆژی سەربەخۆیی ئێران، بۆ یەکەمینجار لە مێژووی ئەو وڵاتەدا. لە ئێران جەژنی جۆراوجۆر هەبوون، بەڵام ئەو جەژنە هەرگیز نەبووە، تیری دات ئەو نەریتەی داهێنا، ڕۆژێکی بەناوی ڕۆژی سەربەخۆیی و ڕزگاربوونی ئێرانییەکان

(٢) دەزانین خوێندنەوەی هەندێ بابەت لەلایەن خوێنەر ناخۆشە، تەنانەت بە درۆ دەزانرێت، چونکە مێژوونووسە کۆنەکان، تەنانەت تا ئەم دواییەش هەموو نیشانەکانی پێشکەوتنیان دەگەڕاندەوە بۆ ئەورووپا، بەڵام ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، کە شاری دارا و شارەکانی دیکەی ناوچە ساردەکان، خانووەکانیان سیستەمی گەرمی ناوەندی هەبوو، بریتی بوو لە ئەمبارێك کە ئاو لە نێویدا گەرم دەکرا و بە هۆی هەندێ بۆڕییەوە دەگوازرایەوە بۆ ژوورەکان تا لە زستاندا گەرم بن. گەشتیار و لێکۆڵەری بەریتانی (سێر چارلزمەك گریگۆر) کە لە ساڵی (١٨٧١ ز) گەشتی بۆ ئێران کردووە، گەشتنامەکەی ماوە، لە شاری قۆچان کە ئەوکات لە شارە بچووکەکانی خۆراسان بوو، هەندێ خانووی بینیون کە لە وەرزی زستان بە بۆڕی هەڵم گەرم دەکران.
وەك زانراویشە دەوڵەمەندەکان لە ماڵەکانیان ئامێری فێنککەرەوەیان هەبووە، مێژوونووسە کۆن و نوێیەکان ئەو ڕاستییەیان باس کردووە و وتوویانە هەر خانوویەك، یەکێك یاخۆ دوو ژووری گەورەی هەبووە، کە دیوارەکانی بە شێوەی هێڵەگ و کون کون بوون، کونەکان بە گیا دادەپۆشران و گەنجینەیەکی ئاو دەخرایە سەربانی ژوورەکە، بە لانی کەم بەشی سێ ڕۆژی دەکرد، ئاوەکەی بە سەر گیاکاندا دەهاتە خوارەوە و تەڕی دەکردن. کاتێك هەوا بەنێو گیاکاندا هاتوچۆی دەکرد، هەوایەکی فێنك و بۆن خۆش دەهاتە ژوورەوە. پزیشك و شاعیری سەردەمی سەفەوییەکان (حەکیم شەفایی) لە پەڕتووکەکەیدا نووسیویەتی: "ئەوکاتەی لە شووشتەر بووم، ڕۆژانە لەو ژوورانەدا پشووم دەدا، کە دیواریان کون کون بوو، هەرچەندە مانگی تەمووز بوو، گەرمترین ڕۆژەکانی ساڵ بوو، شووشتەریش گەرمێن بوو، لە کاتی نووستن خۆم دادەپۆشی، بە هۆی ئەو هەوا ساردەی لە نێو گیاکانەوە دەهات بە بێ پێخەف نەمدەتوانی بخەوم. "زەبیحوڵڵا"

لە دەست یۆنانییەکان دیاری کرد، ئێرانییەکان لە ناخەوە ئەو رۆژەیان دەکردە جەژن، چوونکە بیریان نەچوو بۆوە کە لە دەسەڵاتیی یۆنانییەکاندا ئاین و نەریت و پۆشاکیان لەنێو چووبوو.

لە رۆژی جەژنی نەتەوەییدا کە بە داخەوە کاتەکەی نازانین، پیاوانی ئێران ریشە درێژەکانیان لوول دەکرد، ئەوانەی دەوڵەمەندبوون وەك نەریتی سەردەمی هەخامەنشییەکان بە زێڕ و خشڵ ریشەکانیان دەڕازاندەوە، ژن و پیاو، گەورە و بچووك هێندەیان بۆنی خۆش لە خۆیان دەدا کە لە هەر شوێنێك کە چەند کەسێکی لێبووایە، بۆن هەموو لایەکی دەگرتەوە.

لە رۆژی جەژنی سەربەخۆیی ئێراندا لەلایەن گەورە و دەوڵەمەندەکان خووانی خواردەمەنی جۆراوجۆر دادەنرا، لە هەموو ئاگرخانەکاندا خەڵك نزا و تکای دەکرد، لەنێو نەتەوەکانی ئەوکات، یەکەم نەتەوە کە رۆژێکی بە ناوی رۆژی سەربەخۆیی دیار کرد، گەلانی ئێران بوون، داهێنانی تیری دات بوو کە سی و حەوتساڵ لە ئێران پاشایەتیی کرد. جێنشینەکانی ئەو واتە ئەشکانییەکان بۆ ماوەی چوار سەدە رۆژی سەربەخۆییان دەکردە جەژن. لێتۆژ و مێژوونووسی فەرەنسی (ژاك دۆ مۆرگان) باوەڕی وایە یەکەمین رۆژی پایز، رۆژی جەژنی سەربەخۆیی بووە.

* * *

تا پێش دەسەڵاتیی ئەشکانییەکان، بابەتی تۆرانییەکان تەنیا بە شێوەیەکی لاوەکی هاتووە، لە سەردەمی ئەشکانییەکان بابەتی تۆرانییەکان و ڕووداوەکانی تایبەت بە ئەوان دێتە ناو مێژوو، هەروەها دێتە ناو ئەفسانە و چیرۆکەکان، لە پەڕتووکەکاندا جێی باس دەبێت. ئەو پەڕتووکانە لە سەدەی چوارەمی کۆچی دەکەوێتە دەست لادێییەکی زانای خۆراسانی کە تا ئەم دواییانەش هاوشێوەی هەبوو، ئەویش فیردەوسی بوو کە تۆران و پاشا و ڕووداوەکانیانی هێنایە ناو شانامەکەی.

ئەو بابەتە لە مێژووی ئێراندا زۆر گرینگە، کە ئایا مێژووی ڕاستەقینەی ئێران ئەوەیە کە لە مێژووە یۆنانی و رۆمی و ئەرمەنی و سریانییەکاندا دەخوێندرێتەوە؟! و هەندێ لە پەڕتووکە ئێرانییەکانیش پاڵپشتی ئەوانن، یاخۆ مێژووی راستەقینەی ئێران ئەوەیە کە لە

شانامەی فیردەوسیدا هاتووە و ناوی پاشا و پاڵەوانەکان لە ڕووی زمانەوانییەوە گۆڕاوە بۆ نموونە کوروش گۆڕاوە بە کەیخەسرەو؟

خاڵێك کە پێویستە بڵێین فیردەوسی لە گێڕانەوەی ئەفسانەکانی پێوەست بە مێژووی ئێران زۆر ڕاستگۆ و دەستپاك بووە، هەندێ لەو ئەفسانانەی کە بە ڕوونی بەشێکن لە مێژوو، بە هەمان شێوە گێڕاوەتەوە کە وەری گرتوون، هیچی لە خۆیەوە نەخستووەتە سەری و لێی کەم نەکردووەتەوە، چوونکە وا باوە کە هەندێ ڕووداو لەنێو شانامە هەبووە، لە ئێستەدا نەماوە.

دەستپاکی فیردەوسی لە گێڕانەوەی ئەو بابەتانەی لە پێشینیانی وەرگرتووە، لە شانامەدا بە رادەیەك بووە، تەنانەت لە گێڕانەوەی ئەو بابەتانە کە لەگەڵ ئەقڵدا کۆك نین، خۆی نەپاراستووە و خوێنەر بە ئاسانی تێدەگات کە ئەو زانا خۆراسانییە نەیتوانیوە ئەو بابەتانە باوەڕ پێ بکات، بەڵام چوونکە خۆی بە بەرپرس زانیوە بەرانبەر بە دەستپاکی، هەمووی وەك خۆی باس کردووەتەوە، بوونی ئەو باسانەی لەگەڵ ئەقڵدا ناگونجێن لە بایەخی شانامە کەم ناکەنەوە، لە پەڕتووکی پاڵەوانە کۆنەکانی نەتەوەکانی دیکەدا لەو جۆرە ئەفسانانە بوونیان هەیە.

لە شانامەی فیردەوسی کە تەنیا یەك یاخۆ دوو ڕووداوی نەبێت، بە دڵنیاییەوە تەواوی ڕووداوەکانی لە سەردەمی ئەشکانییەکان ڕوویانداوە، هەندێ بابەت هەیە کە لەگەڵ جوگرافیای سنوورەکەش کۆك نییە، وەك ئەوەی ماوەی شەش مانگ بە ڕۆژ و شەو لە دەریادا ڕۆیشتوون تا بگەنە ئەو شوێنە، لە کاتێکدا کە تەنیا چەند ڕۆژێك بۆ ئەو سەفەرە بەس بووە، جاری واش هەیە کە باکور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە شوێنی خۆیان نین و...هتد. ئەوانە تەنیا کێماسیی نین کە لە شانامەی فیردەوسیدا هەبن و لە داستانی پاڵەوانەکانی هەموو دنیادا هاتوون.

هەرچییەك هەبێت ئێمە تا ئەو ڕۆژەی پشتڕاست نەکرێتەوە کە مێژووی ئێران هەمان ئەوەیە کە لە شانامەدا هاتووە، سەبارەت بە تۆران و پاشاکانی سەردەمی ئەشکانی خۆمان پابەند دەکەین بەو بابەتانەی لە پەڕتووکی مێژوونووسە ئەرمەنییەکاندا هاتووە، هەندێك لە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان زۆرتر لە خەڵکی دیکە سەبارەت بە ڕووداوەکانی سەردەمی ئەشکانییەکان بابەتیان نووسیوە، هەندێکیشیان هاوسەردەم بوونە لەگەڵ ئەشکانییەکان و لە هەمان سەردەم هاتوونەتە دنیاوە، گەورەبوونە و کۆچی دواییان کردووە.

لەوانەیە ئەو پرسیارە بێتە پێشەوە کە ئایا پشت بەستن بە نووسینی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان سەبارەت بە ئەشکانییەکان، جێگەی بڕوایە یان نا؟.

لە وەڵامدا دەوترێت کاتێك سەرچاوەکان تەنیا ئەوانە بن، ناچارین سوودیان لیّ وەربگرین، لە لایەکی دیکە گومانمان نییە هەندێ لە مێژوونووسە یۆنانییەکان بەرانبەر بە ئێران و ئێرانییەکان نیازیان باش نەبووە، هەرچەندە سوودمان لە پەڕتووکەکانیان وەرگرتووە، کەواتە بۆ سوود لە پەڕتووکی ئەرمەنییەکان وەرنەگرین. بە سەرەنجدان لەوەی هەندێ لە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان پیاوانی زیرەك و زانا بوونە، ئاستی تێگەیشتنیان زۆر بەرزتر بووە لە ئاستی تێگەیشتنی سەردەمەکەیان. بۆ نموونە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان دوو هەزار ساڵ پێش ئەوەی لێتۆژان بیانەوێت لە رەگەزی ئەوان بکۆڵنەوە، زانیبوویان ئەوان و ئێرانییەکان یەك رەگەزن.

هەر ئەو مێژوونووسانە باوەڕیان وابووە کە تۆرانییەکان تیرەیەك لە ئێرانییەکان بوون، گەورەکانیان سواری فیل و کەرگەدەن دەبوون و سواربوونی فیل دەکرێت پەسەند بکرێت، بەڵام سواربوونی کەرگەدەن مایەی پەسەند بوون نییە، چوونکە ئەو ئاژەڵە ناتوانرێت ماڵی بکرێت و لە ئاژەڵە گەورەکانی ناوچەی گەرمێندا لە کەرگەدەن دڕندەتری تێدا نییە. وێڕای ئەوەش ئێمە ئەوب ابەتە بە تەواوەتی رەت ناکەینەوە، لەوانەیە لە رابردوودا ئەوان رێگەیان بۆ ماڵی کردنی ئەوان دۆزیبێتەوە و ئێستە ئەو رێگەیەیان بیر چووبێتەوە، بە هەمان شێواز کە لە ئێرانی کۆندا سوود وەردەگیرا لە جۆرێك لە کەڵە کێوی کە گەورەتر بوو لە کەڵە کێوییەکانی ئێستە، بە ئەسپی کێوی دەناسرا، بۆ بارهەڵگرتن و سوارکاری بەکار دەبران، بەڵام ئێستە کەس ناتوانێت ئەو کارە بکات. لە شانامە باس لە سوود وەرگرتنی تۆرانییەکان لە کەرگەدەن ناکات، دەوترێت کە سواری فیل دەبوون.

لەبارەی ئەو باسەی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان لەبارەی تۆرانییەکان وتوویانە و ئەوەی فیردەوسی وتوویەتی چەند جیاوازییەك هەیە:

یەکەم ئەوەیە کە فیردەوسی تۆرانییەکان بە رەچەڵەکی جیا لە رەچەڵەکە ئێرانییەکان دەزانێت، بیّ ئەوەی کە جیاوازییەکە زۆر بێت، بۆیە پاڵەوانە ئێرانییەکان دەکەونە ئەڤینی کچە تۆرانییەکان و کچە شازادەکانی تۆران دەکەوتنە ئەڤینی شازادە ئێرانییەکان، ئەگەر جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دوو رەچەڵەکەکە هەبووایە وەك جیاوازیی لە نێوان رەگەزی رەشپێست و سپیپێست یاخۆ وەك ئەوەی جیاوازی لە نێوان رەگەزی سپی و زەرددا هەیە، ئەوا

ئەو خۆشەویستییانە نەدەهاتنە کایەوە یاخۆ بە کەمی ڕوویان دەدا. لە شانامەی فیردەوسی تۆرانییەکان هەندێکات لە ڕۆژهەڵاتی ئێران بوونە، هەندێ کاتی دیکە لە باکور.

دەکرێت گریمانی ئەوە بکرێت کە تۆرانییەکان لە ڕۆژهەڵات بوونە، هەندێکاتیش بەرەو باکور ڕۆیشتون و هێرشیان بۆ ئێران کردووە، بەڵام بە وتەی مێژوونووسە ئەرمەنەکان ئەوان بەردەوام لە ڕۆژهەڵات بوونە، هەر کات جەنگ لە نێوان پاشا ئەشکانی و تۆرانییەکان بووبێت، گۆڕەپانی جەنگ لە ڕۆژهەڵات واتە ئەفغانستان و پاکستانی ئێستە بووە، تەنانەت کشمیریش کە لە شانامەی فیردەوسیشدا ناوی وەك گۆڕەپانی جەنگ باس کراوە.

جیاوازییەکی دیکە لەبارەی بورجە گەڕۆکەکان بووە، بە ڕای مێژوونووسە ئەرمەنییەکان، تۆرانییەکان لە جەنگەکاندا زۆر سوودیان لێ وەرگرتوون، یەکێکیش لە چەکە کاریگەرەکانیان بورجەکان بوونە.

لە کاتێکدا ئەشکانییەکان لەو سەردەمەدا زۆرتر لە جەنگی تۆرانییەکاندا بوونە، زۆر هۆگری بورجی گەڕۆك نەبوونە، زۆرتر سوودیان لە گالیسکەی جەنگی بینیوە. لە شانامەی فیردەوسیدا هیچ باس لەو بورجانە ناکرێت. بەڵگەنامە مێژووییەکان ئەوە نیشان دەدەن کە لە ئێرانیش بورجی گەڕۆك دروست کراوە، هەر ئەو بورجانەن کە هاتوونەتە نێو یاری شەترەنج و لە لایەکەوە بۆ لایەکی دیکە جووڵەیان پێ دەکرێت.

مێژوونووسە ئەرمەنییەکان چێکردنی ئەو بورجانە بە داهێنانی تۆرانییەکان دەزانن، ئەگەر وا بێت ئێرانییەکان ئەو داهێنانەیان لەوانەوە وەرگرتووە، گومانمان نییە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان ئەو بورجانە هەبوون، بەڵام چوونکە جووڵاندنی ئەو بورجانە زەحمەتی زۆری هەبوون، بۆیە کەمتر لە مەیدانی جەنگدا سوودیان لێ بینراوە.

جەنگەکانی ئێران و تۆران کە بەپێی بیرکردنەوەی ئێمە تەنیا ئەفسانەن، پێویستە وەك ئەفسانە و داستانی نەتەوەیی سەرەنجیان لێ بدرێت، یەکێك لە ڕووداوە مێژووییە ڕاستەقینەکانی مێژووی ئێرانە، کە بە داخەوە تا ئێستە هیچ لێکۆڵینەوەیان لە بارەوە نەکراوە، مخابن تا ئێستە هیچ بەڵگە و شوێنەوارێکی ئەو جەنگە سێ سەدەییەمان بەردەست نییە، نەزانراوە لەو ماوەیەدا چ ڕوویداوە، کاریگەریی ئەو جەنگانە لەسەر ئابووری و کۆمەڵگەی ئێران چ بووە و هۆکارەکانی جەنگەکەش چ بوونە؟!.

گێڕانەوەی مێژوونووسان، جەنگی نێوان ئێران و تۆران لە سەردەمی ئەشکانییەکان بە سێ سەد ساڵ دیاری دەکەن، لە شانامەدا ماوەی جەنگی ئێران و تۆران دیار نەکراوە، بەڵام لە ڕێگەی سەردەمی ژیانی پاشا و پاڵەوانان دەتوانین بزانین کە ئەو ماوەیە دوو سەد تا دوو سەد و پەنجا ساڵ بووە، جیاوازیی زۆری لەگەڵ گێڕانەوەی مێژوونووسەکاندا نییە.

ئێرانناسی ئەورووپایی (سیلۆستر دۆ سانتی) کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا ئاماژی بە جەنگە درێژخایەنەکانی ئێران و تۆران داوە، لە بەڵگەنامە سانسکریتییەکان هەندێ شت هەن پێویستە چاویان پێدا بخشێنرێتەوە. ژان دۆ مۆرگانی فەرەنسیش هەر بڕوای وایە لە بەڵگەنامەکانی سانسکریتدا هەندێ بابەت لە باسی ئەو جەنگانەمان دەست دەکەوێت، بۆ زانینی ئەو جەنگانە، دوو کاری بە ئەرکی سەرەکیی خۆمان دەزانین:

یەکەم خوێندنەوەی سەرچاوە ئەرمەنییەکان کە هەندێکیان وەرنەگێڕدراون بۆ هیچ زمانێك.

دووەم کۆڵینکاریە لەنێو خاکی تۆران، کە کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی ئێران، واتە نیوەی باشووری ئەفغانستان و بەشێك لەو ناوچانەی کە ئێستە باکوری ڕۆژئاوای پاکستان و بلوچستانی پاکستانە.

ئەو زانایە گریمانی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر ئەو کۆڵینکارییانە بکات، لەوانەیە بگاتە هەندێ بەڵگەنامەی مێژوویی سەبارەت بە جەنگەکانی ئێران و تۆران، بەڵام ئەو گریمان و بیرۆکەیە تەنیا بیرۆکەیەکە نێزیك ئەستەم، چوونکە هەرچەندە شوێنی پایتەختەکانی تۆرانییەکان دیارن، بەڵام کەس نازانێت کوێ شانسی دەست کەوتنی بەڵگەنامە مێژووییەکانی تێدا پترە تا کۆڵینکاری لێ ئەنجام بدرێت.

ئەزموون دەری خستووە کۆڵینکاری شوێنەوارەکان کاری تاکە کەسێك نییە، تەنانەت ئەگەر سەرمایەداریش بێت، پێویستە دامەزراوەیەکی زانستی یاخۆ مۆزەخانەیەکی بە توانا کە ئەویش هەر دامەزراوەی زانستیی و مێژووییە، هۆگریان هەبێت بۆ هەڵکەندنی شوێنێك و بودجەیەك بۆ ماوەی چەند ساڵ بۆ ئەو کارە بڕیار لێ بدەن تا چەند کەسێکی پسپۆر لەو بوارە لەو ناوچە دیاریکراوە دەست بە کۆڵینکاری بکەن، هەڵبەت ئەگەر دەوڵەتەکان خۆیان ئەو کارە بە ئەستۆ بگرن باشترە، چوونکە توانامەندتر و پێداویستییان زۆرترە. سەبارەت بە کۆڵینکاری لە تۆران کە دەکەوێتە دەرەوەی ئێران، هیچ گریمانێك لەو گریواتانە نییە.

ژاك دۆ مۆرگان پاڵپشت بەو کەتیبەیەی لە سەدەی نۆزدەیەم لەلایەن لێکۆڵەرێکی بەریتانی لە تۆران دۆزرایەوە، زمانی خەڵکی کۆنی تۆران بە یەکێك لە زمانە ئێرانییەکان دەناسێت، بەڵام لە شانامەدا زمانی تۆرانییەکان بە تورکی دیار کراوە.

فیردەوسی ناڵێت کە ئەوان بە تورکی دوواون، بەڵام هەندێك جار ئەوان بە تورکەکان ناو دەبات، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە زمانی ئەوان تورکی بووە، لە کەس شاراوە نییە، کاتێك فیردەوسی ناوی تورکەکان دەبات، مەبەستی ئەو نەتەوانە نین کە بە زمانی تورکی دەئاخڤن (وەك ئەوەی ئێستە لە تورکیا قسەی پێ دەکرێت)، مەبەست لە رەچەڵەکەکەیانە کە مەغۆلین و بەسەر چەند تیرەیەك دابەش دەبن

بۆ ئەوەی دەستپاکی فیردەوسی لە گێڕانەوەی ئەو جەنگانەی نێوان تۆران و ئێران ئاشکرا بکەین، هەرچەندە فیردەوسی زۆر پێوەست بووە بە ئێران و ئێرانی بوون، بەڵام لە هیچ یەکێك لەو بەشانەی کە باسی ئەو جەنگانە دەکات بە هیچ شێوەیەك تەنانەت بە پلاریش، سووکایەتیی بە رەچەڵەکی مەغۆل ناکات، لە پەڕتووکەکەیدا هیچ خاڵێك لەو بارەوە نابینرێت.

لە ڕووی باڵا و جوانییەوە لە چیرۆکەکانی شانامەدا تۆرانی و ئێرانییەکان هێندە لەیەکدیی نێزیك بوون کە ئەڤین لە نێوان پاڵەوانانی ئێرانی و کچانی تۆرانی و کچە شازادەکانی تۆران و شازادە ئێرانییەکان دەهاتەکایەوە، ئێستە دەڵێین فیردەوسی تۆرانییەکانی لە رەچەڵەکی مەغۆل ناسیوە، ئایا لە نێوان ئەو دوو بابەتەدا ناکۆکیی نابینرێت؟

لە راستیدا تێگەیشتنی ئێستەی ئێمە لە چیرۆکەکانی شانامە بەو شێوەیەیە، ئەو شاعیرە گەورە و پاکە بۆ ئەوەی دەستپاکی بپارێزێت، گێڕانەوەکانی بە هەمان شێوە کردووەتە هۆنراوە کە وەریگرتووە.

ئەو سەردەمەی فیردەوسی لە خۆراسان شانامەی دەهۆنییەوە، سەردەمی درەوشاوەی زانست و ئەدەبی خۆراسان بوو، هەندێك لە زانا و شاعیرە دیارەکانی خۆراسان کە خودی فیردەوسیش یەکێك بوو لە ئەوان، ناویان لە جیهاندا دەرکەوت. فیردەوسی وێڕای باڵادەستی لە ئەدەبیاتدا، بە زانا هەژمار دەکرا، پیاوێکی وەك ئەو، گێڕانەوەیەکی پەسەند نەدەکرد کە لەگەڵ ئەقڵ کۆك نەبووایە یاخۆ ڕاستییە جوگرافییەکانی تێدا رەچاو نەکرابێت.

تۆرانییەکان ماوەی سێ سەد ساڵ لەگەڵ ئەشکانییەکان جەونگان، ماوەی جەنگەکانیان سەد و هەشتا ساڵ پترە لە ماوەی جەنگەکانی ساسانی و رۆمەکان، سەدەیەکیش پتر بوو لە جەنگی خاچهەڵگران.

ئەو جەنگانە بەردەوام نەبوون، هەندێجار نەدەمان، هەروەك جەنگەکانی ساسانی و رۆمەکان بەردەوام نەبوون، بگرە وێستانیان تێدا هەبوو. هیچ سەردەمێك لە مێژووی ئێران شوێنەوارێکی گەورەی بەو ڕادەیەیان لە پاڵەوانبازییەکانی ئێران تێدا نییە، لە هیچ سەردەمێکیدا پاڵەوانە ئێرانییەکان کاری ئازایانەی وەك سەردەمی جەنگی ئەشکانی و تۆرانییەکانیان نەکرد، هەروەها پاڵەوانانی سەردەمەکانی دیکە نەیانتوانی وەك پاڵەوانەکانی ئەوکات جێگەی خۆیان لەنێو دڵی خەڵکی ئێراندا بکەنەوە، ئەو قۆناخەش سێ سەدەییە پێویستە لە ڕووی مێژووییەوە زیندوو بکرێتەوە، چوونکە لە بواری نەتەوەیی و پاڵەوانبازی زیندووە.

پاشای گەورەی ئەشکانی تیری دات (تیرداد) ناسراو بە (ئەشکی دووەم) دوای سی و پێنج ساڵ فەرمانڕەوایی، بە هۆی پیری و بێ توانایی مرد، (ئارتابانووس) یاخۆ (ئەردەوان) کە کوڕی بوو لە جیاتی بوو بە پاشا.

دەستپێکی دەسەڵاتیی ئەو هاوسەردەم بوو لەگەڵ دەستپێکی پاشایەتیی (ئان تیۆکۆسی سێیەم) پاشای سلووکی کە ماوەی سی و هەشت ساڵ بەردەوام بوو، پاشایەکی بەهێز و گەورەی سلوکی بوو.

ئەگەر ئان تیۆکۆسی سێیەم تەمەنی درێژ بووایە، لەوانەبوو زنجیرەی پاشایەتیی ئەشکانی لە سەردەمی ئارتابانووس لەنێو بچوبایە، چوونکە ئەو لە ڕووی سەربازییەوە زۆر پێگەیشتوتر بوو لە ئەسکەندەری مەکدۆنی، بێگومان لە سەردارە مەزنەکانی جیهان بوو.

ئان تیۆکۆسی سێیەم وەك پاشاکانی دیکەی سلووکی زۆر ئازاری ئێرانییەکانیدا، بەڵام ناکرێت پێگەیشتوویی سەربازی و پاوانخوازی ئەو لەبیر بکەین. ئەگەر ئەو لە دوای جەنگی شاخی ڕامیان دەستی بە بادەنووشی نەکردبایە و شەو و رۆژانی خۆی بەو کارە و هەندێ نەریتی دیکەی نەشیاو نەبردبایەتە سەر، کە ئەوکات لەنێو یۆنانییەکان هەبوون، تەمەنی بە بێ سوودی نەدەڕۆیشت، دوور بوو کە ئارتابانووس ناسراو بە ئەشکی دووەم بکارێت لە بەرانبەر ئەودا خۆڕاگری بکات.

مێژوونووسە کۆنەکان ئانتیۆکۆسی سێیەمیان بە (ئەماگنووس) واتە (مەزن) ناوبردووە، ئەو تا پێش ئەو کاتەی ببێتە بادەنووش، بۆ ئەو نازناوە شیاو بوو، چوونکە سەردارێکی مەزن بوو، ئەو کاتەی ئەو لە سوریا بوو، ئەشکی سێیەم بۆ بەرفرەوانکردنی سنووری دەسەڵاتەکەی، خۆی گەیاندە نێو ڕۆژئاوای ئێران و ناوچە شاخاوییەکانی پارێزگای کرماشانی داگیرکرد، دواتر هەوڵیدا تا (پس کوە و پشت کوە) واتە لووڕستانی ئەمڕۆ داگیر بکات.

ئانتیۆکۆسی سێیەم لە سوریا زانیاریی سنووربەزاندنی پاشای ئەشکانی و هاتنی بۆ لووڕستانی پێگەیشت، بۆ هەر زوو لەشکرەکەی خۆی بە کەشتیی لە ڕووباری فورات پەڕاندەوە. مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە ئانتیۆکۆس دوو هەزار کەشتیی بۆ پەڕاندنەوەی لەشکرەکەی لە فورات بەرەو باشوور بەکار هێناوە کە زێدەڕۆیی تێدایە.

مێژوونووسانی ئەرمەنی نووسیویانە کە لەشکری ئانتیۆکۆسی سێیەم لە کاتی پەڕینەوە لە فورات سەد هەزار کەس بووە، بەڵام هیچ شتێکیان لەبارەی ژمارەی کەشتییەکانەوە نەنووسیوە، کەشتییەکان هێندەی توانیان بەرەو باشوور ڕۆیشتن، ئانتیۆکۆسی سێیەم لە ڕووبارەکە پەڕییەوە و کاتێك زانی کەشتییەکان توانای ڕۆیشتنیان نەماوە، لەشکرەکەی خۆی دابەزاند و بەرەو ناوچەی زاگرۆس واتە لووڕستان ڕۆیشت.

شاخەکانی زاگرۆس چەند دەربەندێکیان بەرەو ڕۆژئاوا هەبوو، یەکێك لەو دەربەندانە بە (زید) ناسرابوو کە ئێستە نازانرێت لە کوێیە، بە گریمانی زۆر لە ڕێبازی یەکێك لەو زیلانە بووە کە لە شاخەکانی زاگرۆسەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆن، چوونکە لە ڕۆژئاوای شاخەکانی زاگرۆس، جگە لەوە هیچ دەربەندێك نییە، لەوانەیە لە هەندێ شوێنەوە چەند ڕێبوارێك پێکەوە توانای پەڕینەوەیان هەبێت، بەڵام لەشکر تەنیا لە ڕێگەی ڕێبازی ڕووبارەکەوە توانای چوونیان بۆ ناوچە شاخاوییەکان دەبێت، ئەوەش لەو وەرزانەی ئاوی ڕووبارەکان کەم نەبن.

کاتێك ئانتیۆکۆسی سێیەم گەیشتە ئەو ناوچە شاخاوییانە، پاشای ئەشکانی لەو ناوچەیە دەرچوو بوو، دواتریش کارامسین یاخۆ کرماشانیشی بەجێ هێشت و ڕێگەی ڕۆژهەڵاتی گرتەبەر تا خۆی بگەیەنێتە گۆرگان و خۆراسان، ئانتیۆکۆسی پاشای سلوکیش بەدووی کەوت.

ئەو ڕێگەیەی هەر دوو پاشا پێیدا دەڕۆیشتن، هەر ئەو ڕێگەیەیە کە ئێستە لە کرماشانەوە دەچێتە تاران، لە تارانیشەوە بۆ گۆرگان و خۆراسان، تاکە جیاوازیی ئەوەبوو کە ئەو ڕێگەیە لە سەدەکانی سێیەم و دووەمی پێش زاین بە تەواوەتی سەوزایی بوو، لەو ڕێگەیەی هەردوو پاشای

ئەشکانی و سلوکیدا زەوی وشك بوونی نەبوو، جگە لە جەنگەڵ و لەوەڕگە زیاتر، هیچ شتێك نەدەبینرا.

مێژوونووسی ئەرمەنی (مارئابیا کاتی تا) کە بۆ خۆی بە رێگەی (رێی) واتە ناوچەی تارانی ئێستەدا رۆیشتووە، ناوی هەندێ لە ئاوابیەکانی ئەو ناوچەیە دێنێت کە ئێستەش هەندێکیان ماون. ئێستە لە نێوان ئەو ئاوابیانەدا، جگە لە زەوی بەیار هیچی دیکە نابینرێت، بەڵام مێژوونووسی ئەرمەنی هەموو ئەو زەوییانەی ناوچەی تارانی ئێستە، تا دەگەیشتە گۆرگان لە کاتێکدا بینیوە کە بە لەوەڕگە و جەنگەڵ داپۆشرا بوون.

ئەشکی دووەم دوای گەیشتنی بە ناوچەی هێرکانیا، لەوێندەر نەگیرسایەوە و رێگەی خۆراسانی گرتەبەر، بە وتەی مێژوونووسەکان گەیشتە ناوچەی لابۆس و ئەو ناوچەیە هەمان ئەو شوێنەیە کە ئێستە بە (رامیان) ناو دەبرێت، لە دوا خاڵی باشووری رۆژهەڵاتی ناوچەی گۆرگانە، چوونکە ئاووهەوای ئێران لە رابردوودا شێدار بووە، ئێستە گۆڕاوە، دۆخی ناوچەی لابۆسی یۆنان و رامیانی ئێرانیش گۆڕاون، ئەو ناوچەیە لە سەدەکانی سێیەم و دووەمی پێش زاین یەکێك بووە لە ناوچە بەپیت و سەوزەکانی ئێران.

رامیان ناوچەیەکی شاخاوییە، بەڵام وشك و برینگ نییە، بە درێژایی ساڵ پاوان بۆ ئالیکی مەڕ و ماڵات و ئەسپەکان هەبوو، ئەوکاتەی پاوانەکان لە شاخەکان کۆتاییان دەهات، ئاژەڵەکانیان بەرەو بەرزاییەکان دەبردن. هەرچەندە لە سەدەکانی باستان لە ناوچەی ڕامیان ئاو زۆربوو، بەڵام جووتیارانی ئەو ناوچەیە زەوییەکانیان ئاو نەدەدا، ئەو بابەتەشمان لەو مێژوونووسە ئەرمەنییە وەرگرتووە، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باران بارین، تەنانەت لە وەرزی هاوینیشدا چەند رۆژ جارێك لەو ناوچەیە باران باریوە، بارانەکان هێندە بە رێکی باریون کە جووتیارانی رامیان زانیویانە لە هەر وەرزێك و بۆ نموونە لە هاویندا چەند جار باران دەبارێت و مەودای نێوانیان چەندە.

هەموو جۆرەکانی بەرهەمە هاوینە و زستانییەکان بە رێژەی زۆر بەرهەم دەهاتن، جووتیارانی رامیان تەنانەت بەرهەمە هاوینییەکانیان ئاو نەدەدا، بە شێوازە سەرەتاییەکان گەنم، جۆ، گاوەرس و ئێسپرز واتە وێنجەیان بە بێ ئاودان بەرهەم دەهێنا، ئەوان لە دامێنی شاخەکان زەوییەکانیان دەکێڵا، گەنم و جۆ و گاوەرسیان دەچاند، لە وەرزی دروێنەشدا بێ ئەوەی بۆ ئاودانی دانەوێڵەکانیان خۆیان ماندوو کردبێت، بەرهەمیان هەڵدەگرتەوە. گاوەرس

دانەوێڵەیەك بوو، لە گەنم و هەرزن گەورەتر بوو، دوای ئەوەی دەیانکردە ئارد، لەگەڵ ئاردی گەنم تێکەڵیان دەکرد تا نانەکەیان بەتامتر و بەهێزتر ببێت.

بە هۆی ئەوەی لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا گەرمێن و کوێستانی هەبوو، بە یەکێك لەو ناوچانە دادەنرا کە ئەسپی لێ بەخێو دەکرا، بە وتەی مێژوونووسان یەکێك لە نساکانی ئێران بووە.

دوای هاتنی ئیسلام ناوچەکانی پەروەردەکردنی ئەسپ ناویان گۆڕا بە (داغگاه) هێشتا یەکێك لەو شوێنانە ناوەکەی ماوە بە (داغستان) ناسراوە، هەندێك کەس دەبێژن ئەو وشەیە رەچەڵەکی تورکی هەیە، (داغ) واتای (شاخ) دەدات، داغستان بە هەمان واتای (کوێستان) دێت.

ئەشکی سێیەم کاتێك گەیشتە رامیان، ئەو ناوچەیە بە رادەیەك سەرەنجی راکێشا بڕیاریدا چەند رۆژێك لەوێندەر بمێنێتەوە، بیری نەدەکردەوە کە ئانتیۆکۆسی سێیەم تا ئەو شوێنە بەدووی بکەوێت و هێندە لە سلوکییەی پایتەختی خۆی دوور بکەوێتەوە.

ئانتیۆکۆسی سێیەم پازدە رۆژ دوای ئەوەی پاشای ئەشکانی گەیشت بۆوە ئەو ناوچەیە، گەیشتە ئەوێ، تێگەیشت کە ناوچەی رامیان بە پیتە و بۆ پەروەردەکردنی ئەسپ زۆر باشە. لە رۆژهەڵاتی رامیان دۆڵێك هەبوو کە ڕووبارێکی بەنێودا تێدەپەڕی، ئەوانەی ویستبایان لە رامیان بەرەو پارتیا و خۆراسانی ئێستە بڕۆن، دەبووایە بەو دۆڵەدا بڕۆن کە بە دۆڵی رامیان ناودەبرا.

لە هەردوولای دۆڵەکە و لە دامێنی شاخەکاندا گوندەکان تێکەڵ بە یەکدیی دەبوونەوە، لادێییەکان دامێنی شاخەکان تا سەر ڕووبارەکان دادەچاند، چوونکە ئەو دۆڵە رێگەی سەر خۆراسان بوو، ئانتیۆکۆسی سێیەم دەیزانی ئەشکی سێیەم بۆ پاشەکشە دەبێت بەو رێگەیەدا بڕوات، بۆیە بەشی رۆژهەڵاتی دۆڵەکەی داگیرکرد تا رێگەی پاشەکشەی ئەشکی سێیەم بگرێت، ئەوکات بەشی سەرەکیی لەشکرەکەی برد و هێرشی کردە سەر رامیان.

ئەشکی سێیەم چاوەڕوان نەبوو کە ئانتیۆکۆس تا ئەو شوێنە بەدووی بکەوێت، بۆیە داوای لە خەڵکی ناوچەکە کرد یارمەتی بدەن.

جووتیار و خاوەن ئاژەڵەکانی رامیان نەفرەتیان لە پاشای سلوکی دەکرد بە هۆی ئەوەی دژی ئاین و زمانی ئەوان بوو، بەڵام تا ئەوکات ئەوان نەخرابوونە نێو شەڕ.

لە مێژووی ئێراندا پارێزراوبوونی ناوچەی رامیان لە جەنگ تا ئەوکات، یەکێك لە کارە سەرسووڕهێنەر و نائاسایییەکان بوو. لەوانەیە ناوچە بەپیت و پڕ ئاوەکان بە هۆی بوونیان لە نێوان دۆڵەکان لە هێرشە گەورەکان پارێزراو بووبن، رامیان لە شوێنێك بوو کە هێرشبەران پێیدا تێپەڕ نەدەبوون، بۆیە هەرچەندە زۆر بە پیت بوو، بەڵام نەکەوتبووە بەر هێرشی هیچ هێرشبەرێك، دانیشتووانی رامیان وێڕای ئەوەی نەفرەتیان لە یۆنانییەکان دەکرد، بەڵام چوونکە تا ئەوکات هێرشیان بۆ نەکرابوو، ئارەزوویان بۆ جەنگ نەبوو، ئامادەیشیان نەبوو.

ئەشکی سێیەم لە رێگەی سەردارەکانییەوە بە خەڵکی رامیانی ڕاگەیاند کە ئەگەر بیانەویت زەویوزار و ئاژەڵەکانیان بپارێزن، پێویستە لەگەڵ پاشای سلووکی بجەنگن و پاشەکشەی پێ بکەن، بە پێچەوانەوە ئەو ئێوە دەکوژێت و ئەوەی هەتانە تاڵانی دەکات.

هەروەهاش بوو، پاشای سلوکی بە هیوای دەستکەوت و تاڵان، سەرباز و ئەفسەرەکانی گەیاندبووە رامیان، پێیانی وتبوو ئەگەر بەسەر ئەشکی سێیەمدا سەربکەون، هەموو بوونی ئەشك و لەشکرەکەی و خەڵکی رامیان بۆ ئەوان دەبێت. خەڵکی رامیان تێگەیشتن کە وتەکانی ئەشکی سێیەم ڕاستن، ئەگەر بەرگری نەکەن، نەتەنیا دەکوژرێن، بگرە دوای مردنیشیان سەرمایە و بوونیان دەبێتە هی سەربازانی سلووکی و بۆ هاوسەر و منداڵەکانیان نامێنێتەوە، چوونکە پیاوانی رامیان لەبارەی جەنگیان نەدەزانی، ئەشکی سێیەم هەندێ لە ئەفسەر و سەربازە کۆنەکانی خۆی راسپارد تا راهێنانی جەنگی بە پیاوانی رامیان بکەن.

هەموو ئەو ڕێڕەوانەی لەوانەبوو ئانتیۆکۆسی سێیەم پێیاندا هێرش بکات، بە هاوکاری دانیشتووانی رامیان داخرا، لە پشت هەموویانەوە شوورە و دیواری بەردین چێکران، تەنیا ئەو رێگەیانە نەگیران کە ئاویان پێدا دەهات، چوونکە ئەگەر ئەو رێگەیانەیان گرتبایە کە ئاویان پێدا دەهات، لە بەشێك لە رامیان ئاو زیادی دەکرد و گوند و خانوو و کێڵگەکانی ژێر ئاو دەکەوتن.

بەرگری لە ناوچەی رامیان لەلایەن لەشکرێکی بەهێز هیچ گرفتی نەبوو، چوونکە هەموو ئامرازەکانی خۆراگری ئەو سەردەمەی لێ هەبوو، ئەگەر لەشکرێکی هێرشبەر بۆ ماوەی دە ساڵ گەمارۆی دابووایە، دانیشتووانی ئەو ناوچەیە دووچاری کەمی خۆراك و پێداویستییەکان نەدەبوونەوە، بەردەوام لە پێویستی خۆیان پتریان هەبوو، بەڵام ئەشکی سێیەم وەك بابی واتە (تیری دات یا تیرداد) نەبوو، هێرشی ئەو بۆ سنووری دەسەڵاتیی پاشای سلوکی بە نەزانانە دادەنرا.

لەوانەیە پرسیار بکرێت ئایا لە لەشکری ئەودا سەربازی پارتیا نەبوون، ئایا ئەوانیش وەك ئەشکی سێیەم بیٚ توانا بوون. وەڵامیش ئەوەیە کە لە هەر لەشکرێکدا سەرچاوەی داهێنان و توانا و خۆڕاگری، سەرکردەکەیەتیی، ئەگەر سەرکردە دوور بێت لە توانا و داهێنان و خۆڕاگری، سەربازە ئازاکانی هیچیان پیٚ ناکرێت.

وێڕای ئەوەش لە رامیان سەردارەکانی لەشکری ئەشکانی زۆر کاریگەر بوون، پێشنیاز و بیرۆکەکانیان بووە رێگر لەوەی پاشای بیٚ توانای ئەشکانی لە بەرانبەر سلۆکۆسدا خۆ بەدەستەوە بدات یاخۆ رێگەی هەڵاتن بگرێتەبەر، هەر ئەوان بوون کە پاشای ئەشکانیان هاندا تا یارمەتی لە خەڵکی ناوچەکە وەربگرێت و بە یارمەتی ئەفسەر و سەربازە کۆنەکانی شمشێر بداتە دەست ئەو خەڵکەی تا ئەوکات بێڵیان بەدەست بوو، لە جووتکردن زیاتر هیچیان نەدەزانی، ئەوانیان هانیاندا تا لە ئەسپەکانی رامیان سوود وەربگرێت بۆ پێکەوەنان و دروستکردنی دەستەی ئەسپسوار نویٚ.

هەندیٚ کات ئانتیۆکۆسی سێیەم لە داگیرکردنی بەشێك لە رامیان سەرکەوتوو دەبوو، بەڵام لەشکری ئەشکی سێیەم بە هاوکاری خەڵکی دەڤەرەکە شوێنەکانیان دەگرتەوە، جەنگی هەردوو پاشای سلوکی و ئەشکانی لە دوا مانگی هاوین دەستی پێکرد، تا هاوینی دواتری خایاند.

تەنانەت بارینی بەفر لە ناوچە کوێستانییەکانی رامیان نەیتوانی رێگر بێت لە گەمارۆی رامیان، مەبەستی پاشای سلوکی لەنێوبردنی پاشای ئەشکانی بوو بە تاوانی هێرشکردن بۆ سەر وڵاتەکەی.

سەرەنجام ئەشکی سێیەم پێشنیازی ئاشتی کرد، ئانتیۆکۆس مەرجی بژاردنەوەی تێچووی لەشکرکێشیی و زیانی کوژرانی سەربازەکانی وەك مەرج دانا و وتی: من جەنگم هەڵ نەگیرساندووە، ئەشکی سێیەم هەنگاوی بۆ جەنگ ناوە و هێرشی کردووەتە سەر وڵاتەکەم و ناچار بە لەشکرکێشیی کردم.

چەند نوێنەرێك لە هەردوو لایەن بۆ گفتوگۆ لەبارەی سزاکان دەست نیشان کران.

پاشای سلوکی بۆ کۆتایی هێنان بە جەنگ و کشانەوە بۆ سنوورەکانی پێش جەنگ، داوای سیٚ هەزار تالاَن زێڕ و بیست هەزار ئەسپی کرد.

ئەشکی سێیەم وتی لە تەواوی وڵاتەکەی سێ هەزار تالان زێڕ دەست ناکەوێت، لە لایەکی دیکە پاشای سلوکی گەیشتووەتە هەر شوێنێك لە وڵاتی ئەشکانییەکان، تاڵانی کردووە، هەرچی دانیشتووان هەیانبووە داگیری کردووە، بۆیە لە بەرانبەر لەشکرکێشییەکەی ئەگەر سوودی نەبووبێت، زیانی پێ نەگەیشتووە.

ئانتیۆکۆس وتی تەواوی ئەوەی بۆتە تالانی بۆ سەرباز و ئەفسەرەکانی بووە، هیچی بۆ ئەو نەبووە، بە هۆی تێچووی لەشکرکێشیی کە تا گەڕانەوەی بۆ سلۆکۆسی پایتەخت بەردەوام دەبێت، دووچاری زیانی زۆر دەبێتەوە، پێویستە ئەشکی سێیەم قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە. دوای ماوەیەك لە گفتوگۆی نێوان نوێنەرانی هەردوولا، پەیمانی ئاشتییان بە دوو زمانی یۆنانی و پارتی نووسی کە بریتی بوو لە:

١) سنووری دوو پاشایەتیی سلوکی و ئەشکانی هەمان سنووری پێشوو دەبێت، وڵاتەکانی پارتیا و هیرکانیا و گدرۆزیا (بلوچستان) هی ئەشکی سێیەم و وڵاتەکانی دیکە هی ئانتیۆکۆسی سێیەم دەبن.

٢) ئەشکی سێیەم بەڵێن دەدات کە خۆی و پاشاکانی دوای ئەو هێرش نەکەنە سەر سنووری ئانتیۆکۆس و پاشاکانی دوای ئەو.

٣) ئەشکی سێیەم بۆ قەرەبووکردنەوەی ئانتیۆکۆس بەرانبەر بە تێچووی لەشکرکێشیی و لەنێوچوونی سەربازەکانی، هەزار تالان زێڕ و پێنج هەزار ئەسپ دەداتە ئانتیۆکۆس، ئەویش پێویستە دوای وەرگرتنی قەرەبووکانی، لەشکرەکەی بگەڕێنێتەوە.

ئەشکی سێیەم قەرەبووکردنەوەکەی پەسەند کرد، هەزار تالان زێڕ و پێنج هەزار ئەسپی بەخشی و لەشکری ئانتیۆکۆسیش گەڕایەوە.

هەندێك دەڵێن ئانتیۆکۆسی سێیەم لە کاتی گەمارۆی رامیان ئالودەی خواردنەوەی شەراب بوو، دوای گەمارۆکە، خواردنەوەی شەرابی پتر کرد تا بەو هۆیەوە وەك ئەسکەندەر لە گەنجیدا مرد. هەندێکی دیکە دەڵێن پاشای سلوکی بە هۆی سەرکەوتنی بەسەر پاشای ئەشکانیدا، دووچاری لووت بەرزی بوو، بادە نۆشی هەڵبژارد، هێندەی خوو پێوەگرت تا بە هۆیەوە مرد. رایەکی دیکە هەیە دەبێژێت شەرابە باشەکانی کاسپیەن و پاشای سلووکیان لەگەڵ خواردنەوە راهێنا، ئەو پێش ئەوەی لە رێگەی کاسپیەن و ئەو رێگەیەوە بڕوات بۆ ڕامیان و شەڕ لەگەڵ ئەشکی سێیەم بکات، لە شەرابەکانی ئەو ناوچانەی نەخوارد بۆوە و تام و خۆشی ئەوانی نەدەزانی، لەو گەشتەیدا ئاشنا بوو بە

تامی ئەو شەرابانە و نەیتوانی وازیان لێ بهێنێت، گێڕانەوە مێژوویەکان نیشانیانداوە کە شەرابی کاسپیەن و ڕێی لە دوو سەدە پێش زاین ناوبانگیان هەبووە.

ئانتیۆکۆس پاشای سلوکی لە دوا ساڵەکانی تەمەنی کەوتە چاوچنۆکی بۆ پێکەوەنانی سەرمایە. (بەل) یاخۆ (بەعل) خوداوەندی ئەو بەشەی خەڵکی ئیلام بوو، کە مەزداپەرست نەبوون، پەیکەرەکەی لە زێڕ دروست کرا بوو، بۆیە بڕیاریدا تا پەیکەرەکە بهێنێت و بیتوێنێتەوە و بە ناوی خۆی سککەی لێ بدات و لە گەنجینەی هەڵ بگرێت، بۆیە پەیامی بۆ سەرۆکی زانا ئاینییەکانی پەرستگەی بەعل نارد کە ئەگەر هەندێ کەس بۆ بردنی پەیکەری بەعل چوونە پەرستگەکەی، ڕێگریان نەکات، سەرۆکی زاناکانی پەرستگەکە پرسیاری لە نێردراوەکە کرد کە پەیامی پاشای هێنا بوو، بۆچی پاشا دەیەوێت خودای ئێمە لە پەرستگە بباتە دەرێ؟.

نێردراوەکە وتی کە مەبەستی پاشا نازانێت، تەنیا پێیان وتووە کە بە سەرۆکی پەرستگە بڵێت ئەگەر هاتن تا پەیکەرەکە بەن، ڕێگری نەکات.

بۆیە سەرۆکی پەرستگەکە لە ڕێگەی کاهینەکانەوە بە خەڵکی ڕاگەیاند کە ئانتیۆکۆس دەیەوێت خوداوەندی ئەوان لە پەرستگەکە بباتە دەرێ، ئەمەش بە هەر مەبەستێك بێت، دژی ئاینی ئەوانە و نابێت دەرفەت بدەن کە خوداوەندکەیان لە پەرستگە بچێتە دەرێ.

ئان تیۆکۆسی سێیەم زانیاریی وەرگرت کە سەرۆکی پەرستگەکە ئاگەداری هاوئاینییەکانی خۆی کردووەتەوە کە پەیکەری بەعل دەبەن، فەرمانی کرد تا بچن و پەیکەرەکە لە پەرستگەکە دەربێنن، هەر کەسێکیش بەرگری کرد، بیکوژن و فەرمانی ئان تیۆکۆس بەجێ گەیەنرا، ڕۆیشتن و ژمارەیەك خەڵکیان کوشت و پەیکەرەکەیان لە پەرستگە دەرهێنا.

لایەنگرانی ئاینی بەعل لە ئیلامدا تا ئەوکات، تەنانەت دوای هاتنی سلۆکییەکانیش لە کاروباری ئاینیان ئازاد بوون، کەس ڕێگری نەکرد بوون، بۆیە لەو هەڵوێستەی ئان تیۆکۆس زۆر ناڕازی بوون.

ئەگەر پەیکەری خوداوەندی ئەوان لەبەرد یاخۆ دار بووایە ئانتیۆکۆس نەدەبوو بە مایەی ئازاری ئەوان، ئەو تەنیا چاوی بڕیبۆوە زێڕی ئەوان و کاری بە ئاینەکەیان نەبوو.

ئەگەر داوای لە شوێنکەوتووەکانی بەعل کردبایە تا بە ڕێژەی قورسی پەیکەرەکە زێڕی پێ بدەن، لەوانەیە پەسەندیان کردبایە، بەڵام ئانتیۆکۆس بە پەلە و بێ لێکدانەوە هەوڵی دەست

بەسەردا گرتنی ئەو پەیکەرەیدا، بەپێی هەندێ گێڕانەوە، گوایە ئەوانەی بۆ پەیکەرەکە چوون بە هۆی شەڕ و پێکدادان پەرستگەکەیان وێران کرد. ئەو ڕووداوە بۆوە هۆی ئەوەی هەندێ لە پیاوانی بەعل پەرەست سوێند بخون کە تۆڵەی خوداوەندکەیان لە ئانتیۆکۆسی سێیەم بکەنەوە و لە هاوینی ساڵی (١٨٧ پ. ز) لە شوێنێك لە نێزیك ڕووباری کەرخ کوشتیان و بە کوژرانی ئەو، دوایین پاشای بە دەسەڵاتیی سلوکی لەنێو چوو.

دوای کوژرانی ئانتیۆکۆسی سێیەم، کوڕەکەی سلۆکۆسی چوارەم بوو بە پاشا، کە نازناوی (فیلۆپاتر) واتە (ئەو کەسەی باوکی خۆش دەوێت) بوو، بەڵام لەگەڵ پەرەگرتنی دەسەڵاتیی ئەشکانییەکان، سەرەتاکانی کۆتایی هاتنی پاشایەتیی سلوکییەکان دەهاتە پێش. میتری داتس پاشای ئەشکانی کە لە زمانی ئێستەی فارسی بە (مهرداد) ناو دەبرێت و ئەشکی شەشەم بوو، تا ساڵی (١٣٧ پ. ز) پاشا بوو، پاشایەتیی سلوکی کۆتایی پێهێنا، هەندێك لە شازادە یۆنانییەکان لە ئێرانەوە چوونە میسر، کە لە ئەویش زنجیرەیەکی پاشایەتیی یۆنانی دەسەڵاتدار بوون و لە میسر نیشتەجێ بوون، هەندێکیشیان لە ئێران مانەوە و بە کاری بازرگانی و کشتوکاڵ سەرگەرم بوون، بەڵام چی دیکە دەسەڵاتیی سیاسییان نەبوو.

* * *

ماوەی دەسەڵاتیی زنجیرەی پاشایەتیی سلوکییەکان لە ئێران بەو مەرجەی سەرەتاکەی بە سەرەتای هاتنی ئەسکەندەر هەژمار بکەین تا لەنێوچوونیان، نێزیکەی دوو سەدە بوو.

لە سەردەمی دەسەڵاتیی مهردادی یەکەم کە برای فەرهادی یەکەم (ئەشکی پێنجەم) و کوڕی فری پایت (ئەشکی چوارەم) و نەوەی ئەردەوان (ئەشکی سێیەم) کە پیاوێکی ئازا و دادپەروەر بوو، بنەماڵەی ئەشکانییەکان متمانە و پێگەی تایبەتیان پەیدا کرد، مهردادی یەکەم لە سەردەمی پاشایەتیی خۆیدا کە ماوەیەکی درێژ واتە سی و پێنج ساڵی خایاند، توانی سنووری دەسەڵاتداری ئەشکانیی تا نێزیك ئاستی ئیمپراتۆرییەتێك بباتە پێش.

بە داخەوە لە سەردەمی پاشایەتیی ئەشکانییەکان کە نێزیکەی چوارسەد ساڵی خایاند، مێژوویەکی نووسراو و تۆکمەمان بەردەست نییە، مێژوونووسە ئەرمەنی و سریانی و یۆنانییەکان ئەو مێژوویان بە شێوەی دابڕاو و پارچە پارچە نووسیوەتەوە.

هەرچەندە ئەشکانییەکان نیزیکەی چوارسەد ساڵ لە ئێران پاشا بوون، بەڵام لە سەردەمی پاشایەتیی ئەواندا ئێران تەنیا یەك وڵات نەبووە، بەردەوام دەسەڵاتداری سەربەخۆ کەم تا زۆر خۆیان بە نیزیك لە ئەوان دەزانی، دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد، دەتوانین بڵێین یەکەم وڵاتی (ملوك ئەلتەوافی) لە جیهاندا لە سەردەمی ئەشکانییەکان هاتووەتە کایەوە.

لە ئاڤێستادا دەستەواژەیەك بە ناوی (داهیۆ پتی) هاتووە کە ڕێك واتاکەی بەرانبەر بە (ملوك ئەلتەوافی) دێت و واتای (پاشایەتیی خێڵەکان) لەو دەستەواژەیە وەرگیراوە. بە وتەی دارمێس تەتەری فەرەنسی لە سەردەمی داهیۆ پتی کە هەمان سەردەمی ئەشکانییەکانە، هەموو ئاڤێستا یاخۆ بەشێکی نووسراوەتەوە، ئەگەر گومانمان لە نووسینەوەی هەموو بەشەکانی ئاڤێستاش لەو سەردەمەدا هەبێت، ئەوا گومانمان نییە لە نووسینی (هۆم یەشت) کە بەشێکی ئاڤێستایە لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا، بەپێی لێکۆڵینەوەکانی دارمێس تەتەر (هۆم یەشت) بە تەواوەتی لە سەردەمی ئەوان نووسراوەتەوە.

لە سەردەمی ئەشکانییەکان دوو جەنگی درێژخایەن کە جەنگەکانی ئەشکانی و تۆرانییەکان و جەنگەکانی ئەشکانی و ڕۆمەکان بوون ڕوویاندا.

جەنگەکانی ئەشکانی و تۆرانییەکان وەك باسمان کرد نیزیکەی سێ سەد ساڵی خایاند، جەنگەکانی ئەشکانی و ڕۆمەکانیش بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتیی ئەشکانییەکان بە شێوەی پچڕ پچڕ هەبوون تا گەیشتە سەردەمی ساسانییەکان. ئەرمەنستان کەوتبۆوە نێوان دوو حکوومەتی ئەشکانی و ڕۆمەکانەوە، بۆیە چەند جار کەوتە نێو جەنگەکانەوە، هەندێکات دەبوونە لایەنگری ڕۆمەکان و هەندێکاتیش لایەنگری ئەشکانییەکانیان دەکرد، هۆی نووسینەوەی مێژووی ئەشکانییەکانیش لەلایەن مێژوونووسە ئەرمەنییەکانەوە بۆ ئەو جەنگانە دەگەڕێتەوە.

مێژوونووسە ئەرمەنییەکان بە شێوەی پەراگەندە مێژووی ئەشکانییەکانیان نووسیوەتەوە، بە شێوەیەك کە ناتوانرێت یەك مێژووی گشتگیر لە سەردەمی ئەشکانییەکان بنووسرێتەوە، تەنیا دەتوانرێت ناوی پاشا ئەشکانییەکان دیاری بکرێن کە لە تەواوی پەڕتووکە مێژووییەکانی ئەوکات هەیە، ناو هێنانی پاشاکان بە پێویست نازانین، ئەوانەی دەیانەوێت ناوەکان بدۆزنەوە، دەتوانن پەنا بۆ پەڕتووکە مێژووییەکان، تەنانەت پەڕتووکە مێژووییەکانی سەرەتا ببەن.

بە گشتیی سەبارەت بە سەردەمی پاشایەتیی ئەشکانییەکان، جگە لەو بابەتانەی باسمان کردن و ئەو بابەتانەی لە پەڕتووکی قوتابخانەکانی ئێراندا هاتووە، هیچی دیکەمان بەردەست نییە، پەڕتووکی قوتابخانەکانیش لە مێژوونووسانی دیکەوە بە تایبەتی ئەرمەنی و رۆمەکان وەرگیراون، لە ئێران جگە لە چەند کەتیبەیەك کە لەنێو و دەرەوەی ئێران دەست کەوتوون، بابەتێك نییە کە لە ڕووی مێژووییەوە بە سوود بێت. لەکاتێکدا بە وتەی مێژوونووسە ئەرمەنی و رۆمەکان لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا نووسینەوەی مێژوو باو بووە، بەڵام مێژووی ئەشکانییەکان لە سەردەمی ساسانییەکان شۆراوەتەوە، ئەو تیماجانەی بۆیان بەکار هێنرابوون، بۆ نووسینەوەی مێژووی ساسانییەکان بەکار هێنران.

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی کە بۆچی ساسانییەکان مێژووی ئەشکانییەکانیان لەنێوبرد، دەڵێین کاتی باسکردنی مێژووی ساسانییەکان ئەو بابەتە بە باشی باس دەکەین، چوونکە یەکێك لەو خاڵانەیە کە لە مێژووی ئێران پێویستە لێی وردببینەوە، لە سەردەمانی باستان سڕینەوەی مێژووی زنجیرەیەکی پاشایەتیی کارێکی سەخت نەبوو، چوونکە زۆرینەی پەڕتووکە مێژووییەکان لە یەك دانە پتر نەبوون و لەسەر پێست واتە (تیماج) دەنووسران. کاتێك تیماج دەخرایە نێو ئاو، رەنگی نووسینەکەی دەشۆرایەوە و ئامادە دەبۆوە بۆ ئەوەی شتی دیکەی لەسەر بنووسرێت.

پاشا ئەشکانییەکان کە هەر وەك پاشاکانی قاجار، باپیرانیان بیابانشین و خاوەن ئاژەڵ بوون، زۆر هۆگری بیناکردنی کۆشك و شار نەبوون، جگە لە شاری (داریۆم) کە باسمان کرد، تەنیا دوو شاری دیکەیان بینا کرد، کە برێتی بوون لە (سەد دەرگە) یاخۆ (سەد شار) لە پشتێنەی ناوەندی ئێران و (تیسفون) لە کەناری دیجلە، شاری دیکەی گەورە ناناسین کە لەلایەن ئەوانەوە بینا کرابن، تەنیا چەند شارۆکە و گوندێك دەناسین کە ئەوان دروستیان کردوون.

## ژیانی شاپووری یەکەم کوڕی ئەردەشێری پاپەکان بە پێنووسی خۆی

پێش ئەوەی باسی مێژووی ساسانییەکان بکەین، پێویستە سەبارەت بە مێژووی ئەو سەردەمە ڕوونکردنەوە بدەین تا بزانرێت بۆچی ئەو باسەی لەمەڕ ساسانییەکان دەیخەینە ڕوو نوێیە و جیایە لەو بابەتانەی لە پەڕتووکە کلاسیکەکان لەو بارەوە نووسراون.

تا ساڵی (١٣١٥ کۆچی هەتاوی) واتە ساڵی ئێستەی ئێران کە بەرانبەرە بە ساڵی (١٩٣٦ ز) سەرچاوەی باشمان لەبارەی مێژووی ساسانییەکان هەبوو کە بە ناوبانگترینیان برێتی بوون لە:

١) مێژووی تەبەری کە بە درێژی باسی ساسانییەکانی کردووە.

٢) لێکۆڵینەوەی زانای ئێرانناس و ناسراوی ئەڵمانی (نۆڵدکە) کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەی زایینی لەبارەی ساسانییەکان و نامەی تەنسەر کردبووی، دواتر باسی نامی تەنسەر دەکەین.

٣) پەڕتووکی (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان) لە نووسینی ئێرانناسی بەناوبانگی دانیمارکی (کریس تەن سێن) کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی و بەردەست دەکەوێت.

٤) لێکۆڵینەوەی زانای ئێرانناس (هێرتز فێڵد) لەبارەی کەتیبەی (پایکۆڵی) کە لەبارەی مێژووی ساسانییەکان لە تورکیا کەوتووەتە بەردەست، ناوبراو ماوەیەك لە ئێرانیش کاری مێژوویی کردووە.

٥) مێژووی (ژاك دۆ مۆرگانی) فەرەنسی لەبارەی ساسانییەکان.

٦) مێژووی دیولافوای فەرەنسی لەبارەی ساسانییەکان.

٧) بەرنامەی کاری ئەردەشێری پاپەکان کە بە باوەڕی هەندێ کەس بە بەڵگەنامەیەکی گرانبەها لەبارەی مێژووی ساسانییەکان دادەنرێت.

٨) هەندێ سەرچاوەی دیکە کە باسکردن و ناو هێنانیان دەبێتە هۆی ماندووکردنی خوێنەران، بەڵام وێڕای هەموو ئەو سەرچاوانەی سەبارەت بە مێژووی ساسانییەکان هەبوون، ئەو مێژووە کێماسیی تێدا هەبوو.

دامەزرێنەری پاشایەتیی ساسانییەکان، ئەردەشێری پاپەکانە، دوای ئەوەی (ئەرتەبان یاخۆ ئەردەوان) دوا پاشای ئەشکانییەکانی کوشت، بوو بە پاشای تەواوی ئێران، بەڵام ئەو کەسەی پاشایەتیی ساسانییەکانی کردە ئیمپراتۆری، شاپووری کوڕی ئەو بوو کە سی و حەوت وڵاتی کردە بەشێك لە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و گەورەیی ساسانییەکان بە ئەو دیار کەوت، بەڵام زانیارییەکانی ئێمە لەبارەی ئەو تا ساڵی (١٩٣٦ ز) زۆر و بە سوود نەبوون.

لە ساڵی (١٩٣٦ ز) دامەزراوەی رۆژهەڵاتی زانکۆی شیکاگۆ (ئۆرین تاڵ ئەنیستیتوو) کە بە مۆڵەتی دەوڵەتی ئێران لە ناوچەی فارس کۆڵینکاری و لێکۆڵینەوەیان دەکرد، لە (نەخشی رۆستەم) و لەو شوێنەی بە (کەعبەی زەردەشت) ناسراوە، کەتیبەیەکیان دۆزییەوە کە بە دوو زمانی پەهلەوی ئەشکانی و پەهلەوی ساسانی نووسرابوو.

ئەوکات هێشتا (ئیبراهیم پوور داوود) کە زمانی ساسانی دەخوێندەوە نەهاتبووە ئێران، ساڵێك دواتر واتە لە (١٩٣٧ ز) هاتە ئێران و زمانی ساسانی دەوتەوە. ئەوکات کەسی دیکە لە ئێران نەبوو، کە بتوانێت ئەو کەتیبەیە بخوێنێتەوە، بەڵام زانا ئێرانناسەکانی دەرەوە توانیان هەردوو نووسینەکە بخوێننەوە و پێکەوەیان بەراوردیان بکەن، دوای بەراوردکردن دەرکەوت کە ناوەرۆکی هەردوو نووسینەکە، یەکە و لەلایەن یەکەم پاشای گەورەی ساسانی واتە شاپوورەوە نووسراوە. شاپوور لەو کەتیبەیەدا باسی جەنگ و ڕووداوە گرینگەکانی سەردەمی پاشایەتیی خۆی کردبوو.

دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت، کەتیبەیەکی دیکە بە هەمان ناوەرۆك بە زمانی یۆنانی لە نەخشی رۆستەم هەیە، دەقاودەق وەك هەمان کەتیبەیە کە بە زمانەکانی ئەشکانی و ساسانی نووسراوە.

ئەگەر بڵێین لەو رۆژەوە کە ژیاننامەی شاپووری یەکەم لە زمانی خۆی لەو کەتیبەیەدا دۆزراوەتەوە، نێزیکەی بیست ئێرانناس و زانای دەرەکیی لێکۆڵینەوەیان لە

بارەیەوە کردووە، نەتەنیا زێدەڕۆییمان کردووە، بگرە کەمیش باسمان کردووە، لەوانەیە لێتۆژی دیکەش کاریان لەسەر ئەو کەتیبەیە کردبێت کە ئێمە زانیاریمان لە بارەی ناوەکانیانەوە نەبێت.

ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئەو کەتیبەیە کردووە، وێڕای ئەوەی ویستوویانە سەبارەت بە سەرەتای مێژووی ساسانییەکان زانیاریی وەربگرن، هەوڵیانداوە مێژووی رۆمیش پووختتر بکەنەوە، چوونکە لەو کەتیبانەدا هەندێ بابەت لەبارەی رۆمیش هەبوو.

تا ئێستە چەندین وەرگێڕان لەو کەتیبانە، کە ژیاننامەی شاپووری یەکەمە، لەلایەن خۆی نووسراوە، لە ئەمەریکا و ئەورووپا چاپ کراوە، لە ماوەی رابردووشدا یەك لە هەفتەنامەکانی تارانیش وەرگێڕدراوێکی ئەو کەتیبانەی بە شێوەی گشتگیر بڵاوکردووەتەوە (مەبەستی نووسەر لە کاتی نووسینی پەڕتووکەکە واتە چارەگی کۆتایی سەدەی بیستەمە)، بەڵام ئێمە ناوەرۆکی تەواوی ئەو کەتیبە و بیروڕای زانا ئەورووپی و ئەمەریکییەکان لەبارەی ئەو کەتیبانە، لە چوارچێوەی باسکردنی شاپووردا دەخەینە بەر دیدەی خوێنەران.

لە هەمان ساڵی (١٩٣٦ ز) کە ژیاننامەی شاپوور بە نووسینی خۆی لە کەعبەی زەردەشت دۆزرایەوە، دوو کەتیبەی دیکە لەلایەن کەسێك بە ناوی (کارتێر) دەست کەوت کە یەکیان لە کەعبەی زەردەشت لەژێر کەتیبەی شاپوور و بە رێنووسی وردتر نووسرابوو، ئەوەی دیکەیش لە نەخشی رەجەب بوو.(١)

پێویستە بڵێین وشەی (کارتیر یاخۆ کرتیر) لە سەرەتای مێژووی ساسانییەکان یەکێك لە بابەتە شاراوەکانی مێژووی ئەوان بووە، تا ساڵی (١٩٣٦ ز) هیچ کەس نەیزانیوە چییە، هەندێ لە ئێراننناسە ئەورووپاییەکان لەو باوەڕەدابوون کە بە واتای (تاج، ئەفسەر

---

(١) واپێدەچێت کاتیر لە سەردەمی شاپووری یەکەم زۆر جمووجووڵی نەبووبێت، ئەگەریش هەی بووبێت، نەیدەتوانی لەو کەتیبەیەی شاپووری یەکەم بە پێنووسی خۆی نووسیویەتی، بابەتەکانی بنووسێتەوە، ئەو کەتیبەیە دواتر لە لایەن کارتیر و ئەو کاتەی گەیشتە دەسەڵات، واتە لە سەردەمی دەسەڵاتی کوڕەزاکانی شاپووری یەکەم نووسراوەتەوە. "زەبیحوڵڵا"

یاخۆ دیهیم) هاتووه، بەڵام بەپێی ئەو دوو کەتیبەی لە کەعبەی زەردەشت و نەخشی رەجەب دۆزرانەوە، دەرکەوت کە ناوی کەسێکە کە پایەی پێشەوای زانایانی ئاینی هەبووە و سەرۆکیان بووە، لەو بەشەدا چی دیکە باسی کارتیر ناکەین، باسەکە هەڵدەگرین بۆ ئەو کاتەی باسی ژیان و بەسەرهاتی شاپووری یەکەم دەکەین.

ئێمە سەبارەت بە ئەردەشێری دامەزرێنەری زنجیرەی ساسانییەکان هیچ باس ناکەین، چوونکە شاپووری یەکەم لە ژیاننامەی خۆیدا بە درێژی باسی دەکات، بەو باسەی لەبارەی باوکی دەیکات، باشترین و دروستترین ڕووداوەکانی ژیانی ئەو دەخاتەڕوو.

ئەو بەروارانەی لێرەدا ئاماژەیان پێ دەکرێت هەموو ئەو بەروارانەن کە نۆڵدکەی ئەڵمانی  لە خاکی دەرهێناوەتەوە و (ئارتۆر کریس تن سێن) پەسەندی کردووە، بە گشتیی بەرواری زاینین.

ئاشکرایە ساسانییەکان بۆ پێوانی ساڵەکانیان ساڵنامەی زاینیان بەکار نەهێناوە (زەبیحوڵڵا بهرۆز) لە کاتی پێوەکەی خۆیدا دەریخستووە کە ساسانییەکان چ ساڵێکیان بەکار هێناوە، بۆ ئەوەی خوێنەر ماندوو نەکەین باسی ناکەین و ساڵی زاینی باشترین شێوازە بۆ تێگەیشتنی هەمووان.

زانای ئێراناسی سەدەی پێشوو (ژان گاژە) ئەڵمانی لە کۆی لێکۆڵینەوەکانی زانا ئەمەریکی و ئەورووپاییەکان لەبارەی ژیانی شاپوور (بە پێنووسی خۆی)، بابەتێکی هەڵێنجاوە کە پشت بە خودی ژیاننامەکە دەبەستێت، لقەکانیشی برێتین لە ڕووداوە مێژووییەکانی سەردەمی شاپووری یەکەم، ئێمەش بەشە سەرەکییەکانی ئەو باسە کە خۆیان تێروتەسەلن بۆ خوێنەری بەڕێز دەگوازینەوە.

"باوکم ئەردەشێر کوڕی پاپەك کوڕی ساسانە، پێش ئەوەی بابم لە دایك ببێت، پاپەك لە خەودا بینی دارێك لە ئەو و هاوسەرەکەی ڕووا، لق و پۆپەکانی پەرەیان سەند، هەموو جیهانیان گرتەوە.(٢)

بەیانی پاپەك خەوگرەوەکانی بانگ کرد، خەوەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوان وتیان لە تۆ و هاوسەرەکەت منداڵێك دێتە دنیاوە، دەبێتە پاشا و وەچەکانی جیهان داگیردەکەن.

پاپەك سنوورپارێزی پارساد (فارس) بوو، دوای ئەو کوڕەکەی ئەردەشێر واتە بابی من، بووە سنوورپارێزی پارساد، بەڵام ئەو نەیویست بەرفەرمانی ئارتابان (ئەردەوان) پاشای ئەشکانی بێت، لە ساڵی (٢٠٨ ز) لە شاری (ئێستەخر) خۆی بە پاشا ناساند.

سێ ساڵ دوای ئەوەی باوکم خۆی بە پاشا ناساند، واتە لە ساڵی (٢١١ ز) من هاتمە دنیاوە(٣). کاتێك گەیشتمە تەمەنی پێویست، باوکم منی خستە بەردەستی مامۆستایان

---

(٢) ئەو خەوە لە بابەتی تایبەت بە کوروشیش بینرا، وەك دەبینین خەوەکانی تایبەت بە کەسە هەڵکەوتووەکان لەیەك دەچن. "زەبیحوڵڵا"

(٣) بەرواری لەدایکبوونی شاپووری یەکەم بەپێی شانامەی فیردەوسی جیاوازە لەوەی لێرە دەیخوێنینەوە، لە شانامەدا ئەردەشێر تا پەنجا ساڵی کوڕی نابێت، دواتر کوری دەبێت. بەپێی ئەو مێژووە ئەوکاتەی ئەردەشێر دەمرێت، شاپوور سێ ساڵان بووە، بەپێی شانامەی فیردەوسی تەمەنی کەمتر بووە، بەڵام تەمەنەکەی دەست نیشان نەکردووە.

لەبارەی چۆنییەتی لەدایکبوونی شاپووری یەکەم لە (مێژووی تەبەری) محەمەد کوڕی جەریری تەبەری باسێك پێشکێش دەکات کە ویستمان باسی ئەو پیاوە مازەندەرانییە بخەینە بەردیدەی خوێنەر: "ساسان باپیرە گەورەی شاپووری یەکەم پەیمانی دابوو زنجیرەی پاشایەتیی ئەشکانییەکان لەناو ببات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، پێش مردن وەسیەتی کرد تا ئەو کارەی ئەو نەیتوانیوە تەواوی بکات، کوڕەکەی یاخۆ نەوەکەی یان جێنشینەکانیان تەواوی بکەن، لە هەر شوێنێك کە ئەشکانییەکیان بینی، بیکوژن تا یەك کەس لە ئەشکانییەکان نەمێنێتەوە.

بابکی سێ ساڵانیش نەیتوانی وەسیەتی بابی جێبەجێ بکات، تا ئەردەشێری کوڕی پاپەك گەیشتە سەر تەختی دەسەڵات، ئەو هەوڵی بە ئەنجام گەیاندنی وەسیەتەکەیدا، تەواوی ئەشکانییەکانی کوشت، هەر شوێنەوارێك هی ئەوان بوو لەناوی برد.

ڕۆژێك کچێکی جوان کەوتەبەر دیدەی ئەردەشێر، کچەکە ئەوەندە جوان بوو، کە نەیتوانی چاوی لەسەر لابەرێت، هەرچەندی هەوڵیدا چاوی لەسەر لابەرێت و چاو لە کەسێکی دیکە بکات، نەیتوانی. بۆیە ئەو

کچەی گواستەوە بۆ کۆشکی خۆی، دوای ئەوەی ماوەیەك لە کۆشکی خۆیدا هێشتییەوە، کردیە هاوسەری خۆی، ئەوندە ئەو ژنەی خۆش دەویست کە نەیدەتوانی ئەو بەجێ بهێڵێت و بچێت بۆ راو یاخۆ جەنگ.

دوای سێ مانگ لە هاوسەرگیری، شەوێك ئەردەشێر لێی پرسی تۆ نەوەی کێی و بابت کێ بوو؟.

کچەکە وتی:"بابم لە شازادەکانی ئەشکانی بوو، ئەویان کوشت".

ئەردەشێر بە سەرسوورمانەوە ئاخێکی هەڵکێشا و وتی:"ئایا تۆ شازادە خانمێکی ئەشکانی؟".

ژنە گەنجەکە وتی: "بەڵێ".

دوای ئەو شەوە ئەردەشێر زۆر پەرێشان بوو، چونکە بەپێی وەسیەتی "ساسا"ی باپیرەی دەبووایە هەرچی لە رەچەڵەکی ئەشکانییەکان بوو لەناوی بردبایە، تا لە ئەوان کەس لەسەر زەوی نەمێنێت، لە کاتێکدا کە هاوسەری خۆی شازادەیەکی ئەشکانی بوو. چەند رۆژێك ئەردەشێر ئەوەندە پەرێشان بوو کە نەیدەتوانی خواردن بخوات، هەر جارێك کە بیری لە کوشتنی هاوسەرە گەنجەکەی خۆی دەکردەوە، دەیبینی کە توانای ئەو کارەی نییە.

دواجار بیری کردەوە کە ئەو ژنە بداتە دەست یەکێك لە پیاوانی کۆشکەکەی، پێی وت بیباتە شوێنێك کە نەتوانێت ئەو ژنە ببینێت، بگرە بە هۆی نەبینی بکارێت فەرامۆشی بکات، چونکە ئەوەی لەبەر چاوان نەبێت لەبەر دڵانیش نابێت، پێی وت دوای مانگێك لە دوورخستنەوەی لە کۆشك، ئەو ژنە بکوژێت.

پیاوەکە ئەو ژنەی بردە شوێنێکی دوور، دوای مانگێك ویستی ئەو بکوژێت، ژنەکە وتی من دووگیانم، ئەو کۆرپەی لە سکم دایە هی ئەردەشێرە، ئایا دەوێری منداڵی ئەردەشێر بکوژی؟.

پیاوەکە بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت ئەو ژنە بکوژێت، چونکە ئەوکات کۆرپەکەی ناو سکیشی دەمرێت، ئەو کۆرپەیەش بە دڵنیاییەوە هی ئەردەشێرە. بۆیە دەستی لە کوشتنی ژنەکە هەڵگرت، وێستا تا ئەوکاتەی منداڵەکە بێتە دنیاوە. دواتر ئەو پیاوە ئەندامی نێرینەی خۆی بڕی و لە قوتوویەکی هاویشت و سەری داخست و رۆیشت بۆ لای ئەردەشێر و وتی: "ئەی خەسرەو، من لەو قوتوویەدا ڕاپاردەیەکم هەیە، داواکارم لە ئێوە فەرمان بە گەنجینەچی بکەن تا ئەو لە گەنجینەدا بیپارێزێت تا هەر کاتێك کە داوام کرد پێم بداتەوە"، ئەردەشێر قوتووەکەی دایە گەنجینەچییەکە و وتی هەر کاتێك ئەو پیاوە داوای کردەوە، پێی بدەوە.

ژنە گەنجەکە دوای چەند مانگێك کوڕێکی بوو، چونکە کوڕی پاشا بوو، ئەو پیاوە ناوی نا (شاپوور). دوای چەندساڵ کوڕەکە گەورە بوو، گەیشتە تەمەنێك کە دەبووایە بخرێتە بەر راهێنان و پەروەردەکردن، پیاوەکەی کۆشك چەند مامۆستایەکی بەکرێ گرت تا هەموو جۆرە زانستێکی فێر بکەن، هونەرەکانی سوارکاری و تیرهاویشتن و هەلوکێنیشیان فێر کرد.

تا رێنووسی فارسی و رێنووسی ئەشکانی فێر ببم، لەنێو زمانەکانی دیکەیش، زمانی رۆمییان فێرکردم.

---

چەند ساڵ دواتر کاتێك ئەو پیاوەی کۆشك چوو بۆ لای ئەردەشێر، بینی کە زۆر خەمبارە و پرسیاری لەبارەی هۆی خەمبارییەکەی لێکرد. ئەردەشێر وتی تەمەنم نێزیك کۆتایی دێت، تا ئێستە کوڕێکم نییە کە دوای من ببێتە جێنشینم و نازانم دوای من ئەو وڵاتانەی داگیرم کردوون دەبن بە هی چ کەسێك.

پیاوەکە وتی یەزدان تەمەنی درێژ بە ئێوە ببەخشێت و بەردەوام پاشای ئێمە بمێنن، بەڵام ئێوە خەسرەو بێ جێنشین نییە و یەزدان کوڕێکی پێ بەخشیوون.

ئەردەشێر بە سەرسووڕمانەوە پرسیاری کرد، چۆن ئاگەدارە کە یەزدان کوڕێکی بەو بەخشیوە، خۆی ئاگەداری ئەو بابەتە نییە. ئەوکات پیاوەکە تەواوی رووداوەکانی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆ پاشا باسکرد و وتی من گومانم نەبوو کە ئەو منداڵەی لە سکی ئەو ژنەدایە، رۆڵەی پاشایە، بۆیە خۆم لە کوشتنی ئەو پاراست.

دواتر پیاوەکەی کۆشك داوای لە گەنجینەچی کرد تا ئەو قوتوویەی بۆ بێنێت کە پێی سپاردبوو، دوای هێنانی قوتوویەکە، خۆی سەرەکەی کردەوە، ئەوەی لەناویدا بوو بە پاشای نیشاندا و وتی ئەو رۆژەی زانیم ئەو ژنە سکی هەیە ئەندامی نێرینەی خۆم بڕی، تا بە پاشای بسەلمێنم ئەو کوڕە هی من نییە و ناتوانم منداڵم ببێت.

ئەردەشێر وتی ئەگەر ئەو کوڕەی تۆ باسی دەکەی لە رەگەزی من بێت، بێگومان من ئەو دەناسمەوە، ئەوکات خەسرەو ئەردەشێر فەرمانی کرد تا رۆژێك دیاری بکەن و وتی لەو رۆژەدا کوڕەکە لەناو هەزار کوڕی دیکەدا بێنن بۆ لام و من گومانم نییە کە ئەگەر ئەو کوڕی من بێت لەناو هەزار کوڕدا دەیناسمەوە.

لە رۆژی دیاریکراو ئەو کوڕەیان لە ناو کوڕەکانی دیکە هێنا بۆ لای پاشا، بێ ئەوەی نیشانەی تایبەت لەسەر جلوبەرگی هەبێت، کوڕەکان لە دیار ئەردەشێر کەوتنە یاریکردن، ئەردەشێر بە ناویاندا دەسووڕایەوە، یەك بە یەکیانی چاو لێکرد، یەکێك لە کوڕەکان سەرەنجی ئەوی راکێشا و بەرانبەر بەو هەستی مهربانی گرتی و لەگەڵ خۆی وتی: ئەوە کوڕی منە، ئەگەر نا هەستم بەرانبەری نەدەبوو.

لەوکاتەدا (گۆی) کوڕەکان کەوتە نێزیك قاچی پاشا، هیچیان نەیاندەوێرا لێی نێزیك ببنەوە، گۆیەکە لە زەوی هەڵبگرنەوە، بەڵام کوڕەکە بە بێ ترس لە ئەردەشێر نێزیك کەوتەوە و گۆیەکەی هەڵگرتەوە و گەڕایەوە ناو یاریچییە برادەرەکانی، ئەردەشێر وتی بێگومان ئەوە کوڕی منە، بە پێچەوانەوە نەیدەوێرا لە من نێزیك ببێتەوە.

ئەردەشێر ئەو کوڕەی هێنایە ناو کۆشکی پاشایەتیی کە کوڕی خۆی بوو و رای گەیاند کە میراتگری تەخت و تاجی پاشایەتییە، دوای مردنی ئەردەشێر ئەو کوڕە کە ناوی شاپوور بوو، بووە پاشا. "زەبیحوڵڵا"

ئەوکاتەی دەستەکانم هێندە بەهێز بوون کە بتوانم شمشێر بە دەستەوە بگرم و ژێی کەوان رابکێشم، مامۆستاکانم رایان هێنام لەگەڵ شمشێر وەشاندن و تیر هاویشتن، لە پازدە ساڵییەوە بەشداری تەواوی ئەو شەڕانە بووم کە باوکم بۆ زیادکردنی سنوورەکانی دەسەڵاتیی دەیکرد، لەوکاتەوە بابم شارەزای کردم بە بنەماکانی پاشایەتیی و هەندێك بابەتی فێرکردم کە تا ئێستە بەردەوام کاریان پێ دەکەم.

ئەو فێری کردم کاتێك یەکێك لەژێردەستەکانم تاوانێك ئەنجام دەدات، پێویستە سزای بدەم بە بێ ئەوەی مووچەکەی ببڕم، چوونکە ئەو ژێردەستە هەڵەی کردووە، ژن و منداڵی تاوانیان نییە، ئەگەر مووچەی ئەو ببڕم، ژن و منداڵەکانی دووچاری برسییەتی دەبن، بۆیە دەبێت سزاکەی بەو شێوەیە بێت کە تەنیا خۆی سزا درابێت.

ئەو فێری کردم کە هەر سزایەك دەبێت بەرانبەر بێت بە تاوانەکە و سزای گەورەتر لە تاوان، ستەمە. من زۆر شتی دیکەیش لە باوکم فێربووم و لە ژیانمدا کارم پێ کردن.

ئەو کاتەی باوکم دەستی بە داگیرکردنی ئەو وڵاتانە کرد کە لە بەردەستی ئارتابان پاشای ئەشکانی بوون، ئێمە گالیسکەی جەنگیمان نەبوو، بەڵام باوکم کاتێك زانی پێویستە لەو گالیسکانەمان هەبێت، لەشکرێك لەو گالیسکانەمان چێ کرد، کاتێك کە من بووم بە بیست ساڵ فەرماندەیی ئەو لەشکرەی بە من سپارد.

یەکێك لە ڕووداوە دیارەکانی سەردەمی باوکم کە لە بیرم ماوە، جەنگی ئەو لەگەڵ ئارتابانی پاشای ئەشکانییە لە دەشتی هورمزگان (ئێستە ئەو ناوچەیە بە ئەراك ناسراوە)، لەو جەنگەدا لەبەرئەوەی ئێمە گالیسکەی جەنگیمان هەبوو، بەسەر ئارتابان‌دا سەرکەوتین و ئەو شکستی خوارد، دوای ئەو هیچ پاشایەکی ئەشکانی نەما، بۆ ئەوەی یەکلا ببێتەوە کە هیچ پاشایەکی ئەشکانی نەماوە، باوکم لە شاری تیسفون پایتەختی ئەشکانییەکان کە کەوتبۆوە کەناری دیجلە بە ناو و نیشانی شای پاشاکان ڕێوڕەسمی تاج لەسەرکردنی بە ئەنجام گەیاند.

بابم لە هاوینی ساڵی (٢٤١ ز) ژیانی کۆتایی هات، منیش لە جەژنی نەورۆزی ساڵی (٢٤٢ ز) لە تیسفون تاجم لەسەر کرد، بابم پێش ئەوەی بمرێت سێ ئامۆژگاری کردم:

یەکەم ئامۆژگاری ئەوە بوو: هەردەم مەزداپەرست و دادپەروەر بە.

دووەم ئامۆژگاری ئەوە بوو: شەراب مەخۆوە، ئەگەر خواردتەوە، زۆر بە کەمی و تەنیا هەندێ کات بیخۆوە، چوونکە شەراب لە ئەرکەکانت لە جەنگ و ئاشتی لاوازت دەکات و کارەکانت لە دەست دەردەچن.

سێیەم ئامۆژگاری ئەوە بوو: کە بۆ جەنگی رۆم بەردەوام هێز و توانای خۆم بپارێزم.

ئامۆژگاری سێیەمی باوکم لەو شکستەوە هاتبوو کە لە جەنگ لەگەڵ یەکێك لە ئیمپراتۆرەکانی رۆم بە ناوی (ئەلێکساندەر سۆر) خوارد بووی، بە هۆی ئەو جەنگەوە ئیمپراتۆری رۆم هێندە لووتی بەرز ببوو کە ناوی لە خۆی نابوو (پریسکۆس ماکزیمۆس) واتە فەرمانڕەوای پارساد (فارس).

بابم دەیوت هێزی رۆمەکان لە شێوەی دامەزراوەی لەشکرەکەیانە، ئەگەر تۆ بتەوێت ئەوان شکست بدەی، پێویستە دامەزراوەی لەشکرەکەت بە شێوەیەك بێت کە لە دامەزراوەی لەشکری رۆمەکان باشتر یاخۆ وەك هی ئەوان بێت.

بابم دوای ئەوەی شکستی لە بەرانبەر رۆمەکان خوارد، هەوڵیدا دامەزراوەی لەشکری خۆی وەك هی ئەوان لێ بکات و سوود لە ئارایش و جلوبەرگ و کەرەستە سەربازییەکانی ئەوان وەربگرێت، بێ ئەوەی نەریتە نەخوازراوەکانی ئەوان وەربگرێت کە خراپترینیان لە خاچدانی کەسەکان بوو. تەمەنی باوکم هێندە درێژ نەبوو کە بتوانێت لەشکرەکەی خۆی بگەیەنێتە ئاستی لەشکری ئەوان، منیش دوای ئەو بەردەوام بووم لە کارەکانی، هەر شتێك لە دامەزراوە و نەریتەکانی لەشکری رۆمەکان بەسوود بوو، وەرم گرت، ئەوانەی بە زیانم دەزانین وەلامنان.

من تێگەیشتم کە ژمارەی سەربازەکانی سوپایەکی رۆم، بۆیە شەش هەزار سەربازە، چوونکە ئەزموونەکانی جەنگ دەریان خستووە، کە ئەو ژمارەیە بۆ سوپایەك نە کەمە و نە زۆرە، ئەگەر زۆرتر بێت، بەڕێوەبردنی سوپاکە سەخت دەبێت، کەمتریش لەو ژمارە کێماسیی دەنێتەوە. منیش بە بەرژەوەندیم زانی کە هەر سوپایەك لە هەزار سوار و هەزار سەربازی ئەندازە کە مەنجەنیقەکانیش بەڕێوەببەن و چوار هەزار سەربازی پیادە پێك بهێنم.

من دەمزانی کە چەکی باشی دەستی سەربازە رۆمەکان نێزەیە، ئەوان ئەگەر نێزەیان نەبێت، سوود لە شمشێر وەردەگرن. نێزەی سەربازە رۆمەکان کورت و ئەستوور بوو،

ئەوان نێزەی درێژیان بە ئازاردەر دەزانی. من نێزەیەکم بۆ سەربازە پیادەکانم دەستەبەر کرد کە سێ پەیکانی لە سەرەکەیدا هەبوو، بەو شێوەیە نێزەی دەست سەربازەکانی من بە سوودتر بوو لە نێزەی سەربازە رۆمەکان کە تەنیا یەك پەیکانی لەسەریدا هەبوو.

من چوونکە بینیم ئارایشی ئۆردووگەی لژیۆنی رۆمی زۆر باشە و دەبێتە هۆی ئەوەی ئۆردووگەکە لە شەو و رۆژدا بەردەوام بپارێزرێت، بۆیە هەمان شێوە لە ئارایشم بۆ ئۆردووگەی سەربازەکانم هەڵبژارد.

بۆم دەرکەوت جلوبەرگی سەربازە رۆمییەکان بۆ رێڕۆیشتن و جەنگ زۆر ئاسوودەترە لە جلوبەرگی سەربازەکانی من و جلوبەرگێکم لە شێوەی جلوبەرگی سەربازە رۆمییەکان لەنێو سەربازەکانمدا پەرە پێدا، لە جیاتی زرێ و قەڵغانی قورس و ئازاردەر، وەك سەربازە رۆمییەکان ئەو بەرگەم هەڵبژارد کە بە پارچە کانزا پێکەوە نووساوەکان داپۆشرابوو، بەشی سەرەوەی جەستەی ئەوانی دەپاراست، بەڵام ئەو بەرگانەی قاچی سەربازەکانی دادەپۆشی و پێڵاوەکانیشیان، هی سەربازانی خۆمم لاباشتر بوو، پێڵاوی سەربازانی رۆمی کە بەشێك لە پەنجەکانیان لە دەرەوە بوو، پەنجەکانیانی ئازار دەدان و باش نەبوو، چوونکە وێڕای ئەوەی لە زستاندا قاچیان ئازار دەدات، ناچارن بە هەندێ کووتاڵ پەنجەکانیان داپۆشن، لە هاوینیشدا لەوانەبوو پەنجەکانیان بەر بەردەکان بکەون و بریندار ببن.

من نەمویست سەربازەکانم لە رێپێوان و جەنگەکاندا وەك سەربازەکانی لژیۆنی رۆمەکان ئەو گۆشتە بخۆن کە بە پەستراوی دەخرێتە ناو ریخۆڵەوە، لە کاتێکدا کە گواستنەوەی ئەو گۆشتە لە رێڕۆیشتن و جەنگەکاندا ئاسانتر بوو لە گواستنەوەی خۆراکەکانی دیکە. بیستوومە رۆمەکان ئەو کەسانەی لە خاچیان دەدەن، دەدەنە دەست ئەو کەسانەی کارگەی گۆشتی پەستراویان هەیە و ئەوان سوود لە گۆشتی ئەوان وەردەگرن لە دروستکردنی گۆشتی ناو ریخۆڵە، بۆ ئەوەی هەست بە تامی گۆشتی مرۆڤ نەکرێت، سیر دەکەنە ناو گۆشتەکە تا تامی سیرەکە بە تەواوەتی تامی گۆشتی مرۆڤەکە داپۆشێت، من پێم باشترە سەربازەکانم ئەو گۆشتە بخۆن کە خۆیان بە دڵیانە و ئەوان ناچار بە خواردنی گۆشتی ناو ریخۆڵە ناکەم.

من دوو جۆرە سەربازم هەیە، یەکیان وەك سەربازەکانی لژیۆنی رۆم لە تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵیدا لە ئەرکی سەربازی دەبەخشرێن و دەتوانن دوای ئەو تەمەنە پشوو بدەن، ئەو سەربازانەی لە ئەرکەکەیان خانەنشین دەکرێن وەك سەربازەکانی رۆم گەیشتوونەتە پلەی ئەفسەری و پلەی ئەوان رێکە لەگەڵ ئەو ئازایەتییەی لە سەردەمی ئەرکی سەربازیدا دیاریانداوە، بە هۆی گەیشتنیان بە پلەی ئەفسەری مووچەیان زۆرترە لە مووچەی سەربازە ئاساییەکان، سەربازە خۆبەخشەکانی من لە خێڵە ئێرانییەکانن کە لە کاتی جەنگدا یارمەتییان لێ وەردەگرم و لە کاتی ئاشتییدا لە ئەرك دەیان بەخشم.

پێش ئەوەی باسی جەنگەکانی خۆم و رۆمەکان بکەم، پێویستە چەند وشەیەك لەبارەی (مانی) بڵێم، چوونکە وتوویانە ئەگەر من پشتگیری مانیم نەکردبایە، ئەو ئاینەی ئەو هێنای پەرەی نەدەسەند. من پشتگیری ئاینی مانیم نەکرد و هیچ هۆگرییەکی تایبەتیم بەرانبەر بەو نەبوو، یەکەمجار کە بینیم لە کاتی ڕێوڕەسمی تاج لەسەر کردنم لە ساڵی (٢٤٢ ز) بوو.

ئەوکات ئەو مووغانەی سەرۆکی ئاگرخانەکان بوون لە تیسفون ئامادەبوون، ئەویش بە بۆنەی ئەوەی سەرۆکی ئاگرخانەیەك بوو، لە ڕێوڕەسمی تاج کردنە سەرم ئامادە بوو، چوونکە گەنجترین کەس بوو کە سەرۆکی ئاگرخانە بێت، سەرەنجی راکێشام و ئەوکات کە تەمەنی مانی نەگەیشتبووە سی ساڵ، ئەو بانگەشەی ئاینی تازەی نەدەکرد یاخۆ بانگەشەکەی نەگەیشتبوو بە من.

دوو ساڵ لە دوای پاشایەتیم، لە ساڵی (٢٤٣ ز) بیستم کە گۆردینی سێیەم (گۆردیانووس) ئیمپراتۆری رۆم سەرگەرمی کۆکردنەوەی سەربازە، زانیم کە مەبەستییەتی بەرەو ئێران بێت. ئەو کریستیانانەی کاریان بۆ من دەکرد، ئاگەداری بارودۆخی رۆم بوون، پێیان ڕاگەیاندم کە هەزارەمین ساڵی بیناکردنی رۆم نێزیك بۆتەوە، گۆردینی سێیەم بەڵێنی داوەتە خەڵکی رۆم کە دەچێتە تیسفون و پاشای ئێران دەستگیر دەکات و دەیهێنێت بۆ رۆم، تا بە بۆنەی هەزارەمینساڵیادی دروستکردنی شاری رۆم، ئەو لە سێرکدا بکاتە خۆراك بۆ ئاژەڵە دڕندەکان و خەڵك سەیری بکەن و خۆشی بنوێنن.

ژمارەیەکی زۆر لە کریستیانەکان لە خزمەت مندان، هەروەسا ژمارەیەکیشیان لە لەشکرەکەی مندان، ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتیی بابم بوون، ئێستە لەژێر دەسەڵاتیی مندان، ببوونە پەناگەیەکی باش بۆ کریستیانەکان، هەر یەکە لە ئەوان کە لە دەست ئیمپراتۆرییەتی رۆم و فەرمانڕەواکانیان هەڵدەهات، خۆی دەگەیاندە یەکێك لە وڵاتەکانی ژێردەستی من، تەناهیی و ئاسایشی دەپارێزرا. باپیرانی من کە پێش ئەردەشێری بابم سنوورپارێز بوون، کریستیانەکانیان پەنا دەدا، ئەوانیش بۆ وەڵامی چاکەیان، ئەوان و دواتریش منیان لە بارودۆخی رۆم ئاگەدار دەکردەوە.

دەیانوت گۆردیۆنی سێیەم ئیمپراتۆری رۆم پیاوێکی بەهێز و ئازا و زۆرخۆر بوو، پێش ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆر، (لەگات) بووە. لەگات برێتی بوو لە فەرماندەی لژیونێکی رۆم، ئەو چوونکە فەرماندەی لژیۆن بوو، زۆر ئەزموونی جەنگی هەبوو.

گۆردینی سێیەم دوای ئەوەی دەستی بە کۆکردنەوەی لەشکر کرد، داوای لە تەواوی وڵاتە ژێردەستەکانی کرد تا بێن بۆ جەنگی من. ئەو لە وڵاتانی (کیلیکی، بام ڤی زی، لیسی، کاری، یۆنی، لیدی و میسی) (لە ئاسیای بچووك)، هەروەها وڵاتانی گێرمان و ئەلبانیا و سربیا (کە ئەورووپایی بوون) داوای سەربازی کرد، ئەو لە هەر شوێنێك کە لە تواناد‌ا بوو ژمارەی سەربازەکانی سەربازگە رۆمییەکانی کەم کردەوە تا بتوانێت بە لەشکرێکی بەهێزەوە بێت بۆ جەنگی من، بیستبووی کە من سەرگەرمی بەهێزکردنی لەشکرەکەمم، ئەو پێشبینی دەکرد ئەگەر بە لەشکرێکی لاوازەوە بێتە جەنگی من، شکست دەخوات.

وتمان کە من یەکەی جەنگی رۆمەکانم هەڵبژارد کە هەمان شەش هەزار سەرباز لە لژیۆن بوو، هەزار کەس لە ئەوانم کردە سەربازی سوارە. لە کاتی جەنگدا سوارەکانی تەواوی یەکەکان دەهاتنەوە لای یەك و لە ئەنجامدا لەشکرێکی گەورە پێکدەهات.

من سەرەڕای سوپای سوارە، سوپایەکی دیکەی گالیسکە جەنگییەکانیشم هەبوو، کە تا ئێستەش ئەو سوپایە بە یەکێك لە هۆکارە کاریگەرەکانی سەرکەوتن لە جەنگدا دەزانم. هەریەکە لە گالیسکە جەنگییەکانی من بورجێکی هەیە کە لەنێویەوە تیرهاوێژەکان تیر دەهاوێژن، لە کاتی پێویستدا لە گالیسکەکان دادەبەزن و نێزە و شمشێر بەکار دێنن.

ئەسپی گالیسکەکان لە ئەسپە بەهێزەکان دیاری دەکرێن، لە یەکساڵییەوە ئەوان بۆ ڕاکێشان پەروەردە دەکەن، لە سێ ساڵییەوە کاری سەرەکیی ئەوان دەست پێدەکات کە ڕاکێشانی گالیسکەیە، کاتێك ئەسپەکان حەوت ساڵی تەواو دەکەن، ئەوان لە گالیسکەکان دەکەنەوە و بۆ بەشەکانی دیکەی لەشکر دەیانگوازنەوە.

لە زستانی ساڵی (٢٤٣ ز) هەواڵیان پێگەیاندم کە گۆردینی سێیەم هاتووەتە ناو سوریا، مەبەستی وایە کە بەرەو ئاشوورستان بێت کە لە باکوری میزۆپۆتامیایە.

لێکۆڵینەوەم کرد تا بزانم ئەو لە چ ڕێگەیەکەوە بەرەو ئاشوورستان دێت، بە زوویی زانیم کە ئەو سوودی لە هەوای فێنکی زستانی سوریا وەرگرتووە و بە درێژایی ڕووباری فورات بەرەو ئاشوورستان دێت.

زانیم جووڵەی ئەو لە کەنارەکانی فوراتەوە بۆ ئەوەیە کە بەردەوام لە سەرچاوەی ئاو نێزیك بێت و سیخوڕە بلەز و زیرەکەکانم ڕاسپارد تا زانیاریم لەبارەی چۆنییەتی و چەندایەتیی لەشکری گۆردیۆنی سێیەم بۆ بێنن، ئەوان نەیاندەتوانی بچنە نێو ئۆردووگەیەکی ڕۆمی و زانیاریی وەربگرن، چوونکە دەستگیریان دەکردن و بە تاوانی سیخوڕی لە خاچیان دەدان، تەنیا دەیانتوانی لەسەر ڕێگەی لەشکری ڕۆم بوەستن و لەکاتی تێپەڕبوونیان بە نێزیکەیی ژمارەیان بزانن و جلوبەرگ و کەرەستەکانیان بزانن.

سیخوڕەکانم هەواڵیان هێنا کە ئیمپراتۆری ڕۆم بە دوازدە لژیۆنەوە بۆ جەنگی من دێت و ئەسپسوار نییە، تەنیا ئەفسەرەکانی ئەسپسوارن، سەربازەکانی لژیۆنە پیادەن، بەڵام ڕۆیشتنی سەربازە پیادەکانی لژیۆنە ڕۆمییەکان زۆر جیاوازیی نەبوو لەگەڵ ڕۆیشتنی سوارەکان لە لەشکرەکانی دیکە، چوونکە ئەو مەودایەی ئەوان لە ڕۆژێکدا دەیانبڕی لەگەڵ ئەو مەودایە یەکسان بوو کە دەستەیەك لە سوارەکانی لەشکرێکی دیکە دەیانبڕی. ئەوان ئەو مەنجەنیقانەیان هەبوو کە بچووك و سووك بوون و تایەیان هەبوو، بە هۆی ئەسپەوە ڕادەکێشران.

من لێکدانەوەم کرد کە ئەگەر پاشای ڕۆم بە دوازدە لژیۆن سەرباز بۆ جەنگی من بێت، حەفتا و دوو هەزار سەربازی بە ئەزموونی هەیە. زانیاریم هەبوو کە نەریتی ڕۆمەکان وایە کە لە کاتی جەنگدا، جگە لە سەربازەکانی لژیۆن، سەربازی دیکە لەگەڵ خۆیان دەهێنن، بەڵام ئەو سەربازانە ئەو بایەخە جەنگییەی ئەوانیان نییە، زۆرتر برێتین

لەو کەسانەی کارەکانی دارتاشی و قەڵغان دروست کردن و گواستنەوە دەکەن. ڕۆمەکان گالیسکەی جەنگیان نەبوو، چوونکە ئەوندە پشت ئەستوور بوون بە لژیۆنەکانیان کە بەشەکانی دیکەی لەشکر واتە گالیسکە و سوارەیان بە زیادە دادەنا.

دوای ئەوەی لە تیسفون لە ڕێگەی سیخووڕەکانمەوە لە چەندایەتی و چۆنایەتیی لەشکری دوژمنم زانی، بڕیارمدا بچمە پێشوازی ئەو و نەهێڵم لە تیسفون نێزیك ببێتەوە، لە زستانی هەمان ساڵ بە لەشکرەکەمەوە کە لە پیادە و سوارە و گالیسکەی جەنگی پێکهاتبوو، بەڕێ کەوتم، برا بچووکەکەشم کە ناوی (ئارابێل) بوو لەگەڵدا بوو.

خوازیاربووم کە لە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات بگەمە لەشکری ئیمپراتۆری ڕۆم، بەڵام دەرکەوت کە خێرایی سەربازە پیادەکانی ئەو پتر لەوە بوو کە من بیرم لێ دەکردەوە، چوونکە هەر ئەو ڕۆژە کە من گەیشتمە دەشتی (می زی شە)، بینیم کە لەشکری دوژمن گەیشتووەتە نێو ئەو دەشتە.

چەند وشەیەك لەبارەی دەشتی (می زی شە) دەنووسم تا تۆی ڕێبوار ئەو ڕۆژەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، بزانی ئەو دەشتە کەوتووەتە کوێوە، چوونکە زۆر جار تێپەڕبوونی کات ناوی شوێنەکان دەداتە دەست فەرامۆشی یاخۆ ناوەکەی نامێنێت، بەڵام شوێنەکە لە یادەکاندا دەمێنێتەوە. بۆیە من لەو کەتیبەیەدا ناوی دەشتی (می زی شە) دەنووسم تا نەوەکانی داهاتوو بزانن ئەو دەشتەی من تیایدا لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم جەنگام، کەوتووەتە چ شوێنێك.

می زی شە دەشتێکە کە کەوتووەتە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی ئاشوورستانەوە، کەوتووەتە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات، فورات لە ڕۆژئاوا و دیجلە لە ڕۆژهەڵاتی ئەو دەشتەیە کە دەشتێکی پان و بەرینە و بەراورد بە دەشتەکانی دیکەی میزۆپۆتامیا، دەشتێکە کە بەردەوام سەوز و بە گژ و گیایە و هیچ کات گیای لێ نابڕێت، بۆیە یەکێکە لە لەوەڕگە بەناوبانگەکانی میزۆپۆتامیا، بەڵام ئەوکاتەی لەشکری من گەیشتە ئەو دەشتە، مێگەلی ئاژەڵەکانی لێ نەبوو، چوونکە شوانەکان دوای ئەوەی زانیبوویان لەشکری ڕۆم دێت، مێگەلەکانیان بۆ شوێنی دیکە گواستبۆوە.

ئەوەی بووە هۆی هاتنی ئیمپراتۆری ڕۆم بۆ ناو دەشتی می زی شە ئەوە بوو، کە بوارێك لە ڕووباری فورات لە رۆژئاوای دەشتەکە هەبوو کە لەشکری ئیمپراتۆری ڕۆم دەیتوانی پێیدا بپەڕێتەوە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی فورات.

بواری می زی شە زۆر پان بوو کە کاتی پەڕینەوەی لەشکری ڕۆم، تەنانەت لە وەرزی بەهاردا، ئاو نەدەگەیشتە چۆکیان، ئەگەر ئیمپراتۆری ڕۆم لەو بوارە نەپەڕیبایەوە و نەهاتبایە ناو بەشی ڕۆژهەڵاتی فورات، نەیدەتوانی لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە، دەبووایە زۆر بەرەو باشوور بڕوات، پەڕینەوە لە بوارەکانی دیکەی ئەو ڕووبارە کە پانیان زۆر کەم بوو، بە هۆی وەرزی بەهار و لێشاوی ئاو یاخۆ ئەستەم بوو یان مەترسیی زۆری هەبوو بەشێك لە سەربازەکان و پێداویستییەکانی لەشکری ڕۆم ئاو دەیبردن.

من لەگەڵ لەشکرەکەم لە ڕۆژی دووەمی بەهاری ساڵی (٢٤٤ ز) لە کاتی ئێوارە گەیشتمە دەشتی می زی شە و دەمویست ئەو شەوە لە کەناری فورات بمێنمەوە، ڕۆژی دواتر لە بوارەکە بپەڕمەوە و بچمە کەنارەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری فورات، بەڵام لە دوورەوە پێشەنگی لەشکرێکم بینی، دەرکەوت کە لەشکری ئیمپراتۆری ڕۆمە، ئەوکاتەی من ئەوانم بینی هەموو لەشکرەکەیان لە ڕووبار پەڕیبوونەوە و هاتبوونە نێو دەشتاییەکەوە.

من لەوکاتەدا نەمدەتوانی لەگەڵ ڕۆمەکان جەنگ بکەم، چوونکە پێش دەست پێکردنی جەنگ شەو دادەهات، لە دووەمین ڕۆژی بەهار شەو و ڕۆژ وەك یەکبوون، هەرچەندە شەوەکانی لە شەوی زستان درێژتر بوون، بەڵام بە درێژایی ڕۆژانی هاوین نەدەبوون.

لێرەوە بە بەرژەوەندیم زانی کە جەنگ دوابخەم بۆ ڕۆژی دواتر تا ئەفسەر و سەربازەکانم بە باشی بتوانن پشوو بدەن، چوونکە ئەو ڕۆژە هیچ یەکێك لە ئەوان پێشبینیان نەدەکرد کە لەگەڵ لەشکری دوژمن دەکەوینە جەنگ و لە ڕووی مەعنەوییەوە ئامادەیی پێویستیان نەبوو، بەڵام ڕۆژی دواتر ئامادەیی پێویستیان دەبوو، هەر سەرباز و ئەفسەرێك ئەو شەوە بە باشی پشووی دەدا و دەیزانی بەیانی جەنگ دەکات.

مەزدا چاوی تیژبینی بە من بەخشی بوو، بەشێوەیەك كە دەمتوانی ئەو شتانە لە دوورەوە ببینم كە خەڵكی دیكە نەیان دەتوانی بە باشی ببینن، ئەو رۆژە بینیم كە رۆمەكان دیواریان دروست كردووە، تێگەیشتم كە ئەوان بە هۆی ئەوەی دەیانەوێت شەو لەو شوێنە بمێننەوە لە دەورەی خۆیان دیواریان چێ كردووە تا لە شەودا هێرشیان نەكرێتەسەر.

ئەو دیوارەی رۆمەكان بە دەوری خۆیاندا دروستیان دەكرد كورت بوو، بەڵام پێشی بە هێرشێك دەگرت، بینیم كە لە دوازدە بازنەی داخراو پێكهاتووە هەموویان پشتیان پێكەوە بەستووە و هیچ مەودایەكیان لە نێواندا نییە.(٤)

دوای ئەوەی دیوارەكانی لژیۆنەكانی رۆمم بینی، بیركردنەوە لە هێرشی شەوانەم لە بیرم دەركرد، چوونكە دەمزانی ئەو پەلامارانە، جگە لە بە كوشتدانی هەندێك لە سەربازەكانم، هیچ ئاكامی دیكەی نابێت. من پێشبینیم دەكرد ئەو شەوە تا بەیانی ئەو سەربازانەی ئێمە و رۆم كە سەرگەرمی ئێشكگری شەوانە دەبوون و دەگەڕان، پێكەوە پێكدادانیان دەبێت، هەردوولا هەوڵ دەدەن ژمارەیەك لە یەكدیی بە دیل بگرن و بیانبەن تا لە رێگەی ئەوانەوە ژمارەی سەربازەكان بزانن و بپرسن كە هی كام وڵاتانەن، زانیاریی لەبارەی شێوەی جلوبەرگ و پۆشاكی سەربازی لەشكرەكان وەربگرن، چوونكە بە گرتنی دیل دەتوانرێت زانیاریی بەرچاو لەبارەی چۆنایەتی و چەندایەتیی لەشكری دوژمن دەستەبەر بكرێت.

ئارابێلی برامم ڕاسپارد تا دەستبەجێ دوای رۆژئاوابوون هەوڵ بدات رێگەیەك لە باشوورەوە بەرەو فورات بكاتەوە، پێموت پێویستە ئێمە پێگەیەكمان لە تەنیشت ڕووبارەكەوە هەبێت و بەردەوام پێوەندیی نێوان ئەو پێگەیە و لەشكرەكەمان بپارێزین، بۆ ئەوەی رۆمەكان لە كاتی شەودا نەتوانن ئەو پێوەندییە بپچڕێنن، چوونكە ئاومان نییە و ناتوانین ئەسپەكانمان تا بەیانی بە تینوویەتی بهێڵینەوە، بۆیە ئەگەر تینوو

---

(٤) لژیۆنی رۆمی لە هەر شوێنێك بۆ شەوێك ویستبایان بمێننەوە، پارچە دیوارێكی كاتیان دروست دەكرد، چجای ئەوەی ویستی مانەوە بۆ چەند شەو و رۆژێكیان هەبووایە. "زەبیحوڵڵا"

بمێنن، بەیانی هێزی جووڵەیان نابێت و ئەسپسوار و گالیسکەکانمان بێ سوود دەمێننەوە.

بۆ ئەوەی ئارابێلی برام بتوانێت خۆی بگەیەنێتە کەناری ڕووبارەکە و لەوێندەر پاڵپشتێك چێ بکات، هەندێك لە گالیسکەکانم پێدا و پێم وت گالیسکەکان تا بەرەبەیان لە نێوانماندا دەبێت هاتوچۆ بکەن تا ڕۆمەکان نەتوانن پێوەندیی نێوانمان ببڕن، دوای ئەوەی پێگەی ئێمە لە کەناری ڕووبار دروست بوو، دەستە دەستە ئەسپەکان ببەنە کەناری ڕووبار و تێرئاویان بکەن و بیانهێننەوە، پێش بەرەبەیانیش بۆ جاری دووەم پێویستە ئەسپەکان تێر ئاو بکرێن. گالیسکەکان بە فەرماندەیی ئارابێلی جووڵان و خۆیان گەیاندە ڕووبارەکە. ئەو کاتەی گالیسکەکان بەرەو باشووری ئۆردووگەی ڕۆمەکان دەڕۆیشتن، مەودایان لەگەڵ ئەواندا زۆر بوو، بە هۆی هاتنی شەو و تاریکییەوە، ڕۆمەکان نەیاندەتوانی بە باشی گالیسکەکانمان ببینن، هەندێکیشیان دەنگی جووڵەی ئەوانیان بیستبوو، بە هۆی بوونی ئەو دیوارەی لە دەورەی خۆیان دروستیان کردبوو، ترسیان لە پەلاماری ئێمە نەبوو، ڕۆژی دواتر ئاگەدار کرامەوە، گۆردیۆنی ئیمپراتۆر زانی بووی ئێمە بۆ دەستەبەرکردنی ئاو دەچینە سەر ڕووبارەکە، مەبەستی هێرشکردنمان نییە بۆ سەر ئۆردووگەی ئەوان.

ئێمە ئەو پێگەیەمان تا بەرەبەیان پاراست، کە لە کەناری ڕووبار دروستمان کردبوو، بە بوونی ئەو پێگەیە ئەسپەکانمان تێر ئاوبوون، پیاوانی لەشکریش تینوو نەمانەوە، پێش ڕۆژهەڵاتن ئەو پێگەیەمان کۆکردەوە.

ئەو شەوە دوو سەربازی ڕۆمیمان بە دیل گرت، سێ سەربازی ئێمەش بێ سەر و شوێن بوون، ئاشکرابوو کە ڕۆمەکان ئەوانیان بە دیل گرتووە.

فەرمانم کرد تا دیلە ڕۆمییەکان بێنن بۆ لام و خۆم لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەم، چوونکە وەك باسمکرد زمانی ڕۆمیم دەزانی. لە وتەکانی ئەوان تێگەیشتم ئیمپراتۆری ڕۆم چوارسەد مەنجەنیقی پێیە، وەك خۆشم دەمزانی دوازدە لژیۆن سەربازی هەبوو، زۆرینەی سەربازەکانی گەنج بوون.

لە چەکەکانی سەربازانی ڕۆمم پرسی و زانیم ئەوان (نێزە، شمشێر، تەور و کەوانی سپرینگیان) هەیە، هەموویان زرێیان لەبەردایە، واتە سەربازانی لژیۆن زرێیان لەبەرە،

پارچەکانی کانزا لەسەر بالاپۆشی چەرم بەستراون تا لە زەربەکانی شمشێر و نێزە بیانپارێزێت، هەندێکاتیش لە زەربەکانی تەوریش دەیانپارێزێت.

لە دیلە رۆمییەکانم پرسی کە ئایا هیچ لەشکرێك لە دوای ئەو لەشکرەی گۆردیۆن هەیە تا بێت بۆ هاوکاری؟ ئەوان وتیان لەشکری دیکە نییە و هێزی پالپشتی نایەت.

وتم دیلەکان ببەن، چوونکە دەمزانی بەیانی رۆژێکی سەخت و دژوارمان لە پێش دەبێت، کەمێك پشوومدا، بەلام بیری جەنگی رۆژی دواتر، تەنانەت لە خەویشدا بەری نەدەدام، لە خەوندا دیمەنەکانی جەنگم دەبینی.

لەگەڵ بەرەبەیاندا دەنگی موزیکی جەنگی لەلایەن لژیۆنەکانی ئیمپراتۆری رۆمەوە هات و دەنگی موزیکی جەنگی ئێمەش بەرز بۆوە.

گۆردیۆنی سێیەم بە هۆی ئەو متمانەی بە لژیۆنەکانی خۆی هەبوو لە دەشتی می زی شە هاتە جەنگی من، گۆردیۆن ئەگەر پیاوێکی خودان ئەقڵ بووایە، نەدەبوو لەو دەشتەدا بێتە جەنگی من.

رۆژی پێشتر واتە دووەمین رۆژی بەهار گۆردین کاتێك گالیسکە جەنگییەکان و هێزی سوارەی منی بینی دەبووایە بزانێت دەشتێکی تەخت و بەرین، باشە بۆ بەگەڕخستنی گالیسکە جەنگییەکان و هێزی سوارە، لەکاتێکدا لووت بەرزی و لەخۆباییبوونی لە ئەندازە بەدەری ئەو دەگەڕایەوە بۆ متمانەی زۆری بە توانای لژیۆنەکانی، دەبووایە لەو رێگەیەوە بگەڕێتەوە کە پێیدا هاتبوو، لە بواری فورات بپەڕێتەوە و خۆی بگەیەنێتە کەناری رۆژئاوای فورات و هەوڵ بدات لە شوێنێك جەنگی من بکات کە نەتوانم گالیسکە و سوارەکانم لە دژی ئەو بخەمە نێو جەنگەوە.

ئەگەر ئەو لە درێژایی فورات بەرەو باشوور رۆیشبایە و لە بوارەکانی ئەو ناوچەیەوە هاتبایە کەنارەکانی رۆژهەلاتی فورات، ئەوکات لە ناوچە نیمچە شاخاوییەکانی باشووری میزۆپۆتامیا دەگەیشتە من و لەوانە بوو شکستی نەخوارد بووایە، منیش بۆ رێگرتن لە هاتنی ئەو بۆ میزۆپۆتامیا ناچار بووم تا بەرەو باشوور بچم.

گۆردینی سێیەم چوونکە دوای هاتنی بۆ سوریا بە درێژایی کەنارەکانی فوراتدا بەرەو ئاشوورستان و میزۆپۆتامیا دەهات، کاتێك گەیشتە بواری می زی شە و لێی پەڕییەوە، بیری کردەوە بە پەلە دەتوانێت خۆی بگەیەنێتە دیجلە و تیسفونی پایتەختی

من، چوونکە بواری می زی شە لەو شوێنەیە کە هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات زۆر لێك نیزیك دەبنەوە و بە پەڕینەوە لەو بوارە و گەیشتن بۆ ناو میزۆپۆتامیا، دوای چەند ڕۆژێك ڕێپێوان بەرەو ڕۆژهەڵات دەتوانرا بگەنە ڕووباری دیجلە.

هەرچەندە ئارابیێلی برام کە شەوی پێشتر رام سپاردبوو بۆ پێکەوەنانی پێگەیەك لە کەناری ڕووباری فورات بۆ دابینکردنی ئاو بۆ سەربازەکان و ئاودانی ئەسپەکانمان بەو هۆیەوە پێویستی بە پشوودان هەبوو، بەڵام من ئەوم کرد بە فەرماندەی لای راستی لەشکرەکەم، ئەرکی ئەو هێرشکردن بوو بۆ لای چەپی لەشکری گۆردین بە گالیسکە جەنگییەکان بۆ ئەوەی بگاتە پشتەوەی لەشکرەکەی ئەو یاخۆ سەربازەکانی لای چەپی ئەو ناچار بکات دابېڕێن و لە ئاو بپەڕنەوە و بچنە کەناری ڕۆژئاوای فورات.

دەشتی می زی شە تەخت بوو، بە باشم زانی لە سەرەتای جەنگەوە سوارەکانی خۆم هەروەك گالیسکەکان بخەمە نێو شەڕەوە، چوونکە ئەو دەشتە بۆ بەکارخستنی سوارەکان زۆر باش بوو، بۆیە ئەوانم خستە لای چەپی لەشکرەکەم کە دەبووە باشوور و خۆشم لە نێوەندی (دڵ)ی لەشکر جێگیر کرد.

لژیۆنە ڕۆمییەکان لەو قەڵا کاتییانەی ڕۆژی پێشتر بۆ خۆیان دروستیان کردبوو، هاتنە دەرێ، ئەوانیش وەك ئێمە ریزەکانی خۆیان بۆ جەنگ ڕێکخست، بەڵام گالیسکەی جەنگی و سوارەیان نەبوو، لە نێوەندی گۆڕەپانی جەنگی ڕۆمەکاندا کڵاوخودی یەکێك لە ئەفسەرەکانم بینی دەبریسکێتەوە، بە شێوەیەك کە سەرەنجەکان بەرەو خۆی رادەکێشێت، مەزەندەم برد ئەو کڵاوە هی گۆردین بێت. کاسکێتی لە گاتەکان واتە سەرۆکەکانی لژیۆنەکانیش دەبریسکایەوە، بەڵام وەك هی ئەو نەبوو کە لە هەتاوێك دەچوو لەنێو دڵی ئەو سوپایەدا.

لە بەرەبەیاندا ئەوکاتەی جەنگ دەستی پێکرد، ئێمە باڵادەستییەکی سرووشتیمان بەسەر ڕۆمەکاندا هەبوو، برێتی بوو لەوەی هەتاو لە پشت ئێمەوە بوو، هاوکات لە چاوی ئەوانی دەدا. من هەموو سوارەکانی خۆمم لە لای چەپ دانەنا، هەندێکیانم خستە پشتەوە تا وەك یەدەگ بمێنن و لەگەڵ ڕۆژهەڵاتندا جەنگ دەستی پێکرد.

ئارابێلی برام لە لای راست گالیسکە جەنگییەکانی بەکارخست تا لای راستی ئیمپراتۆری رۆم تێك بشکێنێت، سوارەکانیشمان لە لای چەپ کەوتنە هێرش بردن، منیش بە پیادەکانەوە لە دڵی سوپاوە بەرەو لەشکری رۆم رۆیشتم.

لە سەردەمی پاشایەتیی ئەردەشێری بابمدا من زۆر جار بەشداری جەنگەکانم کردبوو، ئەزموونی جەنگم هەبوو، بەڵام فەرماندەیی جەنگ بەردەوام لەلایەن بابمەوە بوو، ئەو رۆژە بۆ یەکەمین جار من فەرماندەیی جەنگێکی گەورەم لە ئەستۆ گرت.

بەرگی جەنگی من لەو رۆژەدا بریتی بوو لە کاسکێت، زریێ و قەڵغانی رۆمی، شمشێری راست و دوولێو و تەوریشم پێ بوو.

بە باشم زانی ئەو رۆژە لەنێو سەربازە پیادەکانی خۆمدا بجەنگم، چوونکە ئەسپسوار و گالیسکەکانم بەپێی پێویست بەهێز بوون ، دەبووایە لەنێو سەربازە پیادەکانمدا بم تا بوونی من لەنێو ئەواندا ورەیان بەهێزتر بکات.

گۆردینی سێیەم ئاسایی بوو کاتێك ریزبەندی جەنگی ئێمەی بەدی کرد، بینی کە گالیسکە جەنگییەکانمان لە لای راست و سوارەکانمان لە لای چەپن. بۆیە چوارسەد مەنجەنیقەکەی خۆی لە بەرانبەریان دانا، لەگەڵ بەرێکەوتنی گالیسکە و ئەسپسوارەکانی ئێمە، بەردبارانکردنی گالیسکە و سوارەکان دەستی پێکرد، دەنگی بەریەك کەوتنی قووڵی مەنجەنیقەکان بە بەشەکانی دیکە لە کاتی هاویشتنی بەردەکان، هەرا و هەندامەی لەنێو گۆڕەپانی شەڕ نابۆوە.

ئێمەش کە پیادە بووین، بەرەو رۆمەکان دەڕۆیشتین، هەرکە لێیان نێزیك بووینەوە کەوتینە بەر لێشاوی تیری کەوانە سپرینگدارەکانیان، بەڵام قەڵغانە گەورەکانی سەربازەکانمان بۆ پارێزگاری کردنمان لە بەرانبەر تیری ئەوان زۆر کاریگەر بوون، من دەمزانی سەربازەکانم پێش ئەوەی جەنگ دەست پێ بکات، قەڵغانەکانیان دوور دەکردەوە تا بە ئاسانی بتوانن بجەنگن.

وێڕای ئەوەی سێیەمین رۆژی بەهار بوو، بەڵام دوای ئەوەی هەتاو هاتەدەر من دەمزانی رۆژێکی زۆر گەرممان لە پێشە.

فەرماندەکانی گالیسکە جەنگی و ئەسپسوارکانم دەیانزانی بۆ رزگاربوونیان لە بەردی مەنجەنیقەکان، دەبێت بە خێرایی مەودای نێوان هەردوو لەشکر ببڕن و خۆیان

بگەیەننە دوژمن، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە دوژمن، بەشێك لە گالیسكەكان بە هۆی كوژرانی ئەسپەكانیان یاخۆ لێخوڕی گالیسكەكان، لە جووڵە كەوتن، هەندێ لە سوارەكانیش لە لای چەپی شەڕگە لەنێوچوون، بەڵام ژمارەی ئەو گالیسكانەی شكابوون و ئەو سەربازانەی كوژرابوون، زۆر نەبوون، ئەوانی دیكە توانیان خۆیان بگەیەننە رۆمەكان، دواتر مەنجەنیقەكان كاریگەرییان نەما، چوونكە ئەو بەردانەی هەڵیان دەدا سەربازە رۆمەكانیشی دەكوشت.

لەگەڵ دەستپێكردنی جەنگ بەشی نوژداری لەشكرەكەم كەوتنەخۆ، ئەوانەی لەو بەشەدا كاریان دەكرد، دەستیان كرد بە گواستنەوەی ئەو گالیسكەچی و سەربازانەی نێو گالیسكەكان كە بریندار ببوون بە مەبەستی چارەسەركردنیان، من فەرمانم دەكرد هێندەی دەتوانن برینداره‌كان لە گۆڕەپانی جەنگ بۆ دواوە بگوازنەوە و چارەسەریان بكەن بۆ ئەوەی لەژێر قاچی سەربازەكان و سمی ئەسپەكان نەمرن، بەڵام هەندێ كات شەڕ و پێكدادان هێندە توند و سەخت دەبوو كە نەدەتوانرا برینداره‌كان لە شەڕگەكەوە بۆ دەرێ بگوازرێنەوە.

خوازیاربووم گالیسكەكانی لای راستی ئێمە دوای هێرشكردن، بكارن بلەز لای چەپی سەربازانی ئیمپراتۆری رۆم لەبەریەك هەڵوەشێنن، بەڵام ئەوان زۆر بە سەختی بەرگرییان دەكرد.

ئەسپی گالیسكەكانی ئێمە هەوڵیان دەدا بلەز بەسەر سەربازە رۆمەكاندا تێپەڕ بن، بەڵام سەربازە رۆمەكان بە نێزە كورت و ئەستوور و قورسەكانیان، ورگی ئەسپەكانیان دەدڕی، كاتێك یەكێك لە چوار ئەسپەكانی گالیسكەیەك دەبۆوە ئامانجی نێزە و دەكەوت، گالیسكەكە دەوەستا و سێ ئەسپەكەی دیكەیش نەیاندەتوانی گالیسكەكە و لاشەی ئەسپە مردووەكە ڕابكێشن.

كاتێك ئەسپی یەكێك لە گالیسكەكان دەكوژرا، لێخوڕی گالیسكەكە هەموو خێرایی خۆی دەخستەكار تا لاشەی ئەسپە مردووەكە جیا بكاتەوە، بۆیە پچڕاندنی ئەو پارچە چەرمانەی كە ئەسپەكەی لە گالیسكەكە دەبەستەوە بێ كێشە بوو، بەڵام لێخوڕی گالیسكەكە بۆ ئەوەی پێوەندیی لاشەی ئەسپەكە بە بەشی پێشەوەی گالیسكەكە بپچڕێنێت، دەبووایە لەسەر ماڵبەندەكەوە خۆی بگەیەنێتە پێشەوە، دوای پچڕاندنی

پێوەستەکەش بگەڕێتەوە، لە کاتی رۆیشتن و گەڕانەوەیدا لەوانەبوو کە ببێتە ئامانجی (پێلا) واتە نێزەی رۆمەکان یاخۆ تیری کەوانە سپرینگدارەکانی ئەوان، بەڵام ئەگەر تیرهاوێژەکانی نێو گالیسکەکان رێگریان کردبایە لەوەی سەربازانی دوژمن ئەسپی گالیسکەکان بکوژن، گالیسکەکە بەسەر سەربازە رۆمەکاندا دەڕۆیشت و ئەوان بە هۆی داس یاخۆ تایەی گالیسکەکان یان سمی ئەسپەکان دەکوژران.

هەرچەندە من لە دڵی سوپاکەمدا بووم، بەڵام بە رێگەی ئەو راپۆرتانەی لەلایەن فەرماندەی گالیسکەکان و فەرماندەی سوارەکان پێم دەگەیشت، ئاگەداری دۆخی جەنگ لە هەردوو لای لەشکرەکەم بووم.

لە دڵی لەشکریش سەربازە پیادەکانم لەگەڵ سەربازەکانی رۆم دەجەنگان. هەردوولا ئازایانە دەجەنگان و دەمبینی سەربازە رۆمەکان لە بەکارهێنانی نێزە کورت و ئەستوور و قورسەکانیان شارەزاییان پتر بوو لە بەکاربردنی شمشێر. لەکاتێکدا سەربازەکانی من لە بەکارهێنانی شمشێری راست و دوولێو شارەزاتر بوون، هەندێك لەوان وەك گومانم بردبوو، قەڵغانەکانیان فڕێ دابوو تا بتوانن باشتر بجەنگن، چوونکە قەڵغانەکان لە دار چێکرابوون لە کاتی فڕێدانیان سەربازەکانمان دووچاری زیان نەدەبوون.

زۆرم حەز دەکرد لە ئەسپ دابەزم و لە تەنیشت سەربازە پیادەکانمدا بجەنگم، بەڵام ئەرکەکانی فەرماندەیی ئەو دەرفەتەی پێ نەدەدام، بەڵام سەربازەکانم دەیانبینی وێڕای ئەوەی لەسەر ئەسپم، بە ئەندازەی ئەوان لە مەترسیی تیر و نێزەکانی سەربازانی دوژمندام.

ئەوکاتەی لەگەڵ یەکێك لەو ئەفسەرانە دەدوام کە لەلایەن ئارابێلی برامەوە هاتبوو، لەپڕ ئەسپەکەم کەوتە سەر زەوی، دەرکەوت کە نێزەیان لە ورگی رۆکردووە، بۆیە ئەسپێکی دیکەیان بۆ هێنام و سواری بووم. ئەو ئەفسەرەی لە لای ئارابێل هاتبوو، پێی وتم: گالیسکەکانی ئێمە دوای ئەوەی زیانی قورسیان بەرکەوتووە، بەڵام توانیویانە خۆیان بگەیەننە کەنارەکانی فورات و ئێستە بەرەو باشوور دەڕۆن. ئەگەر گالیسکەکان توانیبایان لە رۆیشتن بەرەو باشوور بەردەوام بن تا دەگەنە ئەسپسوارەکان، ئێمە رۆمەکانمان شکست دەدا.

پێش ئەوەی سێبەرەکان کورت ببنەوە و هەتاو بگاتە ناوەندی ئاسمان، جەنگ گەیشتە لووتکەی توندی خۆی، پریشکی خوێنی سەربازە برینداراکان، خۆم و ئەسپەکەشمیان رەنگ کرد بوو.

سەربازەکانم لە بەرزبوونەوەی گەرما کەوتنە رەنج، منیش بە هۆی هەبوونی کاسکێت و زریّ لە ئەوان خراپتر بووم، بەلاّم دەمزانی بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن پێویستە تادوا سات بەرگەی هەموو سەختی و ناخۆشییەك بگرین، جەنگ مەیدانی بەربەرەکانییە، لەنێویدا سەرکەوتن بۆ ئەو لایەنە دەبێت کە پتر خۆڕاگر بێت بەرانبەر بە سەختییەکانی وەك کوژران و برینداربوون و گەرما و ماندووبوون.

هەتاو گەیشتە ناوەندی ئاسمان، سێبەرەکان کورتتر ببوونەوە و بوو بە نیوەڕۆ. فەرمانم بۆ فەرماندەی سوارەکانم نارد تا هەوڵ بدات لە لای راستی رۆمەکان تێپەڕ ببێت و خۆی بگەیەنێتە گالیسکە جەنگییەکان.

دوای تێپەڕبوونی سێ یەکی کاتژمێرەکانی پاش نیوەڕۆ، کاتێك لەسەر ئاوزەنگی ئەسپ وەستابوون، بە ڕوونی دەمبینی گالیسکەکانم لە پشت سەربازە رۆمەکانن، تێگەیشتم ئارابێل توانیویەتی لە ئاراستەی باشوور بەرەو پێش بڕوات و بگاتە پشت دوژمن. ئەگەر ئەسپ سوارەکانیشمان سەرکەوتن بەدەست بێنن، دەتوانن لە پشت سەربازانی دوژمن خۆیان بگەیەننە گالیسکەکان، بەلاّم پیادە رۆمەکان کە بەرانبەر من لە دڵی سوپادا بوون بە سەختی بەرگرییان دەکرد.

بۆ ئەوەی جەنگەکە یەکلا بکەمەوە، بڕیارمدا ئەو سوارانەی بە یەدەگم دانابوون، بهێنمەوە و خۆم ببمە فەرماندەیان لە دڵی لەشکردا، سەرپەرشتی جەنگم بە یەکێك لە سەردارە بە تەمەنەکانم بە ناوی (سارکان) سپارد و وتم: من دەڕۆم تا دڵی سوپای دوژمن تێك بشکێنم، چوونکە پێموایە ئەگەر دڵی لەشکری دوژمن تێك بشکێنم، سەرکەوتن بۆ ئێمە دەبێت.

ئەو ئەفسەرە ئەسپ سوارانەی کە دەبووایە من فەرماندەییان بکەم، بانگ کرد و پێم وتن پێویستە بە یەك هێرشی توند و سەخت سەربازە پیادە رۆمەکان لێك بپرژێنین و بە سوارەکانتان بڵێن کە هیچ کەس نابێت ترسان بپرنگێتەوە و بوەستێت.

کاتێك سوارەکانمان بۆ هێرشکردن ئامادەبوون، سارکان کە لە جیاتی من ببوو بە فەرماندەی گۆڕەپانی جەنگ، بە سەربازە پیادەکانی وت کە بۆ چەند ساتێك پێوەندیی نێوان هەردوو لەشکر بپچڕێنن و پاشەکشە بکەن و رێگە بدەن تا ئێمە بتوانین تێپەڕ ببین، دواتر لە دوای ئێمەوە گۆڕەپانی جەنگ لە سەربازە رۆمەکان پاك بکەنەوە. کاتێك رێگە کرایەوە، سوارە یەدەگەکان کە خۆیان و ئەسپەکانیان حەساوە بوون کەوتنە جوولە.

من لە ریزی یەکەمی سوارەکاندا ئەسپم تاودەدا و تەورەکەمم بە دەستەوە بوو، دیتم سەربازێکی رۆمی پێلاّی خۆی ئاراستەی من کرد، بەلاّم دەست بەجێ تەورەکەمم لە شانیدا و ئەو بەربۆوە و کەوت.

لەو کاتەی ئەسپم تاودەدا، هەستم بە ئازارێك لە رانی راستمدا کرد، بەلاّم کاتی ئەوە نەبوو کە سەرەنجی بدەمێ.

سەربازە رۆمەکان بە شێوەیەکی هەست پێکراو ماندوو ببوون، بەلاّم سوارەکانی من حەساوە بوون، ئێمە بە زەربەکانی شمشێر و تەور، سەربازەکانی دوژمنمان دەخست و بەرەو پێشڤە دەڕۆیشتین، دەمزانی کە لە دوومانەوە سەربازە پیادەکانمان دێن و سەربازە پەراگەندەکانی دوژمن دەکوژن یاخۆ دیلیان دەکەن.

لەپڕ چاوم کەوت بە کاسکێتێك کە دەبریسکایەوە، ئەسپەکەمم تاودا تا خۆم بگەیەنمە خودان کاسکێتەکە، چوونکە دەمزانی ئەو کەسە گۆردینی ئیمپراتۆری رۆمە. زۆر خێرا دەڕۆیشتین، هەندێکات نەماندەتوانی رێگر بین لەوەی تەرمی کوژراوەکان بکەونە ژێر سمی ئەسپەکانمان.

هەندێکات یەکێك لەو سوارانە دەکوژران کە لە لای راست یاخۆ چەپی من بوون، بەلاّم من کە هەستم دەکرد کاتی یەکلابوونەوەی جەنگ نێزیك بۆتەوە، گوێم بە کوژرانی سوارەکانم نەدەدا، دەمزانی بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن، پێویستە خۆم بگەیەنمە گالیسکەکان.

گەیشتینە شوێنێك کە بە تەواوەتی ڕووخساری گۆردینم دیت، تا ئەوکات تەنیا لە باسەکاندا ناسی بووم، بینیم ڕووخسارێکی پان و قەلّەوی هەیە، بەلاّم چاوەکانیم نەبینی، چوونکە لێوی کاسکێتەکەی سێبەری خست بۆوە سەر چاوەکانی و بە تەواوەتی نەدەتوانرا ببینرێت.

به هەمان شێوە کە من ئەوم ناسی، ئەویش منی ناسی و هاواری کرد ئایا هێندەت ئازایەتیی هەیە کە لەگەڵ مندا بجەنگی؟.

منیش بە زمانی رۆمی وەڵامی ئەوم دایەوە، کە تا نها لە رەچەڵەکی ساسانییاندا ترسنووکمان نەبووە، ئەو بە پاسەوانە تایبەتەکانی خۆی وت لابچن، من و ئەو پیاوە بە تەنیا بەجێ بهێڵن. منیش بە پاسەوانانی خۆم لێم دوور بکەونەوە و بە تەنیا جێمان بهێڵن، ئەوانیش لێم دوور کەوتنەوە.

هەرکە پاسەوانەکانی من لێم دوور کەوتنەوە، گۆردینی سێیەم کە سواری ئەسپێکی ڕەش ببوو، لە کاتێکدا کە تێلایەکی (نێزەی تایبەتی رۆمەکان) پێ بوو، ئەسپەکەی تاودا و بەرەو لای من هات. منیش کە سواری ئەسپێکی (ئەبرەش) ببووم ئەسپەکەمم تاودا و بەرەو ئیمپراتۆری رۆم چووم. جڵەوی ئەسپەکەمم بە دەستی چەپ گرتبوو، دەستی راستیشم لەسەر شمشێرەکەم بوو کە هێشتا لە کالان دەرم نەهێنا بوو.

لە ڕێڕەوی هاتنی ئیمپراتۆری رۆم دەمزانی کە بە لای راستمدا دەڕوات، چوونکە کاتێك دوو سوار دەجەنگن، دەبێت لە تەنیشت یەکدی تێپەڕ بن، ئەگەر بەریەك بکەون، هەردوو ئەسپەکە دەکوژرێن و سوارەکان دەکەونە سەر زەوی، چوونکە دەمزانی ئیمپراتۆری رۆم لە لای راستمەوە دەڕوات، دەتوانم لە دوا کاتەکاندا شمشێرەکەم لە کالان دەربکەم، بەڵام پێش راکێشانی شمشێرەکەم، پێویستە بزانم مەبەستی ئیمپراتۆر چییە.

لەپڕ دیتم کە پێلا کەوتە جووڵە، زانیم نێزەکە بەرەو لای من هەڵدەدات. ئەگەر شمشێرم لە کالان دەرهێنا بووایە و بە دەستمەوە بووایە، نەمدەتوانی بە خێرایی لە ڕێڕەوی نێزەکە دوور بکەومەوە، بەڵام چوونکە شمشێرم بە دەستەوە نەبوو، لە هەمان کاتدا بەرەو لای چەپی ئەسپەکەم خوار بوومەوە، نێزە بە سەرووی مندا تێپەڕ ببوو، گۆردینی سێیەم لە تەنیشتمەوە تێپەڕ بوو.

کاتێك نێزەکە لە تەنیشتم تێپەڕی، من خۆم راست کردەوە و جڵەوی ئەسپەکەمم راکێشا و گەڕامەوە. گۆردنی سێیەمیش کە مەودایەکی بڕیبوو، گەڕایەوە و شمشێرەکەی لە کالان دەرکرد.

لە سەرووی زرێی ئیمپراتۆری رۆم ملوانکەیەك هەبوو، ئەڵقەیەکی پان لە سەرووی زرێکەی، ملی ئەوی دەپاراست، هەروەسا سینگ و سکی بە زرێ داپۆشرا بوو،

کاسکێتیش سەری دەپاراست. دەمزانی زەربەی من کاریگەریی لە بەشی سەرەوەی جەستەی ئەو نابێت، تەنیا ئەگەر بەردەستی بکەوێت، چوونکە دوو دەستەکانی ئیمپراتۆر پارێزەری نەبوو، ئەگەر نەمتوانیبووایە زەربە لە دەستەکانی بدەم، دەبووایە زەربەکەم ئاراستەی قاچەکانی بکەم.

گۆردینی سێیەم پیاوێکی قەڵەو بوو، پێ دەچوو قەڵەوییەکەی بگەڕێتەوە بۆ زۆر خۆری.

من وام بیر دەکردەوە کە وەك وتوویانە ئەو زۆر بەهێزە، بەڵام ئەو چاپووك نەبوو، ئەو دەمەی ئەسپەکەی بۆ لای من تاودا، هەستم بە ناچاپووکی ئەو کرد. ئەوکاتەی دوو ئەسپسوار پێکەوە دەجەنگن، هێندەی چاپووکی کاریگەرە، هێندە هێز دەور نابینێت. چوونکە لە جەنگی سواراندا چاپووکی و نەرم بوونی جومگەکانی جەستە و توانای سوود وەرگرتن لە ئەسپ، مەرجی سەرکەوتنن.

کاتێك بۆ جاری دووەم من و ئیمپراتۆری رۆم بەیەك گەیشتین، ئەو شمشێرەکەی لە سەرەوە بۆ خوارەوە بەرەو من راوەشاند.

پێش ئەوەی شمشێرەکەی ئەو لە سەرەوە بۆ خوارەوە بێت، من لەسەر ئەسپەکەم خۆم چەماندەوە و دەمزانی ئەگەر شمشێرەکەی ئەو بە من بکەوێت، ئەوا بە پشتم دەکەوێت و پشتیشم پارێزەری هەبوو و پارچە ئاسنی پانی هەبوون. پێش ئەوەی شمشێرەکەی راست بکاتەوە، هەستامەوە و شمشێرە دوو لێوەکی خۆم ئاراستەی دەستی ئەو کرد.

بەشی پێشەوەی شمشێرەکەم بەر باسکی کەوت، دواتر زانیم کە نەتەنیا باسکی، بگرە جومگەی شانیشی بڕیوە، شمشێرەکەی لە دەست بەربۆوە. دەنگی پاسەوانە تایبەتەکانی گۆردین هات و من بە پاسەوانەکانم وت: رێگە نەدەن گۆردینی سێیەم ببەن.

پێویستە بڵێم کاتێك جەنگی من و ئیمپراتۆر دەستی پێکرد، هێشتا سوارەکانی من هێرشیان دەکردە سەر پیادە رۆمەکان، تەنیا لە یەك بەشی بچووك لە گۆڕەپانی جەنگ کە گۆڕەپانی جەنگی من و گۆردین بوو، جەنگ وەستابوو، سوارەکانی من و پاسەوانەکانی گۆردین تەماشاچی بوون، لە شوێنەکانی دیکە جەنگ بەردەوام بوو.

کاتێك فەرمانم کرد سوارەکانم رێگە نەدەن پاسەوانە تایبەتەکانی گۆردینی سێیەم ئەو ببەن، بۆ جارێکی دیکە خۆم لە ریزی پێشەوەی هێرشبەران بووم، لە دەوروبەری

گۆردینی سێیەم جگە لە پاسەوانەکانی کەسی دیکە ئەسپسوار نەبوون، ئیمپراتۆری ڕۆم هێندە لە پیادەکانی دڵنیابوو کە بەبێ لەشکری سوارە بۆ جەنگی من هاتبوو.

بە چەند ئەفسەرێکم وت بڕۆن، بە سوارەکانمان ڕابگەیەنن ئەگەر تا دوایین کەسیش بکوژرێن، نابێت رێگە بدەن ئیمپراتۆری ڕۆم رابکات، ئەگەر پیادەکان لەسەر رێگەی ئێمە لابدەن، ئێمە ئیمپراتۆری ڕۆم بکوژین یاخۆ بە دیلی بگرین، مووچەی ساڵێکی ڕەبەق بە دیاری دەدەم بە هەریەکەیان، جگە لەوەی مووچەی ئاسایی خۆیان بەردەوام دەبێت.

بەڵێنەکەی من کە هەمووان لە جێبەجێکردنی دڵنیابوون، کاریگەریی زۆری هەبوو، هەرچەندە دەمزانی خودان سواری ئازام هەن، بەڵام دەمزانی سوارێکی ئازا کە هیوای بە وەرگرتنی دیاری بێت ئازاتر دەبێت.

تینویەتیی ماندووی دەکردم، دەمتوانی لە ئەوانی دیکە ئاو وەربگرم و بخۆمەوە، بەڵام ئەوە کاتی دەگرتین، چوونکە سوارانی ڕۆم کە پاسەوانی تایبەتی گۆردین بوون، هەوڵیان دەدا ئەوی لە شەڕگەکە دووربخەنەوە، بۆیە لە ئاوخواردنەوە لە پێشتر ئەوەبوو کە رێگە نەدەم ئیمپراتۆری ڕۆم ببەنە دەرەوە. چوونکە ئەگەر ئەویان دووربخستبایەوە، جەنگ درێژەی دەکێشا، من دەمویست جەنگ بلەز بەکۆتا بێت.